بیار مصطفى سيف الدين

# کێشەی کورد

## لە پەیوەندییەکانی ئەمریکا - تورکیا

پێشەکی و پێداچوونەوە:

پ. د. خلیل علی مراد

وەرگێڕانی:

سەرمەد ئەحمەد



هەولێر- 2009



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- کێشەی کورد لە پەیوەندییەکانی ئەمریکا- تورکیا
- نووسینی: بیار مصطفى سيف الديف
- وەرگێڕانی: سەرمەد ئەحمەد
- نەخشەسازی ناوەوە: یاسین عومەر
- بەرگ: هیشام دۆسکی
- ژمارەی سپاردن: (2590)
- نرخ: 4000
- چاپی یەکەم : 2009
- تیراژ: 1000
- چاپخانە: چاپخانەی هاوسەر (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (425)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

پێشکەشە بە

"بۆ روحی باوکم ... و دایك و خوشك و براکانم"

# پێرست

## ناساندن

پرسی کورد بەشێوەیەکی گشتی هەر تەنها پرسێکی نێوەخۆیی دامالڕاو نەبووە، لەوەتەی کۆماری تورکیا لە ساڵی 1923 دامەزراوە، دۆسیەی پرسی کورد یەکێك بووە لە دۆسیە گرنگەکانی پەیوەندیەکانی دەرەوەی ئەو کۆمارە. بەدرێژایی شەش دەیەی یەکەمی مێژووی کۆماری تورکیا ئەو دۆسیەیە بەشێوەیەکی سەرەکی هەر تەنها لە پەیوەندیەکانی وڵاتانی دراوسێی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست (عێراق، ئێران و سوریا) مایەوە. لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە ئەو دۆسیەیە چوارچێوەی پەیوەندیەکانی تورکیای لەگەڵ ئەو وڵاتانە بڕی بۆ لایەنە هەرێمایەتی و نێودەوڵەتیەکان چوو، بەو وڵاتانەش کە لە پەیمانی ناتۆ هاوبەشی تورکیان، لە وڵاتانی ئەوروپا و رۆژاوا و ئەمریکا. ئەو پەرەسەندنە لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە بەشێوەیەکی بێ وێنە لەگەڵ دەرکەوتنی پرسی کورد بۆ رووی کێشەکان لە تورکیا هات. دوای نزیکەی نیو سەدە لە بێ دەنگی لە کوردستانی تورکیا، لەوەتەی دوایین راپەڕینی کوردان لەوێ لەناوبرا، ئەویش راپەرینی دەرسیم بوو، لە نێوان ساڵانی 1937–1938 روویدا، پارتی کرێکارانی کوردستان لە 15ی ئابی 1984 ەوە دەستی بە چالاکی سەربازی کرد. لەماوەی ساڵانی دواتر ئەو چالاکیە سەربازیانە پەرەیان سەند و بۆ جەنگێکی توندی نێوان ئەو پارتە لەلایەك و هێزەکانی سوپا و ئەمنی تورکی و میلیشیای کوردی (پاسەوانانی لادێ) و هاوکارانی لەلایەکی دیکەوە گۆڕا.

بەپێچەوانەی راپەڕینە کوردیەکانی پێشوو لە کوردستانی تورکیا (راپەرینی شێخ سەعیدی پیران 1925 و راپەڕینی ئارارات 1927–1931 و راپەرینی دەرسیم) کە تەنها لە پارچەیەکی دیاریکراوی ئەو ناوچەیە روویان دەدا و پالێشتیەکی هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی وای نەبوو باسبکرێت، ئەوا پارتی کرێکارانی کوردستان لە رێگەی کۆکردنەوەی لاوان لە کوردستان و لە نێو پەناهەندەکانی ئەوروپا و لە رێگەی پاڵپشتی سیاسی و مادی و لۆجستی کە لە هەندێ لایەنی نێودەوڵەتی و هەرێمایەتی بەدەستی دەهێنا توانی جەنگەکە



درێژ بکاتەوە و رووبەری جەنگەکە بۆ دەرەوەی کوردستانی تورکیا فراوان بکات و بۆ ئەوەی شوێنی دیکەی تورکیا و ناوچەکانی دەرەوبەری بگرێتەوە، ئەوە سەرباری چەند پایتەختێك و شارێکی ئەوروپای رۆژاوا، کە دامەزراوە دیپلۆماسی و بەرژەوەندیە ئابووریەکانی تورکیا لەوێ کرانە ئامانج. لەگەڵ ئەوەی ئامارێکی ورد و باوەڕ پێکراو لەبەردەستدا نییە، بەڵام ئەوەی دڵنیایە ئەوەیە کە جەنگەکە هەزاران کوژراو برینداری لە هەردوولا، بەتایبەتی لە رێزەکانی هێزەکانی تورکی لێکەوتەوە. هەرەوەها بووە بارێکی قورسیش بەسەر ئابووری تورکی، کە خۆی لەبنەڕەتەوە لە دەست گرفتی راستەقینەوە دەینالاند. بە گوێرەی چەند مەزەندەیەك جەنگەکە لە نێوان ساڵانی 1984 تا 1996 نزیکەی 100 ملیار دۆلاری زیان گەیاندووە. بەگوێرەی ئەوەی باسکرا، پرسی کورد لە تورکیا بۆتە پرسی (ئاسایشی نەتەوەیی)، سەرکردە سیاسی و سەربازیەکانی تورکیا پارتی کرێکارانی کوردستان بە رێکخراوێکی تیرۆریستی دادەنێن. ئیدی حکومەتی تورکی پەیوەندیەکانی لەگەڵ لایەنە هەرێمایەتی و نێودەڵەتیەکان لەسەر بنەمای هەلۆێستی ئەو وڵاتانە بەرامبەر پارتی کرێکاران، هەڵدەسەنگاند.

جەنگەکە لە کوردستان بۆ دانیشتوانە سڤیلەکانی ناوچەی چالاکیە سەربازیەکان نەوەك مەرگەسات، بەڵکو ماڵویرانی لێکەوتەوە. دیارترین بەشی ئەو مەرگەساتە بە ئامانجگرتنی هاوڵاتیانی بێ تاوان و چوڵکردن و وێرانکردنی هەزاران گوند و راگواستنی دانیشتوانەکەی و سوتاندن و وێرانکردنی رووبەرێکی فروانی زەوی کشتوکاڵی.

لە راستیدا ئەو لایەی جەنگەکە بووە بابەتێکی گرنگی پەیوەندیەکانی تورکیا لەگەڵ زۆر لەو وڵاتانەی کە بەهۆی ئازارەکانی هاوڵاتیانی مەدەنیەوە رەخنەی توندیان لە تورکیا گرتووە، ریکخراوەکانی مافی مرۆڤ و کەسایەتیە سیاسی و رۆشنبیریەکان و میدیاکان ئەو هەڵوێستەیان وەرگرت، ئەو هەڵویستەیان پارتی کریکارانی کوردستانی نەپەڕاند بەهۆی ئەوەی لە بەشێکی ئەو ئازارانەی هاوڵاتیان بەرپرسیار بوو.

ئەو ڕۆڵە زۆر گرنگەی پرسی کورد یا ئەوەی هەندێ پێی دەڵێن (فاکتەری کوردی – Kurdish Factor) لە سیاسەتی دەرەوەی تورکیا لە ماوەی هەشتاکان و نەوەدەکان سەرنجی ژمارەیەك توێژەری بۆلای خۆی ڕاکێشا. ئەو ڕۆڵەش لە میانەی بەدواداچوونی توێژینەوەی ئەو توێژەرانەدا دەردەکەوێت، ئەوان پێشینەیان بەو ڕۆڵەی ئەو فاکتەرە لە پەیوەندیەکانی تورکیا لەگەڵ سوریا و عێراق و ئێران داوە، هەروەها لە تۆمەت خستنە پاڵ یەکتری و چالاکی سەربازی سنووربەزێن دژ بە بنکەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان بەتایبەتی لە کوردستان عێراق و تەنگژە و هەڕەشەی هەڵگیرسانی جەنگ لە تەنگژەی سوری – تورکی کە لە تشرینی یەکەمی 1998 ڕوویدا. دوای ئەمەش گرنگی فاکتەری کوردی لە پەیوەندیەکانی تورکیا لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژاوا لە دیدگای ڕەخنەکانی ئەو وڵاتانە لەبارەی ئازارەکانی مەدەنیەکان لە کوردستانی تورکیا دەردەکەوێت و ئەمەش ڕێگری لەبەردەم هەوڵەکانی تورکیا بۆ بوونە ئەندام لە یەکێتی ئەوروپا گرتووە.

بەڵام سەبارەت بە ڕۆڵی فاکتەری کوردی لە پەیوەندیەکانی تورکیا و هاوپەیمانە سەرەکیەکەی (ئەمریکا)، ئەوا بەقەد ئەوەی شایەنیەتی لەلایەن ئەو توێژەرانەی کە بە چەند بڕگەیەك یا لاپەرەیەك باسیان کردووە، گرنگی پێنەدراوە.

لێرەوەیە گرنگی ئەو کارەی کە دکتۆر بەیار مستەفا پێشکەشی کردووە، دێت. لە تێزە ئەکادیمیە بە پێزەکەی بە وردی چارەسەر پێگەی پرسی کورد لە پەیوەندیەکانی تورکی ئەمریکی و کاریگەری لەو پەیوەندیانە لەماوەی ساڵانی 1991– 1999 کردووە.

دیاریکردنی ئەم ماوەیە (1991– 1999) پاساوی خۆی هەیە، ساڵی 1991 دوو ڕووداوی دیاری بەخۆیەوە بینی، یەکەم جەنگی دووەمی کەنداو و ئەو ڕووداوانەی کە بەدوای داهاتن وایکرد جیهان ئاوڕ لە مەینەتیەکانی کورد بە گشتی بداتەوە، بەتایبەتی لە کوردستانی عێراق کە هاوپەیمانی نێودەوڵەتی بەسەرکردایەتی ئەمریکا (پێگەی ئارامی) بە پارێزگاری هێزە هاوپەیمانەکانی



تورکیا دابمەزرێنێ. هەرچی ڕووداوی دووەم بوو داتەپینی یەکێتی سۆڤیەت و کارکردەکانی لەسەر سیستەمی پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان و نەمانی ڕژێمی دوو جەمسەری و دەرکەوتنی ئەمریکا وەك تاکە زلهێزی جیهان بوو. ئەو ڕووداوە پرسیاری لەبارەی داهاتووی ڕۆڵی ستراتیژی تورکی بۆ ڕۆژاوا بە گشتی و ئەمریکا بەتایبەتی وروژاند. هەرچی ساڵی 1999 ە، کە دەستگیرکردنی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان عەبدوڵا ئۆجەلانی بەخۆیەوە بینی، کە لە ڕێگەی هەماهەنگیەکی دیاری نێوان دەزگای هەواڵگری تورکی و ئەمریکی هاتە دی.

خۆ لێدان لە باسێکی گرنگ و هەستیاری وەك بابەتی ئەم کتێبە، کە بابەتێکە بەگوێرەی زانیاری کەمی من باسنەکراوە، زۆر سەختی دێتە پێش کە تەنها ئەوانەی لە بواری توێژینەوەی ئەکادیمی کاردەکەن هەستی پێ دەکەن، هەروەها پێویستی بە چەند مەرجێك هەیە، کە دەبێت لەو توێژەرەی کە توێژینەوەکە دەکات دا هەبێت. پێویستە توێژەر لە کۆکردنەوەی مادە زانستیەکەی بە ئارام بێت، بەهۆی بڵاوی ئەو مادەیە و وەرگێڕانی زۆربەیان و توانای شیکردنەوەی مادە زانستیەکەی بەشێوەیەکی زانستی ورد و خستنەڕووی بابەتەکە بە گوێرەی پلانێکی دیراسەتکراو و زمانێکی دروست و پاڵاو. پێش هەموو ئەمانە، دەبێت توێژەر شارەزای تەواوی چوارچێوەی گشتی پەیوەندیەکانی تورکیا– ئەمریکا لەلایەك و پەرەسەندنەکانی پرسی کوردی لە تورکیا لەلایەکی دیکەوە هەبێت، بۆئەوەی چارەسەرەکەی بۆ بابەتەکە تەواو و ڕوون بێت و شیکردنەوەکانی ورد بێت.

بەهۆی هەستیاری ئەو جۆرە توێژینەوەیە، ئەوا بوونی بڕێکی باش لە بابەتگەرایی تێیدا – دەبێتە دەستکەوتێکی گرنگ، کە ڕاستگۆییەکەی پشتئەستوور دەکات. بەبێ زێدەڕۆیی دەتوانم بڵێم کە خەسڵەتەکانی توێژەری زانستی باش تا ڕادەیەکی زۆر لە نووسەری ئەم پەرتوکە ئامادەیە و خوێنەری بەڕێز دوای خوێندنەوەی هەست بەمە دەکات. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە نامەوێت، لەم پێشەکیەوە باس لە ناوەڕۆکی ئەم کتێبە و پرۆگرامی کتێبەکە و سەرچاوە زۆر و ڕەسەن و هەمەجۆرەکانی کە پشتی پێ بەستووە بکەم، هەروەها گرنگترین ئەو دەرەنجامانەی کە لەبارەی کاریگەری پرسی کورد لەسەر پەیوەندیەکانی ئەمریکا

– توركیا توێـژەر پێـی گەیـشتووە و ئـەو دووفاقیـەی کـە لـە هەڵوێـستی ئـەمریکا لەبارەی پرسی کورد لە تورکیا تۆماریکردووە. ئەوەندە بەسە ئاماژە بۆئەوە بکـەم کە خوێنەر لەم کتێبـەدا مادەیـەکی ئۆرجینـاڵ و زانیاریـەکی نـوێ و مانـدوبوونێکی زانـستی دەبـینێ، کـە وا لـە کتێبەکـە دەکـات لـە نێـو پەرتەکخانـەی توێژینـەوە کوردیەکان شوێنی شایستەی خۆی وەرگرێت.

لە ساڵی 2003ەوە دکتۆر بەیار مستەفا دەناسم، ئەو کاتەی لەبارەی تێزی ماستەرەکەی کە لـە کۆلێـژی ئـادابی زانکـۆی دهـۆك بـە سەرپەرشـتی دکتـۆرە سـوعاد حەسـەن جـواد بەناونیـشانی (سیاسـەتی ئـەمریکا بەرامبـەر تورکیـا و کاریگەری لەسەر کوردستانی باکوور 1923–1926) ئامادەی دەکرد بۆ راوێژی زانستی سەردانی دەکردم. کەسایەتی توێژەریکی بەپەرۆشم تیدا بـەدیکرد، کـە دەخوازێت هەموو لایەنیکی بابەتەکە بزانێت و پابەندی مێتـۆدی زانـستی بێـت، ئەوەی ویستی پێی گەیشت و ماسـتەرەکەی بـە پلـەی نایـاب لـە سـاڵی 2004 وەرگیرا، لە هەمان ساڵدا چاپکرا. لەساڵی 2008 کتێبیکی دیکەی بەناونیـشانی (تورکیا و کوردسـتانی عێـراق : دوو دراوسـێی سەرسـوڕماو) چـاپکرد. هەرچـی ئەم کتێبەیە کە لە بنەڕەتەوە تێزی دکتۆراکەیەتی کە لە ماوەی نێوان تشرینی یەکـەمی 2006 و شـوباتی 2009 لـە زانکـۆی موسـڵ لـەژێر سەرپەرشـتی مـن تـەواوی کـردووە، بـە پلـەی (نایـاب) پەسـندکرا، ئەمـەش لەبـەر زۆر هـۆ، کـە دیاریترینیان ئۆرجیناڵبوونی بابەتەکە و میتۆدە زانستیەکەی تێزەکە و هەوڵ و ماندبوونی زۆر لە کۆکردنەوە و خستنەڕووی مادە زانستیەکە.

هیوادارم دکتۆر بەیار، کە ئیـستا ئەنـدامی دەسـتەی مامۆسـتایانی زانکـۆی دهۆکی کۆلیژی ئادابی بەشی مێژووە، لە کاروانی زانستی بەهەمان پەرۆشـیەوە بەردەوام بێـت و رەچـاوی پابەنـدبوون بـە میتـۆدی زانـستی و بابەتگـەرایی لـە نووسینەکانی بکات....لەگەڵ هیوای سەرکەوتنی بەردەوامم بۆت.

پرۆفیسۆر دکتۆر

خلیل علی مراد

زانکۆی موسڵ – کۆلیژی پەروەردە

## پێشەکی

پرسی کورد لە تورکیا، لەلایەن سەنتەرەکانی توێژینەوە و دامەزراوە ئەکادیمیەکانی تورکی و بیانی بە شێوەیەکی تایبەتی بە روونی لەوەتەی دوو دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم گرنگی پێدراوە، بەڵام ئەو توێژینەوانەی کە لەو سەنتەرە و دامەزراوانە دەرچوونە، کاریگەریەکی زۆر کەمی لە پرسی کوردی لە تورکیا و لەسەر پەیوەندیە دەرەکیەکانی تورکیا بە گشتی و پەیوەندیەکانی بە ئەمریکاوە بەتایبەتی هەبووە. توێژەر بواری ئەوەی نەبووە، توێژینەوەو لێکۆڵینەوە قوڵەکانی ئەم بوارە بەسەر بکاتەوە. پێ دەچێت ئەو بابەتانە هەتاکو لەلایەن توێژەرانی تورکیشەوە، ئەوەندە گرنگی پێ نەدرابێت، لەوانەیە نەبوونی توێژینەوەی ئەکادیمی و لێکۆڵینەوەی زانستی لە تورکیا، بە گوێرەی بەسەرکردنەوەی توێژەر ئەمە روون بکاتەوە. هەڵبژاردنی ئەم بابەتە وەك خواستێك بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەموکوڕی و کەلێنانەی کە لەو لێکۆڵینەوە و توێژینەوانەدا لەبارەی پەیوەندیەکانی تورکیا–ئەمریکا هەیە و پێگەی پرسی کورد و کاریگەری لەسەر ئەو پەیوەندیانە، دێت.

ئەم تێزە باس لە چوارچێوەی گشتی پەیوەندیەکانی ئەمریکا–تورکیا لە دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم و پێگە و گرنگی پرسی کورد لە تورکیا و کاریگەری لەسەر ئەم پەیوەندیانە دەکات. ماوەی توێژینەوەکە لە ساڵی 1991 دەست پێ دەکات، کە تێیدا تورکیا پەرەسەندنی گەورە و خێرایی بەخۆیەوە بینی و لە ساڵی 1999 کۆتایی دیت، کە دەستگیرکردنی عەبدوڵلا ئۆجەلانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستانی بەخۆیەوە بینی، لە پرۆسەیەکی هەماهەنگی هەواڵگری ئەمریکی–تورکی–ئیسرائیلی، گەیشتنی پەیوەندیەکانی ئەمریکا– تورکیا بۆ ئاستی ستراتیژی.

میتۆدی توێژینەوەی مێژوویی و سروشتی بابەتەکە، ئەوەی بەسەر توێژەردا سەپاند کە توێژینەوەکەی بۆ چوار دابەشی بنەرەتی دابەش بکات، بەشی یەکەم



بۆ قسەکردن لەبارەی چوارچێوەی گشتی پەیوەندیەکانی ئەمریکا–تورکیا لەوەتەی کۆتایی دووەم جەنگی جیهانی تا ساڵی 1999 تەرخان کردووە. ئەم بەشە بەروخستنێکی مێژوویی پەرەسەندنی پەیوەندیەکانی ئەمریکا–تورکیایە.

باسکردنی رێڕەو رەهەندە مێژووییەکانی ئەم بەشە بۆ روونکردنەوەی رەهەندە راستەقینەییەکانی پەیوەندیەکانی ئەمریکا–تورکیا گرنگ بوو، ئەو پەیوەندیانەی کە لەسەر بنەمای سوود و پێویستی هاوبەش کە لەسەر بناغەی ئەمنی دامەزراو. بابەتی یەکەمی بەشی یەکەم لەسەرەتادا جەخت لەسەر بەدوایەکداهاتنی پەیماننامە مۆرکراوەکانی لەگەڵ تورکیا و یارمەتیە سەربازی و ئابووریە ئەمریکیەکان دەکاتەوە. هەروەها باس لە دیارترین ئەو کۆسپانە دەکات کە هاتوونەتە بەردەم ئەو پەیوەندیانە، بەتایبەتی ئەوەی بە تەنگژەی قوبرسی 1974 و قەدەغەکردنی پێدانی چەکی ئەمریکی بە تورکیا لەوەتەی ساڵی 1975 ەوە پەیوەست بوون، هەروەها گەڕانەوەی پەیوەندیەکانیان بۆ قۆناغی گەرموگوڕی دوای ئەو پەرەسەندنە ترسناکانەی کە تورکیا و دراوسێکانی لە کۆتایی حەفتاکانەوە بەخۆیەوە بینی، تا بە قۆناغی (هاوبەشیی باشکراو) لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی بیستەم گەیشت. هەرچی بابەتی دووەمە، بۆ دەرخستنی ئەو راستیەیە کە باس لەوە دەکات کە تورکیا بە کۆتاییهاتنی جەنگی سارد و داتەپینی یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی 1991 ەوە، گرنگی خۆی لەدەست نەداوە، بەڵکو ئەو گرنگیەی لە سایەی گۆڕانی ئەرکی ستراتیژی تورکیا بۆ ئەمریکا زیادیکردووە، هەروەها دیارترین ئەو بوار و بابەتانەش بەدەردەخات کە تێیدا تورکیا رۆڵێکی بنەڕەتی بۆ بەدیهێنان و پاراستنی بەرژەوەندیە ستراتیژیەکانی ئەمریکا گێڕاوە. بابەتەکە بە بەرووخستنی خشتەی کاری سەردانەکەی بیل کلنتۆنی سەرۆکی ئەمریکی بۆ تورکیا لە ناوەراستی تشرینی دووەمی 1999 کۆتایی پیهاتووە،کە تێیدا تورکیای بەهاوبەشی ستراتیژی وەسفکرد.

هەرچی بەشی دووەمە، کەناونیشانی **"پەرەسەندنەکانی پرسی کورد لە تورکیا"** هەڵگرتووە. کە بۆ توێژینەوە لە هەمەجۆر لایەنی پرسی کورد لەتورکیا

هەر لە دەرکەوتنیەوە تا دەستگیرکردنی ئۆجەلان لە شوباتی 1999 ەوە تەرخانکراوە. لەم بەشەدا سەرەتاکانی پرسی کورد لە دەوڵەتی عوسمانی بەروو خراوە، ئەو پرسەی کە لە کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس 1919–1920 چووە قۆناغی بە نێودەوڵەتێکردنەوە و لە پەیمانی سیڤەرەوە لە ئابی 1920 سیفەتی یاسایی وەرگرت، ئەو پەیمانەی کە دانی بە دامەزراندنی قەوارەیەکی کوردی خودان ئۆتۆنۆمی نا کە دواتر پەرەبسەنێ و بۆ دەوڵەتێك کە کورد لەخۆبگرێت. هەروەها لەم بەشەدا باس لە بەشداریکردنی زۆرێك کورد لە جەنگی سەربەخۆیی تورکی بەسەرۆکایەتی مستەفا کەمال کراوە، کە دواتر مستەفا کەمال دەستبەرداری ئەو بەلێنانەی بوو کە پێیانی دابوو، سیاسەتی نکۆڵیکردن لە ناسنامە و کلتوری گرتەبەر کە دواتر ئەم سیاسەتە بۆ ئایدیۆلۆژیا گۆڕا و بووە بنەمایەك کە رژێمی سیاسی تورکی لە رێگەی یاساکان و دەستوری وڵاتەوە چەسپاندی. هیچ کامێك لە دەستەبژێرانی سیاسی تورکی زاتی ئەوەیان نەکرد، لەم ئایدیۆلۆژیایە کە رەخنەگرتن لێی حەرامکراوی سیاسی بوو، لێی دەربچن. هەروەها لەم بەشەدا باس لە دیارترین روخسارەکانی پرسی کورد لە تورکیا کراوە، کە بە بزووتنەوەی چەکداری ئۆپۆزسیۆن دەستی پێکردووە، کە بە توندی یەك بەدوای یەك سەرکوتکراون. هەروەها رۆشنایی خراوەتە سەر قۆناغی شەستەکان، کە کورد لە رێگەی چوونە پاڵ پارتە چەپەکانی تورکیا، دەروازەیەکی بۆ دەربڕینی ناسنامەی کوردی دۆزیەوە، هەروەها قۆناغی حەفتاکان سەرباری سیاسەتی سەرکوتکردن و تەنگپێهەڵچنین کە حکومەتی ئەو سای تورکی پیادەی دەکرد، بە قۆناغی سەرهەڵدانی رێکخراوی سیاسی چەپی کوردی دادەنرێت، کە دیارترینیان پارتی کرێکارانی کوردستانە. ئەو بەشە باسی لە بزووتنەوەی چەکداری بەسەرکردایەتی پارتی کرێکارانی کوردستان لە ساڵی 1984 کردووە، هەروەها بەرزبوونەوەی پرسەکە لە تورکیا لەماوەی نەوەدەکان و پەرەسەندنەکانی جەنگی نێوان پارتی کرێکارانی کوردستان و سوپای تورکی، لەپاڵ ئاماژەدان بەو کەناڵە ئاشتیانەی کە کورد لە داواکردنی مافەکانی لەرێگەی دامەزراندنی پارتی سیاسی پەنای بۆ بردوون.



هەرچی بەشی سێیەمە، بۆ چوار بابەتی سەرەکی دابەشکراوە، پلە و قەبارەی پاڵپشتی ئەمریکی بۆ تورکیای تێدا خراوەتە روو، کۆمەڵێ خاڵ و بابەتی سیاسی ئەمنی و ئایدیۆلۆژی هەبوون، وایان لە ئەمریکا کرد بەبێ دوودڵی و سڵمینەوە پاڵپشتی لە سیاسەتە ناوخۆییەکانی تورکیا بکات، بەتایبەتی لەبارەی ئەوەی پەیوەستە بە سەرکوتکردنی کورد و پێشێلکردنی مافە مەدەنیەکانیان بە پاساوی رووبەرووبوونەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان. لەم بەشەدا ژمارە و داتا و شاهێد رووداوی واخراوەتەروو، لایەن و شێوەکانی پاڵپشتی ئەمریکی بۆ تورکیا بەدەردەخات، چ سەربازی بێت یا ئابووری یا سیاسی و ئەمنی یا هەوالگری بێت. ئەو پاڵپشتیانە بۆ زۆریك شاراوە بوون و بۆ رووبەرووبوونەوەی پارتی کرێکارانیش کاریگەربوون.

بەشی چوارەم کە بۆ بابەتی "**رەخنەکانی ئەمریکا لە سیاسەتی تورکیا لەبەرامبەر پرسی کورد**" تەرخانکراوە، دەنگدانەوەی کارکردە مەترسیدارەکانی جەنگی نێوان تورکیا وپارتی کرێکارانی کوردستان بۆ سەر مافە مەدەنیەکانی کوردی تیدا خراوەتە روو. لەم بەشەدا پەرەسەندنی هەڵوێستەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن کە خۆی لە ئیدارەی ئەمریکی دەبینێتەوە و دەسەڵاتی یاسادانان کەخۆی لە کۆنگریس دەبینێتەوە و میدیا و رۆژنامەی ئەمریکی و رێکخراو و دەستەکانی مافی مرۆڤ سەبارەت بەو ئازارانەی کە هاوڵاتیانی کورد بەهۆی سیاسەتی حکومەتی تورکیەوە دەیچێژن. هەروەها لەم بەشەدا باس لەو زانیاریانە کراوە کە ئەندازەی مامەڵەکردنی لایەن و دەستە ئەمریکیە فەرمی و نافەرمیەکان هەریەکە بەجیا لەگەڵ کێشەی کورد کردوویانە و ئەندازەی ئەو کاریگەریەی کە کێشەی کورد لەسەر سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر تورکیای جێهێشتووە، کراوە.

تەگەرەی بنەڕەتی کە لەم بەشەدا رووبەرووم بووەوە، سەرباری گرنگی و کاریگەریەکەی کەمی توێژینەوەی نووسرابوو، لەسەر بابەتەکە، هەروەها کەمی سەرچاوەی پەیوەندیدار بە بابەتەکە لە پەرتوکخانەکانی عێراق وایلێکردم بۆ تورکیا سەفەر بکەم، لەوێ بەدوای سەرچاوە و ژێدەری تایبەت بەبابەتەکە لە

زانکۆ و سەنتەرە زۆر و هەمەجۆرەکانی توێژینەوە بگەڕێم. سەفەرکردنم بۆ تورکیا و مانەوەم بۆ ماوەی چوار مانگ، وایکرد گەڕان بەدوای کتێب و سەرچاوەی پڕ زانیاری گرنگ کە تەواوی بابەتەکەی داپۆشی ئاسان بێت. یەکێ لەو سەختیانەی کە ڕووبەڕووم بووەوە، بڵاوبوونەوەی بابەتەکە بوو لە ژمارەیەکی زۆر لەراپۆرتی فەرمی ئەمریکی و راپۆرتی دەستەو ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان بوو، سەرباری ڕۆژنامەی تورکی و ئەمریکی کە زۆربەی جار زانیاری دژ و جیایان بەگوێرەی دیدگای خۆیان تێدا بوو. ئاسان نەبوو، مامەڵە لەگەڵ بیروڕای بەرپرسانی ئەمریکی لەلایەك و لێدوانەکانی هاوتا تورکەکانیان لەلایەکی دیکەوە و کوردیش لەلای سێیەمەوە بکەین، هەمان ڕەوش لە مامەڵەکردن لەگەڵ پرسەکانی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ کێشەکانی دیموکراتی و چەمك و راڤە هەمەجۆرەکانی دیموکراتی لەلایەن هەر سێ لایەنەوە لە ئارادابوو.

لە ئامادەکردنی ئەم تێزەدا پشتم بە سەرچاوە و ژێدەری زۆر و هەمەجۆر بەستووە، کە لە لیستی سەرچاوەکان هاوپێچکراوە. سەرچاوە ئۆرجینالەکان (ڕەسەن) لە چەسپاندنی زانیارەکانی ئەم تێزەدا، بەختی باشیان بەرکەوتووە، بۆیە پشت بە راپۆرتی ساڵانەی دەرچوو لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بەستراوە، سەرباری داتا فەرمیەکانی حکومەتی ئەمریکی و وتارەکانی ئەندامانی کۆنگریس لەبارەی تورکیا و کورد. هەورەها پشت بە راپۆرتە خولیەکانی (دوری) دەستەکانی چاودێری مافەکانی مرۆڤیش بەستراوە. کۆمەڵە راپۆرتەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، (Turkey Country Report on Human Rights Practices) کە ساڵانە لەبارەی پیادەکردنەکانی مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا دەردەچوون، زانیاری پڕ بەهای بە تێزەکە بەخشی، کە وایکرد لە تۆمارکردنی پێشێلکاریەکانی مافی مرۆڤ لەتورکیا وردیەکی زۆری تێدا بێت، ئەمەش لەبەرئەوەی ئەو راپۆرتانە بەهەوڵ و ماندووبوونی بالیۆزخانەی ئەمریکی لە ئەنقەرە و کونسوڵخانە چالاکەکانی لە ناوچە کوردیەکانی تورکیا ئامادە دەکران، کە شوێنی ئەنجامدانی پێشێلکاریەکان بوون. هەروەها راپۆرتی (**پاساوەکانی پێشێلکاری سوپای تورکی بۆ مافەکانی مرۆڤ و باری قوبرس** Report on Allegations o Human Rights Abuses by the Turkish Military and on the Situation in Cyprus) و راپۆرتی (**ئامێرەکانی سەربازی ئەمریکی و پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤ**. Military Equipment and Human Rights Violations U.S.) کە وەزارەتی دەرەوە بەهاوکاری وەزارەتی بەرگری ئامادەیان کرد، ئەو راپۆرتە پانتاییەکی گرنگیان لە نووسینی هەردوو بەشەکانی سێ و چواری تێزەکەدا داگیرکردووە. گرنگی هەردوو راپۆرتەکە لەوەدایە کە بۆ یەکەمجارە تورکیا بە بەکارهێنانی چەکی ئەمریکی بۆ خاپورکردنی گوندی کوردی و راگواستنی دانیشتوان و پێشێلکاری فراوان لە مافەکانی مرۆڤ لە باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵات تۆمەتبار دەکات. سەرباری گرنگی بێ هاوتای ئەو داتاو ئامار و ڕووداوانەی کە تێیاندا هاتوون، بەڵام تۆمارنەکردنی کاردانەوەی ئەمریکی لەبارەی ئەو پێشێکاریانە، پرسیارێکی راستەقینەی لەبارەی سودی دەرکردنی ئەو راپۆرتانە و ئەندازەی کاریگەری لەسەر سیاسەتی ئەمریکی لەبەرامبەر تورکیا هێنایە ئاراوە.

ئەو کۆمەڵە راپۆرتە ساڵانەییانەی کە ڕێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ و دەستەکانی لەژێر ناونیشانی (پەرەسەندەکانی مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا Human Rights Developments / Turkey) دەریدەکات، کە دانەیەکی لەسەر تۆری ئەنتەرنێتدا هەیە، پانتایەکی گرنگ لە تێزەکە داگیر دەکات، ئەمەش لەبەرئەوەی زانیاری دروست و وردی تێدایە و لەو سەردانانەی کە فەرمانبەرانی ڕێکخراوەکە پێ هەڵدەستن بەدەستهاتوون، کە لە ڕێگەی چاوپێکەوتنی راستەوخۆ لەگەڵ هەمەجۆر لایەن ئەنجامیان داوە. گرنگیە بێ هاوتاکەی لەوەدایە کە بێ لایەنەو نوێنەرایەتی هیچ کام لەلایەنە بەشداربووەکانی ململانێکە ناکات. ئەو زانیاریانە تەواوانەی کە لە راپۆرتی دەستە و ڕێکخراوە ناحکومیەکانی دیکەوە هاتوون، لایەنێکی گرنکی بەشەکانی ئەم توێژینەوەی بە ئامار و شاهێد دەوڵەمەند کردووە. بۆ نموونە ئەو توێژینەوەیەی کە توێژەران لە پەیمانگای سیاسەتی جیهانی لەواشنتن بە

هاوكاری یەكێتی زانایانی ئەمریكی لەژێر ناوی (پڕچەككردنی سەركوتكردن: فرۆشتەنیەكانی چەكی ئەمریكی بۆ توركیا لەمیانەی ئیدارەی كلینتۆندا Arming Repression: U.S. Arms Sales to Turkey during the Clinton Administration) ئامادەیان كرد، ئامارو ژمارەی وای تێدا بوو، كە پێدانی چەك و بەخشین و بەرنامەی مەشق و پەروەردەی سەربازی بۆ توركیا لە ماوەی (1984–1999) تێدابوو، ئەو ئامار و داتایانەش پشتیان بە داتا فەرمیە ساڵانەیەكانی هەردوو وەزارەتەكانی بەرگری و دەرەوەی ئەمریكا بەستبوو. هەروەها تێزەكە سوودی زۆری لە راپۆرتەكانی رێكخراوی چاودێری مافەكانی مرۆڤ Human Rights Watch بینیووە، لە راپۆرتی دەرچووی ساڵی 1995 لەژێر ناوی (**گواستنەوەی چەك و پێشێلكاری یاساكانی جەنگ لە توركیا** (Weapons Transfers and Violations of the Laws of War in Turkey بە روونی ئەوەی چەسپاند كە توركیا چەكی ئەمریكی لە پێشێلكاریەكانی یاساكان و مافەكانی مرۆڤ لە توركیا بەكاردێنێت، ئەمەشی بە بەڵگەی مادی و ئیفادەی راستەوخۆی ئەوانەی زیانیان لێ كەوتووە، سەلماند. ئەو راپۆرتانە سەرنجی رای گشتی ئەمریكی و كۆنگرێسی بۆ ئەو رۆڵە ناراستەوخۆیەی ئەمریكا راكێشا، لەبارەی درێژەدانی توركیا بە سیاسەتی دژ بە بەهاكانی دیموكراتی و مافەكانی مرۆڤ، كە ئەمریكا وا بانگەشەیان بۆ دەكات كە لە ئامانجە ستراتیژیەكانیەتی. رۆژنامە ئەمریكی و توركی و كوردی وعەرەبیەكان مادەیەكی دەوڵەمەندیان لە روماڵكردن و تۆماركردنی هەڵوێست و كاردانەی لایەنە جۆراوجۆرەكان دابینكردووە، سەرباری بەدەرخستنی هەڵوێستی رای گشتی لەو سیاسەتەی كە هەر لایەنێك لە بەرێوەبردنی بابەتەكەدا دەگرنەبەر. لە دیارترین ئەو رۆژنامانەكەی كە لەم تێزەدا هانای بۆبردراوە و بەكارهاتووە، رۆژنامەی (نیۆیۆرك تایمز York New Times) و (واشنتن تایمز The Washington Times) و (Akron Beakon Journal ئەوهایۆ) و (سان بیترسبیرك St. Petersburg Times فلۆریدا) و(بۆستن كلوب Boston Club) و (بۆستن) و ئەوانی دیكە بوون. سەبارەت بە رۆژنامە توركیەكان بە فەرمی



نافەرمیەوە، رۆژنامەی (توركیش دەیلی نیوز Turkish Daily News) و (میللیەت Milliyet) و (جمهوریەت Cumhurriyet) و (سەباح Sabah)ە، هەرچی رۆژنامە كوردیەكانە، كە رەنگدانەوەی بیروبۆچوونی پارتی كرێكارانی كوردستانی دەكرد، رۆژنامەی (رۆژی وڵات– **شمس الوطن**) و (وڵات– **وە لات**) بوون. ئەو رۆژنامانە بە سەرچاوەی بنەرەتی هەر توێژینەوەیەك دادەنریت كە توێژینەوە لە پەیوەندیەكانی توركیا – ئەمریكا یا پرسی كورد دەكات، چونكە ئەو رۆژنامانە رووداوە رۆژانەییەكانی گۆرەپانی توركیایان بە بەردەوامی رووماڵكردووە.

كتێب و توێژینەوە ئینگلیزیەكان كۆڵەگەی تێزەكەیان لە زۆربەی بەشەكاندا پێكهێناوە. مایكل كانتەر لە پێشەوەی ئەو توێژەرانەوە دێت كە سوودم لە نووسینەكانی وەرگرتووە، كە بەدرێژی لەبارەی پرسی كورد لە توركیا نووسیوویەتی. نووسینەكانی گانتەر Michael Gunter بەتایبەتی كتێبی (كورد و داهاتووی توركیا The Kurds and The Future of Turkey) مادەیەكی زانستی پڕ لە راڤەی سیاسی لە خۆگرتووە. هەمان شتیش لەسەر توێژەری بەریتانی دیڤید ماكدوال David McDowall و كتێبەكەی (مێژووی نوێی كورد A Modern History Of Kurds) جیێەجیێ دەبێت، گرنگی كتێبەكە گەورەكەی ماكدوال (نزیكەی 500 لاپەڕەیە) هەر تەنها لە بەها مێژوویی و توێژینەوەیی و فیكریەكەیدا نیە، كە شاكارێكی ئەكادیمی بەرزی پێشكەشكردووە، بەڵكو لەوەدایە كە نووسەرەكەی یەكێكە لە دیارترین پیسپۆرانی كاروباری رۆژهەڵاتی ناوەراست و شارەزایە لەبارەی كوردەوە، لە ساڵی 1996 ەوە پۆستی راوێژكاری لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا بۆ كاروباری رۆژهەڵاتی ناوەراستی وەرگرتووە. هەروەها تێزەكە سودی لە نووسینەكانی هەریەكە لە هێنری جی باركی Henri J. Barkey ، مامۆستای پەیوەندیە نێودەوڵەتیەكان لە زانكۆی لیهی Lehigh ئەمریكی و خاوەنی توێژینەوە قوڵ و پێشەنگە لەبارەی توركیا، ئەو توانایەی ناوبراو لەبارەی توركیا وایكرد، لەبارەی كێشەكانی پەیوەست بە توركیا لەماوەی ساڵانی نەوەدەكان راوێژ بە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكی پێشكەش بكات، هەروەها

گراهام فاولەری Graham Fouler گەورە شیکەرەوەی سیاسی لە دامەزراوەی (راند RAND) ی ئەمریکی و جێگری پێشووی سەرۆکی ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتیمانی لە ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکی، هەروەها بۆ ماوەی چەندین ساڵ لە تورکیا مایەوە. جۆناسان راندل Jonathan Randal و کیفن ماکیرنان دوو رۆژنامەنووسی ئەمریکی دیارن، کە راپۆرتی رۆژنامەوانی دووردرێژیان لە رۆژنامەکانی ئەمریکا وەك واشنتن پۆست و نیۆیۆرك تایمز هەیە و سەرباری کتێبیش، لەبارەی پرسەکانی سیاسەتی ئەمریکا و تورکیا و پرسی کورد.

نووسینی توێژەرە تورکەکانیش رۆڵێکی دیاریان لە نیو ئەو سەرچاوانەدا هەیە، جا چ ئەوانەی بە زمانی ئینگلیزی نووسرابن وەك نووسەری تورکی بەناوبانگ عیسمەت ئەیمست Ismet Imset (پارتی کرێکارانی کوردستان PKK) یان ئەوانەی بە زمانی تورکی نووسراون وەك نووسیەنەکانی تۆنجای ئۆزکان Tuncay Ozkan و تۆران یاووز Turan Yavuz (کورد کارتی ئەمریکان ABD'nin Kurt Karti) و کتیبەکەی ئەرسان یاڤی Ersal Yavi (خەونی کوردستان Kurdistan Utopyasi). نووسینەکانی عیسمەت ئەیمست گرنگیەکی تایبەتی هەیە، لە بەرئەوەی بریتین لە کۆمەڵێ راپۆرت، لەبارەی دروستبوونی پارتی کرێکاران و ئایدیۆلۆژیاکەی و پەرەسەندنی چالاکیەکانی لە تورکیا تا سەرەتای نەوەدەکان، کە بۆ رۆژنامەی تورکیش دەیلی نیوز لەماوەی ساڵانی حەفتاکان نووسیوویەتی، بەو سیفەتەی فاکتورێکی (عمیل) هەواڵگری ئەمریکی بووە، هەروەك ئەو دەنگۆیەی لەسەر هەبووە، هەروەها پەیوەندیە باشەکانی بە هەواڵگریی تورکی و سەرکردەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان، راپۆرتەکانی کە لە کتێبی ناوبراودا کۆکراوەتەوە و چاپکراوە، بریتیە لە ئەزموونی کەسی و چاوپێکەوتنی لەگەڵ لایەنەکانی ململانێکە. لێرەدا پێویستە ئاماژە بە ژمارەیەك نووسەری تورکی وەك تونجای ئۆزکان و تۆران یاووز، بکەین، هەرچەندە کتێبەکانیان لە رووی ناوەڕۆکەوە دەوڵەمەندبوون، بەتایبەتی نووسەری یەکەمیان، کە کتێبەکانیان بەدووروردرێژی پرۆسەی دەستگیرکردنی ئۆجەلانی باسکردووە، بەڵام هێشتا بەدەر نیە لە ئایدیۆلۆژیای



دەوڵەت، کە لەسەر نکۆڵیکردن لە ناسنامەی کوردی یا هەر رووخسارێکی دیکەی ئەو ناسنامەیە و مامەڵە نەکردن لەگەڵ هەر ئاراستەیەك کە بانگەشە بۆ دانان بەو ناسنامەیە دەکات، وەستاوە. ئەمەش لەروانگەی "**تیۆری پیلانگێری**". هەندێجار بە یەك چاویلکە نووسیوویەتی و سۆز و نابابەتی بەسەری زاڵە. هەروەها زۆرێك لە وردەکاری و رووداوی فەرمۆشکردووە کە خزمەت بە تێزەکانی ناکات. بۆیە بە وریایەوە مامەڵەی لەگەڵ کراوە، راپۆرتەکانی رۆژنامەکان و راپۆرتەکانی مافەکانی مرۆڤ و سەرچاوە و توێژینەوەکان دیکە، لە راستکردنەوەی بیرواکان بەشداریەکی باشی کردووە .

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە رۆڵی نامە زانکۆییەکان لە دەوڵەمەندکردنی زۆر لایەنی تێزەکە بە زانیاری زۆر و هەمە جۆر بدەین، بەتایبەتی تێزی دکتۆرای واینا س کۆکس Wayne S. Cox. بەناوی (تەنگژە لە ململانێ لە پێناو پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان: باری جەنگی تورکی – کوردی... A Crisis in Conflict for International Relations, The Case of the Turkish/ Kurdish War ...) بکەین، کە توێژینەوەی لەبارەی پرسی کورد بە گوێرەی تیۆری پەیوەندیە نێودەوڵەتیە هاوچەرخەکان کردووە. هەروەها نامەی ماستەری (حەسەن یەڵماز Hasan Yilmaz) بەناوی (تورکیا و رۆژهەڵاتی ناوین: مەترسی و هەل Turkey And The Middle East: Threats and Opportunities)، کە بە توێژینەوەیەکی سەراپاگیری پەیوەندیەکانی تورکیا بە وڵاتانی رۆژهەڵات ناوەراست دادەنرێت و کاریگەری سیاسەتەکانی ئەمریکا و ئەوروپا لەسەر ئاراستە و دیدگای تورکیا بۆ ئەو رووداو گرفتانەی کە لە رۆژهەڵاتی ناوین روودەدەن. هەروەها سوود لە نامەی ماستەری (پیتەر جی . لامیبێرت) بەناوی (ئەمریکا و کورد : توێژینەوەی لە بەڵێنەکانی ئەمریکا The United States and the Kurds: Case studies in United States Engagement)، وەرگیراوە. نامەکەی لامبێرت توێژینەوەی لەبارەی فاکتەری دەرەکی لە دیاریکردنی رێڕەوی پرسی کورد و پەرەسەندنی سیاسەتی ئەمریکی بەرامبەر کوردی عێراق لەمیانەی دوو ئەزموون، یەکەم لەنێوان ساڵانی 1969 تا 1975 و

دووەمیان لە ماوەی ساڵانی 1990 تا 1996 ە، لەگـەڵ روونکردنـەی کاریگـەری فاکتەری هەریمایەتی بەتایەتی تورکی. گرنگی توێژینەوەکـەی لامبێـرت لەوەدانیـە کە زانیاری وای بە کارهیناوە کە بـۆ کەسـی تـر نـەدەکرا بـەکاریبهێنابا، بـەڵکو زۆر دەرەنجام و شیکردنەوەی زیرەکانـەی لـەبارەی مامەڵـەی ئـەمریکا لەگـەڵ گـەلانی چەوسـاوە لەلایـەك و سەرخـستنی بەرژەوەندیـە سـتراتیژیەکانی بەسـەر هـەر ئیعتباریکی دیکەدا لەلایەکی دیکەوە بەدەرخستووە.

سـەرباری ئـەوەی لەسـەرەوە باسـکران، تێزەکـە پـشتی بـە ژمارەیـەکی گـەورەی دیکـە لـە توێژینـەوەی ئـەکادیمی و وتـار بـە زمانـە جۆراوجۆرەکـان بەسـتووە، لێـرەدا پێویـستە ئامـاژە بـۆ ئـەوە بکـەین کـە زۆر گرنگـی نـەدانی دامەزراوە عەرەبیەکان بە بابەتەکە و هەندێکیان بـە ناراسـتەوخۆ ئامـاژەی بـۆ دەکـەن، لـە هەنـدێ باریـشدا ئاماژەیـەکی رووکەشـانەی پـێ دەدەن، ئەمـەش وایکـردووە، قوتـابی بـە زۆری پـشت بـە سەرچـاوە ئینگلیـزی و تورکیـەکان ببەستێ، بەتایبەتی لە دوو بەشی سێیەم و چوارەمدا.

بیار مصطفى سيف الدين

## بابەتی یەکەم:

## چوارچێوەی گشتی پەیوەندییەکانی ئەمریکا-تورکیا 1945-1989

پەلوپۆی مێژووی پەیوەندییەکانی تورکیا–ئەمریکا بۆ سەرەتای سەدەی 19 کە تەنها پەیوەندییەکی بازرگانی بوو، دەگەڕێتەوە[1]. ساڵی 1800 بە گەیشتنی کەشتی ئەمریکی (جۆرج واشنتۆن) بۆ بەندەری ئەستامبۆڵ یەکەم پەیوەندی بازرگانی نێوان ئەمریکا و دەوڵەتی عوسمانی دەستی پێکرد[2]. مۆرکردنی یەکەم بەڵێننامەی بازرگانی لە ئایاری 1830دا لە نێوان هەردوولا بەدوای ئەمەدا هات[3]. دواتریش چالاکییەکی چڕی شاندە مژدە کارەکان کە بەمەبەستی بەهێزکردنی نفوزی ئەمریکی لە دەوڵەتی عوسمانی نێردرابوون[4].

---

(1) - بۆ بەسەرکردنەوەی ئەو ئامارانەی تایبەتن بە ئاڵوێری بازرگانی نێوان ئەمریکا و دەوڵەتی عوسمانی هەر ساڵی 1831 ەوە سەیری:

Cagri Erhan, Turk-Amerikan Iliskilerinin Tarihsel Kokenleri, IMGE Kitabevi, Ankara, 2001, SS, 417-419.

(2) -Cemil Koçak and Gul Inanc Barkay,"A Chronology of Turkish- American Relations", Private View, Vol. 3, No. 7, Spring-1999, P. 28.

کەشتی ئەمریکی گەیشتە بەندەری جەزائیر، کەشتییەکە باجی ساڵانەی بە گوێرەی پەیماننامەی ئەمریکی–جەزائیری ساڵی 1795 بۆ جەزائیر دەگواستەوە، بەڵام (دای) جەزائیر داوای لە (ولیام پینبرۆج) کاپتنی کەشتییەکە کرد، کە شاندە جەزائیرییەکە بۆ پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی بگوازیتەوە.

سلوى سعد الغالبي، العلاقات العثمانية– الامريكية 1830-1918، مكتبة مدبولي، القاهرة، 2002، 31.

(3) – پەیوەندی بازرگانی و کردنەوەی قونسولخانە و بازرگانە ئەمریکییەکان کەوتنە بەر ئیمتیازاتی بیانی لە دەوڵەتی عوسمانی لە بەندەکانی ئەو بەڵێننامەیە بوو. بۆ وردەکاری زیاتر لەبارەی بەندەکانی ئەو بەڵێننامەیە سەیری، سلوى سعد الغالبي، نفس المصدر، ص ص59–66؛ هشام سوادي هاشم السوداني، العلاقات الامريكية–العثمانية 1908–1920: دراسة تاريخية، اطروحة دكتوراه مقدمة الى مجلس كلية التربية–جامعة الموصل، 2002، ص ص18–20؛

Fahir Armaoglu, Belgelerle Turk-Amerikan Munasebetleri, Turk Tarih Kurumu Basimevi, Ankara, 1991, SS. 2-4.

(4) - Erdal Acikses, Amrikalilarin Harpottaki Misyonerlik Faaliyetleri, Turk Tarih Kurumu, Ankara, 2003, SS. 35-56.



ئەو پەیوەندییە بەشێوەیەکی ئاسایی تا ساڵی 1917 درێژەی کێشا، تا ئەو کاتەی دەوڵەتی عوسمانی رایگەیاند کە پەیوەندی دیپلۆماسی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکاندا پچڕاندووە، ئەمەش دوای ئەوەی ئەمریکا جاڕی جەنگی بەسەر ئەڵمانیای هاوپەیمانی عوسمانی دا لە ساڵی 1917[1].

پەیوەندییەکانی تورکیا– ئەمریکا لە قۆناغی یەکەم، لە راگەیاندنی کۆماری تورکیادا، گەڕاندنەوەی پەیوەندییە دیپلۆماسی و بازرگانییەکانی بەخۆیەوە بینی. لە ساڵی 1927 (جۆزیف سی کرۆ Joseph C. Crow) وەك یەکەم باڵوێزی ئەمریکی لە تورکیا بەڵگەنامەی پشتپێبەستنی خۆی بە مستەفا کەمال[2] (دواتر ئەتاتورك)[3] پێشکەشکرد.

دوای هەڵگیرسانی دووەم جەنگی جیهانی و لە ساڵی 1941 هاتنی ئەمریکا بۆ ناو جەنگەکە و چوونە پاڵ هاوپەیمانان دژی وڵاتانی میحوەر، ئیدارەی

---

(1) - Laurence Evans, United States Policy and Partition of Turkey 1914-1924, John Hopkins Press, Baltimore, 1965, Pp. 33-34.

(2) – مستەفا کەمال، لە ساڵی 1881 لە سالۆنیك لە دایکبووە، باوکی فەرمانبەرێکی سادە بووە، ساڵی 1905 کۆلیژی جەنگی لە ئەستامبۆڵ تەواوکردووە، ساڵی 1910 لە میانەی شاندێکی سەربازی بۆ فەڕەنسا سەفەری کردووە. بەشداری لە جەنگەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە تەرابلوس 1911 و بەلقان 1912–1913 کردووە، لە ماوەی یەکەم جەنگی جیهانیدا فەرمادەی فیرقەی 19ی سوپابووە لە دەردەنیل. لەمیانەی هەڵمەتی بەریتانی بۆ سەر دەردەنیلڵ و گالیبۆلی ئازایەتی و زیرەکییەکی بێ وێنەی پیشاندا، هەر ئەمەش وایکرد نازناوی (پاشا)ی پێببەخشن. لە ماوەی ساڵانی 1919–1922 سەرکردایەتی بزووتنەوەی نیشتیمانی تورکی و جەنگی رزگاری خوازی دەکرد، کە هاوپەیمانانی ناچار کرد لەگەڵ تورکیا سەبارەت بە پەیماننامەی ئاشتی (بەڵێنی سیڤەر) دانوستاندن بکەن و کۆنگرەیەکی دیکەی ئاشتی لە لۆزان کە (پەیمانی لۆزان)ی لێکەوتەوە و سنووری ئیستای تورکیا دیاریکرد. کەمال مستەفا لە 1923 تا ساڵی کۆچی دواییکردنی 1938 سەرۆکی کۆماری تورکیا بوو. بۆ زایناری زیاتر سەیری– امين محمود سعيد وكريم خليل ثابت، سيرة مصطفى كمال وتاريخ الحركة الوطنية في الاناضول، القاهرة، 1933، ص 7.

(3) - Cemil KoÇak and Gul Inanc Barkay, A.G.E., S. 28 .

ئەمریکی تێبنی ئەوەی کرد کە دەبێت سوود لە هەڵکەوتی جوگرافی تورکیا وەربگیرێت لە پاڵپشتی کردن لە هەوڵە سەربازییەکانی هاوپەیمانان و پاراستنی سەرچاوەکانی نەوت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەکارهێنانی ئەو نەوتە لە ئامێرەکانی جەنگەکەدا لە دژی وڵاتانی میحوەر. وەك بەشێك لە ئاراستەی نوێی ئەمریکا بەرەو تورکیا، ئەمریکا بە گوێرەی یاسای (خواستن و کرێ Lend Lease Act)[1] کە لە ئازاری 1941 دەرچووبوو لە ماوەی جەنگی دووەمدا بە نزیکەی 950 ملیۆن دۆلار یارمەتی سەربازی پێشکەشی تورکیا کرد.

ئارمانجە فراوانخوازییەکانی سۆڤیەت، کە دوای جەنگی جیهانی دووەم فۆرمەڵە بوو، پاڵی بە تورکیاوە نا دووبارە پەیوەندییە ستراتیژییەکانی لەگەڵ رۆژئاوا بەگشتی و ئەمریکا بەتایبەتی دیاری بکاتەوە[2]. دەرکەوتنی فاکتەری سۆڤێتی یەکەم پاڵنەر بوو لەسەر کردنەوەی ئاراستەی تازە لە سیاسەتی دەرەوەی تورکیادا، هەرکە دووەم جەنگی جیهانی کۆتایی هات، سۆڤیەت هەموو وڵاتانی بەلقان جگە لە یۆنانی داگیرکرد[3]. لە 19ی ئازاری 1945، حکومەتی سۆڤیەتی هاوتا تورکییەکەی لەبارەی نیازی حکوومەتەکەی بۆ هەڵوەشاندنەوەی

(1) – ئەو یاسایە لە بنەرەتەوە بۆ ئەوە داڕێژرابوو بۆ ئەوەی هەموو پاڵپشتییەك بۆ هەوڵەکانی بەریتانیا و هاوپەیمانان لە جەنگی جیهانیدا لە دژی وڵاتانی میحوەر پێشکەش بکات، ئەمەش دوای ئەوەی ئەمریکا زانی کە دۆڕاندنی هاوپەیمانان لە جەنگەکە، دەرەنجام ئاسایشی خۆشی دەخاتە مەترسییەوە، لە 11ی ئازاری 1941 کۆنگرێسی ئەمریکی یاساکەی پەسند کرد، یاساکە دەسەڵاتی تەواوی بە سەرۆکی ئەمریکا دابوو کە بۆ بەرژەوەندی بەرگری نەتەوەیی ئەمریکا ماددە و زانیاری بداتە هەر وڵاتێك کە بیبینێ بەرگریکردن لێی بۆ بەرگری ئەمریکا پێویستە. بۆ زانیاری زیاتر سەیری، خليل علي مراد، تطور السياسة الامريكية في منطقة الخليج العربي: 1941–1947، مطبعة جامعة البصرة، البصرة، 1980، ص45.

(2) -Rachel Prager, Turkish-American Relations: Historical Context and Current Issues, Georgetown University, USA, 2003, P. 5.

(3) -Omer Goksel Isyar, "An Analysis of Turkish-American Relations from 1945 To 2004: Initiatives and Reactions in Turkish Foreign Policy", Turkish Journal of International Relations, Vol.4, No. 3, Fall 2005, P. 23.



پەیماننامەی (برایەتی و دەستدرێژی نەکردن) کە لە ساڵی 1925[1] لە نێوان هەردوولا مۆرکراوە ئاگادار کرد، لە حوزەیرانی هەمان ساڵدا داوای لە تورکیا کرد هەرێمەکانی قارس Kars، اردهان Ardahan و باتوم Batum، بخاتە سەر خۆی و بنکەیەکی سەربازی سۆڤیەتی لە هەرێمی تەنگەبەری تورکی دابمەزرێنێ، بۆئەوەی زامنی ئازادی تێپەڕینی کەشتییەکان لە تەنگەبەری بسفۆر و دەردەنێل بکات[2]، ئەمەش لەسەر بنەمای دووبارە داڕشتنەوەی پەیماننامەی مونترو Montreux کە ساڵی 1936 سەبارەت بە تەنگەبەرە تورکییەکان مۆرکرابوو[3].

یەکەم کاردانەوەی تورکی لەهەمبەر هەڕەشەکانی سۆڤیەت هانابردن بەرەو ئەمریکا بوو، لەرێگەی ناردنی یادداشتێکی فەرمی بۆ کۆنگرێس، کە داوای لێکردبوو، ئاگاداری **"مەترسییەکانی لاوازی بەرەی جەنگی تورکی بن، کە لەوانەیە بوار بە یەکێتی سۆڤیەت بدات بگەنە نەوتی وڵاتانی ناوچە نزیکەکان و هاوسەنگی رۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست تێك بدەن ..."**، هەروەها داوا کرابوو کە پێویستە پاڵپشتی ئابووری تورکیا بکرێت بۆئەوەی بتوانێ بەرپەرچی چاوتێبڕینەکانی سۆڤیەت لە تەواوی ناوچەکە بداتەوە[4].

(1) -Mehmet Saray, Sovyet Tehdidi Karsisinda, Turkiye'nin NATO'YA Girisi: III. Cumhurbaskani Celal Bayar'in Hatiralari ve Belgeler, Ataturk arastirma Merkrzi, Ankara, 2000, Ss.70-73;

– سعاد حسن جواد، تركيا في سنوات الحرب العالمية الثانية 1939–1945، دار دجلة، عمان–بغداد، 2009، ص ص274–276.

(2) -Aylin Guney, "An Anatomy of the Transformation of the US–Turkish Alliance: From Cold War to War on Iraq", Journal of Turkish Studies, Vol. 6, No. 3, September 2005, P.341.

(3) -Kemal Krişci, "U.S.-Turkish Relations: New Uncertainties in a Renewed Partnership", in: Barry Rubin and Kemal Krişci (eds.), Turkey in World Politics AN EMERGING MULTIREGIONAL POWER, Lynne Rienner Publishers, United States of America, 2001, P.130.

(4) -Walter L. Jr. Wright, "Truths about Turkey", Foreign Affairs, Vol. 26, No. 2, January, 1948, Pp.349-350.

مەترسییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئـەمریکا و تورکیـا لەبەرامبـەر ئـەوەی "**پڕۆژە فراوانخوازییەکانی سۆڤیەت**" ئامادەی کردبوو، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە نەوتەکەی بۆ ئەمریکا گرنگییـەکی زۆری هـەبوو، وەڵامـدەرەوە بـوون. شـیکەرەوە سەربازییەکانی ئەمریکا لە هەمان مـاوەدا گەیـشتنە ئـەو بڕوایـەی کـە "**هەڵکـەوتی جیۆستراتیژی تورکیـا بـۆ دەورەدانـی فراوانخـوازی ئایـدیۆلۆژی و هەرێمایـەتی سۆڤیەتی، یەکلاکەرەوەیـە**"، هـەروەها لـەڕووی فاکتـەری سـەربازییەوە تورکیـا "گرنگییەکی زۆری لە ناوچەی ڕۆژهـەڵاتی دەریـای ناوەڕاسـت و ڕۆژئـاوای دەریـای ناوەڕاسـت دا هەیـە"، هـەروەها گەیـشتنە ئـەو رایـەی کـە هـەر فراوانخوازییـەکی سـۆڤیەتی لـەو ناچـانە مەترسـییەکی راسـتەقینە بـۆ بەرژەوەندییـە زینـدووەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دروست دەکات[1].

تورکـەکان وای دەبیـنن کـە یەکـەم ئامـاژەی وەڵامـدەرەوەی ئـەمریکی بـۆ مەترسـییەکانی تورکیـا، ئـەوەبوو کـە (دیـن ئاتشـسون–Dean Acheson)ی وەزیری دەرەوەی ئەمریکی، لە یەکی کانوونی یەکەمی 1945 بـە حکوومـەتی تورکی راگەیاند کە "**حکوومەتی وڵاتەکەی دیدێکی نارۆشن و لێڵی سەبارەت بە داواکارییە هەرێمایەتییەکانی سۆڤیەت لە تورکیا هەیە... ئەو داواکارییانەش لە لەباربردنی ئاشتی جیهاندا بەشداری دەکات**"[2]. لە هەمان ڕێڕەوی ئاراستەی تـازەی ئـەمریکا (لیژنـەی دارشـتنی جـەنگی هاوبـەش– Joint War Plans Commission) لە واشنتۆن توێژینەوەیـەکی لـەبارەی تورکیـا ئامـادەکرد، لـە کۆتایی توێژینەوەکەدا حکوومـەتی ئـەمریکی راسـپارد کـە وا لـە تورکیـا بکـات "**ببێتە بنکەیەکی چالاکی گرنگی ڕۆژئاوا لە دژی یەکێتی سۆڤیەت لە ناوچەی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت، ئەگـەر جـەنگی چـاوەڕوانکراو هەڵگیرسـا**"[3]. دوای

---

[1] -Aylin Guney, Op. Cit., Pp. 341-342.

[2] - توماس .أ. برايسون، العلاقات الدبلوماسية الأمريكية مع الشرق الأوسط من 1784 الى 1975، دار طلاس للدراسات والترجمة، دمشق، 1985، ص ص 342–343.

[3] - نبيل حيدري، تركيا: دراسة في السياسة الخارجية منذ عام 1945، بيروت، 1986، ص 152.



ئەمەش دین ئاچسیون لەبەردەم ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکی هۆشداری دا کـە پێویستە لەسەر وڵاتەکەی دەستی سۆڤیەت لە تورکیـا و یۆنـان دوور رابگرێـت، ئەگینا دەبێت بیرۆکەی لەدەستدانی بنکە ستراتیژییەکان و هێڵـەکانی گەیانـدن و لۆجستیکی بنکە ئەمریکییەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست قەبوول بکات[1].

پەیوەندییەکانی ئەمریکا – تورکیا لە ماوەی نێوان کۆتـایی دووەم جـەنگی جیهانی و ساڵانی پەنجاکان، "**سەردەمی زێڕینی**" خـۆی گوزەرانـد، گەیـشتنی کەشتی ئەمریکی (میسوری Missouri) بۆ ئەستەمبۆڵ لـە 5ی نیـسانی 1946، تەرمی (ئەرتکونErtegun)[2]ی باڵویزی تورکی هەڵگرتبوو، ئاماژەی تێڕوانینی نوێی ئەمریکا بوو بۆ تورکیا.

لە 12ی ئازاری ساڵی 1947 ویلایەتە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا پرەنـسیپی (ترۆمان)[3]ی جاڕدا، کە ئەو بنەمایـەی دارشـت کـە ئـەمریکا بەهۆیـەوە رۆڵـی بەریتانیا لەڕۆژهەڵات ی ناوەڕاست و پەیوەندییـە نێودەوڵەتییـەکان دەگێڕێـت. پرەنسیپەکە هەرتەنها سەرەتای شەڕی سارد و سیاسەتی دەورەدانـی یـەکێتی سۆڤیەتی دیاری نەکرد، بەڵکو دووبارە رەوشی تورکیا لە جیهاندا دیاریکرد، لە وڵاتێکی دواکەوتوو لە بەشداریکردن و دوو دڵ لەو هەوڵە جەنگییانـەی کـە دژی وڵاتانی میحوەر دەدران لە میانەی جـەنگی جیهانیـدا، بـۆ وڵاتێـك لەمپـەر بێـت لەبەرامبەر کۆمۆنیزم[4]. لەم ڕێڕەوەدا ئیدارەی سەرۆك هاری ترۆمـان لـە 22ی ئازاردا بریاریدا بەبڕی 400 ملیۆن دۆلار یارمەتی دارایی و سەربازی بە هەریەکە لە تورکیا و یۆنان بدات، بۆئەوەی بتوانن رووبەڕووی فراوانخـوازی و قـەڵمڕەوی

---

[1] -Aylin Guney, Op. Cit., P. 342.

[2] -Cemil KoÇak and Gul Inanc Barkay, Op. Cit., P. 28.

[3] - لە ناوی سەرۆکی ئەمریکا هاری ترومان (1945–1953).

[4] - هنري جيه باركي، تعاون الشد والجذب الاستراتيجي: علاقة الولايات المتحدة الامريكية مع تركيا في الشرق الاوسط، في: ديفيد لـيش (تحريـر)، الـشرق الاوسـط والولايـات المتحـدة: اعـادة تقيـيم تاريخي وسياسي، ترجمة احمد محمود، المجلس الاعلى للثقافة، القاهرة، 2005، ص 659.

سۆڤیەتی بن[1]، بەشی تورکیاش لە برە پارەکە گەیشتە 100 ملیۆن دۆلار[2]. ئەو هەنگاوەی ئەمریکا لەلایەن ئەو تورکانەی کە لە 12ی تەمووزی 1947 لەمبارەیەوە پەیماننامەیەکیان مۆرکردبوو، پێشوازی لێکرا[3].

ئینجا پرۆژەی مارشاڵ[4] وەك تەواوکەری پرەنسیپی ترۆمان لە جێبەجێکردنی پرۆژە و پلانە ئەمریکییەکان لە چوارچێوەی دووبارە بونیاتنانەوەی ئەورووپا و دژایەتیکردنی دەسەڵاتی سۆڤیەتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هات. تورکیا بە گوێرەی پرۆژە ئەمریکییەکە لە ماوەی ساڵانی 1949–1952 بەبەهای 778 ملیۆن دۆلار یارمەتی بەدەست کەوتووە، کە زیاتر لە 500 ملیۆن دۆلار یارمەتی سەربازی بوو[5]. یارمەتییە پێشکەشکراوەکانی ئەمریکا لە بنەڕەتەوە بۆ ئەوەبوون تاکو توانای شەڕکردنی هێزەکانی تورکیا بەهەموو شێوەی زیاد بکات، سەرباری دروستکردنی رێگای سەربازی و پڕکردنی جبەخانەکان لە چەك، بۆ نموونە لە میانەی ساڵی 1948 تورکیا زیاتر

(1) -Rachel Prager, Op. Cit., P. 5.

(2) Cemil Koçak and Gul Inanc Barkay, Op. Cit., P. 28.

(3) – سەیری دەقی رێککەوتننامە بکە لە– Fahir Armaoglu, A.G.E., SS. 162-164

(4) – پرۆژەی مارشاڵ، کە لەناوی جۆرج مارشاڵەوە (1880–1959) هاتووە، کە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بوو. بەگوێرەی پرۆژەکە دەبێت بەرنامە بۆ یارمەتیدانی ئەورووپا لە رووی ئابوورییەوە دابنرێت، تاکو بتوانێت داتەپینی ئابووری رابگرێت و نائارامی سیاسی لەناوبەرێت، کە بەهۆی جەنگەوە سەری هەڵداوە، لە 5ی حوزێرانی 1947 وەزیری ناوبراو لە گوتارێکدا گوتی ئەمریکا پێشوازی لە دەستپێشخەری وڵاتانی ئەورووپا سەبارەت بەدانانی پرۆگرامێکی ئابووری کە یارمەتی یەکتری پێ بکەن دەکات، لەهەمان کاتدا کە یارمەتییە ئەمریکییەکانیش دەست دەخەن. بەرپرسە ئەمریکییەکان ئاماژەیان بۆ ئەوە کرد کە پلانەکە بەبێ نەوتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت. خليل علي مراد، تطور السياسة الأمريكية...، ص ص 276–277.

(5) - ريتشارد غريمت وآلن ليبسون، تركيا: صعوبات وآفاق، دائرة الشؤون الخارجية والدفاع القومي، إدارة أبحاث الكونكرس الأمريكي،مؤسسة الأبحاث عربية، سلسلة دراسات إستراتيجية (12)، بيروت، 1980، ص ص 17–18



لە 180 فڕۆکەی لە جۆری F-47 و 30 فڕۆکەی جۆری B-29 وەرگرتووە، فڕۆکەخانە سەربازییەکانی تورکیا لە دیاریەکر و باندرما دووبارە دابەشکرانەوە، هێزی دەریایی تورکی بەشێوەیەکی وا گەشەی پێدرا بتوانێت تەنگەبەری دەردەنێل بەرووی کەشتییە ژێرئاوەکانی سۆڤیەت دابخات[1]. ئامانجێکی دیکەی گرنگی یارمەتییەکانی ئەمریکا بۆ تورکیا، چاککردنی ئەو ژینگەیە بێت کە دژی بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی کۆمۆنیزم بێت[2].

لەلایەکی دیکەوە لە چوارچێوەی ئاراستەی تورکیا بەرەو رۆژئاوا، بەتایبەتی بەرەو ئەورووپا، ئەمریکا پاڵپشتییەکی سیاسی و مەعنەوی گەورەی تورکیای کرد، دوای ئەوەی تورکیا خرایە ناو پرۆژەی مارشاڵەوە، تورکیا لە ساڵی 1949 ەوە بۆ (ئەنجوومەنی ئەورووپا Council of Europe)[3] بانگهێشتکرا، بۆئەوی ئەندامێتی تەواو بەدەست بهێنێت[4].

جەختکردنەوەی ئەمریکا لە میانەی ساڵانی 1948–1949 لەسەر بەهێزکردنی ئاسایشی ئەورووپای رۆژئاوا، وایکرد پەیمانی ناتۆ (رێکخراوی پەیمانی باکووری ئەتلەسی) دابمەزرێ، هەروەها وایکرد ستراتیژی ئەمریکا دووبارە رێکبخرێتەوە، بۆیە تورکیا لە ئەندامێتی لە پەیمانی ناتۆ دوورخرایەوە، ئەمەش لەترسی ئەوەی تواناکانی ئەمریکا لە ناوچە فراوانەکانی جیهاندا بە فیڕۆ نەچێت، دوای ئەوەی بەرگری ئەورووپای رۆژئاوا بەهێز کرا، ئەمریکا بڕیاریدا چاو بە رێوشوێنە ئەمنیەکانیدا بخشێنێتەوە[5].

(1) - نبيل حيدري، نفس المصدر، ص ص 154–155

(2) -Aylin Guney, Op. Cit., P. 342.

(3) – لە 5ی ئازاری 1949 بە گوێرەی میساقێك کە لە لەندەنەوە مۆرکرا، دامەزرا، لە 3ی ئابی هەمان ساڵدا جێبەجێکرا، میساقەکە ئامانجی ئەنجوومەنەکەی بە کارکردن لە پێناوی یەکێتی ئەورووپا و باشترکردنی گوزەران و دەستگرتن بە پرەنسیپەکانی دیموکراسی و پەرلەمانی و حوکمی یاسا و ماف مرۆڤ دیاریکرد. هنري باركي وآخرون، القضية الكردية في تركيا، ترجمة، هفال، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، اربيل، 2007، ص 38.

(4) -Omer Goksel Isyar, Op. Cit., P. 23.

(5) - نبيل حيدري، نفس المصدر، ص 155.

هەرچەندە توركیا هەستی بە نائومێدی كرد، لەبارەی بەشداری پێنەكردنی لە پەیمانی ناتۆ راستەوخۆ دوای دامەزراندنی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پرۆشی و هاوكاری بێ هاوتای خۆی بۆ ئەمریكا پیشاندا، كە ئەوكات لەژێر فشارێكی گەورەی سەربازیدا بوو، كاتێ سەركردایەتی هێزەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان جەنگی كۆریای دەكرد، لە 25ی تەمووزی 1950 حكوومەتی توركی بریاریدا هێزێكی سەربازی پێكهاتوو لە 4500 سەرباز بۆ پاڵپشتی هێزەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان بەسەركردایەتی ئەمریكا بنێرێت[1]. لە راستیدا هێزەكانی توركیا لە رووی پێكانەوە پلەی دووەمیان لە دوای هێزەكانی ئەمریكاوە بەدەست هێنا، ئەمەش ئاماژەیەك بوو بۆ رۆڵی ئەو سوپایە لە بەدیهێنانی كارەكەی و ئاماژەیەكیش بوو بۆ پابەندنی ئەو سوپایە بەرامبەر بە ئەمریكا، كە وای لە ئەمریكا كرد لە بەرامبەر توركیا دا لەرووی ئەدەبی و ئەخلاقییەوە پابەند بێت[2].

وەك وەڵامێكی داواكارییە بەپەلەكانی توركیا و وەك پاداشتێك لەسەر ئەو رۆڵەی لە جەنگی كۆریادا گێڕای و لەترسی لەدەستدانی هاوپەیمانێكی گرنگی سەردەمی جەنگ و ئاشتی، هەروەها دوای ئەوەی ئەمریكا دانی بەو رۆڵە یەكلاكەرەوەیە نا كە توركیا دەتوانێ لە پاراستنی باڵی باشووری پەیمانی ناتۆدا بیگێڕێت، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریكی لە ئایاری 1951 دا بریارێكی وەرگرت، كە بەسەر هاوپەیمانانی سەپاندن دەبێت توركیا و یۆنان وەكو دوو ئەندامی تەواو لە پەیمانی باكووری ئەتڵەسی وەربگیرێن[3]. لە 18ی شوباتی 1952 توركیا بووە ئەندامێكی تەواوی پەیمانی باكووری ئەتڵەسی[4].

دەكرێت گرنگترین خەسڵەتە ستراتیژییەكانی توركیا وەك شارەزا ستراتیژییەكانی ئەمریكا دیاریان كردووە، كورتبكەینەوە –توركیا لە نێو

(1) -Cemil KoÇak and Gul Inanc Barkay, Op. Cit., P. 28.

(2) -Aylin Guney, Op. Cit., P. 342.

(3) - نبيل حيدري، نفس المصدر، ص 156.

(4) -Mehmet Saray, A.G.S., S. 229.



وڵاتانی پەیمانی باكووری ئەتڵەسی درێژترین سنووری هاوبەشی لەگەڵ یەكێتی سۆڤیەتدا هەیە بۆیە پێویستی بە پارێزگاری هەیە، سنوورەكەی بۆ ماوەی 380 میل بە زەوییەكی شاخاوی درێژ دەبێتەوە، هەروەها كەنارەكانی كە بەسەر دەریای رەشدا دەروانن بە درێژی 625 میل. هەروەها نزیكی جوگرافیی لە یەكێتی سۆڤیەت وای لێدەكات لەلایەنی ستراتیژییەوە هەڵكەوتێكی گرنگی بۆ دانانی وێستگەی كۆكردنەوەی زانیاری سەربازی بە ئامێری هەواڵگری هەبێت. هەروەها توركیا سنووری هاوبەشی لەگەڵ هەریەكە لە یۆنان و بولگاریا و ئێران و عێراق و سووریا دا هەیە. توركیا كۆنترۆڵی بەسەر هەردوو تەنگەبەری بسفۆر و دەردەنێلدا دەكات، ئەگەر بتوانێت دایان بخات، ئەوا نزیكەی 250 یەكەی دەریاوانی سۆڤیەتی پەكی دەكەوێت. هەروەها توركیا پردی وشكایی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوایە و ئەورووپا بە ئاسیا دەگەیەنێ، هەروەها دەبێتە لەمپەر لەبەردەم باكوور و باشوور لەڕووی چالاكییەكانی سۆڤیەت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەوەستێ. سەرباری ئەمەش لەگەڵ یۆنان و پاكستان و ئێراندا بواری وشكانی و ئاسمانی و ئاوی پێكدەهێنن. پێویستە هەموو هێزێكی بەهاناوەچوونی سۆڤێتی بەو بوارەدا تێبپەڕێ تا بگاتە ململانێی هەڵگیرساوی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست یان دوورگەی عەرەبی[1].

ئاوێزان بوونی بەرژەوەندییەكانی ئەورووپا و ئەمریكا لە پەیوەندی لەگەڵ توركیا لەماوەی جەنگی سارددا، بەهێزتر بووە لەچاو ئەو سەردەمەی كە گۆڕەپانی سیاسەتی نێودەوڵەتی لەماوەی دەیەی كۆتایی سەدەی بیستەمدا گۆڕانكاری بەخۆیەوە بینیووە[2]، توركیا لە ساتەوەختی هەستیاردا خزمەتی بنەڕەتی ئەمریكای كردووە، كاتێ ئەمریكا یارمەتی ئابووری سەربازی

(1) - نوبار هوفسبيان، الوضع الاستراتيجي: آفاق العلاقات التركية–الأمريكية، في: نوبار هوفسبيان (تحرير) وفيروز احمد وآخرون، تركيا بين الصفوة البيروقراطية والحكم العسكري، إعداد ومراجعة غانم بيبي وسامي الرزاز، مؤسسة الأبحاث العربية، بيروت، 1985، ص 285.

(2) - هاينتس كرامر، تركيا المتغيرة تبحث عن ثوب جديد، ترجمة فاضل جتكر، مكتبة العبيكان، الرياض، 2001، ص 376.

جۆراوجۆری پێشکەشی تورکیای کردووە، بەجۆرێك دوای تەواوبوونی جەنگی سارد تورکیا دوای ئیسرائیل و میسر گەورەترین یارمەتی وەرگرتووە[1].

دەستپێکردنی جەنگی سارد و زۆربوونی چالاکییەکانی سۆڤیەتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەمریکای گەیاندە ئەو باوەڕەی کە پڕۆگرامی یارمەتی ئابووری و سەربازی و هاریکاری تەکنیکی هیچی دیکە تەواو ئەکتیڤ نابێت بۆ بەرگرتن بە هاتن و دەست تێوەردانەکانی سۆڤیەتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بۆیە بڕیاریدا ستراتیژێکی نوێ کە لەسەر بنەمای **"بەرپەرچدانەوەی هاتنەناوەوەی سۆڤیەتی"** بنیاتنرابێت، بگرێتە بەر[2]. یەکەم هەوڵیش کە لەم پێناوە دای پرۆژەی دامەزراندنی سەرکردایەتی بەرگری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو لەساڵی 1951 بەناوی (رێکخراوی بەرگریکردن لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست– Middle East Defense Organization)، تورکیاش بە پەرۆشەوە خۆی بۆ ئەو پرۆژەیە پێشکەشکرد، بەو پێیەی تورکیا بازنەی گەیاندنی ناتۆ و رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە[3]. پارتی دیموکراتی تورکی[4] کە ساڵی 1950 دەسەڵاتی وەرگرت، زیاتر بە روونی لایەنگری ئەمریکای دەکرد و سەردانەکەی جەلال بەیاری Celal Bayar (1950–1960) سەرۆك وەزیرانی تورکی لە 17ی کانوونی دووەم 1954[5] بۆ واشنتۆن وەك بەرجەستەکردنی ئەو پەرۆشییە بەرەو ئەمریکا هات و سەرەتای قۆناغێکی تازەش لە پەیوەندییەکانیان بوو.

---

(1) -Kemal Krişci, Op. Cit., Pp. 130-131 .

(2) - توماس .آ. برایسون، نفس المصدر، ص460.

(3) - نبیل حیدري، نفس المصدر، ص 156.

(4) – ئەو حیزبە لە 7ی کانوونی دووەمی 1946 لەلایەن دەستەبژێرێکی بۆرژوازی دامەزراوە کە لە پارتی گەلی کۆماری دەسەڵاتدار جودابیوونەوە. جەلال بایار و عەدنان مندریس و رەفیق کورالتان لە دامەزرێنەرانی ئەو پارتە بوون، ئەو پارتە لە هەڵبژاردنەکانی ئایاری 1950 دەسەڵاتی وەرگرت، تا کودەتای 27ی ئایاری 1960 لە دەسەڵات مایەوە. سەیری:
M. Serhan Yucel, Turkiye'nin Siyasal Partileri: 1859-2005, Alfa Yayinleri, Istambul, 2006, S. 29.

(5) -Cemil KoÇak and Gul Inanc Barkay, Op. Cit., P. 28.



لەوەتەی ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی بیستەمەوە پەیوەندییەکانی تورکیا–ئەمریکا بەرەو چالاککردنی شێوازی دیکەی هاوپەیمانێتی چوو، کە لەسەر بنەمای هەرێمایەتی دامەزراوە. دوای سەرنەکەوتنی ئەزموونی (رێکخراوی بەرگریکردن لە رۆژهەڵاتی ناڤین– Middle East Defense Organization)، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرەو شێوازی دیکەی هاوپەیمانی گرتن رۆیشت، دامەزراندنی قولپی بەغداش (حلف بغداد Baghdad Pact)[1] هەنگاوێکی ئەم رێگایە بوو، تورکیاش ئەندامێکی دامەزرێنەری بوو. پەیمانەکە بەشێك لەو ستراتیژەی ئەمریکا پیکدێنا کە تایبەت بوو بە تەواوکردنی پشتێنەی پەیمانە سەربازییەکان کە بۆ دەورەدانی یەکێتی سۆڤیەت پێکدەهێنرا[2].

---

(1) – قولپی بەغدا، ریککەوتنیکی هاریکاری سەربازی و ئەمنی بوو، لە نێوان عێراق و تورکیا لە شوباتی ساڵی 1955 لەژێر چاودیری رۆژئاوا مۆرکرا. لەهەمان ساڵدا هەریەکە لە بەریتانیا و پاکستان و ئێران چوونە پاڵی و بەناوی پەیمانی بەغدا ناسرا. پەیمانەکە ئەنجوومەنە وەزارییەکان و لیژنە سەربازی و ئابوورییەکانی پێکهێنا. ئەمریکا بە سیفەتی چاودیر بەشداری لە لیژنە سەربازی و ئابوورییەکەدا کرد. ئامانجی پشتەوەی رۆژئاوا لەو پەیمانە دابینکردنی بەرژەوەندییە نێودەوڵەتی و هەرێمایەتییەکانی بوو. لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی پەیمانەکە بازنەیەکی دیکەی ئەو پەیمانە سەربازییانە بوو کە رۆژئاوا بەسەرکردایەتی ئەمریکا دایمەزراندبوو، بۆئەوەی دەورەی یەکێتی سۆڤیەت و رژێمی کۆمۆنیزم بدات و بەزەبر بەر بە بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی سۆڤیەتی بگرێت. بەڵام لەسەر ئاستی هەرێمایەتی ئامانج لێی پارێزگاریکردنی رژێمەکانی سەربە هاوپەیمانەکە بوو، تاوەکو بەهانەیەکی سیاسی و یاسایی بۆ بوونی هێزە سەربازییەکانی لە ناوچەکە بهینیتەوە و گورزیش لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی نیشتیمانی ناوچەکە بدات. شۆڕشی 14 ی تەمووز گورزێکی کوشندەی لە پەیمانەکە دا، عێراق لە ئازاری 1959 لە پەیمانەکە هاتەدەرێ، ئەمەش ئەندامەکانی ناچارکرد لە ئابی 1959 بارەگای پەیمانەکە بۆ ئەنقەرە بگوازنەوە و ناوەکەشی بۆ (پەیمانی بەڵێنی ناوەندی– حلف المعاهده اللامرکزیه–سنتو) بگۆڕن. عبد الوهاب الکیالي وکامل الزهیري، الموسوعة السیاسیة، المؤسسة العربیة للدراسات والنشر، بیروت، 1974، ص ص248–249.

(2) – نبیل حیدري، نفس المصدر، ص156.

بۆ تەواوکردنی پلانەکانی و بەهۆی ئەو پەرەسەندنە ترسناکانەی کە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی و ناوچەی عەرەبی بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی پەنجاکانی سەدەی بیستەم بەخۆیەوە بینی، ئەمریکا دووبارە پێشینەی کارەکانی ڕێکخستەوە. لە دەرەنجامەکانی دوژمنکاری سێ قۆلی بۆ سەر میسر ساڵی 1956، ئەمریکا پرەنسیپی (ئەیزنهاوەر)ی لە ئازاری 1975 ڕاگەیاند[1]، ئەو پڕەنسیپەی کە لە بنەماوە بۆ پاراستنی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە کۆمۆنیزمی ئەنتەرناسیۆنال و پڕکردنەوەی بۆشایی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە ئەمریکا بەرلەوەی یەکێتی سۆڤیەتی پڕی بکاتەوە[2].

کۆڵەگەی سەرەکی جێبەجێکردنی سیاسەتی ئەمریکی بەرامبەر وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەتی دوای ئەوەی لە 22ی ئازاری 1975 چووە پاڵ پرەنسیپی ئەیزنهاوەر وایلێهات هەڵوێستی تورکیا لە پلانە ئەمریکییەکاندا باش بوو[3]، نموونە لەسەر ئەمەش قەیرانی سووریای 1975. دوای ئەوەی پەیوەندی سووریا بە یەکێتی سۆڤیەتی بەهێز بوو، لۆی هندرسۆنی L. Henderson وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ تاوتوێکردنی دۆسیەی سووری سەردانی تورکیای کرد، دوای سەردانەکە تورکیا هێزێکی زۆری لە هاوینی 1975 بۆ سەر سنووری وڵاتەکەی لەگەڵ سووریا نارد[4]. لەلایەکی دیکەوە ئەنقەرە پلانی بەرپەرچدانەی شۆڕشی 14ی تەمووزی 1958ی عێراقی بە واشنتۆن ڕاگەیاند، بەڵام واشنتۆن بە تورکیای ڕاگەیاند کە دەست لە کاروباری عێراق وەرنەدات، وڵامەکە بەمشیوەیە

---

(1) – لە ناوی سەرۆکی ئەمریکی دوایت ئەیزنهاوەر (1953–1961) هاتووە.

(2) – بۆ سەیرکردنی دەقی ریککەوتننامەکە:

Fahir Armaoglu, A.G.E, Ss. 258-260.

(3) -Cemil Koçak and Gul Inanc Barkay, Op. Cit., P. 28

(4) - بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی تەنگژەی سووری سەیری: توماس برایسون، نفس المصدر، ص ص52–55؛ فواز جرجس، النظام الإقليمي العربي والقوى الكبرى، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، 1997، ص ص 124–131.



داڕێژرابوو "**هەموو بیرۆکەیەکی دەستێوەردانی لە عێراق لەلایەن ئێران و یا تورکیاوە تا دوا ئەندازە کاریکی دزێوە**"[1].

بەکارهێنانی بنکە سەربازییەکانی تورکیا بۆ دەستتێوەردان لە لوبنان لە تەمووزی 1958 ڕوونترین ئاماژەبوو بۆ بەهێزبوونی پەیوەندییە دوو قۆڵییەکانی نێوان ئەمریکا–تورکیا، هێزەکانی ئەمریکا لەدەرەوەی چوارچێوەی ئامانجەکانی ناتۆ[2] بنکەی (ئەنجەرلیك)[3]ی بەکارهێنا. پرۆسەی گەشەسەندنی پەیوەندییە دوو قۆڵییەکان لە کۆتایی پەنجاکانەوە بە شێوەیەکی ڕاستەوانە ئاراستەی گرت، تورکیا لە ساڵی 1959 دانی بە بوونی ڕۆکێتی (جوبیتر– Jupiter)ی ئەمریکی لەسەر خاکەکەی نا[4]. لە 5ی ئازاری 1959 وەك وەڵامێك لە بەرامبەر کشانەوەی عێراق لە پەیمانی ناتۆ، پەیوەندییە دوو قۆڵییەکانی ئەم دوو وڵاتە بۆ (ڕێککەوتننامەی ئاسایشی هاوبەش – Cooperation Agreement) بەهۆیەوەش ئەمریکا گەورەترین ئیمتیاز و مافی لە تورکیا لە چاو هەموو وڵاتەکانی دیکەی ناتۆ، دەستکەوت[5]. سەردانەکەی

---

(1) - فيليب روبنس، تركيا والشرق الأوسط، ترجمة: ميخائيل نجم خوري، دار قرطبة، قبرص، 1993، ص ص 36–37.

(2) -Cemil KoÇak and Gul Inanc Barkay, Op. Cit., P. 28.

(3) -بنکەیەکی سەربازی ئاسمانی ئەمریکییە، ساڵی 1954 بە پشت بەستن بە ریککەوتننامەی دوو قۆلی نێوان تورکیا و ئەمریکا بونیاتنراوە، لەسەرەتاوە بەناوی بنگەی (ئەدەنە)ەوە ناونراوە، دواتر لە ساڵی 1959 ناوەکەی بۆ (بنکەی ئەنجەرلیك بۆ بەرگری هاوبەش) گۆڕا. ئەو بنکەیە ڕۆلێکی بێ وێنەی لە جەنگی کەنداو و پاراستنی (داڵدەی ئارام بۆ کوردان– الملاذ الامن للكورد) لە باکووری عێراق گێڕا. بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی بنکەی ئەنجەرلیك سەیری: فواز موفق ذنون، "قاعدة انجرليك الجوية"، بحث محفوظ في مركز الدراسات الاقليمية–جامعة الموصل، وحدة البحوث السياسية، ملفة رقم (4)، ص 7.

(4) -Omer Goksel Isyar, Op. Cit., P.24.

(5) – بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی دەقی ڕێککەوتننامەکە سەیری:

Fahir Armaoglu, A.G.E, Ss. 258-260.

ئەیزنهاوەری سەرۆکی ئەمریکا بۆ تورکیا لە تەمووزی 1959 جگە لە دەربڕینی بەهێزبوونی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولا نەبێت هیچی دیکە نەبووە[1].

بەم شێوەیە لە پەنجاکاندا بەرزترین پلەی سوودی هاوبەشی نێوان ئەنقەرە و واشنتۆن تۆمارکراوە، تاوەکو ئەو پەیوەندییە لەو قۆناغەدا بە **"زەواجی بە سوود"** وەسفکراوە[2]. تورکیا ڕێگەی بە ئەمریکادا 26 بنکەی سەربازی ئەمریکی لەسەر خاکەکەی بونیات بنێ، کە بنکەی گەڕان بەدوای زانیاری و بنکەی ڕادار و فڕۆکەخانە و کۆگای ئازوقەی لە خۆگرتبوو[3]. لەو ماوەیەدا واشنتۆن و ئەنقەرە دەیان ڕێککەوتننامەیان مۆرکرد، کە زۆربەیان بە نهێنی مایەوە، بە گوێرەی ئەو ریککەوتننامانە ئەمریکا مافی بەکارهێنانی بنکە و دامەزراوە سەربازییەکانی تورکیای وەرگرت و لەپاڵ کردنەوەی بنکەی نوێ، هەروەها ئەو ئەمریکییانەی لەو بنکە و دامەزراوانە نیشتەجێ ببوون چەندین ئیمتیازیان بەدەستهێنا، لە بوارەکانی دادوەری و دادگاکان و هەتاکو دامەزراندنی خزمەتگوزاری پۆستەی تایبەت بەخۆیان و دامەزراندنی بازاڕگای بەخشراو لە باج، ئەو مافە بەخشراوانە بە ئەمریکییەکانی تورکیا لەو مافانەی کە واشنتۆن بەهۆی ریککەوتننامەی (ڕەوشی هێزەکان– Status Forces) لەگەڵ وڵاتانی پەیمانی ناتۆدا بەدەستی هێناوە، زۆر زیاتر بوو، بۆ نموونە نابێت فەرمانبەرە سەربازییە ئەمریکییەکان تاوانەکەیان هەرچییەك بێت نابێت بهێنرێنە بەردەم دادگاکانی تورکیا، هەروەها **"سەربازانی ئەمریکی بە پلەی عەقید ئەگەر بە ئۆتۆمبێل لە منداڵێك بدات، یا ئەفسەرێکی سەرخۆش بەبەرچاوی خەڵك ئاڵای تورکی بدڕێنێ، نابێت بهێنرێنە بەردەم هیچ دادگای سەربازی تورکی"**. تەنها ئەوەندە بەسە کە بڕوانامەیەك کە لەلایەن بەرزترین پایەی سەربازییەوە مۆرکراوە، دەربچێت و بڵێت **"تۆمەتبار لە میانەی بەدیهێنانی کارەکەی تاوانەکەی ئەنجامداوە"**[4].

(1) -Cemil KoÇak and Gul Inanc Barkay, Op. Cit., P. 29.

(2) -Rachel Prager, Op. Cit., P. 4.

(3) - ریتشارد ف. غریمت والن لیبسون، نفس المصدر، ص18.

(4) - نبیل حیدري، نفس المصدر، ص ص157–158.



ئاوەڕدانەوەیەکی بابەتییانە لە ڕێککەوتنامەکانی نێوان واشنتۆن و ئەنقەرە لە پەنجاکانەوە بەسە بۆئەوەی خۆشی پەیوەندییە **"ئەمنی–سەربازی"**یەکان کە هەردوو وڵاتی بەیەکەوە گرێداوە[1] و قەبارەی ئەو ڕۆڵەی کە ئەنقەرە بێ دوودڵی و گازاندەکردن لە خزمەت ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا گێڕاویەتی، دەربکەوێت[2]. سەرباری ئەمەش ئەو تەبایی و تێکگەیشتنەی پەیوەندییەکانی ئەمریکا– تورکیا لەسەر میزاج و زەوقی خەڵکی ش ڕەنگی داوەتەوە، لەماوەی پەنجاکاندا گۆڕانییەکی میللی تورکی زۆر بەناوبانگ ببوو و زۆرێك لە گەنجانی تورك دەیانگوتەوە بەناوی **"ئەمریکا، ئەمریکا تورکیا بەردەوام لەشەڕەکانت لە پێناوی ئازادی تا کۆتایی دونیا لەگەڵدا دەبێت"**. توێژەرێك سیاسەتی تورکیا بەرامبەر بەرژەوەندییەکانی ئەمریکای لەو ماوەیەدا بەم شێوەیە وەسفکردووە، کە لە (مەلیك مەلیکترە)[3].

نێوەندە تورکییەکان لە نوخبەی سیاسی، لە نێوانیاندا کەسانێك هەبوون پایەیەکی حکوومی هەستیاریان هەبوو، هۆشداریان لە زیادەڕۆیی لە بەدواکەوتنی تورکیا بەدوای سیاسەت و ئامانجەکانی ئەمریکا دا، بەڵکو هەندێکیان هۆشدارییان لە مەترسی دەرەنجامی ناچاوەڕوانکراوی ئەو پەرۆشی و ڕاکردنەی تورکیا بەرەو واشنتۆن دا، بۆ نموونە فەتین ڕوشدی زورلو Rustu Zorlu Fatin وەزیری دەرەوەی تورکیا لە کۆتایی ساڵی 1959 ڕایگەیاند کە **"پێویستە تورکیا بیر لە دەرچوون لە فەلەکی ئەمریکی بکاتەوە، گرێدانی تورکیا بە ئەمریکاوە بەبێ بیرکردنەوە و قازانج، هەڵەیە.**

(1) - المصدر نفسه، ص157.

(2) - نوبار هوفسبیان، نفس المصدر، ص286.

(3) - Soli Özel, "The Turkish-US Relationship in Historical Perspective", in: Bruce Maddy-Weitzman and Asher Susser (Ed), Turkish-Israeli Relations in a Trans-Atlantic Context Wider Europe and the Greater Middle East, The Moshe Dayan Center for Middle Eastern and African Studies, Tel Aviv, 2005, P. 108.

**ئەم جۆرە سیاسەتە بەردەوام نابێت و تورکیاش هیچ دەستکەوتیکی چنگ ناکەویت، بەڵکو زیانی لێدەکەوێت"**[1].

ساڵانی شەستەکان دیاریکردنەوەی پەیوەندییەکانی تورکیا–ئەمریکای بەخۆیەوە بینی[2]، ئەو ماوەیە چەندین رووداوی لەگەڵ خۆی هێنا، جۆرێك لە کەلێنی خستە سیاسەتی دەرەوەی تورکیا، نەخشەی دابەشبوونی لە پەیوەندییەکانی تورکیا–ئەمریکا کێشا[3].

لەسەرەتای شەستەکانەوە ئەو حاڵەتی بەستەڵۆکییەی کە باڵی بەسەر پەیوەندییەکانی تورکیا– سۆڤیەت دا کێشابوو، گۆڕانکاری بەخۆیەوە بینی، لە تەمووزی 1960 بڕیاردرا سەرۆکی هەردوو وڵات، عەدنان مەندەرس سەرۆکی حکوومەتی تورکیا و نیکیتا خرۆشۆف N. Khrushchev (1953–1964) سەرۆکی سۆڤیەت سەردانی یەکتری بکەن، بەڵام کودەتای سەربازی 27ی ئایاری 1960 حکوومەتەکەی مندریسی لەناوبرد. دوو هۆکار وایکرد تورکیا بەرەو یەکێتی سۆڤیەت بجولێ، یەکەم تورکیا پێویستی بە یارمەتی ئابووری نوێ هەبوو، دووەم ئەو مەزەندەیەی کە سیاسییە تورکەکان پێیگەیی بوون، ئەوە بوو کە لەوانەیە پەیوەندییەکانی (ئەمریکا–سۆڤیەت) بەسەردانەکەی خرۆشۆف بۆ ئەمریکا ساڵی 1959 و بەستانی کۆنگرەی لوتکەی ئەمریکی – سۆڤیەتی لە ئایاری 1960 قۆناغێکی تازە بهێنێتە کایەوە. ئەوانە گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە گفتوگۆی ئەمریکا–سۆڤیەت لەوانەیە وابکات پەیوەندی ئەو دوو جەمسەرە گەورەیە خۆش بکات، کە پەیوەندی تایبەتی نێوان ئەمریکا و تورکیا لەناو دەبات. لە کانوونی یەکەمی 1959 لەمیانەی سەردانەکەی ئەیزنهاوەری سەرۆکی ئەمریکا بۆ تورکیا نیگەرانی و مەترسییەکانی تورکیا

(1) - Çetin Yetkin, Turkiye'de Askeri Darbeler ve Amrika, yeniden Anadolu ve Rumeli Mudafaa-I Hukuk Yayinlari, Antalyu, 3.basim, 2006, S. 64.

(2) – نوبار هوفسبيان، المصدر السابق، ص286

(3) – نبيل حيدري، المصدر السابق، ص159.



خرانە روو لە کشانەوەی پاراستن و پابەندییەکانی ئەمریکا بۆ ئەو وڵاتە[1]. هەروەك توێژەریکی تورك دەڵێت، بەڵکو ئاماژەی کۆتایی **"مانگی هەنگوین"**ە کە لە دەیەی پەنجاکاندا درێژەی کێشا[2].

ساڵانی یەکەمی دەیەی شەستەکان راستی مەترسییەکانی تورکیای چەسپاند و سەلماندنی کە ناهاوسەنگییەك لە نێوان بەرژەوەندییەکانی هەردوو وڵاتدا هەیە، وڵاتێك هێزێکی مەزنە و دووەمیان هیزیکی هەریمایەتی ناوەندە[3].

دوو پەرەسەندنی ترسناك وایکرد پەیوەندییەکانی نێوان دوو هاوپەیمانی نزیك دەرزی تێبکەوێت، یەکەم تەنگژەی رۆکێتە کۆبییەکان ساڵی 1962، کە 13 رۆژی خایەند، کاتێ سەرۆکی ئەمریکی جۆن کێنیدی J. Kennedy (1961–1963) بۆ خرۆشۆڤ سەرۆکی سۆڤیەتی پیشنیاز کرد، کە ئەمریکا ئامادەیە تورکیا لە رۆکێتی جۆپیتەر پاك بکاتەوە، لەبەرامبەردا سۆڤیەت رۆکێتەکانی لە کوبا بکشێنێتەوە، ئەمە لە کاتێکدا بوو جیهان لەسەر لێواری جەنگێکی ناوەکی دابوو[4]. ئەم مامەڵەیە وای لە تورکیا کرد چاو بە پەیوەندییەکانی لەگەڵ هەردوو زلهێزدا بخشێنێتەوە، لەلایەك گومانێکی بەهێزی لای تورکیا سەبارەت بە راستگۆیی ئەمریکا لە پابەندییەکانی لەهەمبەر ئاسایشی نەتەوەیی تورکی[5]. لەگەڵ رەوینەوەی **"وەهمی هاوپەیمانی"** لەگەڵ رۆژئاوا، لە شەستەکاندا سەرکردە تورکەکان دەستیان بە گۆڕینی سیاسەتەکانیان لەبەرامبەر یەکێتی سۆڤیەت،

(1) – دويغو بازو اوغلو سيزر، سياسات تركيا الامنية، دراسات ستراتيجية، مؤسسة الابحاث العربية، الدراسة رقم (37)، السنة الثانية، بيروت، 1983، ص 20.

(2) - Soli Özel, Op. Cit., P. 109.

(3) - Aylin Guney, Op. Cit., P. 342.

(4) -Nurhan Ince, Problems and Politics in Turkish Foreign Policy, 1960-1966: With Emphasis on Turkish-United States Relations, The Cyprus Question, and The Leftist Movement, Ph. D. Thesis, University of Kentucky, 1974, Pp. 75-82;

خليل إبراهيم محمود الناصري، السياسة الخارجية التركية أزاء الشرق الاوسط للمدة الواقعة 1945–1991، اطروحة دكتوراه مقدمة الى مجلس كلية العلوم السياسية، جامعة بغداد، 1995، ص 23.

(5) - Kemal Krişci, Op. Cit., P. 132.

بەرەو ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ سۆڤیەت چوون، ئەمەش دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە ئەمریکا بەرژەوەندییە ئەمنییەکانی بەر لە بەرژەوەندییە ئەمینییەکانی هاوپەیمانانیان دادەنێت[1].

دووەم پەرەسەندنی گرنگ بە (تەنگژەی قوبرسەوە)[2] گرێدرابوو، لەیەکەم تەنگژەی قوبرسدا (1963–1964)[3]، لە 5ی حوزەیرانی 1964 عیسمەت ئینونۆ (1961–1965) سەرۆك وەزیرانی تورکی، نامەیەکی لە لیندۆن جونسونی L. Johnson (1963–1968) سەرۆکی ئەمریکا وەرگرت، کە هۆشداری دەداتە تورکیا لە هەر دەستتێوەردانێکی لە قوبرس بە بیانوی پاراستنی کەمینە تورکمانییەکان، بەگوێرەی قسەی ئەنقەرە، ئەوکات کەمینە تورکمانەکان لەلایەن زۆرینەی یۆنانییەکانەوە دەچەوسێنرانەوە، هەروەها نامەکە ئەوەشی بە تورکیا راگەیاندبوو کە نابێت چەکی ئەمریکی یان چەکی هەر وڵاتیکی ئەندامی ناتۆ لە حاڵەتی دەستتێوەردان لە قوبرس بەکاربهێنێت، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە پاڵپشتی کردن لە تورکیا بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر هێرشێك یا پەرچەکردارێکی سەربازی سۆڤیەتی چاوەروانکراو[4].

بێ هیوایی تورکیا لە هاوپەیمانێتی ئەمریکا دەنگدانەوەیەکی فراوانی لە هەردوو ئاستی فەرمی و میللی لێکەوتەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە ساڵی 1966 ناوەڕۆکی نامەکەی جونسون بڵاوکرایەوە، لەسەر ئاستی میللی دروشمی "Yankee Go Home"[5] بڵاوترین دروشمێك بوو کە لە کۆبوونەوە

(1)– ریتشارد ف. غریمت والن لیبسون، المصدر السابق، ص 18.

(2) - Clement H. Dodd, Turkey and the Cyprus Question, in: Alan Makovisky and Sabri Sayari (ed), "Turkey's New World: Changing Dynamics in Turkish Foreign Policy", Washington Institute for Near East Policy, Washington D.C, 2000, Pp.170-153.

(3) – خليل على مراد، "الأزمة القبرصية الأولى وانعكاساتها على علاقات تركيا مع الولايات المتحدة الأمريكية"، مجلة دراسات تركية، العدد 1، السنة الأولى، كانون الثاني 1991، ص ص 45–67.

(4) -Kemal Krişci, Op. Cit., P. 132.

(5) – واتە (یانکییەکان بگەڕێنەوە وڵاتی خۆتان) مەبەستیشی لە ئەمریکییەکان بوو، وای لێهات ئەو دروشمە تورکەکان لەبەرامبەر هاتنی کەشتییە ئەمریکییەکان بۆ تورکیا، بەرۆیان دەکردەوە.



میللییەکان و کۆڕە گشتییەکان و کۆڕبەندەکانی لاوانی تورکی دەگوترایەوە. هەرچی کاردانەوەکەی بوو لەسەر ئاستی فەرمی و حکوومی، ئەوا ئەنقەرە بەرەو گرتنەبەری هەڵوێستی زیاتر سەربەخۆ لەبەرامبەر سیاسەتەکانی ئەمریکا چوو، هەروەها هەڵیدا پەیوەندی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتانی بێ لایەن ببەستێ[1]. پرۆسەی ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکان لەگەڵ سۆڤیەت بە شێوەیەکی راستەوانە لە رێگەی سێ تەوەری سەرەکییەوە بەرێوەدەچوو، یەکەم، ئاڵوگۆڕکردنی سەردانە فەرمییەکان لە ئاستی باڵا، دووەم، رێککەوتن لەسەر پرەنسیپی سەرەکی یاسای نێودەوڵەتی تایبەت بە سەربەخۆیی هەموو وڵاتێك و رێزگرتن لە سەروەری ئەو وڵاتانە و پرەنسیپی پێکەوە ژیانی ئاشتییانە لە نێوان دوو رژێمی کۆمەڵایەتی جیاواز. هەروەها یارمەتی ئابووری سۆڤیەتی و رێزگرتنی سۆڤیەت لە پابەندییەکانی تورکیا بەرامبەر پەیمانی ناتۆ، سێیەم، ژمارەی کێشە جیهانییەکان بەشێوەیەکی بەرەبەرەیی زیادبوو، هەردوو لا لەسەر ژمارەیەك لە کێشە جیهانییەکان رێککەوتن، هەردوولا داوایان کرد بەزوویی کۆتایی بە جەنگی ڤێتنام بهێنرێت و ئیسرائیلیش ئەو هەرێمە عەرەبییانەی لە جەنگی 1967 داگیری کردوون پاشەکشە بکات و پاڵپشتی لە تەبایی نێودەوڵەتی بکەن و کار بۆ گریدانی کۆنگرەیەکی جیهانی بۆ چەگ داماڵین بکەن[2].

دوای نیوەی شەستەکان ئاراستەی نوێ لە پەیوەندییەکانی تورکیا بە ئەمریکا بەشێوەیەکی روونتر بەرجەستە بوو، بە ئاراستەی وەرچەرخان لە سیاسەتی پشت بەستن بە ئەمریکا بەتەنها بەرەو گەڕان بەدوای هەمە چەشنکردنی سەرچاوەکانی سیاسەتی دەرەوە و هاوسەنگیکردن تا بکرێت لە نێوانیاندا و پەیوەندی لەگەڵ سۆڤیەت دیاری بکریت، یەکەم رێوشوێن لەم بوارەدا تورکیا گرتیە بەر بەرزکردنەوەی یادداشتێك بوو لە 7ی نیسانی 1966 بۆ حکوومەتی واشنتۆن، سەبارەت بە چاوخشاندنەوەیەکی گشتی بەو هەموو

(1) -Omer Goksel Isyar, Op. Cit., P.26.

(2) - دویغو بازوغلو سیزر، المصدر السابق، ص 20.

ڕێککەوتنە سیاسی و سەربازییانانەی کە لە نێوانیاندا مۆرکراوە، دەرەنجامی دانوستاندنەکان چاوخشاندنەوە بوو بە مەرجەکانی ڕێککەوتننامەکان و ئیمتیازە بەخشراوەکان بوو، بۆ بەرژەوەندی حکوومەتی تورکی، بۆ نموونە بڕیاردرا بوونی ئەمریکا لە تورکیا بەشێوەیەکی بەرەبەرەیی کەم بکرێتەوە، هێزی سەربازی تورکی ژمارەیەك بنکەی سەربازی و وێستگەی ڕاداری لە تەرابزون و ئەزمیر و سامسۆن وەرگرتەوە، هەروەها ویستگەکانی ڕادار لە سینوپ و دیاربەکر و ئەنجەرلیك خرانە بەر مەرج و ڕێوشوێنی نوێوە، ئەنقەرە بەڵێنی لە ئەمریکا وەرگرت کە هیچ نهێنییەکی سەربازی لە حکوومەتی تورکی نەشارێتەوە[1].

بەڵام لە کۆتایی شەستەکاندا هەردوو لایەنی تورکی و ئەمریکی، هەستیان بەو زیانەی کە لە پەیوەندییەکان کەوتووە کرد. بۆ بەرگرتن لە زیاتر تێکچوونی پەیوەندییەکان، هەردوو لا لە 3ی تەمووزی 1969 ڕێککەوتنێکی نوێیان مۆرکرد، ئەویش ڕێککەوتننامەی هاوکاری بەرگری بوو[2].

ئەو ڕێککەوتننامەیە لەسەر بنەمای یەکسانی و هاوسەنگی لە پەیوەندییە دوو قۆڵییەکان دارێژرابوو، نابێت دەستدرێژی سنووری پابەندییەکانی پەیمانی ناتۆ ببەزێنێ، لە گرنگترین بەندەکانی دیکەی ئەوەبوو، کە نابێت بەبێ ڕەزامەندی پێشوەختەی حکوومەتی ئەنقەرە، هیچ دامەزراوەیەکی بەرگری یا ئەو دەستکردن بە چالاکانی دامەزراوەکان بکرێت و ڕێگە بە ئەمریکا نادرێت هیچ بنکەیەك لەسەر خاکی تورکیا بەکاربهێنێت تا ئەمریکا لە وردەکاری و سروشتی ئەو چالاکییەی دەیخوازێت ئەنجامی بدات تورکیا ئاگادار نەکاتەوە. هەروەها ماف بە ئەنجوومەنی وەزیرانی تورکی درا، ئەو چالاکییانە بوەستێنێ، لە حاڵێکدا ئەگەر ناکۆکی لەسەر کەوتەوە[3].

(1) -Mehmet Gonlubol, Nato, USA and Turkey, in: Kemal H.Karpat (Ed), Turkey's foreign Policy in transition: 1950-1979, Leiden,1975 , Pp. 38-40;
نبيل حيدري، المصدر السابق، ص ص160–161.

(2) -Cemil Koçak and Gul Inanc Barkay, Op. Cit., P.29;
خليل على مراد، الازمة القبرصية الاولى، ص 59.

(3) -Fahir Armaoglu, A.G.E, SS. 277-285.



ئەگەر ریککەوتننامەی تەمووزی 1969 بابەتی بەکارهێنانی بنکە سەربازییەکانی تورکیا و ڕەوشی سەربازانی ئەمریکای لەم وڵاتەی ڕێکخستبێ، بەڵام ڕێگر نەبوو لەوەی کە پەیوەندییەکانی ئەم دوو وڵاتە ڕووبەڕووی ناکۆکی و تەنگژەنە بێتەوە. ئەمەش لەو ناکۆکییەی کە لە نیوەی یەکەمی دەیەی حەفتاکانەوە بەهۆی پابەندنەبوونی تورکیا بە قەدەغەکردنی کشتوکاڵی ئەفیونەوە ڕوون دەبێتەوە[1]. دوای ئەمەش بەهۆی کێشەی قوبرسەوە سەرلەنوێ تەنگژە لە پەیوەندییەکانی هەردوولا ڕوودەدات، کاتێ تورکیا لە 20ی تەمووزی 1974[2] هێزەکانی تورکیا بەشی باکووری دورگەی قوبرسیان داگیرکرد، بەڵام ئەمجارەیان کاردانەوەی ئەمریکا بەهێز بوو، کاتێ هاتنی چەکی بۆ تورکیا قەدەغەکرد، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمریکی لە 18ی کانوونی یەکەمی 1974 یاسای یارمەتییە دەرەکییەکانی

(1) – ڕەگ و ڕیشەی گرفتی ئەفیون بۆ ناوەڕاستی حەفتاکان دەگەڕێتەوە، کاتێ حکوومەتی ئەمریکا هانی تورکیای دا سنووریك بۆ چاندنی ئەفیون دابنێت و دواتریش قەدەغەی چاندنی بکات، لەساڵی 1968 کاتێ واشنتۆن قەرزێکی بەبری 3 ملیۆن دۆلار بۆ پاڵپشتی چاندنی بەروبوومیك شوینی ئەفیون بگرێتەوە، دا، هەردوولا گەیشتنە ریککەوتن. لەسەرەتای حەفتاکان ماوەی ئەو ریککەوتننامەیە کۆتایی هات، تورکان گەڕانەوە سەر چاندنی ئەفیون، ئەمەش تەنگژەیەکی نوێی لە پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولا لێکەوتەوە، هەندێ ئەندامی کۆنگرێس هەڵمەتیان بۆ سەر تورکیا دەست پێکرد، ئەمەش وایکرد ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکی لە ئابی 1971 بڕیارێکی دەرکرد و ڕێوشوێنی توندی بەسەر چاندنی خەشخاش سەپاند، دوای درووێنەی 1972 بڕیاری حکوومەتی (نهاد ئەریم)ی بەدواداهات و تێیدا چاندنی خەشخاش لە تورکیا تەحریم کرد، لەبەرامبەر ئەوە تورکیا بری 35 ملیۆن دۆلار لە ماوەی سێ ساڵدا بەدەست دەخات، وەك قەرەبووی جووتیارە زیان لێکەوتووەکان و گۆڕینی جووتیارانی خەشخاش بۆ چاندنی بەروبومی هەمەچەشنەی دیکە. بۆ وردەکاری زیاتر بروانە: برایسون، المصدر السابق، ص ص556–557.

(2) - علية عبد الحسين سعيد نصر الله، موقف الولايات المتحدة الامريكية من المشكلة القبرصية: 1960–1974، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية التربية–جامعة البصرة، 2005، ص ص132–141.

ئەمریکای بە 43 دەنگ بەرامبەر 40 دەنگ پەسند کرد، هەروەها بڕیاری بڕینی یارمەتییە سەربازییەکانی تورکیای لە 5ی شوباتی 1975 دا، بە پشت بەستن بە برگەی 10ی ماددەی 620ی یاسای ناوبراو، ئەمەش لەسەر ئەو بنەمایەی کە **"تورکیا وەلامی داخوازی و مەرجەکانی ئەمریکای نەداوەتەوە"**[1].

وایلێهات تەنگژەی قوبرس بووە یەکێ لە ترسناکترین ئەو ڕووبەڕووبوونەوانەی کە تووشی پەیوەندییەکانی ئەمریکا – تورکیا هات، بە شێوەیەك دوای ئەم تەنگژەیە تورکیا لە **"وڵاتێکی هاوپەیمان بۆ ئەمریکا بۆ وڵاتیکی دۆستی دابڕاو"**[2] گۆڕا. قسەکەر بەناوی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا هەڵوێستی ئەمریکا لەمەڕ ڕێوشوێنی تورکی بەم شێوەیە دەربڕی و گوتی: **"بەکارهێنانی هێز پەیوەندییەکانی نێوان تورکیا و یۆنان ناخاتە مەترسییەوە، بەڵکو وادەکات تەواوی ناوچەکە بخاتە مەترسییەوە، چارەسەری کێشەی قوبرس ناکرێت لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێزەوە بێت"**[3]. ئەم هەڵوێستەی ئەمریکا سەرەتا والێکدرایەوە کەوا **"پاڵپشتییەکی پەنهانییە(بەمتمانە)"** بۆ داگیرکاری تورکی، بەلام کاتێ هێزەکانی تورکیا دەسەلاتیان لە دورگەکە فراوانکردووە و چالاکییەکانیان چڕکردەوە و بڕیاری ئارامگرتنیان دا، هەڵوێستی ئەمریکا گۆڕا، دەنگدانەوەی هەلوێستەکەی ئەمریکا لە کۆنگرێس کە بەهۆی گرووپی فشاری (لۆبی) یۆنانی–ئەرمەنی دروستبوو، چاوەڕوانی هەموو دەرفەتێکیان دەکرد بۆئەوەی تورکیای تێیدا تاوانبار بکەن[4].

---

(1) - سیزائي اورکونت، العلاقات العسكرية الأمريكية–التركية، ترجمة :مركز البحوث والمعلومات، بغداد، 1987، ص ص78–79.

(2) - Sabri Sayari, Turkey and United States: Changing Dynamics of an Enduring Alliance, in: Tariq Y. Ismael and Mustafa Aydin (ed), Turkey's Foreign Policy in the 21st Century: A Changing Role in the World Politics, Ashgate Publishing Company, USA, 2003, P. 29.

(3) - فتحية النبراوي ومحمد نصر مهنا، قضايا العالم الإسلامي ومشكلاته السياسية بين الماضي والحاضر، القاهرة،1983، ص 506.

(4) - Sabri Sayari, Op. Cit., P. 29.



چەند کەسایەتییەکی دیار لە ئەندامانی ئەنجوومەنی پیران و نوێنەران لە کۆنگرێس هەڵمەتیکیان بۆ پاڵپشتی کردن لە بڕیاری سەپاندنی گەمارۆ بەسەر تورکیا، کە زۆربەی ئەندامانی لە بنەچەوە یۆنانی بوون، وەکو بنجامین روزنپال B. Rosenthal و توماس أیكلتون T. Eagleton و ادلای ستیفنسون A. Stevenson و ادوارد کیندی لە ئەنجوومەنی پیران، و جون برادیماس J. Bradimas و باول ساربانز P. Sarbanes و بیتر کیروز P. kyros و ج. یاترون G. Yatron لە ئەنجوومەنی نوێنەران. هەوڵەکانی ئەوانە وایکرد زۆربەی ئەندامانی کۆنگرێس لەسەر پەسندکردنی بڕیاری بڕینی یارمەتییەکان لە تورکیا ڕازیبوون، بڕیارەکە لە 5ی شوباتی 1975 ەوە جێبەجێکرا[1]. بڕیارەکەی ئەمریکا بووە مایەی نارەزایەتی حکومەت و ئۆپۆزسیۆنی تورکی بەیەکەوە، هەروەها جەماوەری تورکیاش بەهەموو توێژە کۆمەلاتییەکانییەوە بەرامبەر ئەمریکا تورەییان دەربڕی، بۆیە لە 17ی حوزەیراندا حکوومەتی نوێی تورکی بەسەرۆکایەتی سلێمان دیمیریل (31ی ئازاری 1975 تا 21ی حوزیرانی 1977)[2] یادداشتێکی فەرمی ئاراستەی حکوومەتی تورکیا کرد و لایەنیکی بە

---

(1) - Paul Y. Wanatabe, Ethnic Groups, Congress and American Foreign Policy: The Politics of Turkish Arms Embargo, West port and London, Green Wood press 1984, Pp. 128-126.

(2) – لە ئەسپارتەساڵی 1924 لەدایك بووە، کۆلیژی تەکنیکی لە ئەستامیۆل تەواوکردووە، ژیانی زانستی وەك ئەندازیار لە توێژینەوەی کارەبایی دەستپیکردووە، بۆ پسپۆری وەرگرتن لە بەنداو و کارەبا بۆ ئەمریکا نێردراوە، ساڵی 1952 دوای گەڕانەوەی وەك بەرپرسی دامەزراندنی بەنداوی (سەیحان) دیاریکرا، دواتر دووبارە بۆ خوێندن بۆ ئەمریکا چووە، دوای گەڕانەوەی بە پلەی سەرکەوتوو، پایەی بەڕیوەبەری گشتی کاروباری ئاویی وەرگرت. ساڵی 1962 بە ئەندام بوونی لە حیزبی عەداله چووە ناو مەیدانی سیاسییەوە، بەخێرایی پلەکانی حیزبی بڕی، تاوەکو لە ساڵی 1968 سەرۆکایەتی ئەو پارتەی وەرگرت. ساڵی 1965 کاتی وەك نوێنەری ئەوپارتە بووە ئەندام پەرلەمان، کاری سیاسی کرد. هەر لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە تا ساڵی 1980 شەش جار پایەی سەرۆکی حکوومەتی وەرگرتووە، دووجاریش لە کودەتای ئازاری 1971 و ئەیلولی 1980 لەکارلادراوە، ساڵی 1991 حەوتەم حکوومەتی پێکهینا لە ئاری 1993 بەهۆی مردنی لەناکاوی ئۆزال بە سەرۆکی کۆمار هەڵبژێردرا، تا ساڵی 2000 لە پایەکەی مایەوە. سەیری سایتی ئەلیکترۆنی حکوومەتی تورکی بکە: www.cankaya.gov.tr/eng_html/demirel.html.

ئاشكرا هەڕەشەی لە ئیدارەی ئەمریكی كرد و كاتێ باسی **"ئەگەر لەماوەی 30 رۆژدا ئەمریكا گەمارۆ هەڵنەگرێت، ئەوا رەوشی پەیوەندییەكانی نێوان ئەمریكا–توركیا بە فەرمی دەگۆڕێت"**[1]. هەروەها بولەند ئەجوید–Bulent Ecevit[2] سەرۆكی حیزبی گەلی كۆماری رایگەیاند كە **"توركیا لەلایەن هاوپەیمانی سەرەكی خۆیەوە بەهۆی دەستتێوەردانی لە قوبرسەوە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە نیشتیمانییەكانی، سزادراوە"**[3]. نەجمەددین ئەربەكانی[4] سەرۆكی حیزبی خەلاسی نیشتیمانی، بڕیاری گەمارۆكەی بە

(1) - لقمان عمر محمود احمد، العلاقات التركية–الأمريكية 1975–1991: دراسة تاريخية، أطروحة دكتوراه غير منشورة مقدمة الى مجلس كلية الآداب، جامعة الموصل، 2004، ص44.

(2) – لە دیاریترین سیاسەتمەدارانی توركیایە، ساڵی 1925 لە ئەستەمبوڵ لەدایكبووە، ساڵی 1944 لە كۆلێژی ئەدەبیانی زانكۆی ئەستامبوڵ دەرچووە، لەماوەی ساڵانی (1946–1950) لە چاپخانەی باڵوێزخانەی توركیا لە لەندەن كاریكردووە، لە ساڵی 1950 لە رۆژنامەی رۆژانەی ئۆلۆس زمان حالی حیزبی گەلی كۆماری وەكو نووسەر كاریكردووە، ساڵی 1957 زەمالەی خوێندنی لە دامەزراوەی رۆكفیلەری ئەمریكی بۆ خوێندنی مێژووی كۆمەڵایەتی و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و عوسمانی لە زانكۆی هارڤارد وەرگرتووە، دوای گەڕانەوەی بۆ توركیا وەكو وەرگێڕی عیسمەت ئینینۆ كاریكردووە، كە لە ناوەڕاستی شەستەكانەوە بۆ پۆستی وەزیری كار لە هەموو حكومەتەكان راسپێردراوە، ناكۆكییەكی فیكری توندی لەگەڵ ئینینۆدا هەبوو، لە تشرینی یەكەمی 1972، لە كۆنگرەی بیست و یەكەمی حیزبدا بۆ سەرۆكی حیزب هەڵبژێردرا، ئەجوید رۆڵێكی ترسناكی لە سیاسەتی توركیا لە ماوەی حەفتاكان و نەوەدەكانی سەدەی بیستەم گێڕا، لە تشرینی دووەمی 2006 كۆچی دوایی كرد. بۆ زانیاری زیاتر سەیری:

Douglas A. Howard, The history of Turkey, Green Wood Press Westport-Connecticut, London, 2001, P.191 .

(3) - Douglas A. Howard, The history of Turkey, Green Wood Press Westport-Connecticut, London, 2001, P.191 .

(4) – نەجمەددین ئەربەكان، لە شاری سینوپ ساڵی 1926 لەدایكبووە، ساڵی 1948 بروانامەی ئەندازیاری میكانیكی لە زانكۆی ئەستامبوڵ بەدەستهێناوە، ساڵی 1935 لەهەمان پسپۆڕی بروانامەی دكتۆرای لە ئەڵمانیا وەرگرتووە، لەبواری بزوێنەری دیزڵدا كاریكردووە، ساڵی 1956=



**"سیاسەتێكی ئەمریكی دوژمنكارانە بۆ توركیا كە بەرگری لە ماف و بەرژەوەندییە نەتەوەیی و نیشتیمانی خۆی كردووە"**، وەسفكرد[1]. لەلایەكی دیكەوە بڕیارەكەی ئەمریكا شەقامی توركی بە هەموو رەوتەكانیەوە لەوپەڕی چەپەوە بۆ ئەوپەڕی راستیەوە، گڕدا. بەشێوەیەكی خێرا گیانی دوژمنداری بۆ ئەمریكییەكان لە نێو خوێندكارانی زانكۆ و بیریارانی چەپ و ریكخراوە چەپەكان گەشەی كرد[2].

لەسەر ئاستی كرداری، یەكەم رێوشوێن كە توركیا پەنای بۆ برد ئەوە بوو، رایگەیاند كە (رێككەوتننامەی هاریكاری بەرگری) ساڵی 1966 هەڵوەشاوەتەوە و كار بە پرۆسە و پرۆگرامەكانی بەرگری هاوبەش لە هەموو بنكە ئەمریكییەكانی توركیا ناكرێت، جگە لە بنكەی ئەنجەرلینك نەبێت، ئەو بنكەیەش لەناو چالاكییەكانی پەیمانی ناتۆدا بوو[3]. بولند ئەجەویدی هاوبەشی دیمیرل لە هاوپەیمانی فەرمانڕەوای ئەوسا، قەدەغەكردنی بەرهەمهێنانی ئەفیونی لە رۆژئاوای توركیا هەڵوەشاندەوە كە پێشتر بە داوایەكی ئەمریكی سەپێنرابوو[4]. لەسەرەتای ساڵی 1976ەوە پەیوەندییەكان شڵەژانی تێكەوت، كاتێ سلێمان دیمیرڵ سەبارەت بە هەر

=كارگەیەكی بۆخۆی دامەزراندووە، لە ساڵی 1966 پۆستی سەرۆكی دائیرەی پیشەسازی لە توركیا وەرگر، لەساڵی 1970 یەكەم پارتی ئیسلامی بەناوی پارتی رژێمی نیشتمانی دامەزراند، كە دوای كودەتای سەربازی ئازاری 1971 پارتەكەی قەدەغەكرا، ئینجا پارتێكی دیكەی بەناوی حیزبی خەلاسی نیشتمانی دامەزراند تا دوای كودەتای سەربازی مانگی ئەیلولی 1980 بەردەوام قەدەغەكرابوو. بۆ زانیاری زیاتر سەیری: صباح الدين اوجار، اربكان والرفاه الاسلامي، ترجمة: الصفصاني احمد المرسي، ايتراك للنشر والتوزيع، القاهرة، 2003، ص265.

(1) -Alan Makovsky. "Policy towards Turkey: Progress and Problems", in: Morton Abramowitz (Ed), Turkey Transformations and American policy, The century foundations press New York, 2000, P. 225 .

(2) -Sabri Sayari, Op. Cit., P. 29 .

(3) -Cemil Koçak and Gül lnanç Barkay, Op. Cit., P. 29.

(4) -Omer Goksel lsyar, OP, Cit., P. 28 .

كەمتەرخەمی نواندنێك لە رێككەوتننامەی نوێی بەرگری كە بەنیازبوون لە شوێنی (رێككەوتننامەی هاریكاری بەرگری ببەستن)، هۆشداری دا بە كۆنگرێسی ئەمریكی. هەروەها رایگەیاند كە ئەگەر دوای هەڵبژاردنەكانی ئەمریكا (تشرینی دووەمی 1976) هەر دواخستنێكی دیكە لە كرێدانی رێككەوتننامە بكرێت، ئەوا پەیوەندییەكانی ئەمریكا–توركیا زیاتر تووشی كۆسپ و شڵەژان دەبێت[1].

ترسناكترین كاردانەوەی توركیا بۆ ئەمریكا، پەرەسەندنی پەیوەندییەكانی توركیا بوو بە یەكێتی سۆڤیەتەوە، كاتێ لە ساڵی 1975 هەردوولا رەشنووسی وسیقەیەكی سیاسییان لەبارەی پرەنسیپەكانی هاوسێیەتی باش و هاوكاری برایانە مۆركرد، كە دواتر لە ساڵی 1978 لە مۆسكۆ مۆركرا. ئەو رێككەوتننامەیە رێگەی بە دروستكردنی پەیوەندییە ئابووری و سیاسییەكان دا وەك یەك، لە نێوان گەورە بەرپرسانی هەردوو وڵات سەردان ئاڵوگۆڕ كرا، پەرەسەندنی پەیوەندییەكان گەیشتە ئەو رادەیە كە بولەند ئەجەویدی سەرۆكی وەزیرانی توركی لە ئایاری 1987 لە لەندەنەوە رابگەیەنێ كە **"یەكێتی سۆڤیەت هەڕەشە بۆ سەر توركیا دروست ناكات...، بەدرێژایی ساڵان سۆڤیەت هیچ رەفتارێكی دوژمنكارانەی بەرامبەر توركیا پیشان نەداوە..."**[2].

ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا كاردانەوەی توركیا بە زیادەڕۆیی لەقەڵەمدا، لە 24ی حوزیرانی 1975 كیسینجەر وەڵامی یادداشتەكەی 17ی حوزیرانی 1975ی توركیای دایەوە و گوتی: **"كەس ناتوانێت هەڕەشە لە ئەمریكا بكات... هاوپەیمانانی ئەمریكا ئەگەر لە هاوپەیمانی مانەوە، كاریكی جوان بۆ ئەمریكا ناكەن..."**[3]. سەرەڕای ئەو لێدوانە كاركردەكانی بریاری توركی بۆ ئەمریكا بەخێرایی هات. بەكرداری چالاكییە ئەمریكییەكان لە چوار

(1) - نبيل حيدري، المصدر السابق، ص41–163.

(2) - ديغو بازوغلو سيزر، المصدر السابق، ص22.

(3) - كمال المنوفي، "التطورات الجديدة في السياسة الخارجية التركية"، مجلة السياسة الدولية (القاهرة)، السنة (12)، العدد 44، نيسان 1976، ص45.



بنكەی گرنگی سەربازی وەستێنران[1]، بوونی ئەمریكی بە رادەیەكی زۆر كەم بووەوە، لە 27 هەزارەوە لە ساڵی 1965 بۆ نزیكەی 6 هەزار لە ساڵی 1979[2]. بەهای یارمەتییە سەربازییە ئەمریكییەكان بۆ توركیا بۆ تەنها 130 ملیۆن دۆلار دابەزی، دوای ئەوەی تێكرای یارمەتییەكان دەگەیشتە 165 ملیۆن دۆلار بەدرێژایی ساڵانی نێوان 1950 تا 1974[3]. سەرباری ئەمەش بەردەوامبوونی گەمارۆكە بۆ ئەمریكا واتای لە دەستدانی خزمەتەكانی چوار دامەزراوەی سەرەكی سەربازی دەگەیاند، كە دەزگای هەواڵگری ئەمریكی بەهۆیانەوە، زانیاری بەبەهای لەبارەی یەكێتی سۆڤیەت كۆدەكردەوە، ئەركی ئەو بنكانە هەمەلایەن بوو، یەكەم چاودێری پابەندییەكانی یەكێتی سۆڤیەتی بە هەردوو رێككەوتننامەی رۆكێتە بالیستی و سنووردارکردنی چەكی ستراتیژی، دووەم چاودێریكردنی چالاكییەكانی سۆڤیەت لە رۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست و دەریای رەش و ناوچەكانی باشووری یەكێتی سۆڤیەت، سێیەم چاودێریكردنی تاقیكردنەوە رۆكێتییەكان و مانگە دەستكردەكان و تەقینەوە ناوەكییەكان. بەڵكو هەندێ مەزەندە بۆ ئەوە دەچوو كە لە 25٪ی ئەو زانیارییانەی لەبارەی سەكۆی هاوێشتنی رۆكێتە سۆڤیەتییەكانەوە بەدەست دەگەیشتن، لەو بنكانەی توركیاوە دەست دەكەوتن. هەندێ شیكەرەوە باسیان لەوە كردووە كە دامەزراوە سەربازییەكانی ئەمریكا لە توركیا 30٪ی زانیارییەكانی لەبارەی یەكێتی سۆڤیەت بۆ ئەمریكا كۆدەكردەوە.

بەڵام لە توركیا كاریگەری گەمارۆكە بەشێوەیەكی راستەوخۆ لەسەر لایەنی ئابووری و سەربازی رەنگی دایەوە، سەرباری رەنگدانەوەی لەسەر پەیوەندییە دەرەكییەكانی. سەبارەت بە لایەنی سەربازی ئەوا كاریگەری گەمارۆكە مەترسیدار و راستەوخۆ بوو، توركیا كە خۆی پیشەسازی جەنگی نەبوو، پێویستی بە دابینكردنی چەك لە وڵاتانی ئەورووپی دیكە لەناو پەیمانی ناتۆ

(1) – ريتشارد غريمت وآلن ليبسون، المصدر السابق، ص84.

(2) – ديغو بازوغلو سيزر، المصدر السابق، ص22.

(3) – نوبار هوفسبيان، المصدر السابق، ص287.

هەبوو، ئەمـەش واتـای وازهێنـان بـوو لـە پرۆگرامـی بوژاندنـەوەی ئـابووری بـۆ خـاتری بەدەسـتهێنانی پێویـستییە جەنگییـەکان، لـە سـاڵی 1975 خەرجییـە سەربازییەکانی تورکیا گەیشتە 21 ملیار لیرەی تورکی، بەکۆتایی هاتنی هەمان سـاڵ سـەرجەمی خەرجییـەکان بـۆ 27 ملیـار لـیرە بـەرزبووەوە. بەشـێوەیەك خــەرجی ســەربازی لــە ســاڵی 1976 رێــژەی 26٪ خەرجییــە گــشتییەکانی حکوومەتی تورکی پێکدەهێنا[1].

بەم شێوەیە لـە نیـوەی یەکـەمی دەیـەی حـەفتاکان ئـابووری تـورکی کـە پێـشتر لـە تەنگژەیـەکی توندـدا بـوو، بـەهۆی بەرزبوونـەوەی نرخـی نـەوت و تـەرخانکردنی بودجەیـەکی زیـادە بـۆ خـەرجی سـەربازی، تەگـەرەی گـەورەی بەهۆی دەرەنجامەکانی داگیرکردنی قوبرس و کێبڕکێکردن لەگەڵ یۆنان کـە لـە دژی تورکیـا خـۆی پڕچـەك دەکـرد، هاتـە پـێش. بـە کۆتـایی سـاڵی 1975 لـە دەرەنجامی ئەمە و لە سایەی زۆرکەمبوونەوەی بەرنامەی یارمەتی ئەمریکی بۆ تورکیا، داهاتی نەتەوەیی بە رێژەی 15٪ دابەزی، کورتهێنان لە کەرتی گشتیدا گەیشتە 8.8٪ ی بەرهەمی نەتەوەیی و ئاستی هەڵاوسانی دراو بە کۆتایی ساڵی 1978 گەیشتە نزیکەی لە 60٪، بێکاری بڵاوبووە و رێژەی لە 20٪ی قـەبارەی هێزی کارکەری پێکدەهێنا، لەهەمان کاتدا قەرزی دەرەکی گەیشتە نزیکەی 25 ملیـۆن دۆلار[2]. دەرەنجامـەکانی هـەموو ئەمانـە لەسـەر رەوشـی نـاوخۆ، کـە خراپبـوونی بـاری ئـەمنی و زۆربـوونی کێـشە کۆمەڵایەتییـەکانی بەخۆیـەوە دەبینی، زۆر گەورە بوو.

هەردوو وڵات دوای تێپەربوونی چـوار سـاڵ بەسـەر گەمارۆکـە لـە مەترسـی ئـەو رەوشەی کە پەیوەندییەکانیان پێـی گەیـشتووە، گەیـشتن، دانوسـتاندن لـە نێـوان هەردوولا لـەژێر پـەردە، بەرێوەچـوو، دەرەنجامەکـەی ئـەوەبوو، جیمـی کارتـەری

(1) – نبيل حيدري، المصدر السابق، ص175؛ احمد نوري النعيمي، تركيا وحلف شمال الأطلسي، المطبعة الوطنية، الأردن، 1981، ص283.

(2) - Erol Manisoli, "The Effects of the US Military Embargo on Turkish Economy", Foreign Policy, Ankara, 1975, Pp. 98-97. Via at: (www.Foreignpolicy.com.tr/archive);



Jimmy Carter(1977-1981) سـەرۆکی ئـەمریکا، (یاسـای یارمەتییـە ئەمنییـە نێودەوڵەتییەکانی) لە 8ی ئایاری 1978 پێـشکەش بـە کـۆنگرێس کـرد و لـە 26ی ئەیلولی 1978 دارشتنە یاساییەکەی وەرگرت، دوای ئـەوەی کـۆنگرێس پەسـندیان کرد و سەرۆکیش مۆری کـرد، بەمـەش کۆتـایی بـە گـەمارۆ سـەپێنراوەکە هـات[1]. بریارەکە لە لایەن حکوومەتی تورکییەوە پێشوازی لێکرا، لەلای خۆیـەوە رایگەیانـد کە رێگە بە ئەمریکا دەدات دووبارە بنکە سەربازییەکانی تورکیا بـۆ مـاوەی سـاڵێك لە 9ی تشرینی دووەمەوە بەکاربهێنێت[2].

هەرچەندە رێککەوتننامەی 1978 تاڕادەیەك پەیوەندییەکانی ئـەمریکا–تورکیـا خۆش کرد، بەڵام ئەوەی بە کردار و بەشێوەیەکی راستەوانە پێگەی تورکیای بەهێز کرد و گرنگییەکەی لای سەرکردە ئەمریکییەکان دوو هێندە کـردەوە، روودانـی دوو پەرەسەندنی ترسناك بوو لە هەرێمی دەوروبەری تورکیا، کە کەلێن و بۆشایی خستە نـاو زیـاتر لـە بـاڵێکی سیـستەمی ئـەمنی رۆژئـاوا، یەکـەم، پەرەسـەندنی یەکـەم هەڵگیرسانی شۆڕش بوو لە ئێران، کە دەسەڵاتی موحەمەد رەزا پەهلەوی رامالّی لە کانوونی دووەمی 1979 ئێرانی بەجێهێشت. بەڵام پەرەسـەندنی دووەم داگیرکـاری سۆڤیەت بوو بۆ ئەفغانستان لە 25ی کانوونی یەکەمی 1979. ئـەوەی یەکـەم هـەر تەنها رژێمیکی سیاسی دژ بە ئەمریکای بەرهـەم نـەهێنا، بـەڵکو ژمارەیـەك پێگـەی گوێهەڵخستن (تنـصت)ی گرنگـی تایبـەت بـە سـیخوریکردن بەسـەر تاقیکردنـەوە رۆکێتیەکانی یەکێتی سۆڤیەتی لە دەست دا، بەڵکو دوژمنداری رژێمی نوێی ئێرانی بۆ ئەمریکا، بەواتای چاودێریکردنی ئێرانیش دەهات[3]. بـەڵام رووداوی دووەم وایکـرد دووبارە جەنگی سارد بگەڕێتەوە، بە دیدی ئەمریکییـەکان، دووبـارە هاوپـەیمانێتی تورکی و هەڵکەوتی تورکیای ستراتیژی رۆڵێکی یەکلاکەلەرەوەی دەبێت[4].

(1) -Cemil Koçak and Gül lnanç Barkay, Op. Cit., P. 29.

(2) - لقمان عمر محمود احمد، المصدر السابق، ص83.

(3) - هنري جيه باركي، المصدر السابق، ص662.

(4) – هنري جيه باركي، المصدر السابق، ص ص663–662.

ئەو پەرەسەندنە گرنگانە شان بەشانی بەردەوامبوونی پەشێوییە ناوخۆیەکانی تورکیا لە سایەی حکوومەتە لاوازەکان کە سەرکردایەتییەکی باشی نەبوو، بەردەوام بوو[1]، لەسەرەتای حەفتاکانەوە کێشە ئابوورییەکان و هێز و چالاکی گرووپە چەپ و راستەکان بەشێوەیەکی مەترسیدار گەشەی دەسەند، کۆڵگەکانی رژێمی دەسەلاّتداری تورکی لاوازکرد، بەڵکو توندوتیژی سیاسی بووە راستییەکی حاشاهەلنەگر لە تەواوی سالاّنی حەفتاکان. سالاّنی دوای 1973 لە رووی ئابوورییەوە بە خراپترین سالّ دادەنرێن، بەهۆی بەرزبوونەوەی نرخی نەوت و پاشەکشەی ولاّتانی ئەورووپی لە داواکردنی دەستی کارگەری تورکی بەهۆی ئەو پوکانەوەیەی کە تووشی ئابووری ئەو ولاّتانە ببوو، هەروەها گەمارۆی ئەمریکی لەسەر هاوردەکردنی چەك بۆ تورکیا لە شوباتی 1975 و سزا ئابوورییە ئەورووپەکان، کە دوای داگیرکاری تورکی بۆ قوبرس سەپینرابوون، ئەمە سەرباری تێچوونی سەربازی لە داگیرکاری باکووری قوبرس، ئەرکی ئابووری تورکی دوو هیند کردەوە[2]. لەبەرامبەردا حکوومەتە تورکییە یەك بەدوای یەکەکان بەدەستهێنانی دەنگی دەنگدەران و دەسەلاّت بەدەستەوە گرتنیان لە گرتنەبەری سیاسەتێکی ئابووری وا کە تورکیا لە تەنگژەی ئابووری بهێنێتە دەر، پێ باشتر بوو. شەپۆلی تیرۆر و کوشتنی تاکەکانی دەستەبژێری سیاسی لە هەموو توێژێك و بەردەوامی هێزی تیرۆر تا کۆتایی حەفتاکان، تا وایلێهات رێژەی پرۆسەکانی کوشتن لە رۆژێکدا دەگەیشتە 20 قوربانی، هەروەها وایلێهات هەندێ کەسایەتی دیاری وەك نیهاد ئایرەمی سەرۆك وەزیرانی پێشوو و کەمال تورگلەری سەرۆکی سەندیکاکانی کرێکارانی شۆرشگێر ببنە ئامانجی بکوژەکان[3]. ترسناکترین لایەنی ئەو

(1) - فيروز احمد، صنع تركيا الحديثة، ترجمة سلمان داود الواسطي وحمدي حميد الدوري، بيت الحكمة، بغداد، 2000، ص396.

(2) - روجر اوين، الدولة والسلطة السياسية في الشرق الأوسط، ترجمة: عبدالوهاب علوب، المجلس الأعلى للثقافة، القاهرة، 2004، ص 145.

(3) - فيروز احمد، صنع تركيا الحديثة، ص ص397–394.



دەرەنجامە دابەشبوونی پۆلیس و هێزی ئاسایش خۆی بوو بۆ دوو گرووپ، یەکێکیان پالّپشتی لە راسترەوی نەتەوەیی توندرەو دەکرد و ئەوەی دیکەیان لە چەپرەو دەکرد، ئەمەش وایکرد جێبەجێکردنی یاسا کارێکی ئەستەم بێت[1].

لەگەڵ بەردەوامی باری نالەباری سیاسی و زۆربوونی توندوتیژی سیاسی و خوێنرێژی و بێ توانایی حکوومەتە یەك بەدوای یەکەکانی تورکیا بۆ دانانی سنوورێك بۆ رەوشە نالەبارەکە، لە ئێرانیش حالّەتی شۆرشگێری گرگرتوو، لە بەرزبوونەوەدا بوو، بالّیۆزخانەی ئەمریکا لە تاران لە 4ی تشرینی یەکەمی 1979 داگیرکرا. تورکیا بەو پێیەی کەوتۆتە رۆژئاوای ناوچەکە، گرنگییەکی یەکلاکەرەوەی لە ستراتیژی پەیمانی ناتۆ هەیە. دەستتێوەردانی سۆڤیەت لە ئەفغانستان کۆتایی بە ماوەی کرانەوەی لە کوتاییەکانی هەفتاکاندا و ئاماژەیەك بوو بە دەستپێکردنی **"شەری ساردی دووەم"**[2]. ئەمەش هەلۆیستی ستراتیژی تورکیای لە پەیمانی ناتۆ بەهێز کرد، هەرچەندە کەمینەیەك لە شارەزایانی رۆژئاوایی لەو باوەرەدابوون کە تورکیا بەو رەوشەی هەیەتی لە توانای دا هەیە ئەرکەکانی خۆی بەجێبهێنێت[3].

ئەمریکا کە چاودێری باری پەشێوی و توندوتیژی سیاسی بەردەوامی تورکیای دەکرد، نوێنەرێکی تایبەتی وەزارەتی دەرەوەی ماتیو نیمیتز Mathew Nimitz لە 8ی کانوونی دووەم 1980 بۆ ئەنقەرە نارد، ئەمەش بەمەبەستی تەواوکردنی رێوشوێنە کۆتاییەکانی هەردوو رێکەوتننامەی بەرگری و هاوکاری هاوبەش نێوان هەردوو لا. دوای راوێژی نێردراوی ئەمریکی لەگەڵ دێمیرێل، یەکەمیان لەوەگەیشت کە دووەم هێشتا لە مەترسی رەوشەکە نەگەیشتووە، بەتایبەتی دوای دیمیریل لە وەرگرتنی بیرۆکەی رێگەدان بە ئەمریکا بۆ بەکارهێنانی بنکە تورکییەکان لەلایەن هێزەکانی دەستتێوەردانی

(1) - المصدر نفسه، ص384.

(2) – فيروز احمد، صنع تركيا الحديثة، ص392.

(3) – المصدر نفسه، ص392.

رارا و نارازی بوو، ئەو هێزانەش خێراوە–Rapid Deployment Forces[1] بابەتی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە بوون لە واشنتۆن، سەربارى ئەوەش ئامادە نەبوو هیچ سازشێك لەمەڕ گەڕانەوەی یۆنان بۆ پەیمانی ناتۆ بکات، ئەگەر بۆ ماف کەشتیوانی لە دەریای ئیجە[2] بۆ تورکیا سازش نەکرێت. لەسەر ئەم بنەمایە نیمیتز ئەم دیدگایەی خوارەوەی لەبارەی حکومەتی تورکی بۆ وڵاتەکەی گواستەوە: **"تورکیا لە سایەی حکوومەتی ئێستای شیاوی ئەوە نییە ئەو رۆڵە هەرێمایەتییەی کە واشنتۆن بۆی دیاری کردووە، بگێڕێ"**[3]. سەربارى ئەمەش هەردوولا دارشتنی کۆتایی ریککەوتنی (هاریکاری بەرگری و ئابووری هاوبەش– Defence and Economic Cooperation Agreement) لە ئەنقەرە لە 29ی ئازاری 1980 مۆرکرد. رێککەوتنەکە بە گشتگیر دەناسرایەوە، هەموو لایەنەکانی پەیوەندییە دوو قۆڵییەکانی لە خۆگرتبوو، چ ئابووری یا پیشەسازی و هاوکاری زانستی و تەکنیکی و پرۆسەی بوژاندنەوەی تورکیا[4]. شایەنی باسە ئەو رێککەوتنە نەچووە بواری جێبەجێکردنەوە تا دوای کودەتای سەربازی ئەیلولی 1980 نەبێت.

لەسەر ئاستی ناوخۆ هەموو ئەو رێوشوێنانەی (1979/11/12–1980/9/12) حکوومەتەکەی دیمیریل گرتیەبەر و هەموو ئەو بەڵێنانەی بۆ کۆتایی هێنان بە دوو شەڕەکە **"تیرۆر و هەڵاوسان"** دابووی سەرنەکەوت،

(1) – هێزی بڵاوبوونەوەی خێرا: هێزێکی تایبەتییە ئەمریکا بە ئامانجی دەستتێوەردانی خێرای سەربازی بۆ بەرە گەرمەکانی جیهانی سێیەم دروستی کردووە، بەتایبەتی لە دوورگەی عەرەبی و ئەمریکای لاتینی. لە حوزەیرانی 1979 دوای رووخانی رژێمی شا لە ئێران دروستبوونی راگەیەنراوە، لە 110 هەزار رەگەزی هەڵبژێردراوی کەتیبەی پەڕەشوتوانی دووەم و هەشتەم پێکهاتووە. ئەوانە بۆ دەستتێوەردان لە هەر شوێنێك کە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا بکەوێتە مەترسییەوە ئامادەن. ینظر: عبدالوهاب الکیالي وکامل الزهیري، المصدر السابق، ج4، ص ص817–818.

(2) - Omer Goksel Isyar, Op. Cit., Pp. 29-28.

(3) - فیروز احمد، المصدر السابق، ص393.

(4) - Fahir Armaoglu, A.G.E, SS. 302-300.



بەڵکو رەوشەکە لە خراپەوە بەرەو خراپتر دەچوو، هەروەها ئەحکامە لە ناکاوەکانیشی کە بەهۆیەوە دەستی سەرکردە سەربازییەکانی لە دۆزینەوەی رێگاچارە بۆ گرفتەکان ئاوەڵاکرد، سەرنەکەوتن، تیرۆر نزیکەی 1500 کوژراوی دروێنەکرد. وەستانی گەشەی ئابووری بەردەوام بوو، بێکاری زۆر ببوو، رێژەکانی هەڵاوسان لە بەرزبوونەوەدا بوو[1]. سەرنەکەوتنی پەرلەمانی تورکی لە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمارێکی تازە بۆ وڵات لە شوێنی فەخری قورتوك Fahri Koruturk کە لە نیسانی 1980 کۆتایی بە دەسەڵاتی هات، رەوشەکەی زیاتر ئاڵۆزکرد[2].

ئەم رەوشە رێگەی بۆ سوپا خۆشکرد دەستتێوەردان بکات و کودەتا ئەنجام بدات، ئەمەش بە سێیەم کودەتا دوای کودەتاکانی 1960 و 1971 دادەنرێت، لە سپێدەی رۆژی هەینی ریکەوتی 12ی ئەیلولی 1980، بەیاننامەیەکی سەربازی لە رێگەی رادیۆی نیشتمانی بە ناوی ژنەرال کەنعان ئەڤرەن-Kenan Evren[3]ی سەرۆك ئەرکانی تورکیا خوێنرایەوە. رایگەیاند عەسکەر دەسەڵاتی بەدەستەوە گرتووە و سەرۆکی وەزیران سلێمان دیمیریل و بولەند ئەجەویدی سەرۆکی ئۆپۆزسیۆن و زیاتر لە 100 کەسایەتی سیاسی دەست بەسەر کراون و ئەنجوومەنی نیشتمانی (پەرلەمان) هەڵوەشێنراوەتەوە و ئەحکامی عورفی سەپێنراوە و دەستوور هەڵپەسێردراوە[4].

زۆربەی توێژەران و پسپۆران و ژمارەیەك کەسایەتی نزیك لە ناوەندی بڕیاری ئەوسای تورکیا بۆ ئەوە دەچن کە ئەوەی پاڵی بە ژەنەراڵەکانەوە نا کە

(1) - فیروز احمد، المصدر السابق، ص ص403–402.

(2) - فاروق ابو ظهر، ترکیا: "هل تعود الجزمة الى الثکنة"، مجلة الوطن العربي، بیروت، العدد188، السنة9، 25 ایلول 1980، ص ص14–13.

(3) – سەرۆك ئەرکانی سوپای تورکی بوو، سەرۆکایەتی کودەتای 1980ی کرد، بووە سەرۆکی دەوڵەت و حوکمی سەربازی سەپاند، دواتر لە کانوونی یەکەمی 1982 تاکو تشرینی یەکەمی 1989 بووە سەرۆك کۆمار. جلال عبدا لله معوض، صناعة القرار في ترکیا والعلاقات العربیة–الترکیة، مرکز دراسات الوحدة العربیة، بیروت، 1998، ص ص 24–25.

(4) - Douglas A. Howard, The History of Turkey, Greenwood Press Westport, Connecticut, London, 2001, P. 159.

کودەتا بکەن حاڵەتی باری توندوتیژی سیاسی و خوێنڕێژی نەبوو، بەڵکو هەستکردنیان بوو بە باری نا ئارامی لە تورکیا، دوای هەڵگیرسانی شۆڕش لە ئێران و داگیرکردنی سۆڤیەتی بۆ ئەفغانستان، ئەمەیان بە فشاری ڕۆژئاواوە گرێدا[1]، هەندێکیش ئاماژە بە تێوەگلانی ڕاستەوخۆی دەزگای هەواڵگری ئەمریکی لە کودەتاکە دەزانن[2]، ئەوەی لێرەدا دەتوانرێت دڵنیا بکرێتەوە، ئەوەیە کە هەواڵی کودەتاکە لەلایەن سیاسەتمەدارانی ئەمریکا بە خۆشحاڵییەوە پێشوازی لێکرا، ئەو خوشحاڵی و پێشوازیکردنە لە بەیاننامە فەرمییەکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ڕەنگیدایەوە کە لە ڕۆژی کودەتاکە دەرچووە و ئاماژەی بەمەوە کردووە کە **"لە کودەتاکە خوێنڕێژی نەبووە و هاووڵاتیان و بەرژەوەندییە ئەمریکییەکان لە مەترسی دا نییە..."**[3].

وەرگرتنی دەسەڵات لەلایەن ژەنەراڵەکانەوە بە سەردەمێکی نوێ لە سیاسەتی دەرەوەی تورکیا دانرا، سەبارەت بە پەیوەندی بە واشنتۆنەوە، ئەوا لەسەر بنەمایەکی بەهێزتر و پتەوتر هاوپەیمانی[4] دامەزرانەدن. **"ڕێککەوتننامەی هاوکاری بەرگری و ئابووری هاوبەشی ساڵی 1980"** دەربڕی پلەی کەڵەکەبوون و بەرزبوونەوەی هاوپەیمانی نێوانیانە، ئەو ڕێککەوتننامەیە شتی دیکەی لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتی کە بۆ پەیوەندی هاوپەیمانییەتی کلاسیکی نێوان ئەمریکا–تورکیا گرنگە، زیاد کرد، کاریگەرییەکەی دواتر لەسەر نەخشەی سیاسی ناوچەکە ڕەنگی دایەوە، بەشێوەیەک کەوتە خزمەتی بەرژەوەندی و ئامانجە هاوبەشەکانی تورکیا – ئەمریکا[5].

یەکەم ئاماژەی پەرەسەندنی گەورە لە پەیوەندییەکانی ئەمریکا–تورکیا بە سەردانی هەریەکە لە کاسپار واینبرگر –C. Weinberger، وەزیری بەرگری

(1) - ینظر: فیروز احمد، صنع ترکیا الحدیثة، ص391.
Sabri Sayari, Op. Cit., Pp. 30-31

(2) - Çetin Yetkin, A.G.E., SS. 203-171

(3) - Fahir Armaoglu, A.G.E, S. 4-3.

(4) - Sabri Sayari, Op. Cit., Pp. 31-30.

(5) – نبیل حیدري، المصدر السابق، ص166.



ئەمریکی و ئەلیکساندەر هیگ–A. Haig، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ تورکیا لەماوەی 10 ڕۆژدا، بەدەر دەکەوێت.

سەردانەکەی کاسپار واینبرگر کە لە کانوونی یەکەمی 1981، 4 تا 6 ڕۆژی خایاند، لە شوێنی داننان بوو بە ڕژێمی سەربازی و هەڵسوکەوتەکانی لە گێرانەوەی سیستەم و دیموکراسی، کاسپار واینبرگر لە کۆتایی سەردانەکەی ڕایگەیاند **"ئیمە وای دەبینین کە مافەکانی مرۆڤ لە ژینگەیەکدا کە سیستەم و یاسا تێدا سەروەر نەبێت ناتوانرێت گەشە بکات. سەرسورمانی خۆم بۆ توانای حکوومەتی تورکی دەربڕی لەسەر ئەوەی کە زۆری بۆ لەناوبردنی باری پەشێوی و تیرۆری بەربڵاو"**[1]. بەرپرسە پایە بەرزەکەی ئەمریکا لە ئەنقەرە ڕایگەیاند کە گەیشتوونەتە ڕێککەوتننامەیەک سەبارەت بە پێکهێنانی کۆبەندی بەرگری هاوبەش بۆ **"فراوانکردن و باشکردنی هاوکاری بەرگری"**، بە گوێرەی ئەو ڕێککەوتننامەیە ئەمریکا و ڕۆژئاوا یارمەتی گەورە پێشکەشی تورکیا دەکەن، بە ئامانجی بوژاندنەوەی ئابووری و بەدیهێنانی ئارامی سیاسی ناوەخۆ، بۆئەوەی تورکیا بتوانێ ڕۆڵی خۆی لەسەر هەردوو ئاستی سەربازی و ستراتیژی بگێڕێ[2]. لەسەر ئەمە ئەمریکا یارمەتییەکانی بۆ تورکیا زیادی کرد، لەماوەی نێوان 1977 تا 1980 یارمەتییە ساڵانەییەکانی ئەمریکا لە 125 ملیۆن دۆلار بۆ 175 ملیۆن دۆلار و دواتر بۆ 225 ملیۆن و 450 ملیۆن بەدوای یەکدا زیادی کرد[3]. لە بواری سەربازی ئەمریکا پرۆگرامی تەواو و درێژی بۆ نوێکردنەوەی توانا سەربازییەکانی تورکیا بەتایبەتی بۆ هێزەکانی دەریایی و ئاسمانی خستەگەڕ. بۆندی لەگەڵ ئەلمانیای ڕۆژئاوا بۆ بونیادنانی کەشتی

(1) – نوبار هوفسبیان، المصدر السابق، ص281؛ سالار اوسي ویوسف إبراهیم الجهماني، ترکیا وأمریکا: من الأقطاب المتعددة الى نظام القطب الواحد، ملفات ترکیة، دار حوران، دمشق، 2000، ص ص25–26.

(2) - نوبار هوفسبیان، المصدر السابق، ص289.

(3) - نوبار هوفسبیان، المصدر السابق، ص ص290–289؛ سالار اوسي یوسف إبراهیم الجهماني، المصدر السابق، ص79.

جەنگی دەریایی پیشکەوتوو بەبەهای 375 ملیۆن دۆلار مۆرکرد، لە بواری هێزی ئاسمانیدا ئەمریکا ڕێگەی بە تورکیا دا کە فڕۆکەی شەڕکەری لە جۆری F-16دا هەبێت، لەسەر ئەم بنەمایە لە دەیەی نەوەدەکان کۆمپانیای ژەنەراڵ داینمکس– General Dynamicsی ئەمریکی بەرهەمهێنی ئەم جۆرە فڕۆکەیە بۆندیکی بۆ پێدانی 160 فڕۆکەی F-16، بەهای بۆندەکە گەیشتە 4 ملیۆن دۆلار[1].

ئەمریکا لە ماوەی حوکمی عەسکەردا 1980–1983 کاری بۆ ئامادەکردنی تورکیا کرد، بۆئەوەی سەرلەنوێ شوێنی خۆی لە سیستەمی ئەمنی ڕۆژئاوا و ناتۆدا بگریت، لەپێناوی ئەمەدا بەرنامە چڕوپڕەکانی و یارمەتییە زۆرەکانی و بۆ پاڵپشتیکردن لە توانا سەربازییەکانی تورکیا، لەو دیدگایەوە هەڵقوڵاوە کە **"تورکیا هاوپەیمانێکی باوەڕپێکراوی هەستیاری بەرژەوەندییەکانی ئەمریکایە لە ناوچەکە"**[2]. ئەمەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە تورکیا شوێنی سروشتی و گرنگی خۆی لە پەیمانی ناتۆدا بەخێرایی وەرگرتۆتەوە، حکوومەتی سەربازی ئەیڤرین بە پەرۆشەوە پاڵپشتی لە پرۆژەی **"پشتێنەی سەوز"** کرد، کە تایبەتە بە وڵاتانی میانڕەوی ئیسلامی لەبارەی یەکێتی سۆڤیەتی[3]. تورکیا لە گەڕانەوەی یۆنان بۆ پەیکەری سەربازی پەیمانی ناتۆ بێ مەرج بێ بەرامبەر نارازی نەبوو[4]. هەروەها پاڵپشتی خۆی بۆ پرۆژەکانی ئەمریکا لە بەرگری کردن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دوورگەی عەرەبی دژی سۆڤیەت ڕاگەیاند، وەکو پرۆژەی **"هێزی بڵاوبوونەوەی خێرا"**. بەکورتی سیاسەتی ئەمریکا لە ماوەی دوو کودەتاکە لە دروستکردنی **"دیواری کۆنکریتی"** لە دژی سۆڤیەت سەرکەوتوو بوو[5].

---

(1) – للتفاصيل ينظر: نبيل حيدري، المصدر السابق، ص ص170–169؛ لقمان عمر محمود احمد، المصدر السابق، ص ص134–133.

(2) -Omer Goksel Isyar, Op. Cit., P.30.

(3) - Soli Özel, Op. Cit., P. 110.

(4) - فيروز احمد، المصدر السابق، ص393.

(5) -Omer Goksel Isyar, Op. Cit., P. 31



ئەنجامەکانی هەڵبژاردنە گشتییەکانی تورکیا کە لە 6ی تشرینی دووەمی ساڵی 1983 ئەنجامدرا، قۆناغێکی نوێی لە مێژووی تورکیای لەگەڵ خۆی پێچایەوە، لەوماوەیەدا دووبارە دارشتنەوەی پەیکەری ڕژێمی سیاسی و سیاسەتی دەرەوەی بەخۆیەوە بینی[1]، ئەنجامەکانی ئەو هەڵبژاردنە، بەدەسهێنانی ڕێژەی 45.15 ٪ ی دەنگەکانی بۆ پارتی نیشتمانی دایک Ana Vatan Partisi[2] بە سەرۆکایەتی تورگوت ئۆزال[3] و بەدەستهێنانی 211 کورسی پەرلەمانی لێکەوتەوە، واتا لە 53٪ی کورسییەکان، پارتی گەل[4]

---

(1) -Muhitin Ataman, "Leadership Change: Ozal Leadership and Restructuring Turkish Foreign Policy", Alternatives Turkish Journal of International Relations, vol.1, No.1, spring 2002, Pp.131-134.

(2) – لە ئایاری 1983 بەسەرۆکایەتی تورگوت ئۆزال و کۆمەڵێ برادەری خاوەن پۆستی حکوومی دامەزراوە، ئەوانە بە مەیلی ڕاسترەو ڕۆلیان لە کودەتای 1980 دەناسرانەوە، بەرنامەی هەلبژاردنی حیزبەکە جەختی لەسەر کەرتی تایبەت وەك بنەمای پەرەسەندنی ئابووری تورکیا و دەستتێوەرنەدانی تورکیا لە چالاکییە بازرکانی و پیشەسازییەکانی وڵات دەکردەوە، لەپاڵ هاندانی بیرۆکەی بازاڕی ئازاد و روکارکردنی ئابووری، سیاسەتی دەرەوەیان بە لایەنگری و پاراستنی ئاستیکی بەرزی گرێدان بوو بە ڕۆژئاوا و ئەمریکا. M. Serhan Yucel, A.G.E., Ss. 56-57.

(3) – ئەندازیارێکی بەنداو بووە و لە زانکۆکانی ئەمریکا دەرچووە، سەرۆك وەزیرانی تورکیا بوو لەماوەی (1983–1989) هەروەها سەرۆکی کۆمارەکەی هەشتەمی (1989–1993) لە ئایاری 1983 پارتی نیشتیمانی دایکی دامەزراند، هەر لەو بەروارەوە جلەوی هاوسەنگییەکانی نێوان لاباڵە جیاوازەکانی پارتەکەی بەدەستەوە گرتووە، چ کەس وەکو ئەو لە دوای تەتاتورکەوە کاریگەری لەسەر سیاسەتی تورکیا دانەناوە، بەشێوەیەك دەتوانریت ماوەی (1983–1993) بە دەیەی ئۆزالیزم لەسیاسەتی تورکی ناوبەرین، ئۆزال خەسڵەتی کەسایەتی کاریزمی وەکو تەتاتورکی هەبوو. (www.cankaya.gov.tr/eng_html/ozal.html).

(4) – بەسەرۆکایەتی نەجدەت تالب ساڵی 1983 دامەزراوە، پارتێکی چەپی میانەرەوە، بە پلەی سەرەکی لە ڕۆشنبیران و بیریارانی کاریگەر بە ئایدیۆلۆژیای کەمالی پێکهاتووە، ئەو حیزبە لە ڕێگەی وەرگرتنی بیری کەمالی ویستی دەنگدەرانی پارتی گەلی کۆماری لە خۆی کۆبکاتەوە، هەروەها پەیوەندی بە سەرکردەکانی کودەتاکەی 1980ەوە کرد.

M. Serhan Yucel, A.G.E., S. 69 .

30.46٪ی دەنگەکان، 117 کورسی واتا 29٪ ی کورسییەکان، بەڵام پارتی دیموکراتی نیشتیمانی Milli Demokratik Partisi[1] 23.27٪ی دەنگەکان و 71 کورسی لەپەرلەمان، واتا 17.72٪ی کورسییەکان، بەگوێرەی دەرەنجامەکانی هەڵبژاردنەکان، دوای کودەتای ساڵی 1980 تورگوت ئۆزال بووە یەکەم سەرۆك وەزیرانی مەدەنی[2].

پێشوازی ئەمریکا و رۆژئاوا لە حکوومەتە مەدەنییەکەی ئۆزال ئامانج لێی گەڕانەوەی سەرلەنوێی ژیانی دیموکراتی نەبوو بۆ تورکیا، بەڵکو مەبەستی خودی کەسایەتی ئۆزال بوو، کە لە نێوەندە رۆژئاوایی و ئەمریکییەکان بەوە ناسرابوو، کە پەرۆشی گرێدانی تورکیایە بە رۆژئاوا و ئەمریکا نەوەك تەنها لەڕووی سەربازییەوە بەڵکو لە رووی ئابووری و بازرگانی و کەلتووریشەوە[3]، پاڵپشتی ئەمریکا لە میانەی هەڵبژاردنەکان بۆ ئۆزال شاراوە نەبوو، رۆژنامەی (وۆل ستریت جورنال– Wall Street Journal) بابەتیکی بڵاوکردەوە، لەبەشێکی ئەمە هاتبوو: **"ئەگەر رێگە بەئۆزال نەدرێت بەشداری هەڵبژاردنەکان بکات ئەوا ئیدارەی ئەمریکی لە عەسکەر رازی نابیت"**[4]، تەنها دوای دوو رۆژ لە هەڵبژاردنەکانی تورکیا وتەبیژ بەناوی کۆشکی سپییەوە رایگەیاند کە

---

[1] – بەسەرۆکایەتی ژەنەراڵی خانەنشینکراو تورگوت سون ئەلب لە ئایاری 1983 دامەزراوە، پارتێکی راسترەوی لایەنگری ئەو دەسەڵاتە سەربازییەیە کە لە کودەتای 1980 هاتە دەسەڵات، بە حیزبی دەسەڵاتدار دادەنرێت چونکە پاڵپشتی دارایی راستەوخۆ لە سەرۆك کۆمار و ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی وەردەگرێت.

[2] -Meliha Benli AltuniŞik and Özlem Tür, Turkey: Challenges of Continuity and Change, Rutledge Curzon, London and New York, 2005, Pp.46-47.

[3] - فيروز احمد، " تورگوت أوزال: العبقرية الاقتصادية"، في: نوبار هوفسبيان (تحرير)، تركيا بين الصفوة البيروقراطية والحكم العسكري، ص277.

[4] -YALIM ERALP, "An Insider's View of Turkey's Foreign policy and It's American Connection", in Morton Abramowitz (Ed), The United states and Turkey: Allies in Needs, Century foundation press. New York, 2003, P. 113.



**"ئەمریکا متمانەی تەواوی بە حکوومەتی نوێی تورکی بەسەرۆکایەتی تورگوت ئۆزال هەیە، بتوانێ ئەو دەستکەوتانە بهێنیتە دی کە تورکیا پێویستیەتی، ئەمریکاش ئامادەیە پاڵپشتی پێویستی لێبکات، لەم رێرەوەدا واشنتۆن هەوڵی هاوکاری توند لەگەڵ حکوومەتی نوێی ئەنقەرە دەدات و هەوڵی توندکردنی پەیوەندییە دوو قۆڵیەکانی نێوان هەردوو وڵات دەدات"**[1].

ئەگەر ماوەی نێوان (1980–1993) بە **"قۆناغی چاککبوونەوە"**، لە پەیوەندییەکانی تورکیا – ئەمریکا لەقەڵەم بدرێت، ئەوا ئەو ماوەیەی (1983–1989) کە ئۆزال هەردوو حکوومەتەکەی تێدا دروست کرد و دواتر بووە سەرۆك کۆمار (1989–1993)، بوژاندنەوە و جۆرایەتی لە پەیوەندییەکان بەخۆیەوە بینی و لەماوەی تەنگژەی جەنگی دووەمی کەنداودا (ئابی 1990–شوباتی 1991) گەیشتە لوتکەی پەرەسەندن و بەم شێوەیە تا کۆچی دوایی ئۆزال لە 17ی نیسانی 1993 بەردەوام بوو[2].

سەردانە چڕوپڕەکانی گەورە بەرپرسانی تورکی، بە ئۆزالیشەوە بۆ واشنتۆن، رەنگدانەوەی ئاستی ئەو پەرەسەندنە بوو کە پەیوەندییەکانی ئەمریکا–تورکیا پێیگەیووە، چوار سەردانەکەی ئۆزال لەماوەی سەرۆکایەتی وەزیران و سەرۆك کۆماریدا بۆ ئەمریکا، بۆ دامەزراندنی پەیوەندی ئابووری و بازرگانی کەلتووری بەس بوو، سەرباری بەهێزکردنی پەیوەندییە سەربازییەکان و بەرنامەی پێشووی یارمەتییەکان، بەڵکو خودی ئۆزال پەیوەندی برادەرایەتی لەگەڵ جۆرج بۆشی باوك (1989–1992)[3] دروستکرد. دوای

---

[1] - لقمان عمر محمود احمد، المصدر السابق، ص 138.

[2] -Kemal Krişci, Op. Cit., P. 132.

[3] - یەکەم سەردانی ئۆزال بۆ واشنتۆن لە نیسانی 1985 بوو و 10 رۆژی خایاند، دوای سەردانەکەی نیهاد ئەریمی سەرۆك وەزیرانی پێشووتری تورکیا لە ساڵی 1972 یەکەم سەردانی بەرپرسێکی تورکی بوو لەو ئاستە بۆ ئەمریکا، هەرچ سەردانی دووەم بوو لە کانوونی دووەمی 1988 لەسەروبەندنی هەڵبژاردنی جۆرج بۆشی باوك بوو، بوو. بەڵام سەردانی سێیەم لە ناوەڕاستی شوباتی 1990 بوو، بۆ گفتوگۆکردنی بریاری کۆنگرێسی ئەمریکی سەبارەت بە=

ئەوەی لەسەرەتای نیوەی دووەمی چلەکانەوە گەشە و پوکانەوەی بەخۆیەوە بینی، پەیوەندییەکانی ئەمریکا—تورکیا لەم ماوەیەدا ئارامی بەخۆوەگرت و گەیشتە قۆناغی پێگەییشتن و چووە قۆناغێکی نوێ کە لەسەر **"هاوبەشی هەمەجۆر"** بونیاتنراوە، کە بە هاوکاری لە بورای سەربازی و سیاسی و دیبلۆماسی دەست پێدەکات و بۆ هاوبەشی ئابووری درێژدەبێتەوە، ناوی (هاوبەشی لوتکە Enhanced Partnership)ی لێنرا[1].

یەکێ لە گەورە ژەنەراڵەکانی ئەمریکا تێڕوانینی ئەمریکی بۆ رۆڵی تورکیا لە کۆتایی هەشتاکان بەم شێوەیە وەسفکردووە **"بۆ تێگەیشتن لە تورکیا، پێویستە مرۆڤ وا خۆی مەزەندە بکات، لەگەرەکێکی زۆر خراپدا دەژێت. هیچ ئەندامی ناتۆ نییە وەك تورکیا رووبەرووی ژمارەیەك هەڕەشە و گرفت ببێتەوە"**[2].

لە بواری سەربازیدا، ئەمریکا هەڵسەنگاندنەکەی بۆ گرنگی و رۆڵی نوێی تورکیا لە ناتۆ و پلانە رۆژئاواییەکان، بۆ واقیع کۆڕی، زیاتر لە پێویستی و داواکارییە سەربازییەکانی تورکیا گەیشت، لەم رێڕەوەدا دووبارە دانوستاندن لە بارەی بەلێننامەی (هاوکاری بەرگری و ئابووری) سازکرا، کە لە ئازاری

=جینۆسایدی ئەرمەن بوو، سەردانی چوارەم و کۆتایی لە ئەیلولی 1990 کە تایبەتکرا بوو بۆ گفتوگۆی پرسی داگیرکاری عێراق بۆ کوێت. هەوڵەکانی ئۆزال لەم چوار سەردانەی بۆ گەشەدان بە هەمەجۆر پەیوەندی و بەیەکەوە گرێدان بوو لەگەڵ ئەمریکا، بەتایبەتی پەیوەندی ئابووری، هەروەها بەشێکیشی بۆ بەرپەرچدانەوەی لۆبیە ئەرمەنی یۆنانییەکان بوو، هەروەها کەمکردنەوەی رەخنەکانی وڵاتان لەبارەی دۆسیەی مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا. لە راستیدا ئۆزال زۆربەی ئەنجامە خواستراوەکانی سەردانەکانی بەدەستهێنا. للتفاصيل، ينظر: لقمان عمر محمود احمد، المصدر السابق، ص ص 139—153؛ نبيل محمد سليم يونس، تطور العلاقات التركية—الامريكية في ظل المتغيرات الدولية المعاصرة، اطروحة دكتوراه مقدمة الى مجلس كلية العلوم السياسية، جامعة بغداد، 1997، ص164.

(1) -Rachel Prager, Op. Cit., P. 6.

(2) -Omer Karasapan, Turkey and US Strategy in the Age of Glasnost, Middle East Report, September, October 1989, No.160, P.6.



1980 مۆرکرابوو، لە کانوونی یەکەمی 1985 کۆتایی هاتبوو، ئەو دانوستانانەی کە ماوەی زیاتر لە ساڵێکی خایاند، وایکرد بەلێننامەکە بۆ ماوەی پێنج ساڵی دیکە درێژ بکرێتەوە تا کانوونی یەکەمی 1990 بخایەنێ، بەگوێرەیەوە ئەمریکا ئاسانکاری سەربازی و هەوالگری نوێی لە تورکیا چنگ کەوت، لەنێوانیان دامەزراندنی 12 بنکەی نوێی سەربازی[1]، سەبارەت بە تورکیا، ئەوا بەڵێنی لە ئەمریکا وەرگرت کە پاڵپشتی لە هەوڵەکانی بۆ لەناوبردنی تیرۆر و هەر هەوڵێك کە دەبێتە هۆی پاڵپشتیکردن لە بزووتنەوە تیرۆریستییەکان، بکات[2].

سەربازی بەرەڵڵاکردنی بەرنامەی یارمەتیدان و هاوکاری و نوێکردنەوەی هێزە چەکدارەکانی تورکیا، بەکردەوە کۆمپانیا تورکییەکان لە بەرهەمهێنانی سیستەمی جۆراوجۆری چەك بەشداری پێکران، بە دامەزراندنی کارگەیەك بۆ فڕۆکەی F-16 لە ئەسکیشەهر، دامەزراندنی کارگەی گەیاندن و پەیوەندی و ناردنی هەستیاری ژمارەیی، مۆڵەت بە پیشەسازی میکانیکی و کیمیایی تورکی درا کە سەکۆی رۆکیتی FFAR [3] بەرهەم بهێنێ. هەروەها تورکیا لە ساڵی 1990 ەوە بە هەماهەنگی لەگەڵ پەیمانی ناتۆ، چەکی پیشکەوتووی ئەمریکی، لە تانك و فڕۆکەی هێرشبەری ستوونی و رۆکێتی زەوینی—ئاسمانی، بە تورکیا داوە، هەروەها وەزارەتی بەرگری ئەمریکی بۆ بونیادنانی پرۆژەیەکی نوێی ناوەکی لە ئەدەنە[4]، بری 3.7 ملیۆن دۆلاری تەرخانکرد، لەماوەی نێوان 1980—1989 بری یارمەتییە سەربازییەکانی ئەمریکا گەیشتە 4790 ملیۆن دۆلار، کە 3022 ملیۆن دۆلاری بەشێوەی قەرز بوو، 1768یشی بەشێوەی بەخشین بوو[5].

(1) - نديم البـتكين، تركيا: بوابة إستراتيجية للإمبريالية العالمية، الحقيقة برس، لندن، 1987، ص32.

(2) -FAhir ARMAGLU, A. G. E., S. 371.

(3) -Muhittin Ataman, Op. Cit., P. 145.

(4) - ينظر: لقمان عمر محمود احمد، المصدر السابق، ص 166.

(5) - سالار اوسی ويوسف إبراهيم الجهماني، المصدر السابق، ص 79.

ئەوەی حکوومەتی سەردەمی ئۆزال لە حکوومەتەکانی دیکە جیادەکاتەوە، جۆراوجۆری پەیوەندییەکانی تورکیا–ئەمریکا بوو، بە پێچەوانەی حکوومەتەکانی پێشوو، کە هەوڵ و ماندووبوونی لە پەیوەندییەکان بۆ گەشەدان بەلایەنی سەربازی و ئەمنی بوو، جەختیان لەسەر بەهێزکردنی پەیوەندییە ئابووری و کەلتووری و مێژووییەکانیان دەکردەوە بە ئەورووپاوە، هەرچی ئۆزال بوو جەختی لەسەر بەهێزکردنی پەیوەندییە ئابووری و کەلتووری و مێژووییەکانی بە ئەمریکاوە دەکردەوە[1]، لەپاڵ هاوسەنگی راگرتنی پەیوەندییە سەربازی و ئەمنییەکان، لە بواری ئابووریدا لەوەتەی جێگری سەرۆکی حکوومەتی تورکیا و بەرپرسی کاروباری ئابووری (1980–1983)[2]بوو، بەم قسەیە ناوبانگی دەرکردبوو "**بازرگانی نەوەك یارمەتی**"، سەرکەوتنی لە گۆڕینی ئابووری تورکی بەسەرخۆ داخراو بۆ ئابوورییەکی ئازادی هەناردە، بووە مایەی پێشوازی و پاڵپشتی لە واشنتۆن[3].

بە تایبەت گرنگیدانی ئۆزال بە لایەنی ئابووری پەیوەندییەکان لەگەڵ ئەمریکا، وایکرد ئەمریکا ببێتە بازاڕی هەناردەکانی تورکیا، و بووە هۆی ئەوەی لە ئابی 1985 ریککەوتننامەی "**پاریزگاریکردن و هاندانی وەبەرهێنانی تورکی –ئەمریکی هاوبەش**" مۆر بکریت. کە باسی دەرفەت بەخشینی یەکسانی بۆ هاوولاتی و کۆمپانیاکانی هەردوو دەولەتی دەکرد، بەگوێرەی رێنمایی لێکچوو[4]. دامەزراندنی (ئەنجوومەنی کاری تورکی–ئەمریکی– The Council of Turkish-American Work) بەرجەستەکردن و دەنگدانەوەیەکی دیکەی ئاراستەی نوێی تورکی و وەلامدانەوەی ئەمریکی بوو،

(1) -Muhittin Ataman, Op. Cit., P. 146.

(2) -George S. Harris, U.S-Turkish relations, in: Alan Makovsky and Sabri Sayari (ed), Turkey's New World, Washington Institute for Near East Policy, Washington D.C, 2000, P. 195.

(3) - هنري جيه باركى، المصدر السابق، ص663.

(4) -Jonathan Feiser, Turkey and the United States: An Alliance not yet Beyond Repair, Eurasia Insight, November, 2003, P. 17. via at:(www.evrasianet.org).



بۆ بەهێزکردنی پەیوەندییە ئابوورییەکانیان، ئەنجوومەنەکە لەلایەن بەرپرسانی هەردوو حکوومەت لە بەرزترین ئاست بە سەرۆکی هەردوو وڵاتەوە، چاودێری دەکرا، لە میانەی وتەیەك کە ئۆزال لە نیسانی 1986 لە میانەی کردنەوەی کۆبوونەوەی یەکەمی ئەنجوومەنەکە لە ئەستەمبۆل پێشکەشی کرد، رایگەیاند کە ئەو دڵنیایە لەوەی کە ئەنجوومەنەکە بەشداری لە گەشەدان بە پەیوەندییەکانی تورکیا–ئەمریکا دەکات، سەرباری ئەرکە سەرەکییەکەی خۆی لە بەهێزکردنی هاوکاری نێوان کۆمپانیا ئەمریکی – تورکییەکان[1].

ئەو ژمارە و ئامارانەی تایبەتن بە ئاڵوێری بازرگانی و هاوکاری ئابووری نێوان ئەمریکا–تورکیا لەماوەی هەشتاکان، هەرچۆنێك بن، پازدانێکی راستەقینە لەم بوارەدا تۆمار دەکەن، قەبارەی ئاڵوێری بازرگانی لە نێوان هەردوولا گەیشتە نزیکەی 2.28 ملیار دۆلار[2]، ئەمەش دوای ئەوەی بەهاکەی لە ساڵی پێشوودا، 361.20 ملیۆن دۆلار بووە.

ئەنقەرە لەماوەی هەشتاکان و نەوەدەکان هەولێکی زۆری دا لە پێناوی دۆزینەوەی گرووپێکی فشاری لایەنگر بۆ خۆی لە واشنتۆن، بۆئەوەی لەبەرامبەر گرووپەکانی فشاری یۆنانی دایان بنێت، کە گرفتی گەورەیان بۆ پەیوەندییەکانی تورکیا بە ئەمریکا دروستدەکرد. تورکیا وای دەبینی کە گرووپەکانی فشاری یۆنانی لە دانانی گەمارۆی چەك بەسەر تورکیاوە بەرپرسن، کە ساڵی 1975 ئەمریکا بەسەر تورکیای سەپاند، هەروەها گرووپەکانی فشاری ئەرمەنی بە بەرپرسی وروژاندنی پرسی کوشتارگەی تورکی بۆ ئەرمەنەکان لە ماوەی یەکەم جەنگی جیهانیدا دەزانی[3]، تورکیا دیپلۆماتکار و سیاسییە پێشووەکان بە دوای دۆستی لایەنگر (لوبی) لەناو ئەمریکادا دەگەڕا، بۆئەوەی گرنگی تورکیا لە ناوەندە سیاسییەکانی ئەمریکا

(1) - للتفاصيل ينظر: لقمان عمر محمود احمد، المصدر السابق،ص ص169–170.

(2) - التقارير الصحفية للسفارة العراقية في أنقرة، التقرير المؤرخ في: 1989/9/19، ارشيف مركز الدراسات الإقليمية، ص5.

(3) - هنري جيه باركى، المصدر السابق، ص663.

بەرز بنرخێنن، دوای ئەوەی شوکری ئەلەکداغ Sukru Elekda ی بالیۆزی تورکیا لە واشنتۆن ساڵی 1983 حکوومەتی تورکیای راسپارد کە پەنا بۆ کۆمپانیایەکی ئەمریکی بەرێت کە **"کار لە دروستکردنی بریار لە ئەمریکا دەکات"**، ئەویش کۆمپانیایGray and Company، بوو، کە رۆبێرت گرای Robert Gray نزیك لە کۆمارییەکان بەڕێوەی دەبرد، ئەو کۆمپانیایە هەمان ئەو کۆمپانیایە بوو کە ساڵی 1980 هەڵمەتی سەرۆکایەتی رۆناڵد ریگنی بەڕیوە دەبرد، حکوومەتی تورکی ساڵانە یەك ملیۆن دۆلاری بە کۆمپانیاکە دەدا[1]، لەهەمان تەوەردا حکوومەتی تورکی گرنگییەکی زۆری بە کۆمەڵەی (دۆستایەتی تورکیا ئەمریکا – American Friends of Turkey)[2] دەدا و پاڵپشتی سیاسی دارایی دەکردن، سەردانەکانی گەورە بەرپرسانی تورکی و ئەمریکی بۆ ئەو کۆمەڵە یە رەنگدانەوەی ئەو گرنگی دانە بووە[3].

هەرچەندە ئەو پازدانە جۆرایەتییەی لە ماوەی هەشتاکان لە پەیوەندییەکانی ئەمریکا – تورکیادا هەبوو، بێ گرفت و هەڕەشە نەبوو، لەپاڵ گرفت و کێشەی ئابووری، کە بەهۆی فراوانکردنی پەیوەندییە ئابوورییەکانی هەردوولاوە لەوماوەیە دروست بوو[4]، ترسناکترین هەڕەشە کە رووبەڕووی پەیوەندییەکانی تورکیا–ئەمریکا بووە، وروژاندنی بابەتی بەرپرسیاریتی تورکیا بوو لە کوشتارگەی ئەرمەنییەکان، ئەمە کاتی کە یەکێ لە ئەندامانی کۆنگرێسی ئەمریکی کە ناوی رۆبێرت دوڵ Robert Dual لە شوباتی 1987 پرۆژەی بریاریکی دا بە ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکی، تێیدا رۆژی 24ی نیسانی

(1) -Yilmaz Polat, Washington Entrikalari, AD Kitapcilik AS, Istanbul, 1999, SS. 24-25.

(2) – ساڵی 1982 لە واشنتۆن دامەزراوە، بە ئامانجی بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی ئەمریکا– تورکیا و ناساندنی کلتووری تورکیا و لابردنی هەر کۆسپێك خراپ حاڵیبوونێك کە وابکات پەیوەندییەکانی ئەمریکا–تورکیا بشێوێنی. (http://ar.wikipedia.org/wiki/)

(3) - لقمان عمر محمود احمد، المصدر السابق، ص ص145–147.

(4) -Muhittin Ataman, Op. Cit., P. 146.



بە رۆژی (کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان Armenian Genocide Day)[1] داناوە و تورکیا بە بەرپرسیاری مێژووی ئەم جینۆسایدە دەزانێ. پرۆژە بریارەکە شڵەژانیکی گەورەی لە نێوەندە سیاسی و ئیدارییەکانی ئەمریکا و تورکیای لێکەوتەوە، ئەم مەسەلەیە لەهەردوولاوە، گرنگی زۆری پێدرا، بەڵام هەوڵە چڕەکانی تورکیا کە هەڕەشە و ئارەزووی لەخۆگرتبوو، ئەمریکای لە مەترسی پەسندکردنی بریارەکە و کارکردی بریارەکە لەسەر پەیوەندییە تایبەتییەکانی بە تورکیاوە ئاگادار کردەوە، ئەم هەوڵانە وایکرد کۆنگرێس پرۆژەی رەشنووسی بریارەکە بە زۆرینەی 51 دەنگ لە دژی 48 دەنگ رەتبکاتەوە، ئەمەش بووە مایەی خۆشحاڵی و پێشوازی نێوەندە سیاسییەکانی ئەنقەرە و واشنتۆن[2].

گرنگی تورکیا وە **"هێزێکی ستراتیژی"** بۆ ئەمریکا لەماوەی دەیەی هەشتاکانی سەدەی بیستەم بەشێوەیەکی راستەوانە بەهێزتر بوو، هەروەها حاڵەتی هەماهەنگی و گونجان لە بەرژەوەندییە ئەمنی و ستراتێژی و سیاسی و ئابوورییەکانی نێوانیان بەهێز و توندوتۆڵ بوو، ئەو کێشە و ناکۆکییانەی کە ناوەناوە لە نێوانیان لەبارەی چەند پرسێکی دیاریکراو روویدەدا، جگە لە تەنگژەیەکی کاتی نا کاریگەر لەسەر مۆرکی پەیوەندییەکان هیچی دیکە نەبوون، بەرپرسانی ئیدارەی ئەمریکی لە زیاتر لە بۆنەیەك ئەم راستییەیان زیاتر لە جاریك دەربریووە، بۆ نموونە ئەلکسەندەر هیگ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا – تورکیا رۆڵەکەی بەم شێوەیە وەسفکردووە: **"ناکرێت دەستبەرداری بین یان بیگۆڕین، بەهەر نرخیك بێت مافی پاڵپشتیکردنی هەیە"**[3].

(1) - ينظر التفاصيل في: التقارير الصحفية للسفارة العراقية في أنقرة، التقرير المؤرخ في: 1989/10/31، ص10.

(2) -Yilmaz Polat, A. G. E, SS. 58-67 ؛

التقارير الصحفية للسفارة العراقية في أنقرة، التقرير المؤرخ في: 1989/10/31، ص10، التقارير الصحفية للسفارة العراقية في أنقرة، التقرير المؤرخ في: 1989/10/24، ص 4.

(3) - فيروز احمد، المصدر السابق، ص 464.

لەسـەرەتای نەوەدەکانـەوە وەرچـەرخانێکی گـرنگ لـە پەیوەندییـەکانی ئەمریکا–تورکیا روویدا، تورکیـا لـە پـاڵ ئـەڵمانیای یـەکگرتوو، لـە نێـوان ئـەو وڵاتانە بوون، لە رووی جوگارفیای سیاسییەوە، زۆر کاریگەر بوون بە رووخانی یـەکێتی سـۆڤیەت[1]، سـەرباری ئەمـەش لـە مـاوەی دوای جـەنگی سـارد، داگیرکردنـی کوێـت لەلایـەن عێراقـەوە لـە ئـابی 1990 یەکـەم هەرەشـەی لـە پەیوەندییەکانی هەردوولا دروست کرد[2].

---

[1] -Graham E. Fuller, "The Institutional Framework of U.S. Turkish Relations", in: The Parameters of Partnership: Germany, The U.S. And Turkey, American Institute for Contemporary German Studies, Johns Hopkins University, Washington D.C., October, 1997, P. 2.

[2] - هنري جيه باركى، المصدر السابق، ص 664.

## بابەتی دووەم: ڕێگە بۆ هاوبەشی ستراتیژی

ئەو گۆڕانکارییە خێرا و گەورانەی کە جیهان لەوەتەی کۆتایی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستەمەوە بەخۆیەوە بینی، جاڕی پاشەکشەی گەردەلولی جەنگی ساردی دا، بەشێوەیەك وایکرد هیواکانی جیهان لە نێوان ئاواتی پرشنگدار و بێ هیوایی بجولێ، ڕژێمە کۆمۆنیستەکانی ئەورووپای ڕۆژهەلات یەك لە دوای یەك دەڕووخان، دیواری بەرلین تێکدرا و میخائیل گۆرباتچۆڤ (1985–1991) سەرۆکی سۆڤیەتی چاکسازی سیاسی ریشەیی (پیرۆسترۆیکا و گلاسنوست)[1] سازکرد، سەردەمی هاوکاری توند لە نێوان هەردوو زلهێزەکە دەستی پێکرد، وا پێدەچوو سەردەمێکی تازە لە ئاشتی و ئازادی لە تەواوی جیهاندا گەشە بکات[2].

ئاواتەکانی جیهان لە چەند ساڵێکی کەمی دواتر، ڕووبەڕووی بێ ئومێدییەکی گەورە بووەوە، دیموکراتییە نوێکانی ئەورووپای ڕۆژهەلات دەستی بە پاشەکشە کرد و بەتوندی تووشی گرفتی گۆڕانکاری بوو، گۆرباتچۆفیش لە چاکسازییەکانی پاشەکشەی کرد[3]، هەروەها بەلقان، یوگسلاڤیا بەتایبەتی، تووشی دڵەڕاوکێی ڕەگەزپەرستی بوو و پێدەچوو بچێتە ناو جەنگێك کە هەڕەشە بێت لەسەر تەواوی

[1] - ووشەی پیرسترویکا بە واتای دووبارە بونیاتنانەوە دێت و، ووشەی الکلاسنوست بە واتای ئاشکراکردن دێت.

[2] - ريتشارد نيكسون، الفرصة السانحة: التحديات التي تواجه امريكا في عالم ليس به الا قوة عظمى واحدة، ترجمة: احمد صدقي، دار الهلال، بيروت، 1992، ص ص 9–10؛ ارسين كالايسي اوغلو، السياسة الخارجية التركية أزاء الامن الاقليمي والتعاون في الشرق الاوسط: العلاقات العربية–التركية... الى اين؟، في: علي محافظة وآخرون، العرب وجوارهم... الى اين؟، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، 2000، ص 238.

[3] - آلان تُد، ديمقراطيات ودكتاتوريات سادت اوروبا والعالم: 1919–1989، ترجمة: مروان ابو جيب، دار الحوار الثقافي، بيروت، 2004، ص ص 366–367.



ئەورووپا، لەلایەکی دیکەوە جیهان لە پەرەسەندنێکی مەترسیداری هەستیار حەپەسا، کاتێ عێراق، لە 2ی ئابی 1990 کوێتی داگیرکرد، لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بە **"تەنگژە و جەنگی دووەمی کەنداو"** (ئابی 1991)[1]، ئەو کارەی عێراق بە گوێرەی حساباتی ئەمریکی بەواتای کۆنترۆڵکردنی ڕێژەیەکی گەورەی نەوتی کەنداوی عەرەبی، دەهات[2]. بە پێنج مانگ دوای کۆتایی هاتنی دووەم جەنگی کەنداو، ڕووداوێکی گرنگتر ڕوویدا، ئەویش ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت بوو، دوای سەرنەکەوتنی کۆمۆنیستە بەلشەویکە نوێکان لە کودەتا دژی گۆرباتچۆڤ لە 19ی ئابی 1991[3].

هەروەها بەهۆی ڕووخان و لێکهەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت چەند وڵاتیکی نوێ دەرکەوتن، کە هەندێکیان یەدەگێکی مەزنی دەرامەتی سروشتی و سەرچاوەی وزەیان هەیە، بەتایبەتی ئەوانەی کەوتوونەتە سەر دەریای قەزوین، وەك ئازەربایجان[4].

[1] - جرجيس فتح الله المحامي، مغامرة الكويت: الوجه والخلفية، ستوكهولم، 1991، ج 1، ص 17 وما بعدها.

[2] - ريتشارد نيكسون، المصدر السابق، ص21.

[3] - هاووڵاتیانی مۆسکۆ لە سپێدەی ڕۆژی 19ی ئابی 1991 بینییان کە هەموو ویستەگانی تەلەفزیۆن بەرنامە ئاساییەکانیان تاکو نیوەڕۆ ڕاگرت، دواتر یەنایێڤ جیگری سەرۆکی سۆڤیەتی ڕایگەیاند کە گۆرباتچۆڤ توانای بەجێهینانی ئەرکی سەرۆکایەتی نییە، بۆیە لە وڵاتدا لەسەر بریاری لیژنەی لەناکاو باری لەناکاوی ڕادەگەیەنرێت، لیژنەکە لەلایەن یەنایێڤەوە سەرۆکایەتی دەکرا و وەزیری بەرگری و دەرەوە و سەرۆکی حکوومەت و ژمارەیەك سەرکردەی حکوومی و حیزبی تێیدا ئەندام بوون، کاری لیژنەکە لە 3 هەفتە زیاتری نەخایاند و دەرگای لیژنەکە لەبەردەم سەرکردەکانی کۆمارە سۆڤیەتییەکان خرایە سەرپشت، کە داوای ڕزگاربوون لە ڕژێمی کۆمۆنیستی و سەربەخۆیی کۆمارەکانیان لە یەکێتی سۆڤیەت دەکەن. سەیرکە: ليونيد مليتشين، تاريخ روسيا الحديثة من يلتسن الى بوتين، ترجمة: طه الولي، دار علاء الدين، دمشق، 2001، ص9 و لەدواوە.

[4] -Hakan Kantrci, Kisakactaki Bolge Kafkasya, IQ Kultur Sanat Yayincilik, Istanbul, 2006, SS. 111-125؛

سيار كوكب علي الجميل، "الجغرافيا التاريخية لجمهوريات أسيا الوسطى"، في: خليل علي مراد واخرون، جمهوريات أسيا الوسطى وقفقاسيا: الجذور التاريخية والعلاقات الإقليمية، مركز الدراسات التركية (الاقليمية حالياً)، جامعة الموصل، 1993، ص ص 44–46.

ئەو ڕووداوە گەورە و لەناکاوە، قورسایی و گرفتی ناوچەکە و جیهانی زیاد کرد، هەموو ناوچەکانی ئاسیای ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەورووپای ڕۆژهەڵات و بەلقان، بەشی خۆیان لەو گۆڕانکارییە و بەرپرسیارێتی وەرگرت.

سەبارەت بە تورکیا ڕووداوەکە هەر تەنها بە واتای نەمانی هەڕەشەی سۆڤیەتی و پەیدابوونی ڕژێمی تازەی جیهان نایەت، بەڵکو بەواتای چاوخشاندنەوەش دەهات بەسەرجەم پەیوەندییە دەرەکییەکانی، بەتایبەتی ئەو تەوەرەی کە پەیوەندییەکانی بەهۆیەوە لەگەڵ ئەمریکا بەستاوە، کە لەسەر بنەمای دەورەدانی هەڕەشەی سۆڤیەتی بونیادنراوە. پێدەچوو، چوارچێوەی نوێی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولا، روون نەبێت[1]. دوودڵی دڵەڕاوکێ بەرۆکی زۆربەی سیاسەتمەدارانی تورکی گرت، سەبارەت بە ڕۆڵ و پێگەی وڵاتەکەیان لە ڕژێمی جیهانی و هەرێمایەتی نوێ، بەتایبەتی ئەورووپییەکان هەنگاوی زیاتریان بەرەو یەکگرتن لەژێر چەتری یەکێتی ئەورووپی دا، دوای ئەوەی دیواری بەرلین لە 1989 ڕووخا، ئەو یەکێتییەی پێدەچوو شوێنی تورکیای تێدا نەبێتەوە[2].

لەلایەکی دیکەوە ئۆزال بە چاوێکی جیاواز سەیری بابەتەکانی دەکرد، **"ڕەوشە نوێیەکە"** کە جیهان و ناوچەکە دوای کۆتایی جەنگی سارد بەخۆیەوە بینی بە کۆمەڵێ هەلی لەقەلەمدا ئەگەر هاتوو بە باشی بەکاربهێنریت تورکیا بۆ **"هێزێکی ستراتیژی ئابووری"** وەردەگەڕیت، ئەوسا ئەو مۆرکە باوەی لەبارەی ئەرکی تورکیا لە ناوچەکە دەگۆڕێت[3]، ئۆزال ئەمەی لە وتەیەکدا کە لەبەردەم کۆنگرەی لوتکەی سەرۆکی کۆمارە تورکییەکانی ئاسیای ناوەڕاست[4] دەربڕی کە لە 30ی تشرینی یەکەمی 1992 لە ئەنقەرە بەسترا، گوتی: **"ئەگەر هەڵە**

(1) -Soli Özel, Op. Cit., P. 110.

(2) -Ibid.

(3) -Simon V. Mayall, Turkey: Thwarted Ambition, McNair Paper, Institute for National Strategic Studies, National Defense University Washington, DC, 1997, P. 56 .

(4) - الجمهوريات الناطقة بالتركية هي كازاخستان، قرغيزستان، توركمنستان، وأوزبكستان.



**نەکەین، ئەوا سەدەی 21 سەدەی تورکان دەبێت"**[1]. هەروەها وای دەبینێ کە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، تورکیا شوێنی خۆی لە نێو نەتەوە پێشکەوتووەکان وەربگریت و بۆ ئاستی **"شارستانییەتی هاوچەرخ"** بەرز بێتەوە و لە توانای تورکیا دا هەیە، ببێتە **"ژاپۆنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست"**[2]. ئۆزال چاوەڕوانی دەکرد تورکیا ڕۆڵێکی میحوەری لەسەر هەردوو ئاستی هەرێمایەتی و جیهانی بگێڕێت، دەکرێت بەرژەوەندییەکانی تورکیا کە لە کۆمارە تورکییەکانی ئاسیای ناوەڕاست و حەوزی دەریای ڕەش و حەوزی دەریای ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە وڵاتانی عەرەبی دراوسێ و ئیسرائیل و ئێران و بەلقانی تێدایە، لەم شوێنانە کە بەرژەوەندییەکانی تورکیای بەسەر دابەشبووە، دەکرێت بەرژەوەندییەکانی تورکیا بەدیبهێنرێن و بوژاندنەوەی ئابووری و بەشی خۆ بەرهەمهێنان بەدەست بخرێت، بەڵام گەیشتن بەمە پێویستی بە دوو خاڵی بنەرەتی هەیە، یەکەمیان، گۆڕانکاری ریشەیی لە سیاسەتی ناوەخۆ لە بواری کۆمەڵایەتی و ئابووری ئەنجام بدریت، دووەم، کە بۆ سەرکەوتنی یەکەم گرنگە و بە پلەیەك لەسەری بەندە، ئەوەیە کە هێز و کاریگەری دیپلۆماسییەتی تورکی لە سیاسەتی نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی بنەرەتی پشت بە توانای تورکیا لە بەدەستهێنانی پاڵپشتی ئەمریکی دەبەستێ[3].

ڕۆڵی تورکیا لە دەیەی نەوەدەکان لە ڕوانگەی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکاوە دیاری دەکریت، لە گەشەدان بە سەرچاوەکانی وزە لە ناوچەی دەریای قەزوین و بەشداریکردن لە گەشەی هاوکاری لە حەوزی دەریای ڕەش و پاڵپشتیکردنی وڵاتانی تازە سەربەخۆی ئاسیای ناوەند بۆ تەواوکردنی سەربەخۆیی و یەکێتی دوو نەتەوە، سەبارەت بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دەورەدانی هەریەکە لە ئێران و

(1) - محمد نور الدين، تركيا في الزمن المتحول: قلق الهوية وصراع الخيارات، رياض الريس للكتاب والنشر، لندن–بيروت، 1997، ص 234.

(2) -Simon V. Mayall, Op. Cit., P. 56.

(3) -George S. Harris, Op. Cit., P. 198.

عێراق و گەشەسەندنی هاوکاری ستراتیژی لەگەڵ ئیسرائیل لە حەوزی دەریای ناوەڕاست، ئەوا ئۆزال ئامادەیی پیشاندا بۆ چەسپاندنی ئاشتی و چارەسەری ناکۆکییەکان لەگەڵ یۆنان. هەروەها تورکیا خۆی وەك کلیلێك بۆ دامەزراندنی کۆشکی هاوکاری و پەیوەندی پەرەسەندووی نێوان وڵاتانی بەلقان پێشکەشکرد، ئەمە سەرباری پشتگیری پرۆسەی دامەزراندنی پەیکەری نوێی ئەمنی بۆ ئەورووپا و فراوانکردنی ناتۆ و دووبارە بونیادنانەوەی ناتۆ، کرد[1]. لە ئابی 1992 یەکێکی لە گەورە بەرپرسانی ناتۆ پێگەی جیۆسیاسیی تورکیا بەم دەستەواژەی خوارەوە دارشت: **"تاکە وڵاتێك لەوەتەی کۆتایی جەنگی سارد، تەنها بۆ ناوچە سەرەکییەکانی تەگژە لە دەوروبەری ئەورۆ–ئاسیا، دەچێت، ئەو وڵاتەش تورکیایە"**[2]. هەروەها زبیگنیۆ بریجنسکی راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی لەسەردەمی کارتەر و راوێژکاری سەنتەری توێژینەوەی ستراتیژی نێودەوڵەتی لە واشنتۆن، تورکیای لە پاڵ ئێران بە میحوەرێکی جیۆسیاسی گرنگ بە پلەی یەکەم پۆلێنکردووە، لەبەرئەوەی **"پارێزگاری لە ئارامی ناوچەی دەریای رەش دەکات و هاوسەنگی رووسیا لە قەوقاز رادەگریت و هێشتا تریاك بە فەندەمێنتالیزمی ئیسلامی دەدات، هەروەها وڵاتێکی بەسوودە، چونکە دالّدەی باشووری پەیمانی ناتۆیە. لەوانەیە ئەگەر تورکیا بۆ وڵاتیکی ناجیگیر بگۆڕێت، ئەوا حەز بکات توندوتیژی بۆ باشووری بەلقان رەوانە بکات، لەهەمان کاتدا بۆ رووسیا ئاسان دەبێت، دووبارە بەسەر ئەو وڵاتانەی قەوقاز کە تازە سەربەخۆ بووینە، زاڵ بێت"**[3]. لەوانەیە ئەوەی کە پێگەی تورکیا لە ئامانجەکانی ئەمریکا باش هەڵسەنگاندبێ، ئەوە ریچارد هۆلبرۆك Richard Holbrook ی

(1) - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص11.

(2) - إحسان غورکان، ترکیا في الجیوسیاسیة الجدیدة وآثارها في مستقبل العلاقات العربیة–الترکیة، في: اورهان کولوغلو وآخرون، ندوة العلاقات العربیة الترکیة: حوار مستقبلي، مرکز دراسات الوحدة العربیة، بیروت، 1995، ص 589.

(3) - زبیغنییف برجنسکي، رقعة الشطرنج العظمی: التفوق الامریکي وضروراته الاستراتیجیة الملحة، ترجمة سلیم ابراهام، دار علاء الدین، ط2،دمشق، 2003، ص56.



یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ کاروباری ئەورووپی و ئەندازیاری چەمکی نوێی بۆ پەیوەندییەکانی ئەمریکا–ئەورووپا، کە لە ناوەڕاستی نەوەدەکان باسی لەوە کرد کە **"دەبیت تورکیا بە رۆڵێکی پێویست، کە رۆڵی قەڵایەکی قاییم لە رووبەڕووبوونەوەی فەندەمینتالیزیمی ئیسلامی و دەورەدانی دەگێڕێت، لە قەوقاز و بەلقان و حەوزی دەریای رەشیش بە رۆڵی یاریدەدەر هەڵسێ و رێگا بازرگانییەکانی نێوان بازاڕە نەوتییە دەوڵەمەندە نوێیەکان لە ئاسیای ناوەند و لە نێوان ئەورووپا بەرەفت بکات، لە هەرشوێنی سەنتەرێکی تازەی هێز بەدەر بکەویت، تورکیا لەوێیە"**[1].

تەنگژەی کەنداو جەنگی دووەمی، دووبارە بەخێرایی پێگەی گرنگی ستراتیژی تورکیا بۆ جیهانی رۆژئاوا بە گشتی و ئەمریکا بە تایبەتی ئاشکرا کرد، راستەوخۆ دوای داگیرکاری عێراق بۆ کوێت، هەڵوێستی تورکی بەم رستەیە کورتکرایەوە **"تورکیا بە داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە خەمبارە"**، کارەکەی بە مەترسی بۆ سەر پاراستنی دۆستایەتی لە ناوچەکە وەسفکرد. بەڵام زۆری پێنەچوو تورکیا هەڵوێستێکی زیاتر سوڕ و توندی وەرگرت، کاتی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی زنجیرەیەك بریاری (660 لە 2ی ئابی 1990، 661 لە 6 ئابی 1990) سەپێنراوی دەرکرد، بریاری یەکەم کردەوەکەی عێراقی پڕتستۆ کرد و داوای دەستبەجێ کشانەوەی بێ مەرجی لێکرد، دووەمیش سەپاندنی گەمارۆی ئابووری بەسەر عێراق، ئۆزال لە 8ی ئابی 1990 بەدەستپیشخەری خۆی بەر لەوەی جیمس بیکەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە هەمان رۆژدا بگاتە ئەنقەرە، وەستاندنی هەردوو بۆڕییە نەوتی عێراقی راگەیاند، کە بە ناو تورکیا بۆ بەندەری جیهان نەوتیان دەگواستەوە[2].

(1) - السفیر (جریدة)، 1 أیار 1995.

(2) - بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی هەلوێستی ئەمریکا لە شەڕی کەنداو سەیری:
William Hale, "Turkey, The middle East and Gulf Crisis", International Affairs, Vol. 68, No.4, October, 1992, Pp. 683-687;
فیلیب روبنس، ترکیا والشرق الأوسط، ترجمة میخائیل نجم خوري، دار قرطبة، قبرص، 1993، ص ص87–88.

هەندێ توێژەر وەرگرتنی ئەو هەڵوێستە لایەنگیرییەی ئۆزال بۆ هێزی هاوپەیمانی ڕۆژئاوا بەسەرکردایەتی ئەمریکا بە پابەندبوونی تورکیا بە میساقەکانی پەیمانی ناتۆ و هەماهەنگی سیاسەتەکانی لەگەڵ ستراتیژەکانی گرێدەدەن، هەروەها وەك دەربڕی پەرۆشی تایبەتی خودی ئۆزال بۆ دڵنیابوون لەسەر ئینتیمای تورکیا بۆ سەربازگەی ڕۆژئاوا[1]. هەروەها هۆی ئەو هەڵوێستە بۆ ئەو دڵەڕاوکێیە زۆرەی تورکیا لە هەمبەر زیادبوونی هێزی سەربازی عێراق، کە ئامادەشە بەکاریبهێنیت دەگەرێتەوە، ئەو باوەڕە لە ناوەندە گرنگەکانی تورکیا باو کە ئەگەر عێراق هێزە سەربازییەکەی بۆ دەستگرتن بەسەر دەرامەتە نەوتیەکانی کوێت لە ئێستادا بەکاربهێنیت، ئەوا لە داهاتوودا بۆ دابینکردنی ڕێرەوی ڕووبار لە دژی تورکیا بەکاری دەهێنیت[2].

دڵڕاوکێکە لەوەتەی سەرۆکی تورکی یەلدرم ئەکبولوت[3] لە ساڵی 1989 لەگەڵ سەدام حوسێنی سەرۆکی عێراقی لە بەغدا کۆبووەوە و، لە زیادبووندا

(1) – زۆربەی دەستەبژێری سیاسی تورکی لەپاڵ دامەزراوەی سەربازی، ئەو بریارەی ئۆزالیان بە توندی ڕەتکردەوە، یەکێك لە ڕاپرسییەکان کە لەماوەی تەنگژەکە سازکرا، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە 88٪ی ڕای گشتی تورکی هەڵوێستەکەی ئۆزال لەمەڕ جەنگەوە ڕەتدەکەنەوە. محمد نور الدين، تركيا في الزمن ...، ص237. للإطلاع على ردود الأفعال الرسمية والشعبية على قرار أوزال، سەیری، فيروز احمد، صنع تركيا الحديثة، ص ص449–452؛ Aylin Guney, Op. Cit., P. 34.

(2) - فيليب روبنس، المصدر السابق، ص ص89–90.

(3) – یەلدرم ئاکبولوت: ساڵی 1935 لە ئارزنجان لە دایکبووە، بڕوانامەی یاسای لە زانکۆی ئەستەمبۆل وەرگرتووە، کاری پارێزەری کردووە، لە ساڵی 1983 لەسەر لیستی حیزبی نیشتمانی دایك بۆتە نوێنەر، چەند پۆستیکی باڵای لە حکوومەت وەرگرتووە، دیاریترینیان سەرۆکی ئەنجوومەنی گەورەی نیشتمانی و دواتر سەرۆك وەزیران و لەسەروبەندی وەرگرتنی ئۆزال سەرۆکایەتی تورکیا بوو بە سەرۆکی حیزبی نیشتمانی دایك، ئۆزال ئەوی هەڵبژارد تاکو لاوازی کەسایەتی ئەو بۆخۆی بەکاربهێنیت، بۆ ئەوەی هەمان ڕۆڵی سیاسی زاڵ لە ئیدارەی کاروباری حیزب و حکوومەت و دەوڵەت بگیری، تا وایلێهات لای ڕۆژنامە و پارتە ئۆپۆزسیۆنەکان ئەو ڕایە باوبوو، کە ئۆزال لە پشت پەردەوە حوکم دەکات، بەکردەوە سەرۆکایەتی دەوڵەت و حیزبی فەرمانڕەوا و حکوومەتی بەیەکەوە کۆکردەوە، سەیری : جلال عبد الله معوض، صناعة القرار في تركيا...، ص 26.



بوو، سەرۆکی عێراقی بە سەرۆکی تورکی گوتبوو **"ئەگەر لە ڕەفتارکردن وەکو ئێمە دەمانەویت لە کێشە کرنگەکان سەرنەکەون، ئەوا پەیمانی باکووری ئەتڵەسی هیچی دیکە کاریگەر نابیت و بۆ یارمەتی دانی ئێوە نایەت، ئەی کێ بۆ یارمەتی ئیوە دێت؟"**[1]. ئەوەی لە دیپلۆماسییەتی تاکڕەوانەی سەرۆك ئۆزال لە مامەڵەکردن لەگەڵ تەنگژەی کوێت دەستدەکەوێت، ئاماژە بە قۆستنەوەی هەل دەدات، لە وڵامدانەوەی ئەو ڕایەی دەڵێت تورکیا گرنگی ستراتیژی خۆی لای ڕۆژئاوا و ئەمریکا بەتایبەتی دوای کۆتایی جەنگی سارد لەدەستداوە، ئەو گرنگییەی کە لەبنەڕەتەوە لە ڕۆڵەکانی تورکیا لە هەوڵەکانی ڕۆژئاوا لە دەورەدانی نفوزی سۆڤیەتی دەیگێریت[2]. ئۆزال ڕەفتارەکەی عێراقی بە **"هەلێك وەرگرت کە لە ئاسمانەوە هاتبێ"**[3]. بۆ وەڵامی ئەو گوومانەی کە دەرهەق بە ئەو دەگوتران بەکارهێنان. لەهەمان تەوەر عەلی بۆزەری وەزیری دەرەوەی تورکی ڕایگەیاند کە **"دەبێت بەردەوام ئەو ڕێز و حورمەتەی بدەینێ کە شایەنیەتی"**[4]. لەم پێگەوە ئوزال لە 15ی تشرینی یەکەمی 1990 خۆی بۆ سەفەری واشنتۆن ئامادەکرد و لەوێ چاوی بە جۆرج بۆش کەوت، بۆشی دڵنیاکردەوە کە وڵاتەکەی **"هاوپەیمانیکی ستراتیژی ئەمریکایە و هێزێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە کە پشتی پێدەبەستریت... هەموو ئەو شتانەی ئەمریکا ویستوویەتی و تەمەنای کردووە، جێبەجێ کردووە، دوو**

(1) - ارسين كالايسى اوغلو، المصدر السابق، ص238.

(2) - احسان غوركان، تركيا في الجيوسياسية الجديدة وآثارها في مستقبل العلاقات العربية التركية، في: اورهان كولوغلو واخرون، العلاقات العربية–التركية: حوار مستقبلي، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، 1995، ص588.

(3) -Simon V. Mayall, Op. Cit., P. 57.

ئۆزال لە بەرگریکردن لە هەڵوێستەکەی کە بە لایەنگری تەواوی جۆرج بۆش تۆمەتبار کرابوو، لەتەنگژەی کوێت، لەبەردەم ژمارەیەك نوێنەری پارتەکەی گوتی: "ئەو بۆندەی کارە پڕ قازانجترین بۆندی ژیانم بووە، لە هیچ کاتێکی پێشتر ئەو هەموو قازانجە بەکارێکی کەم کۆنەکراوەتەوە". سەیری: Aylin Guney, Op. Cit., P. 345.

(4) - جرجيس فتح الله، المصدر السابق، ص 287.

**بۆرییە نەوتییەکەی عێراقی داخستووە و رێگای نێودەوڵەتی لەسەر عێراق قەپاتکردووە و ئەو 60 هەزار سەربازەی لەسەر سنووری عێراق کۆکراونەتەوە بە 40ی دیکە بەهێز کراون"**. دواتر ئۆزال وردەکاری ئەو زیانانەی کە بەهۆیەوە بەر تورکیا دەکەوێت، پێشکەشکرد، لایەنی ئەمریکی بەڵێنی دا کە بەشی یەکسان بە قوربانییەکانی تورکیا لەبەرچاو دەگرێت[1].

پێشبینییەکانی ئۆزال لە شوێنی خۆی هاتن، ئەمریکا جارێکی دیکە هەستی بە گرنگی سوودی ستراتیژی تورکیا بۆ جیهانی رۆژئاوا کرد، دەرەنجام و ئەنجامەکانی جەنگی کوێت، گرنگی تورکیایان بۆ ئەمریکا دڵنیا کردەوە[2]، تەلەفۆنی بۆش بەدرێژایی کاتی تەنگژەکە بە ئەنقەرەوە گرێدرابوو، تەلەفزیۆن و رۆژنامە تورکییەکان دەستیان بە بڵاوکردنەوەی هەموو گفتوگۆیەکی تەلەفۆنی نێوان سەرۆک بۆش و سەرۆک ئۆزال کرد. ئۆزال بەبێ پسانەوە ئەوەی لەسەر زار خۆش بوو بەو رۆژنامەنووسانەی چاوپێیدەکەوتن، بڵێ: **"دوێنێ سەرۆك بۆش پێی گوتم..."** و **"ئەمڕۆ ئامۆژگاری بۆشم کرد و من..."** و **"هەر بەم بۆنەوە سەرۆك بۆش بۆی دەرپڕیم کە..."** جارێك بە شانازییەوە بە رۆژنامەنووسانی گوت، کە 23 پەیوەندی تەلەفۆنی بۆشی لە ماوەی شەش هەفتەکەی دوای داگیرکاری عێراق بۆ کوێت، وەرگرتووە، تا کار وایلێهات، هەندێ لەوانەی لە دیوەخانی تایبەتی ئەو دادەنیشن بیڵێن، کە **"بریارە چارەنووسسازەکەی بۆش بۆ رزگاری کوێت، لەسەر وەڵامی راسپاردەکانی ئۆزالەوە هاتووە"**[3].

واشنتۆن لە رێگای زیادکردنی بەشی چنینی تورکی کە هاوردەی بازاڕەکانی ئەمریکا دەکرێت، بە پەلە پاداشتی تورکیای کردەوە و بەڵێنی دا کە بە بەهای 1.4 بلیۆن دۆلار لە بەنکی نێودەوڵەتی پێشینە بە تورکیا بدات. هەرچی لە لایەنی سەربازییەوە بوو، یارمەتی تورکیای دا بە بەهای 8 بلیۆن دۆلار چەك

(1) - المصدر نفسه، ص 286.

(2) -Soli Özel, Op. Cit., P. 111.

(3) - جرجيس فتح الله، المصدر السابق، ص286.



دابین بکات، بەهۆی چەکداماڵینی گۆرەپانی ئەورووپای ناوەراست، 1000 تانك و 700 زرێپۆش و ژمارەیەك رۆکێتی بەدەستهێنا، هەروەها بەڵێنی دیکە لەمەڕ رادەستکردنەوەی 40 فرۆکەی ئیف 4 ی بەکارهێنراو، کە لە ساڵی 1984ەوە فریزکرابوون، بەهۆی فشارەکانی لۆبی یۆنانی و بەڵێنیدا بە کەم نەکردنەوەی یارمەتییە سەربازییەکانی ئەمریکا ساڵانە بۆ ژێر 545 ملیۆن دۆلار[1].

دەرەنجامەکانی **"تەنگژەی کوێت"** دووبارە بە خێرایی رۆڵ و گرنگی ستراتیژی تورکیای بۆ ئەمریکا پێناسە کردەوە، هەروەها گرنگی و هەمەلایەنی و ئاڵۆزی رۆڵی تورکی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئاشکرا کرد، بەم شێوەیە کە وای لە ئەمریکا کرد وەك بنکەیەکی سەرەکی ناتۆ **"لە دەرەوەی ناوچەی چالاکییەکان و دورگەی ئارامی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی شڵەژاو"** سەیری تورکیای دەکرد، هەروەها وەك بەردی بناغەی ئەو ستراتیژەی کە بەدرێژایی نەوەدەکان بە ستراتیژی (دەورەدانی دوولایەنە–الاحتواء المزدوج– Dual Containment)[2] لە دژی ئێران و عێراق[3]، ناسرابوو، سەیر دەکرد. هەروەها تەنگژەکە هانی ئەمریکای دا کە بەشێوەیەکی چڕ پشت بە زیاد بەگڕخستنی رۆڵی تورکیا لە حساباتی هەرێمایەتی و بەدیهێنانی ئامانجە ستراتیژییە بەیەکەوە گرێدراوەکان، ببەستێ[4]. لەوانەیە ئەو پێگە باشەی تورکیا زۆر بە جوانی لە دەستەواژەی مارتن ئەندیکی یاریدەدەری پێشووی وەزیری

(1) - فيليب روبنس، المصدر السابق، ص89.

(2) – ئەو سیاسەتە بوو کە ئەمریکا لەیەکەم سەرۆکایەتی کلینتۆندا گرتبوویەبەر، ئەو سیاسەتە لەسەر گۆشەگیرکردن و مەحرومکردنی هەریەکە لە ئێران و عێراق لە بەدەستهێنانی تەکنەلۆژیا وەستا بوو، بەتایبەتی تەکنەلۆژیای سەربازی و مامەڵەکردنی سیاسی و نێودەوڵەتی. عمرو ثابت، الاحتواء المزدوج وما وراءه: تاملات في الفكر الاستراتيجي الامريكي، مركز الامارات للدراسات والبحوث الاستراتيجية، ابو ظبي، 2001، ص 7.

(3) -George S. Harris, "Turkish-U.S relations", in: Alan Makovsky and Sabri Sayari (ed), Turkey's New World, Washington Institute for Near East Policy, Washington D.C, 2000, P. 191.

(4) - عماد الضميري، تركيا والشرق الا وسط، مركز القدس للدراسات السياسية، ،2002، ص93.

دەرەوەی ئەمریکا و بەڕێوەبەری کاروباری ڕۆژهەلاتی دوور و باشووری ئاسیا لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکی، بەدەردەکەوێت، کاتێ گوتی: "**تورکیا دەوڵەتێکی سکۆلاریزمی دیموکراتی ئیسلامییە و هێزێکی سەربازی و ئابوورییە و پێگەیەکی ستراتیژی هەیە و، لە مێژە هاوپەیمانی ئەمریکایە. یەکێك لە ڕێگاکانی بەرەنگاربوونەوەمان ئەوەیە ڕێگایەك بدۆزینەوە بۆ بەکارهێنانی باشترین فاکتەر بەگەران لە دوای ئامانجەکانی ئێمە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست**"[1].

دەستگرتن بە ستراتیژی "**دەورەدانی دوولایەنە**" لە سەردەمی ئیدارەی سەرۆك کلینتۆن (1992–2000)، ڕێگایەك بوو بۆ هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ هەریەکە لە عێراق و ئێران، کە بە "**هەڕەشە بۆ سەر بەرژەوەندییەکان لە هەرێمەکە**" وەسفکرابوون[2]، ئەمەش وای لە واشنتۆن کرد کە هانی تورکیا بدات بۆ ئەوەی چالاکانە بە کاروبارەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست گرێدراو بێت و لەگەڵ هاوپەیمانانی ئەمریکا کار بکات، تورکیا ڕۆڵێکی ناوەندی لە دەورەدانی عێراق بۆ پابەنکردنی بە تەواوی بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان گێڕا و هەماهەنگی لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ جێبەجێکردنی سزا نێودەوڵەتییەکان کرد و لەوەی کە پێی دەگوترا "**وەلامی یەکلاکەرەوە بۆ شەڕ فرۆشییەکانی عێراق**"[3] ڕاوێژ و هاوکاری بە ئەمریکا دەدا. گرنگی تورکیا هەر تەنها بەشداریکردنی هاوپەیمانان لە جەنگی سەر عێراق و جێبەجێکردنی

(1) - تقرير معهد واشنطن، اعده مادلين أولبرايت ومارتن انديك والين ليبسن، وليام كوهين، الكسندر هيك، صموئيل لويس، مجلة الدراسات الفلسطينية، العدد12، خريف 1992، ص ص 115–153.

(2) - السياسة الأمريكية في الشرق الأوسط، تقرير لمجموعة الرئاسة للدراسات (واشنطن)، ترجمة: فريدون كاكەيی، مراجعة يوسف كوران، مركز كُردستان للدراسات الإستراتيجية، السليمانية، 2002، ص 87.

(3) - السياسة الأمريكية في الشرق الأوسط، المصدر السابق ص ص127–128؛ بۆ زانینی بیروبۆچوونێکی عیراقی لە هەڵوێستی تورکیا بەرامبەر عێراق لە دووایی شەڕی کەنداوی دووەم سەیرکە: ابراهيم خليل احمد العلاف، "السلوك السياسي الخارجي التركي ازاء العراق بعد ام المعارك"، في سياسة تركيا الخارجية تجاه الوطن العربي، إبراهيم خليل احمد واخرون، مركز الدراسات التركية، الموصل، 1998، ص ص 21–43.



بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانی تایبەت بە گەمارۆی سەر عێراق نەبوو، بەڵکو ئەم ڕۆڵە بەردەوام بوو بە درێژایی ماوەی نەوەدەکان لە دەورەدانی عێراق. سەرکەوتنی ئەمریکا لەبەرامبەر عێراق بە ڕێژەیەکی زۆر بە مەودای وەلامدانەوە و هاوکاری تورکیاوە بەند بوو، ناچارکردنی عێراق بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش و مەرجەکانی شەڕ ڕاگرتن و بەردەوامبوونی پرۆسەی (دابین کردنی ئارامی Provide Comfort)، بە دامەزراندنی دالدەی ئارام بۆ کوردی عێراق لە باکووری هێلی 36[1]، کە پێویستی بەوە هەیە کە تورکیا ناوە ناوە ڕەزامەندی لە بەکارهێنانی بنکە ئاسمانییەکانی لە لایەن ئەمریکا و هاوپەیمانەوە، دەربڕێت، بۆ جێبەجێکردنی پارێزگاری لە ناوچەی ئارامی کوردی[2] بە هەڵسانی فڕۆکەکان بەسەر ئەو ناچەیە، مارتن ئادیك ئەو ڕۆڵەی تورکیای بەرز نرخاند، لە وتەیەکدا کەلەبەردەم پەیمانگای واشنتۆن بۆ توێژینەوەی ڕۆژهەلاتی دوور لە ریکەوتی 1993/5/18 پێشکەشی کرد و گوتی: "**تورکیا پایەیەکی گرنگە لە هەوڵەکانمان بۆ دەورەدانی سەدام حوسێن هەیە...**"[3]

(1) - ناوچەی ئارامی کوردی، لە بڕیاری ژمارە 688ی ئەنجوومەنی ئاسایش کە لە نیسانی 1991ەوە دەرچووە، هاتووە، کە ڕێگەی بۆ پرۆسەی دابینکردنی ناوچەی ئارامی لە باکووری عێراق خۆش کرد، ئەو بڕیارە عیراقی ناچارکرد، دەستبەجێ ڕێگە بە ڕێکخراو و دامەزراوە مرۆییەکان بدات بگەنە ناوچەی ئارامی کوردان، بۆئەوەی پاڵپشتی و یارمەتی و پارێزگاری پێشکەشی هاوولاتیانی سڤیل بکەن، هەروەها سەیری:

Michael A. Schiesl, the Objective of United States Military Intervention in Northern Iraq between Desert Storm and Operation Iraq Freedom, A thesis presented to the Faculty of the U.S. Army Command and General Staff College in partial Fulfillment of the requirements for the Degree Master of Military Art and Science General Studies, B.S., Missouri Western State College, Saint Joseph, Missouri, 1991. Pp. 3-4; Kemal Kirisci and Gareth M. Winrow, The Kurdish Question and Turkey, An Example of Trans-State Ethnic Conflict, Frank Cass, London-Portland, P. 32.

(2) -Soli Özel, Op. Cit., P. 111

(3) - ناصيف حتي، الوطن العربي في استراتيجيات القوى العظمى، اورهان كولوغلو وآخرون، المصدر السابق، ص ص 479–480.

لە هەمبەر ئێراندا، تورکیا سیاسەتیکی کەمتر پاشکۆیی بۆ ئەمریکای گرتەبەر، تووشی تەگەرە بوو، لەسیاسەتی دەورەدان و گۆشەگیرکردنی ئێران[1]، بۆ رازیکردنی واشنتۆن، سەبارەت بە هەوڵەکانی بۆ هێشتنەوەی پەیوەندی باشی بە تارانەوە، ئەنقەرە هەندێجار وای پێشاندەدا کە دژی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکایە، تورکیا پێویستی بە بەکارهێنانی دەرامەتە ئێرانییەکان بۆ دابینکردنی پێداویستییە زۆرەکانی لە وزە، هەیە، کێشەکانی ئاسایشی وڵات لە هەردوو وڵات بە عێراقیشەوە بە کێشەی کوردەوە بەندە[2].

جگە لە دامەزراوەی سەربازی هەموو هێزە سیاسییەکانی تورکیا داوای دامەزراندنی پەیوەندی ئاساییان لەگەڵ تورکیا دەکرد، چونکە ئێران و ئەو رێگایانەی بە ناو وڵاتانی قەوقازی دا رەت دەبوون، دەروازەیەکی گرنگی دیکە بوون بۆ تورکیا بۆ گەیشتنی بە ئاسیای ناوەند. روون و ئاشکرایە، کە هەموو ئەمانە لەگەڵ هەولە بەردەوامەکانی ئەمریکا بۆمەبەستی گۆشەگیرکردنی ئێران لە گۆرەپانی سیاسی دەیدا یەکانگیر نەدەبوو، بەڵام هەستکردنی واشنتۆن بە زەرورەتی پاراستنی هاوپەیمانێتییەکەی لەگەڵ تورکیا بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییە ستراتیژە هەرێمایەتییەکان وای لە سیاسەتمەدارانی ئەمریکی کرد، ئەوەندە زێدەڕۆیی نەکەن لە گلەیی و گازاندەکانیان سەبارەت بە سیاسەتی تورکیا دەرهەق بە ئێران[3].

---

(1) - حول اختلاف وجهات النظر بين الولايات المتحدة الأمريكية وتركيا بخصوص ايران ينظر:
Hasan Yilmaz, Turkey and The Middle East: Threats and Opportunities, Master Thesis of Arts in National Security Affairs from the Naval Postgraduate School, Monterey, California, 2001, Pp.143- 149؛
عقيل محفوظ، المؤسسة العسكرية والسياسة العامة في تركيا: دراسة في جدليات المجتمع والدولة والسياسة الخارجية، أطروحة دكتوراه مقدمة الى كلية الاقتصاد/ جامعة حلب، 2006، ص ص 308–311.

(2) -Henri J. Barkey, Iran and Turkey: Confrontation across an Ideological Divide, in: Alvin Z. Rubinstein and Oles M. Smolansky(Ed), Regional Power rivalries in the new Eurasia: Russia, Turkey, and Iran, M.E. Sharpe. New York, London, 1995, P. 154.

(3) - هاينتس كرامر، المصدر السابق، ص 384.



لەو فاکتەرە گرنگانەی کە وای لە ئەمریکا کرد، پەیوەندییەکانی لە ئاستێکی بەرز و گەشەسەندوو لەگەڵ تورکیا بهێڵێتەوە، ئەو راستییە بوو کە ئەمریکا دەیزانی تورکیا توانای ئەوەی هەیە پردی دۆستایەتی لەگەڵ دەوروبەرە هەرێمایەتییەکانی دروست بکات، "**پەیوەندییەکانی وڵاتانی ئەو دەوروبەرەش دۆستانە نییە هەروەها پەیوەندی لەگەڵ ئەو وڵاتانەش دروست بکات کە لە بارەی دیموکراتییەوە لە ئەمریکا جیاوازن**"، بە گوێرەی روانگەی گەورە دیپلۆماتکارێکی ئەمریکی کە ئاماژەی کردووە بۆ ئەوەی کە: "**سەرباری ئەوەی پرۆسەی ئاشتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەبن گەیشتووە، بەڵام تورکیا پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ ئیسرائیلدا پاراستووە، کە بەدەرە لە ریرەوی پرۆسەی ئاشتی و هەر ئاواش دەمێنێتەوە. هەروەها بەرژەوەندییەکانی تورکیا لە ناوچەکانی دەوروبەری خۆی کە عێراق و قەوقاز و ئیسرائیل لەخۆدەگریت، هەر بە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکاوە گرێدراو دەبێت، تورکیا بەهۆی بەها رۆژئاواییەکەی و ناسنامە بێ هاوتاکەیەوە، باشترین هاوبەشی ئەمریکا دەبێت، کە دەتوانیت پارمەتیدەری ئەمریکا بێت لەو ناوچانەدا**"[1]. گرنگترین گۆڕانکاری لە سیاسەتی دەرەوەی تورکیا دوای رووخانی یەکێتی سۆڤیەت و دووەم جەنگی کەنداو پەرەسەندنی پەیوەندییەکانی بوو بە ئیسرائیلەوە[2]. لەنەوەدەکان پەیوەندییەکانی تورکیا–ئیسرائیل زیاتر ئاشکرا بوو، ئەمەش لەوەتەی تورکیا لە ساڵی 1991 بریاریدا ئاستی پەیوەندی دیپلۆماسییەکانی لەگەڵ ئیسرائیل بۆ ئاستی بالیۆزخانە بەرز بکاتەوە. ئەم پەیوەندییانە بەشێوەیەکی خێرا گەشەی سەند و بەشێوەیەك پێشتر نموونەی نەبووە، لە 1996/2/23 هەردوولا ریککەوتننامەی (هاوکاری سەربازی) یان مۆرکرد[3].

---

(1) - ياسر احمد حسن، تركيا: البحث عن مستقبل، الدار المصرية اللبنانية، القاهرة، 2006، ص ص312–313.

(2) - هنري جيه باركي، المصدر السابق، ص 673.

(3) - للتفاصيل ينظر: جلال عبد الله معوض، صناعة القرار في تركيا...، ص ص 221–270.

سەرەرای ئەوەی کە رێککەوتننامەکە بۆ دابینکردنی کۆمەڵێ دەستکەوت و ئامانجی سیاسی و سەربازی و ئەمنی، هات. هەردوولا بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانە زۆر هەوڵیان دا[1]. ناکرێت رێککەوتنەکە لە ستراتیژی ئەمریکی لە ناوچەکە داببڕێنرێت، کە لە وردەکارییەکانیدا **"کۆکردنەوەی دوو هاوپەیمانە کە لە کۆمەڵێ چاوتێبڕینی هەرێمایەتی هاوبەشن"**، یەکەمیان بە گوێرەی دیدگای ئەمریکی، بەرزەفتکردنی سیاسەتەکانی هەرێم و دەورەدانی سەرچاوەکانی هەڕشەی ناو ئەو هەرێمە، هەروەها هەوڵدان بۆ پێکهینانی ئەو سیاسەتە بەشێوەیەك بێت کە هەردوو وڵاتەکە بتوانن، کۆنترلی ئاراستەکانی بکەن. هەروەك یەکی لە توێژەران باس دەکات، کە ئامانج و گرنگییە هاوبەشەکانی لەگەڵ هەردوو **"هاوپەیمانە نوێیەکە"** لە **"دەورەدانی هەڕەشە هەنووکەیی و هەڕەشە چاوەڕوانکراوەکانی ئێران و عێراق و سووریا و سنووردانان بۆ بڵاوبوونەوەی چەکی کۆکوژ، هەروەها بەرنگاریکردنی رادیکالیزمی ئایینی و توندوتیژی"**[2].

دیدگاکانی ئەمریکی و تورکی و ئیسرائیلی تاڕادەیکی زۆر لە زۆر لایەنەوە، یەکانگیر دەبوون، لە لایەنی ئەمنی و پرۆژەکانی ئاشتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، تورکیا و ئیسرائیل بەپەرۆشەوە بوون بۆ بینینی رۆژهەڵات ێکی ناوەڕاستی بێ هەموو تەکەتولێك و رژێمیکی زاڵ، بە پرۆژەکانی **"یەکێتی عەرەبی"** بچێت، ئەو پرۆژانە بە بروای تورکیا هەڕەشە بۆ ئاشتی پێکدێنن، ئاوا رۆژهەڵات ێك رێگە لە سەرهەڵدانی هەموو شێوەکانی توندوتیژی و شۆڕشگێڕی دەگرێت، ئەم جۆرە دیدگایە لەگەڵ دیدگای ئەمریکاش دەگونجا، کە وای لە تورکیا

---

(1) - ئامانجەکانی تورکیا لە رێککەوتننامەکە، لەبنەرەتەوە بۆ جەتی لەسەر دۆسییەکانی سنور و گرژیەکانی لەگەڵ سووریا و ئاو و کورد بووە، هەروەها بۆ زامنکردنی باڵادەستی سەربازی بەسەر وڵاتانی ناوچەکە، بۆئەوەی رۆڵی سەرکردایەتی لە رێوشوێنە سیاسی و هەرێمایەتییەکان بگیری، هەروەها مەبەستی تورکیا لە رێککەوتنەکە بەدەستهێنانی لایەنگری لۆبی جولەکە بوو، لە ناو ئەمریکا، بۆئەوەی لە گاریگەرییەکانی لۆبییە یۆنانی و ئەرمەنییە نەیارەکان کەمبکاتەوە، سەیری : عماد الضميري، المصدر السابق، ص111.

(2) - عقيل محفوظ، المصدر السابق، ص ص 287–288.



دەبینی ببیتەوە فاکتەری راکێشانی وڵاتانی عەرەبی میانڕەو وەکو ئوردەن بۆ پێکهێنانی پەیوەندی ئاسایی لەگەڵ ئیسرائیلی هاوپەیمانی ستراتیژی[1].

دەیەی نەوەدەکان، نزیکبوونەوەیەکی گەورەی لە بیروڕای ئەمریکی–تورکی بە خۆیەوە بینی، لەبارەی گرێدانی کۆنگرەی ئاشتی مەدرید، کە ساڵی 1991 لە نێوان فەلەستینییەکان و ئیسرائیلییەکان بەسترا، واشنتۆن وادەبینی کە تورکیا کۆڵەگەیەکی گرنگی پرۆسەی ئاشتی عەرەبی–ئیسرائیلییە[2]. هەروەها پلانەکانی ئەمریکا لە ئاسیای ناوەند و شوێنانی دیکە ئاسان دەکات، مارك کرۆسمان Mark Crossman ی بالیۆزی ئەمریکا لە تورکیا (1994–1997) ئەمەی بەم جۆرە دەربڕی و گوتی: **"هاوکارییەکانمان لە کێشە هەرێمایەتییەکان بە شێوەیەك فراوان دەکەین، کە تورکیا بتوانێ ببێتە لایەنێکی گرنگی پرۆسەی ئاشتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. لە ئەمریکا توانایەکی گەورە بۆ پاڵپشتیکردنی پلانەکانی تورکیا و ئیسراسل لە ئاسیای ناوەند، هەیە"**[3].

ئۆزال بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی مەدرید بە پەرۆش بوو، دووبارە باسی لە پرۆژەی لولەکێشی ئاشتی کرد[4]، لە 18 ئەیاری 1991 گوتی: **"کێشەی ئاو**

---

(1) -Kemal Krişci, Op. Cit., P. 135.

(2) - بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی بووچونی تورکیا لە بارەی پروسەی ئاشتی عەرەبی–ئیسرائیلی سەیری:
Bulant Aras, the Palestinian–Israel Peace Process in International Context with a Note on the Consequences for Turkish Foreign Policy, M. A. Thesis, Bogazici University, Istanbul, 2001, Pp. 154-159.

(3) -George E. Gruen, "Turkey and the Middle East after Oslo", in: Robert O. Freedman (ed), The Middle East and the Peace Process, The Impact of the Oslo, Baltimore Hebrew University, Florida, P. 202.

(4) – بیرۆکەی پرۆژەکە بۆ ساڵی 1986 دەگەڕیتەوە، کاتێ کۆمپانیای براون ئاند رۆدی ئەمریکی، توێژینەوەیەکی لەبارەی سوودی پرۆژەکە ئامادەکرد و گەیشتە ئەوەی کە پرۆژەکە لەلایەنی تەکنیکی و ئابوورییەوە دەتوانێ دوو لولەکیش ( یەکێکیان رۆژئاوا و ئەوەی دیکەیان لولەکێشی کەنداوە) لە باشووری کەنەداو بۆ گواستنەوەی 6 ملیۆن مەتر چوارجا ئاو لە زیادە ئاوی رووبارەکانی (سەیحان و جیجان) بۆ وڵاتە عەرەبییەکان، درێژ بکاتەوە، تیچووی لولەکێشی رۆژئاوا بە 8.5 ملیار دۆلار و ئەوەی کەنداویش بە 12.5 ملیار مەزەندە کرا و ماوەی=

**لە سووریا و ئوردەن و فەلەستین و ئیسرائیل و نیمچە دورگەی عەرەبی هەیە، تورکیا تاکە سەرچاوەی ئاوی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، بۆیە بانگی دامەزراندنی پرۆژەی لولەکێشی ئاشتیمان کرد، ئاو بەوڵاتانی عەرەبی و کەنداو دەفرۆشین، هەرچی بۆ ئیسرائیلە ئەوا بەرامبەر ئاشتی ئاوی پێ دەفرۆشین چونکە بەبێ ئاشتی ئەو پرۆژە جێبەجێ ناکرێت"**[1]، ئەم هەنگاوە بووە مایەی پێشوازی لە واشنتۆنەوە[2]، کـە هـانی تورکیـای دا، هاوپـەیمانی دیکـەش لـەخۆ بگریـت، ئەویش ئوردەن بوو، بۆئەوەی ببێتە **"نموونەی دەرکەوتنی ئەنـدازەی ئـەمنی یـان هاوپـەیمانی نـوێ لـە ناوچـەگە گرنگەکـە"**، کـە ئـەمریکا بـەپێی رۆڵـە

= تەواوبوونیشی لە نێوان 8 تا ساڵ دەبیت و تەمەنە چاوەڕێ کراوەکـەی 50 سـاڵ دەبیـت، تێچووی دەستکەوتنی یەك مەترچوارجا ئـاوی لولەکێـشی رۆژئـاوا بـە 84 سـەنت و لولەکێـشی گەنداو بە 1.7 دۆلار مەزەندە کرا بە بەراورد لەگەڵ ئاوی ویستگەکانی چارەسـەرکردنی ئـاوی دەریـا. ئەگـەر پرۆژەکـە جێبـەجێ بکرابـا تورکیـا بـە بـەهای 2 مليـار دۆلار سـاڵانە داهـاتی دەستدەکەوت، بیرۆکەکە یەکەمجار بـە شـێوەیەکی فـەرمی لـە کۆنگرەی سـێیەمی سـەنتەری توێژینەوەی ستراتیژی و نێودەوڵەتی زانکۆی جۆرج تاوەنی ئەمریکی، ورژێنـرا، کۆنگرەکـە لـە 1987/6/25 لە ژێر ناوی ( سیاسەتی ئـەمریکا لەبەرامبـەر دەرامەتـە ئاوییـەکانی رۆژهـەڵاتی ناوەڕاست)، تورکان لە میانەی کۆنگرەکەدا بـە شـێوەیەکی فـەرمی پـرۆژەی ئـاوی ئاشـتییان باسکرد، بۆئەوەی ئاو بە سووریا و ئوردەن و شەش وڵاتەکەی دیکەی گەنداوی عەرەبی بـدات، تورکیا بۆیە ناوی پرۆژەکەی بەم ناوەوە نـاو نـا، لەبـەر ئـەو بـاوەڕە بـوو کـە ( گەشـەدان بـە پەیوەندییەکانی هاوکاری ئابووری نێوان دەوڵەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، سـوودی هاوبەشـی لە بەگەڕخستنی دەرامەتـە ئاوییـەکان لـێ دەکەوێتـەوە، هـەروەها تونـدی نائـارامی ناوچـەکە کەمدەکاتەوە...) پرۆژەکە تەنها وەك مەرەکەبی سەر وەرەقە مایەوە، بەهۆی تێچوونەکەی و درێژی ماوەکەی، بەڵام ناوە ناوە باس دەکرایەوە، هەروەها لەلایەن دەوڵـەتانی عـەرەبی وەك سووربا و عێراق بە توندی رەت دەکرایەوە، بۆ وردەکاری زیاتر لـە بـارەی پرۆژەکـە سـەیری: جلال عبد الله معوض، "تركيا والامن القومي العربـي: الـسياسة المائيـة والاقليـات"، المـستقبل العربي، العدد 160، بيروت، حزيران 1992، ص ص 107–108؛

George E. Gruen, Op. Cit., P. 201.

[1] - جلال عبدالله معوض، تركيا والامن القومي...، ص 111.

[2] -Kemal Krişci, "Turkey and United states: Ambivalent Alliance", Middle East Review of international Affairs, vd.2. No. 4, December, 1998, P. 21.



باڵادەسـتەکەی لـە پەیوەندییـە نێودەوڵەتییـەکان، توانـای کاریگـەر نوانـدنی زیاتری لەو ناوچانەی کە ئـەو وڵاتانـە تێدا دەژین، هەیـە[1]. لـە چوارچـێوەی هەوڵەکانی ئـەمریکا بـۆ چارەسـەرکردنی ململانێـی عـەرەبی–ئیسرائیلی، ئـەوا نێوەندە سیاسـییەکانی تورکیـا چـاوەڕوانی ئـەوەیان دەکـرد، کـە ئـەمریکا لـە چوارچێوەی رێککەوتننامەی (ئیسرائیلی–سووری) فشار بخاتە سەر ئەنقەرە و رازیی بکات کە داواکارییـەکانی سـووریا تایبـەت بەدابەشـکردنی ئـاوی رووبـاری فورات لەبەرامبەر دەستبەرداربوونی سووریا لە سەرچاوە ئاوییـەکانی بەرزاییـەکانی جۆلان بۆ ئیسرائیل، جێبەجێ بکـات. هەرچـەندە هەنـدێ لـە تورکـان نـارازیبوونی خۆیـان پیـشاندا، بـۆ ئـەوەی تورکیـا بـەم شـێوەیە بکرێتـە **"قوربـانی پرۆسـەی ئاشتی"**، بەڵام ئەمە کاریگەری لە هەڵوێستە بەهێزە سیاسییەکانی ئەنقەرە نەکرد، کە پاڵپشتی لە هەوڵەکانی ئەمریکا لەم بوارە دەکات[2].

دۆسیەی ناکۆکییەکانی تورکیا – یۆنان بواریکی گـەورەی لـە گرنگییـەکانی ئەمریکا داگیرکرد، بەرژەوەندییەکانی ئـەمریکا وایخواسـت کـە تورکیـا و یۆنـان دۆست بن و بە دوو وڵاتی هاوبەشـی سـتراتیژی وەك هاوپـەیمان بـۆ ئـەمریکا و رۆژئـاوا بمێننـەوە، بـەردەوامبوونی ئاشـتی و دووبـارە نەخشەکێـشان بـۆ بونیادنانـەوەی بـەلقان، بەشـێوەیەکی سـەرەکی لەسـەر مـەودای وڵامدانـەوەی ئەسینا و ئەنقەرە بەندە، هەردوولا قورساییە گەورەکـەی پرۆسـەی گۆڕانکـاری ستراتیژی ناتۆ بەرەو باشوور وە ئەستۆ دەگرن. هەروەها هەردووکیان دەتوانن بەشداری لە سەرکەوتنی **"رێوشوێنەکانی ئاشتی"** کـە ئـەمریکا لـە رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت پێـی هەڵدەسـتێ، بکـەن، هـەروەها دەتـوانن ببنـە کۆگـای وزە و دەروازەی گرنگـی دابینکردنـی سەرچـاوەکانی وزە لـە ناوچـەکانی کەنـداوی عەرەبی و دەریای قەزوین، بـۆ یـەکێتی ئـەورووپا. هـەروەها ئـەمریکا بەشـێکی بنەرەتی بونیادنان و ئەندازەی هـەر پرۆژەیـەکی **"بـەرگری دژە رۆکـێتی"** بـە

[1] - هنري جيه باركي، المصدر السابق، ص ص 676–675.

[2] - هاينس كرامر، المصدر السابق، ص 385.

هەردوولاداوە، کە بەرامبەر هەڕەشە هاتووەکانی سنوورەکانی ناتۆ لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست[1].

هەرچەندە کاریگەری خراپی ناکۆکییەکانی تورکیا—یۆنان لەسەر گەشەی پەیوەندییەکانی ئەمریکا — تورکیا مایەوە، هەروەها زیاتر لە گرژییەك لە نێوان تورکیا و یۆنان لە ماوەی نەوەدەکان روویدا، ئەوا واشنتۆن هەولێکی زۆری بۆ گرتنەبەری سیاسەتی "**ئارامکردنەوە**" و "**هاوسەنگی**" بەبێ ئەوەی گوێ بە گرووپەکانی فشاری یۆنانی ناو کۆنگرێسی ئەمریکی بدات، ئەمەش بەلەبەرچاوگرتنی گرنگی ستراتیژی روو لە زیادی تورکیا، بەشێوەیەکی زیاتر لە یۆنان، لە چوارچێوەی ستراتیژی ئەمریکا[2]. هەر لەم چوارچێوەیەدا واشنتۆن توانی وابکات ناکۆکییەکان نەگەنە رووبەڕووبوونەوەی سەربازی لە نێوان تورکیا و یۆنان، هەرچەندە ناکۆکییەکانی تورکیا—یۆنان ئالۆز و قووڵە، دیپلۆماسییەتی چڕوپڕی ئەمریکی توانی وا لە هەردوولاکە بکات زنجیرەیەك ڕێککەوتننامەی ورد لەبارەی هەوڵەکانی بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەکانیان بە ئاشتییانە، ساز بکەن[3]. لەم بۆنەیەدا دەتوانین ئاماژە بە ڕۆڵی واشنتۆن لە چارەسەکردنی تەنگژەی هەردوو دورگەی (ئیمیا—کارداك Imia-Kardak)[4] لە ساڵی 1995 بکەین، بانگەشە دژبەیەکەکانی تورکان و یۆنان لەبارەی موڵکییەتی دوو دورگەکە، خەریك بوو بۆ ململانێیەکی سەربازی لە نێوان هەردوو وڵات بگۆڕێت[5]، ئەگەر بیل کلینتۆنی سەرۆکی ئەمریکی و هەندێ لە

(1) -Ian O. Lesser, "Turkey, Greece, and the U.S. In a Change Strategic Environment", Published by RAND, Santa Monica, 2001, Pp.5-9.

(2) - جلال عبد الله معوض، صناعة القرار في تركيا...، ص 265.

(3) - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص 290.

(4) -کارداك" ناوە تورکییەکەی دورگەکەیە، کە دورگەیەکی شاخاوی بێ ئاوەدانییە، ئەنقەرە رازی نابیت بە یۆنانەوە بلکێندرێت، هەرچی ئەمیایە ئەوا ناوە یۆنانییەکەیەتی. هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص 289.

(5) -George S. Harris, Op. Cit., P. 191.



سەرکردە سیاسییەکانی ئەمریکا، بە پاڵپشتی جولانەوە دیپلۆماسییەکانی خافێر سۆلانەی ئەمینداری گشتی ناتۆ نەبا لە نێوان هەردوولا[1].

هەرچی پرسی ئاڵۆزی قوبرس بوو، هەرچەندە ئامانجی ئەمریکا لە قوبرس هێشتنەوەی قوبرس بوو بە "**ئیتیحادێکی پیکهاتوو لە دوو تایەفە و دوو هەرێم**"، بە بوونی دەوڵەتێك کە دوو جۆر رەگەز لە دوو هەرێمدا بژین، هەریەکەیان خودان ئۆتۆنۆمییەکی دیاریکراوی خۆی بێت، تورکیا لەمەدا لەگەڵی ناکۆك بوو، جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە پێشوەختە دەبێت دان بە کۆماری تورکی قوبرسی باکوور دابنرێت، بەڵام پلەی ناکۆکییەکە نەگەیشتە ئاستی "**بەیەك نەگەیشتنی بەرژەوەندییەکان**"، ڕێککەوتنی هەردوولا لەسەر بەهێزکردنی ئارامی دورگەکە، ئەمریکا ڕێگەی نەدا تورکە قوبرسییەکان سیستەمی ڕۆکێتی (S-300) ی دژە فڕۆکەی رووسی وەربگرن، ئەمانە پێگەی وەرگرتنی ڕێوشوێنی بونیادنانی متمانە لە نێوان قوبرسییە یۆنانییەکان و تورکان پێکهێنا[2]، ئەمانەش تارادەیەکی زۆر بەشداری لەباشترکردنی پەیوەندییەکانی یۆنان—تورکیا لە دەیەی نەوەدەکان کرد، هەروەها بەشداری لە بەهێزکردنی ئەو لێکنزیکبوونەوەیە کرد، کە وایکرد یۆنان لە بەهاناوەچوونی لێقەوماوانی بومەلەرزەی ساڵی 1999 لە تورکیا بەشداری بکات[3]. باشتربوونی

(1) - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص290.

(2) - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص388.

(3) - مەرگەساتی بوومەلەرزەی ئابی 1999، بۆنەیەك بوو بۆ هەریەکە لە تورکیا و یۆنان بۆ دەستپێکردن بە بەرژەوەندی سیاسی چالاك، ئەو بوومەلەرزەیەی کە لە ئەستەمبۆلی دا، بی هێزی و گەندەلی حکوومەتی تورکیای بەدەرخست، تا رادەیەکی وا نەتوانێ بەهانای لیقەوماوان بیت، ئەمەش وای لە دەزگاکانی راگەیاندن کرد، بە توندی رەخنەی لێبگرن، بە شێوەیەك کە وای لە حکوومەت کرد بوار بە دامەزراوە نا حکوومییەکان لە بەهاناوەچوونی لێقەوماوان بدات و پێشوازی لە یارمەتییە نێودەوڵەتییە مرۆییەکان، کرد. یۆنان بە حکوومەت و گەلەوە لە پێشەوەی ئەو وڵاتانە بوو کە وەڵامی بانگهیشتەکەی تورکیای دایەوە، ئەمە بووە هۆی پەرەسەندنی پەیوەندییەکان بە شێوەیەکی راستەوانە، هەتاکو بوومەلەرزەکە رۆلێکی هەستیاری گێڕا لە لوتکەی هەلسنگی کانوونی یەکەمی 1999 لە رەت نەکردنەوەی یۆنان بۆ بریاری پاڵاوتنی تورکیا لە یەکێتی ئەورووپا، وەك پاڵێوراوێکی تەواو. Kemal Krişci, "U.S.-Turkish Relations…", Pp.143-144.

پەیوەندییەکانیان وایکرد، یەکێ لە فاکتەرە بنەرەتییەکانی شلەژان لە پەیوەندییەکانی ئەمریکا — تورکیا لە بەین بچێ[1]، هاوکاری هەردوو ولاتەکە لە یارمەتیدانی لێقەومانی بوومەلەرزەکە کاریگەرییەکی باشی لە کۆنگرێسی ئەمریکی هەبوو، کە وایکرد لە تشرینی یەکەمی 1999 بریارێك دەربکات و هاوسۆزی بۆ قوربانیانی بومەلەرزەکە پیشان بدات، هەروەها داواشی لە هەردوولا کرد، هەولّی زیاتر بۆ چارەسەری ناکۆکییەکانیان بە رێگەی گفتوگۆ بدەن. هەروەها ئاماژە لە کۆنگرێس دەرچوو بە کێشانەوەی نارەزایی لەسەر هەناردەکردنی چەك بۆ تورکیا[2].

لە ناوچەی ئاسیای ناوەند، کە پێنج کۆماری سەربەخۆ (تورکمانستان، تاجیکستان، کازاخستان، قیرغیزستان و ئۆزبەکستان) دوای هەلوەشتاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت دەرکەوتن، دیدگای بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا– تورکیا لە هەمەجۆر بواری ئابووری و ئەمنی و سیاسی و سەرچاوەکانی وزە و وەبەرهێنان[3] و پەراوێزکردنی ئەو ولّات و رژێمانەی کە کار لە دژی بەرژەوەندییەکانیان دەکات، لەسەری هەموویانەوە رووسیا و ئێران. پەرەسەندنەکانی دواتر ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە سیاسەتەکانی ئەمریکا ئەژێندا و ئامانجی قوول و دووری هەلگرتووە، یەکەمیان کە سووکترینیانە ئەوەیە **"ناوچەی بەرژەوەندییەکانی ناتۆ لە خانەوادەی ولّاتە سەربەخۆکان بە هیواشی فراوان بکات"**. لەوانەیە، ئەرکە ئاشکراکەی ئەمریکا لەبواری **"بەهێزکردنی دیموکراسییە نوێکانی زەوییەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو"**. پێویستی بە بەکارهێنانی تورکیایە وەك دەروازیەك[4] بۆ پێدا رۆیشتن بۆ ئەو شوینانە، ئەویش بەوە دێتە دی کە تورکیا خەسلّەتی **"برا گەورە"** لە وابەستە

---

[1] -Sabri Sayari, Op. Cit., P. 33.

[2] -Kemal Krişci, "U.S.-Turkish Relations…", P.144.

[3] - اوليفية روا، "الجيوستراتيجيا الجديدة في أسيا الوسطى"، شؤون الأوسط، العدد 78–79، بيروت، كانون الاول 1998– كانون الثاني1999، ص ص 29–39.

[4] - ميشال يمين، "تقدم حلف شمال الأطلسي شرقاً استمرار لنهج الحرب الباردة"، شؤون الأوسط، العدد 68، بيروت، كانون الأول 1997–كانون الثاني 1998، ص 158.



ئەتنی و ئایینی و کلتووری و زمانەوە بەکارهێنانی، بۆ نموونە ئازەربایجان کە کلیلی نەوتی قەزوین و ئۆزبەکستانە و کۆسپی سەرەکییە لەبەردەم دەستتێوەردانەکانی رووسیا لە ئاسیای ناوەند[1].

لەگەلّ هەلّوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت، ئەنقەرە لە ئاسیای ناوەند خۆی لەبەرامبەر **"دونیایەکی تازەدا"** بینی، دونیایەك ویستی پێی گاریگەر بیت. کۆمارە نوێکان بە پەرۆش و پێشوازییەکی گەورەوە لەلایەن بەشێکی فروانی دەستەبژێری ولاتەوە پەسند کرا، ژمارەیەك ناوەندی توندرەوی وەك لە نێوەندەکانی (پارتی بزووتنەوە نەتەوەیی)[2] دا هەبوو، بیروڕا و گوتاریکی زۆریان لەبارەی یەکێتی نەتەوە تورکەکان بە سەرۆکایەتی تورکیا کە لە دوا وێستگەدا دەبێتە **"هێزێکی سیاسی بەتوانای وا کە دانی پێدادەنرێت و لە توانای دا دەبێت بەشداری لە پرۆسەی دارشتنی رژێمی نوێی جیهان، بۆ ئەو کۆمارانە دەنارد"**[3]. ئەو مەیلە لەلای زۆریك لە سیاسەتوان و هاوولّاتیانی ئەو کۆمارانە بە پرۆشەوە وەرگیرا، باس لەوە دەکرێت، کە شاعیرێکی قیرغیزسی

---

[1] -Hooman Peimani, Regional security and the future of Central Asia: the competition of Iran, Turkey, and Russia, Praeger Publishers, Westport, Connecticut, London, 1998, P. 84.

[2] – پارتی بزووتنەوەی نەتەوەیی: رەگ و ریشەی پارتەکە بۆ سالّی 1948 دەگەڕیتەوە، پێشتر پێی دەگوترا پارتی ئوممەت، دواتر لە سالّی 1954 بوو بە پارتی نیشتمانی جووتیاران، لە ئابی 1965 (ئەلەب ئەرسەلان تورکیش) سەرکردایەتی پارتەکەی زەوت کرد و لە تەمووزی 1968 دامەزراندنی سەربازگەی مەشقی بۆ لاوە نیشتمانپەروەر توندرەوەکانی پارتەکەی، راگەیاند، ئەو رێکخراوە چەکدارانە زنجیرەیەك دەستدرێژی کردە سەر نەیارەکانی، لەوەتەی نیسانی 1969 ەوە کۆماندۆزەکانی پارتەکە کە پێیان دەگوترا ( گورگە بۆرەکان) چەندین چالاکی کوشتنیان ئەنجام دا، هەروەها دەستدرێژییان بۆ سەر چەند بالیۆزخانەیەکی بیانی کرد، لە کانوونی دووەمی 1971 دەستیان بە شەڕی پارتیزانی کرد و بەنکەکانیان دەدزی، لە سالّی 1985 پارتەکە بەناوی ( پارتی کاری نەتەوەیی) گەڕایەوە، دواتر لەسالّی 1993 بۆ ناوە کۆنەکەی ( پارتی بزووتنەوەی نەتەوەیی) گەڕایەوە، ینظر، ابراهیم خلیل احمد وآخرون، إبراهيم خليل احمد وآخرون، تركيا المعاصرة، مركز الدراسات التركية، جامعة الموصل، 1987،ص ص 173–174.

[3] - هاينتس كرامر، المصدر السابق، ص171.

لەسەروبەندی سوڕانەوەکانی ئۆزال بە ئاسیای ناوەند لە ساڵی 1993، بەم دوو دێرە شیعرە پێشوازی لێ کرا: "**کۆچتان کرد [لە ئاسیای ناوەند] بەسەر ئەسپ و چاوتان مەغۆلیە و بە فرۆکە گەرانەوە و چاوتان شینە**"[1]. هەرچی سلێمان دیمیریل بوو رایگەیاند کە "**تورکیا ئامادەیە بەرپرسیاریتی لە ئەدریاتیك تاکو دیواری مەزنی چین لە ئەستۆ بگریت**"[2]. تورکیا لە وڵاتە یەکەمینەکان بوو کە دانی بە سەربەخۆیی ئەو کۆمارانە نا و بە پەرۆشەوە پاڵپشتی لە رژێمە نوێکانی ئەوێ کرد، سەرباری جۆرجیا و ئۆکرانیا و مەکدۆنیا و هەتاکو ئەرمینیاش، ئەمەشی لەبەر ئەوەبوو، تاکو رێگە لە دووبارە بونیادنانەوەی یەکێتی سۆڤیەت، بگرێت، یا هەر شێوەیەکی دیکەی "**ئیمپراتۆرییەتی تازەی رووسی**"، لەترسی ئەوەی نەوەکو ناوچەکە تووشی پرۆسەیەکی بە ئیسلام بوون، لەسەر دەستی رەوتە فەندەمێنتالیزمە ئێرانییەکان، بێت[3]. بەڵام ئەم پەرۆشییە و ئاواتەی تورکیا بۆ بەدیهێنانی خەونەکەی بەبێ بەدەستهێنانی پاڵپشتی یەکلاکەرەوەی ئەمریکا، دەبووە خەونێکی دوورە دەست[4].

ئەمریکا بەپەلە هانی ئەنقەرەی دا بۆ ئەوەی هەوڵ بدات رۆڵی سەرکردایەتی لە پەرەسەندنەکانی ئەو کۆمارە تازە سەربەخۆیانە بگێرێ، هەروەها تورکیای وارازاندەوە کە نموونەیەکی رۆژئاوایی دژ بە نموونەی ئێرانییە لە ئاسیای ناوەند و فاکتەرێکی بنەرەتییە بۆ یارمەتیدان لە دامەزراندنی رژێمی سکولاریزم (عەلمانی)ی لایەنگر بۆ رۆژئاوا لە کۆمارەکانی پێشووی سۆڤیەت[5]. تورکیا بە پەرۆش بوو بۆ رۆڵ بینینە نوێیەکە و، هەر زوو خۆی وەك بازنەی گەیاندن لە

(1) - اوليفية روا، المصدر السابق، ص38.

(2) -Stephen J. Blank, " Turkey's Strategic Engagement in former USSR and U.S. interests" in, Stephen J. Blank and Others, Turkey's Strategic Position at Crossroad of World Affairs, Strategic Studies Institute, U.S., December, 1993, P. 69.

(3) -Kemal Krişci, "Turkey and United States…", P. 20.

(4) -Stephen J. Blank, Op. Cit., Pp. 69-70.

(5) - هاينتس كرامر، المصدر السابق، ص 171–173.



نێوان کۆمارە لاوەکان و ویلایەتە یەکگرتووەکانی پێشکەش کرد[1]. سەرۆك ئۆزال، کاتێ لە کانوونی یەکەمی ساڵی 1991 لە کۆنگرەی (پێداویستییەکانی تورکیایی ستراتیجی) کە لە ئەستەمبۆل بەسترا، وتەیەکی پێشکەشکرد، ئەو رۆڵ بینینە نوێیەی دەربڕی و گوتی: "**تورکیا لە کۆتایی سەدەی ئێستا دەبێتە هێزێکی مەزن، ئەمەش نەوەك بەهۆی رەوشی ئێستاوە، بەڵکو لەبەر ئەو رۆڵەی کە دەرەوە داوای لیکراوە**"[2]. دروشمی "**جیهانی تورکی لە ئەدریاتیك بۆ دیواری چین**" لە واشنتۆنەوە پێشوازی لێکرا، ئەمریکا گرەوی لەسەر توانای تورکیا لە پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کە کۆمۆنیزم بەجێیهێشتووە، کرد[3]. ئەمریکا هەوڵی دا ئەو کۆمارانە بە هەڵبژاردنی نموونەی تورکی بە هەموو لایەنە دیموکراتی و عەلمانی و ئابووری بازاڕەوە رازی بکات، جۆرج بۆش بەخۆی ئەو دیدگایەی راستەوخۆ بۆ سەرۆك وەزیرانی تورکی دیمیریل گواستەوە: "**تورکیا دۆست و هاوبەشی ئەمریکایە و نموونەشە بۆ ئەوانی دی، بەتایبەتی بۆ کۆمارە تازە سەربەخۆکانی ئاسیای ناوەند، تورکیا منارەیەکی گەشاوەیە لە ناوچەکە، تەوژمەکانی دەگۆڕین**"[4]، هەروەها ئەمریکا 190 قوتابی ئەمریکی بۆ فێربوونی زمانی تورکی ناردە تورکیا، بۆئەوەی لە ئەرکی جۆراوجۆر لەو کۆمارانەدا بەکاریان بهێنێت[5].

دیاریترین گۆڕەپانی هاوکاری و هەماهەنگی تورکیا و ئەمریکا لەو کۆمارانە بواری وزە و کاری بازرگانی بوو، ئەو هاوکارییەی کە بەهۆیەوە دەتوانرا، یەکێ

(1) -Patricia M. Carley, "Turkey and Central Asia: Reality Comes Calling", in, Regional Power Rivalries IN THE New Eurasia, Russia, Turkey, and Iran Alvin Z. Rubinstein and Others (ed), M. E. Sharpe, Inc., New York, London, England, 1995, P.194.

(2) - إبراهيم خليل احمد العلاف، "صراع النفوذ التركي–الإيراني في جمهوريات قفقاسيا واسيا الوسطى الإسلامية"، في: عوني عبد الرحمن السبعاوي آخرون، جمهوريات اسيا الوسطى وقفقاسيا: الجذور التاريخية والعلاقات الاقليمية، مركز الدراسات التركية، جامعة الموصل، الموصل، 1993، ص 118.

(3) -Omer Goksel lsyar, Op. Cit., P. 32.

(4) - سالار اوسي ويوسف إبراهيم الجهماني، المصدر السابق، ص 80.

(5) - إبراهيم خليل احمد العلاف، "صراع النفوذ التركي–الإيراني…، ص 124.

لە ستراتیژە گرنگەکانی ناتۆ لە دروستکردنی "**پشتینەیەکی تورکی**" لە کۆمارە تورکییە تازە سەربەخۆکان، بۆئەوەی رووسیا لە دەرەوەی پرۆژەکانی وزە و راکێشانی بۆری نەوتی بەناو ئەو ناوچانە و "**تاك باڵادەستی**" بەسەر دەریای رەش بهێڵێتەوە[1].

تورکیا ویستی لە پرۆسەکانی پەرەپێدان و خستنە بازاڕی سامانە نەوتی و گازییە گەورەکانی ناوچەی دەریای قەزوین و تورکمانستان و کازاخستان و ئازەربایجان بە پلەی یەکەم بەشداری بکات، ئەمەش وەك هەوڵێك بۆ چارەسەری خواستی زۆری وڵاتەکەی بۆ وزە، ئەمەش لە رێگەی بەدەستهێنانی دەستکەوتی بە بەهای ئابووری لە هێڵەکانی بۆری و ئەو ئامرازانەی لە پارچەکانی ئەو هێڵانەدا بەستراون، هەروەها بەهێزکردنی گرنگی ستراتیژی وڵات لەلای وڵاتانی ئاسیای ناوەند و هاوپەیمانە کلاسیکییەکانی لە رۆژئاوا. لە پێناوی بەدەستهێنانی ئەمە، بە پلەی یەکەم سەرکەوتنی سیاسەتە نەوتییەکانی لە قەزوین پێویستی بە پاڵپشتی سیاسی ئیدارەی ئەمریکی هەیە[2]، کە بە پەرۆشەوە سەرقالی گەران بوو، بەدوای دۆزینەوەی رۆڵێك بۆ ئەمریکا. جیمس بێکەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەبەردەم ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکی لە شوباتی 1992 رایگەیاند کە یەکێ لە هۆکارەکانی دەستپێکردن بە سەردانەکەی 9 ی شوباتی 1992 بە کۆمارەکانی ئاسیای ناوەند "**لەبەر چالاکی دیپلۆماسی ئێرانی بوو لەو کۆمارانە، بۆیە ئاساییە کە ئەمریکا لەم کێبڕکێیەدا لە پاڵ تورکیا بوەستێ**"[3]. لەهەمان رێرەودا بانگەشەی تورکیا لە کانوونی یەکەمی 1994 بۆ دامەزراندنی هێڵی نەوت لە باکۆ بۆ بەندەری جیهانی تورکی لەسەر کەناری دەریای ناوەڕاست، پاڵپشتی و هاندانێکی فەرمی لە ئەمریکاوە بەدەستهێنا، ئەمریکا بە نیگەرانییەوە بە چڕی چاودێری پرۆژەی هاوشێوەی دەکرد، کە دەخوازرا بۆری بەناو ئێران و ئەرمینا

(1) -Stephen J. Blank, Op. Cit., P. 69.

(2) - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص ص 177–180.

(3) - محمد نور الدین، ترکیا في الزمن ...، ص ص 214–215.



تیبپەرێنێ، ئەوەی دیکەیان رووسیا بۆ گواستنەوەی نەوت لە کێڵگەی (تەنکیر و کازاغستان) بۆ بەندەری (نوفۆ–راسیسك)ی رووسی لەسەر دەریای رەش[1]. لەو کاتەی کە روون بووەوە کە هەردوو رێرەوەکەی دوایی (ئێرانی–رووسی) تێچووی لە ریرەوی تورکی کەمتر بوو، بەڵام واشنتۆن بە توندی رەتی دەکردنەوە، لەسەر جێبەجێکردنی پێشنیارەکەی تورکی سوڕبوو[2]، لەوەتەی کۆتاییەکانی ساڵی 1997، تیمێکی کاری تورکی ئەمریکی هاوبەش تایبەت بە دەرامەتی وزە پێکهێنرا، کە ژمارەیەك شارەزای لە خۆگرتبوو، تیمەکە بەسەرۆکایەتی ستڕۆب تالبوت Strobe Talbott ی یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بوو، بەمەبەستی ریکخستنی سیاسەتی ئەمریکا. ئیدارەی کلینتۆن لەو باوەڕەدابوو، کە ئەو پەرەسەندنانەی لە دەریای قەزوین روودەدەن، کاریگەرییەکی زۆری لە پرۆسەی دارشتن و پێکهێنانی جیهانی دوای کۆمۆنیزم و دەسەڵاتی ئەمریکی لە پرۆسەکە هەیە. بیل ریچارد B. Richardson ی وەزیری وزەی ئەمریکی، ئەو گرنگییەی روونکردەوە، کاتێ گوتی: "**کێشەکە بە ئاسایشی ئەمریکاوە لە بواری وزەوە بەندە، ئەو ئاسایشەی کە پێویستی بە هەمەجۆرکردنی سەرچاوەکانمان بۆ نەوت و گاز لە ئاستی جیهانی هەیە... هەروەها پەیوەندی بە دوورخستنەوەی ئەوانەوە هەیە، کە باوەریان بە بەهاکانی ئیمە نییە، بۆئەوەی بەم شوێنە ستراتیژییانە نەگەن**"، ئێران دەکەوێتە ناو ئەو تێبینییەوە، چونکە بە تێروانینی ئەمریکا "**ئێران رەگەزی سەرەکی نائارامی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، لەرێگەی داڵدەدانی تیرۆر و بڵاوکردنەوەی فەندەمینتالیزمی ئیسلامی و هەوڵدانی بۆ بەدەستهێنانی چەکی ناوەکی**"، ستیوارت ئەیزنشتات S. Eisenstadt ی یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، دوای سەردانەکەی بۆ پاریس لە مانگی شوباتی 1998 ئەو

(1) - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص ص 179–180.

(2) -Henri J. Barkey, "The Endless Pursuit: Improving U.S-Turkish Relations", in: Morton Abramowitz (Ed), The United States and Turkey: Allies in Need, A Century Foundation Book, New York, 2003, P. 314.

تێبینییەی خوارەوەی بۆ هاوبەشە ئەوروپییەکانی گواستەوە: **"ئێمە تەواو باوەڕمان وایە کە نابێت مۆڵەت بە درێژکردنەوەی ئەو بۆڕییانە بەناو ئێران بدەین. هیچ بواری دوودڵی و پاساو و بەهانە هێنانەوە نییە"** لەبری ئەوە ئەمریکا هەوڵدەدات، **"هانی دۆزینەوەی دەروازەیەکی دیکە بدات کە نەوتەکە لە ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوا بە ناو دەریای قەزوین و قەوقازدا بڕوات"**. کە هێڵی باکۆ – جیهان بەشێکی گرنگی دەبێت[1]. لە هەمان چوارچێوەدا ئەمریکا دەسەڵاتی خۆی لەلای هەموو ئەو وڵاتانەی کە پەیوەندییان بەپرۆژەکەوە هەیە، چڕکردەوە، هەروەها لەلای ئەو لایەنە سیاسییانەی کە گرنگی پێدەدەن، لە پێناوی ئەوەی بوار بە دامەزراندنی هیچ هێڵێکی ئەلتەرناتیڤی پرۆژەکەی تورکی نەدرێت، تیمێکی شارەزا لەو وڵاتانە دیاریکرا و ژمارەیەکی زۆر لە شاندی پایەبەرزی ئەمریکی ڕەوانەی ناوچەکە کران، هەروەها دەستپێشخەری بۆ دابینکردنی پاڵپشتی دارایی بۆ وەبەرهێنان لەدەرەوە بەڕێخرا[2]. پلانەکەی ئەمریکا جگە لە بەشێك لە ستراتیژییەتی ئەمریکی ناسراو بە (دەورەدانی دوولایەنە) هیچی دیکە نەبوو، کە بتوانرێت ڕێگە لە تێوەگلانی زیاتری ئێران لە پلانەکانی ناوچەی دەریای قەزوینی تایبەت بە گواستنەوەی وزە[3] بگرێت. بە گوێرەی تێڕوانینی ئەمریکی پلانەکە ئامانجی بوو، هەڕەشەی ستراتیژی چاوەڕوانکراو کە خۆی لە **"فەندەمێنتالیزمی ئیسلامی کە ئێران سەرپەرشتی دەکات"**، دەورە بدات. بۆ سیاسەتمەدارانی ئەمریکی و ڕۆژئاوا، دەبوو بەرووی بڵاوبوونەوەی ئیسلامی ئسوڵی لە ناوچەی نائارامی سیاسی بوەستێت، ناوچەیەك بۆئەوەی ببێتە مۆڵگەی بێ بەرزەفتکردن بۆ بڵاوبوونەوەی چەکی وێرانکەر، بە ڕۆکێتی ناوەکیشەوە[4]. بۆیە سەیر نەبوو کە ئێرانییەکان تورکیا بە **"داردەستی ئەمریکا بۆ سەرکوتکردنی ئیسلامی**

(1) - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص ص 183–184.

(2) - للتفاصیل ینظر: المصدر نفسه، ص ص 184–186.

(3) - المصدر نفسه، ص 380.

(4) - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص 174.



**سیاسی"** لەو کۆمارە ئیسلامییانەی دوای هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت دروستبوون، تۆمەتبار بکەن[1].

یەکێ لە بوارەکانی دیکەی هاوکاری توندی ئەمریکی– تورکی لەو کۆمارانەدا، بەشداریکردن بوو لە بەڕێوەبردنی ناکۆکییە ئەتنیەکان و چارەسەرکردنیان، بە تایبەتی ململانێی ئازەربایجانی– ئەرمەنی لەسەر ناوچەی (ناگۆرنۆ کاراباغ)[2]، ئەمریکا هانی تورکیای دا کە پاڵپشتی لە ئازەربایجان بکات بەمەبەستی بەدیهێنانی هاوسەنگی، دوای سەرکەوتنە یەکبەدوای یەکەکانی ئەرمەنی[3]. ئەمریکا بە هەماهەنگییەکی تەواوەوە بۆ وەستانی ململانێی (ناگۆرنۆ کاراباغ) لەگەڵ تورکیا کاری کرد، تورکیا پاڵپشتی لە هەوڵەکانی ئەمریکا بۆ وەستاندنی ململانێی (ناگۆرنۆ کاراباغ) کرد، لە ئەنجامی ئەو هەوڵانە ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بڕیاری ژمارە (882)ی تایبەت بە وەستاندنی شەڕ لە ئازەربایجان دەکرد، تورکیا بەبێ سڵمینەوە لایەنگری ناردنی هێزی بۆ ناوچە کێشەدارەکە کرد و نیازی خۆی بۆ بەشداریکردن لەو هێزانە پیشاندا. بەڵام سەرجەم ئەم شێوە دەستێوەردانانە لەلایەن ئەرمینیا و رووسیا و ئێرانەوە ڕەتکرانەوە، رووسیا ئەوکات هێشتا داوای دەکرد کە دەبێت هێزی ئاشتیپاریز لەژێر سەرکردایەتی ئەودا بێت. حکومەتی تورکی نەیدەتوانی کاریگەری لەسەر ڕێڕەوی ڕووداوی ململانێکانی ئەرمەنی– ئازەربایجانی بنوێنێ، هەرچەندە هەمەجۆر یارمەتی پێشکەش بە ئازەربایجان کرد، ئەمەش لەبەرئەوەی ڕووبەڕووی ڕەتکردنەوەی گەورەی رووسی و ئێرانی بووەوە، هەروەها ڕووبەڕووی گرفتی گەورەی تایبەت بەو پەشێوییەی کە لە ئازەربایجان لە ناوەوەدا باو بوو، ببووەوە، بەڵام ئازەربایجان و ئەمریکا توانییان پرۆژەکانی وزە و هێڵەکانی نەوت لە باکۆ لەم ململانێیە بەدوور بگرن[4].

(1) - طلال یونس الجلیلي، "ناغورنو کاراباخ: التنافس والمتغیرات الدولیة"، في: خلیل علی مراد آخرون، المصدر السابق، ص 176.

(2) -Kemal krişçi, "Turkey and United States…", P.20.

(3) - طلال یونس الجلیلي، المصدر السابق، ص 177.

(4) -Stephen J. Blank, Op. Cit., Pp. 74-75.

"**سیستەمی تازەی جیهان**" لە دیدگای ئەمریکییەوە، بەواتای دووبارە ڕێکخستنەوەی کێشە نێودەوڵەتییەکانی کە لە دەرەنجامی ئەو گۆڕانکارییە قووڵانەی کە دونیا لەسەر هەردوو ئاستی سیاسی و ئابووری دوای کۆتایی شەڕی سارد و نەمانی ململانێی نێوان دوو جەمسەرەکە هاتۆتە کایەوە، بۆ بەلقانیش ئەوا سەرکەوتنی سیاسەتی "**دەورەدانی نوێ**" دژ بە ڕووسیا، بۆئەوەی ڕێگەی پێنەدرێت میحوەرێکی نوێ لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە وڵاتانی ئاوە گەرمەکان پێکبهێنێ، پێویستی بە پاککردنەوەی بەلقان هەیە لە دوایین دەستەبژێری جەنگی سارد، کە خۆی لە یەکێتی یوگسلاڤی دەبینێتەوە بەتایبەتی ئەگەر هاتوو ئەو دەستەبژێرە مەیلێکی نەتەوە پەرستی توندڕەوی هەبێت و هەوڵی بە سیاسەتکردنی مەیلە ڕەگەزی و ئایینییەکان لە ڕێگەی هەردوو تەوەری سلاڤی و ئەرسەدۆکسی بدات[1] و بیکات بە جێگرەوەی ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزمی ڕووخاوی یەکێتی سۆڤیەت.

ڕۆژەکەی ئەمریکا و هاوپەیمانە ڕۆژئاواییەکەی لە بەلقان دوای ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت ڕووبەڕووی تەگەرەی گەورە بووەوە، کە خۆی لە ڕەوشە ناهەموارەکەی ئەو ناوچەیە و ئەو پەشێوییەی کە لە یۆگسلاڤیا باو بوو، دەبینی. کە زۆری پێنەچوو بۆ ململانێی توندی ڕەگەزپەرستی پەرەی سەند، دەرەنجامەکەی هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی یۆگسلاڤی بۆ زیاتر لە قەوارەیەك بوو، لە سنوورەکانی یەکێتی ئەورووپا پرۆسەیەکی فراوانی پاککردنەوەی ڕەگەزی دەستپێکرد، ئەمریکا لە ڕوانگەی بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانییەوە، تورکیای بە دیاریترین کۆڵەگەی پرۆسەکانی دابینکردنی ئاشتی و ئارامی بەلقان و دووبارە کێشانەوەی نەخشەکان دەبینی، بە سوود وەرگرتن لە پێگەی جوگرافی تورکیا و بنکە سەربازییەکانی و بەکارهێنانی پەیوەندییە ئایینی و کلتوورییەکانی بە گەلانی موسوڵمانی ناوچەکە. سەرباری سوود وەرگرتنی لە قورسایی تورکیا لە ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی، بۆ وەدەستهێنانی پاڵپشتی

[1] - عمرو عبد الكريم سعداوي، النخبة السياسية الصربية: آخر نخب الحرب الباردة، ملف السياسة الدولية العدد (141)، تشرين الاول 1999، ص ص 86–87.



وڵاتانی ئەندام تێیدا، بۆ دابڕاندنی ڕژێمی سربی بەسەرۆکایەتی سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ[1]. تورکیا بە توندی داوای پاراستنی یەکێتییەکەی دەکرد و لە شوباتی 1992 دانی بە هەموو ئەو وڵاتانەی کە سەربەخۆیی خۆیان لە یەکێتی سۆڤیەت ڕاگەیاند نەنا. بەڵام کاریگەری پەرەسەندنە باوەکانی ناو یۆگسلاڤیا و دەستپێشخەرییەکانی وڵاتانی یەکێتی ئەورووپی بە دانانی بە هەریەکە لە کرواتیا و سلۆڤینیا و بۆسنە و هەرسك[2]، وای لە تورکیا کرد ڕووبەڕووی سەرکردە سربییەکان ببێتەوە[3].

سیاسەتەکانی تورکیا بە شێوەیەکی بنەڕەتی بە ئاراستەی پاڵپشتیکردن لە بەرژەوەندییەکانی موسوڵمانانی ناوچەکە دەچوو، کە ڕووبەڕووی لەناچوون و

[1] - هانتس کرامر، المصدر السابق، ص 259.

[2] – بڕیارەکەی پارتی کۆمۆنیستی یۆگسلاڤی لە کانوونی یەکەمی 1990 بە وازهێنانی لە دەسەڵات و ڕێگەدان بە هاتنە کایەی سیستەمێکی نوێ فرەیی لە وڵاتدا، بووە هۆی ئەوەی بەرەی ئۆپۆزسیۆن لە کرواتیا و سلۆڤینیا هەر زوو سەرکردایەتی ئاراستەی سەربەخۆیی کرد و لە تەمووزی 1991 سەربەخۆییان ڕاگەیاند، سربیا کە بەسەر حکومەتی ئیتیحادی زاڵ بوو، ئەو ڕێوشوێنەی ڕەتکردەوە، کاتێ پەرلەمان فیدراڵ داوای لە سوپا کرد بۆ پاراستنی یۆگسلاڤیا بە یەکگرتوویی بکەوێتەکار، ڕووداوەکان بە خێرایی شێوەیەکی دراماتیکی وەرگرت. وەك هەوڵێك بۆ هەڵوەشاندنەوەی سەربەخۆییەکە سوپا چووە ناو سلۆڤینیا، بەڵام ڕووبەڕووی کۆمەڵەی ئەورووپی بوونەوە، دواتر ململانێکە بۆ کرواتیا گواستراوە، کە ئەویش لەلای خۆیەوە بەرپەرچی هێرشی سربی دایەوە، بەوشێوەیەی کە لە سلۆڤینیا ئەنجامدرا، لە کرواتیاش بەهەمان شێوە شەڕەکە وەستێنرا، دواتر سربیا دانی بەسەربەخۆیی هەردوو وڵات نا. ئەو ڕووداوانە جگە لە دەستپێك و سەرەتای سەردەمێکی دڕندە لە بەلقان لە ماوەی نەوەدەکان، ئەو جەنگەی کە لە شوباتی 1991 یەکەم پریشکی دا، لەسەرەتای 1999 گەیشتە کۆسۆڤا، ينظر التفاصيل في: عزة جلال، "كوسوفا: جذور الصراع في البلقان، ملف السياسة الدولية، العدد (141)، تشرين الاول 1999، ص ص82–83؛ ناظم عبد الواحد الجاسور، "الازمة البلقانية: من حرب البوسنة الى حرب كوسوفو: الإرادات المتصارعة للقوى المتحالفة وآفاق المستقبل"، مركز الدراسات الدولية، جامعة بغداد، 1999، ص ص 5–8.

[3] - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص 258.

جەنگی کراوە ببوونەوە[1]، تورکیا دەستی یارمەتی بۆ براکانی لە ئایین و **هاوبەش** لە مێژووی، بە درێژایی سەردەمی عوسمانی درێژکردووە. لە ئابی 1992 ئەنجوومەنی گەورەی نیشتمانی تورکی داوای لە حکوومەتەکەی کرد کە **هەوڵێستێك** لەبەرامبەر سیاسەتی سربی بەرامبەر قڕکردنی موسولمانان وەربگریت، کارە لەوەش ئەولاتر چوو کاتی نەجمەدین ئەربەکانی ئەندامی ئەنجوومەنەکە و سەرۆکی (حیزبی رەفاه Refa Partesi)[2] داوای کرد کە

---

(1) - بەشەکانی جینۆساید لە بۆسنە بۆ شوباتی 1992 دەگەڕێتەوە، کاتێ زۆرینەی خەلکی بۆسنی لە ڕێگەی ریفراندۆمێکی گشتییەوە سەربەخۆیی خۆیان لە یۆگسلاڤیا راگەیاند. دوای ئەمەش سربیا و کروات جەنگیان بەسەر ئەو قەوارە موسولمانە نوێیە دا جاڕدا، سوپای فیدرالی سربی لە بەرژەوەندی سربەکانی دانیشتوانی بۆسنە، چووە ناو بۆسنەوە و لە ئەنجامی شەڕەکان 70٪ی خاکی کۆمارە گەنجەکە، لەسەر حیسابی موسولمانەکان کەوتە دەست سربەکان، پرۆسەیەکی قڕکردن و پاکسازییەکی ئەتنی بەرفراوان، هاوشانی هەڵمەتەکەی سوپا بەڕێوەچوو، کە هێزە سربییەکان دژ بە دانیشتوانە بۆسنییەکان ئەنجامیاندا، هەوڵەکانی یەکێتی ئەورووپی و نەتەوە یەگرتووەکان لە پەسندکرنی ڕێککەوتنی شەڕڕاگرتن بۆ ماوەی چوار ساڵ هیچ ئەنجامیکی نەبوو، جەنگەکە لەم ماوەیەدا مەودایەکی ئاییني وەرگرت، نیوەندە ئیسلامییەکانی جیهان، رۆژئاوای بە ناراستگۆ لە هەوڵەکانی بۆ وەستاندنی هەڵمەتەکانی جینۆساید وەسفکرد، ئەمەش وایکرد سربەکان کاتی تەواویان بۆ پاککردنەوەی بەلقان لە موسولمانەکان هەبیت، ئەمریکا هاتە ناوەوە و سربەکان رەتیانکردەوە لە سەر مێزی گفتوگۆ دابنیشن، تا لە 14ی کانوونی دووەم ساڵی 1995 رێککەوتننامەی دایتۆن مۆرکرا، لە دیاریترین بەندەکانی ئەو رێککەوتننامەیە، بۆسنە کرا بە دوو بەشەوە، یەکەمیان لە 51٪ی بۆ موسولمانەکان و کروات و لە 49٪ بۆ سربەکان، دەستووری فیدرالی هەر دوو بەشەکە بەیەکەوە گریدەدا و سەرابیڤۆش بە پایتەختی یەکگرتووی هەموان مایەوە. سەیری: عزة جلال، المصدر السابق، ص ص 82–83.

(2) -حیزبی رەفاه: لە تەمووزی 1983 بەسەرۆکایەتی ئەحمەد تەکدال دامەزراوە، درێژکراوەی پارتی (سەلامەتی نیشتمانی)ە، کە ئاراستەیەکی ئیسلامی هەبوو، لە ئەربەکان لە سەرەتای حەفتاکانەوە دایمەزراند بوو، دوای هەلگرتنی بریاری یاساغبوونی، دووبارە لە ساڵی 1987 ئەربەکان سەرۆکایەتی حیزبەکەی بەدەستەوە گرت، حیزبەکە لە مێژووی تورکیا یەکەم حکوومەتی ئیسلامی لە حوزەیرانی 1996 پێکهینا، حیزبەکە لە ساڵی 1997 بە تۆمەتی دەستدان لە پرەنسیپەکانی عەلمانییەتی تورکیا دەرگای داخرا.، سەیری، محمد حرب، "آليات الحركة الإسلامية في تركيا"، مجلة السياسة الدولية، السنة (34)، العدد (131)، كانون الثاني، ص 132.



**"تورکیا ئەوەی پێشتر لە قوبرس فێری بوو لە بۆسنە دووبارەی بکاتەوە"**، شەقامی تورکی زۆر توڕە بوو و گوومانیان لە بوونی **"پیلانێکی رۆژئاوایی"** کە لە دژی موسولمانی بەلقان داریژرابیێ دەکرد[1].

بە پێچەوانەی پەرچەکرداری توڕەی شەقامی تورکی، حکوومەتی تورکی لەبەرامبەر ئەو تەگەرە گەورانەی لە بینینی رۆڵ لە ئیدارەی تەنگژەی بەلقان رووبەرووی بووەوە، چۆکی دادا. ئەمەش بەهۆی ئەوەی سربەکان رازی نەبوون تورکیا **هیچ** رۆڵێك لە بەلقان ببینیێ، **هەروەها** بەهۆی ترسی سیاسەتمەدارانی تورکی لەوەی کە بەلگراد بە جاڕدانی جەنگی یەکلایەنە تۆمەتباریان بکات[2]. **هەروەها** لەلای یۆنانیشەوە رەخنەی توندی لێگیرا و سربیاش لەمەدا **هاوبەشی** بوو، کە تورکیا هەوڵی دووبارە خۆسەپاندنەوە وەك هێزێکی زاڵ بەسەر نیمچە دورگەی بەلقان دەدات، تا دووبارە کلتوری عوسمانی لە ناوچەکە زیندوو بکاتەوە[3].

ئەو فاکتەرانەی سەرەوە وایکرد، رۆڵی تورکیا هەتاکو لە میانەی چالاکییەکانی ناتۆشدا لە ئیدارەی جەنگەکەدا **"پەراوێزیی بێت"**، بەڵام ئەمریکا لەو باوەڕەدا بوو کە دەکرێت سوود لە رۆڵێکی دیاریکراوی تورکیا وەربگرێت، بۆ زامنکردنی ئارامی لە بەلقان، بۆیە وای لە تورکیا کرد **"دەروازەیەکی نهێنی بێت"** بۆئەوەی چەك بە بۆسنیا بدات، لە کاتێکدا گەمارۆی نێودەوڵەتی بۆ هێنانی چەك بۆ یۆگسلاڤیا لە ئارادابوو، تورکیای کردە **هاوبەشی** سەرەکی خۆی لە بەرنامەی **"دابینکردن و مەشق"** کە وەزارەتی بەرگری ئەمریکی بۆ سوپای یەکێتی بۆسنی بەرێیخستبوو. بە پێی بەرنامەکە، ئەمریکا ئامێری سەربازی دابین دەکات و تورکیاش ئەرکی مەشق پێکردن لە ئەستۆ دەگریت، **هەروەها** بەپێی بەرنامەکە 300 سەربازی بۆسنی مانگانە لە تورکیا مەشقیان

---

(1) -William T. Johnson, Turkey and Europe: Expectations and Complications, in: Stephen J. Blank and Others, Turkey's Strategic Position at the Crossroads of World Affairs, Strategic studies institute, U.S, 1993, Pp.16-17 .

(2) - احمد السيد زكي، موقف دول البلقان من النزاع في كوسوفا، ملف السياسة الدولية، العدد (141)، تشرين الاول 1999، ص 136.

(3) - هاينتس كرامر، المصدر السابق، ص ص 260–261.

پێ دەدرا. ئەمریکا داوای لە ئەنقەرە کرد ئەو یەکەیەی کە لە 1000 سەرباز پێکهاتووە و لە ناو هێزەکانی ئاشتیپارێزی نێودەوڵەتی–SFOR کە ژمارەیان 34 هەزار دەبێت و لە بۆسنە بڵاون، بهێڵێتەوە[1].

ڕێککەوتننامەی دایتۆن کە لە 14ی کانوونی دووەمی 1995 بۆ کۆتایی جەنگەکە مۆر کرابوو، سەرکەوتوو نەبوو، لە ئاساییکردنەوەی ڕەوشی بەلقان و کۆتاییشی بە جەنگە خوێناوییەکە نەهێنا، ڕێککەوتنەکە باسی "**هەرێمی کۆسۆڤا**"ی نەکردبوو، کە زۆرینەی هەرە زۆری ئەلبانی بوون، ئەو هەرێمە پێکدادانی توندی لە نێوان پۆلیسی سربی پاڵپشتیکراو لەلایەن سوپا و جەنگاوەرانی سوپای ڕزگاری کۆسۆڤای ئەلبانی بەخۆیەوە بینی[2].

ئەو پەرەسەندنانەی کۆسۆڤۆ ترسی لەلای وڵاتانی گەورەی ئەوروپی لە هەڵگیرسانی ململانییەکی دیکەی نوێ پەیداکرد، لەو ناوچانەی کە بوونی ئەلبانی تێیدا بەهێزە، هەروەها لە مەکدۆنیا و چیای ڕەش و ئەلبانیا و سربیا، کە بۆ وڵاتانی ئەوروپی دراوسێ دەگوازرێتەوە. بۆ خۆلادان لە هەموو ئەمانە، دەبوو ئەوروپا دەست بە لێدوانەکەی خافیر سۆلانەی ئەمیندداری گشتی ناتۆوە، بگرن، کە لە سەروبەندی کۆتایی جەنگی بۆسنەدا دای، کاتێ ڕایگەیاند کە "**ئەزموونی دەستکەوتوو لە جەنگی بۆسنەدا، لەوانەیە بتوانێ وەك نموونەیەك لە چالاکییە دیکەی داهاتووی پەیمانی ناتۆدا خزمەتمان بکات**"[3].

ئەمریکا بەبێ سڵمینەوە، پاڵپشتی لە بیرۆکەی "**دەستتێوەردانی سەربازی**" ڕاستەوخۆی لە کۆسۆڤۆ و خاپوورکردنی ژێرخانی سربی کرد، ئەمەش نەوەك لەبەر دانانی سنووریك بۆ هەڵسوکەوتە ڕەگەزپەرستەکانی سرب و ترسی ئەوروپا، بەڵکو لەبەرئەوەی بیرۆکەی دەستتێوەردان کۆمەڵێ ئامانجی بۆ ئەو دەپێکا، گرنگترینیان: دامەزراندنی بنکەیەکی ستراتیژی بوو لە بەلقان، کە

(1) - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص ص 262–263.

(2) - للتفاصیل، ینظر: أبو بكر الدسوقي، البان كوسوفو بين التفاوض والقتال، ملف السياسة الدولية، العدد (141)، تشرين الاول 1999، ص ص 90–93.

(3) - ناظم عبد الواحد الجاسور، المصدر السابق، ص 11.



ئەوەی لە کۆسۆڤۆ مابووەوە لە ڕووی 12وڵاتەکەی دەورووبەر کە ناتۆ دەیەوێت لە مەکەدۆنیاوە تا کۆمەڵە وڵاتانی بەڵتیك لە باکوور، لەسەر سنووری ڕووسیا، چارەنووسی دابین بکات، بۆئەوەی سیاسەتی دەورەدانی ڕووسیا تەواوببێت و زیاتر تەنگ بە ڕووسیا هەڵبچنریت[1]. دامەزراندنی ئەو بنکەیە لە تێڕوانینی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا، واتا بۆ یەکەمجارە ئەمریکا گەورەترین بنکەی سەربازی لە ناوچەکە لە نێوان مەکدۆنیا و بۆسنە و کرواتیا و هەنگاریا بڵاوەپێکردووە، ئەمە سەرباری بنکە بڵاوەکانی لە ئیسپانیا و ئیتاڵیا و یۆنان و تورکیا، ئەمەش بەمانای بوونی کەوانەیەکی گەورەی بنکەکانی کە لایەکی باشووری ئەوروپا و وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات و وڵاتانی سەربە یەکێتی سۆڤیەتی پیشوو، لە باوەش دەگرێت[2]. زاڵبوون بەسەر بەلقان زاڵبوونە بەسەر ڕێگاکان و یارمەتییە نەوتییەکانە، نەوەك ئەوەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دێت بەتەنها، بەڵکو ئەوانەشی کە لە کۆمارەکانی ئاسیای ناوەندیش دێن، بەکردەوە کار لەسەر دامەزراندنی سێ هێڵی گواستنەوەی نەوت و گاز لە کێڵگەکانی دەریای قەزوین بەرەو ئەوروپا و بازاڕە ئەمریکییەکان کرا. "**مۆڵگە گرگرتووەکانی دڵەڕاوکێ لە چیچان و جۆرجیا و ناگۆرنۆکەرەباغ و کوردستان کاریگەرییان بەسەر ئەو هێڵانەوە هەیە**"[3].

لە 24ی ئازاری 1999 تاکو نیوەی هەمان ساڵ، هێزەکانی ناتۆ بەسەرکردایەتی ئەمریکا، زنجیرەیەك هێرشی ئاسمانی ئەنجامدا، لە میانەیدا 15000 هێرش ئەنجامدران، شەش هەزاری بۆسەر ژێرخانی ئابووری و دامەزراوە زیندووەکانی بەلگراد و تەواوی شارە سربییەکان بوو، بەهۆیەوە سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ ناچارکرا بەندەکانی ڕێککەوتننامەی (رامبۆوییە–Rambouillet)لە فەڕەنسا لە ساڵی 1999 پەسند بکات، کە پێشتر ڕەتی دەکردەوە. بەندەکانی ڕێککەوتننامەکە، هێزی سوپا و پۆلیسی سربی لە

(1) - عمرو عبد الكريم سعداوي، المصدر السابق، ص 87.

(2) - ناظم عبد الواحد الجاسور، المصدر السابق، ص 11.

(3) - المصدر نفسه، ص ص 11–12.

هەرێمەکە پاشەکشە پێکرد و بە هاتنی هێزی نێودەوڵەتی بۆ پاراستنی دانیشتوانی کۆسۆڤۆ رازیبوو، لە هەرێمەکە ئیدارەیەکی لۆکاڵی بە سەرپەرشتی راستەوخۆی نەتەوە یەکگرتووەکان پێکبهێنرێت[1].

هەرچی تورکیا بوو، ئەوا ئاساییە هەر لەسەرەتاوە لایەنگری گورز وەشاندنە توندەکەی ئەمریکا بکات و ئامادەیی خۆی بۆ بەشداری لە هەر کارێك کە دژی سرب بێت پیشاندا. لەگەڵ دەستپێکردنی هێرشەکانی ناتۆ تورکیا بە 18 فڕۆکەی شەڕکەری جۆری F-16 بەشداری کرد، ئامادەیی خۆی بۆ دابینکردنی بنکە سەربازییەکانی بۆ هەموو ئەرکەکانی ناتۆ لە کۆسۆڤۆ پیشاندا، هەروەها بریاریدا بە 1000 سەربازی لە هێزی وشکانی لە بەدیهێنانی ئەرکەکەدا بەشداری بکات، بەڵام ناتۆ ئەم خواستەی دوایی تورکیای رەتکردەوە، بەهۆی رازی نەبوونی یۆنانەوە. بە پێچەوانەی سەرجەم وڵاتانی ئەورووپی، ئەوانەی لە بەدیهێنانی ئەرکەکەدا تەمبەڵییان نواند، تورکیا رازی بوو بەشی خۆی لە پەنابەرانی کۆسۆڤی کە دەگەیشتە 26 هەزار پەنابەر وەربگریت، خێوەتگای پەرنابەران لە ئەلبانیا و مەکدۆنیا لەسەر سنووری بۆلگاریا دامەزرێنرا، هەروەها نزیکەی 10 تا 15 هەزار پەنابەری خەڵکی کۆسۆڤۆ بەبێ هیچ ئالۆزییەك پەنایان بۆ تورکیا برد[2].

بەشدارییە چالاکەکانی تورکیا لە هەوڵ و چالاکییەکانی ناتۆ لە کۆسۆڤا، نەخشەی رۆڵ بینینی تورکی بۆ قۆناغی دوای کۆتایی جەنگەکەی لە خۆ نەگرتبوو، بۆ بەشداریکردن لە هێزی ئاشتی کۆسۆڤا KFOR بانگهێشتی تورکیا نەکرابوو، هەرچەندە هێزە ئەورووپییەکان باوەڕیان وابوو کە پرۆسەی ئاشتی لە بەلقان بەبێ بەشداری تورکیا جێبەجێ ناکرێت[3]، بەڵام هیچ ئاماژەیەك بۆ بەشداریکردنی تایبەتمەندی تورکی لە چالاکییەکانی کۆمەڵەی گەورەی

---

[1] - ینظر تفاصیل ذلك في: حسن ابو طالب، حرب کوسوفو وحدود التغییر في النظام الدولي، ملف السیاسة الدولیة، العدد (141)، تشرین الاول 1999، ص ص 94–99.

[2] - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص ص 264–265.

[3] - المصدر نفسه، ص ص 266–267.



هەشتدا[1] نییە. بەڵام لە هەمان کاتدا حەزی بەوە نەدەکرد ببینێ دەسەڵاتی تورکیا فراوان ببێ و بگەڕێتەوە ناوچەکە، سەبارەت بە تورکیا ئەوا زیادەڕەوی لە بەدەستهێنانی رۆڵی گەورەدا نەکردووە لە ناوچەکەدا، بەشێکی گەورەی ئەم هەڵوێستەی بۆ گونجانی سیاسەتی دەرەوەی لەگەڵ هاوپەیمانە گەورەکەی ناتۆ (ئەمریکا) دەگەڕێتەوە[2].

ئەمریکا، تورکیای بە هاوپەیمانێکی بەتوانا لە دابینکردنی یارمەتی بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە مرۆییەکانی پەیمانی ناتۆ و نەتەوە یەکگرتووەکان و بەرپەرچدانەوەی ئەو رەوشەی هەڕەشە لە ئارامی و ئاشتی جیهانی دەکات، لەقەڵەم دەدا. وەك وڵاتێکی **"خاوەن هێزی گەورەی مرۆیی، کە لە توانای داهەیە، ژمارەیەکی زۆر لەم هێزە بنێرێتە بەرەکانی جەنگ ئەگەر بەرەی جەنگ لە ناوچەکە کرایەوە"**[3]. ئیدارەی ئەمریکی ئەو رۆڵە **"کەم تێچوونەی کە تورکیا لە جیاتی ئەمریکا دەیگێڕێت"**، بەرز نرخاند، **چونکە تێچووی سەربازیکی ئەمریکی لە تورکیا ساڵانە 90 هەزار دۆلارە، کەچی تێچووی سەربازێکی تورکی ساڵانە تەنها 16 هەزار دۆلارە.** لەبەرامبەر ئەم جیاوازییە گەورەیەی تێچوونی سەربازی ئەمریکی و هاوتا تورکییەکەی، ئەمریکا هەڵیدا ئەرکەکانی بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا بە سوپای تورکی بسپێرێن لەبەرامبەردا ئەمریکا ئەرکی پەرەسەندن و بەهێزکردنی سوپای تورکی بدات، کە لە کۆتاییدا هەر لە خزمەت بە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا دەبێت[4].

---

[1] – کۆمەڵەی هەشت یا کۆمەڵەی هەشت گەورە وڵاتە پیشەسازییەکەی جیهان، کە ئەمریکا، یابان، ئەڵمانیا و رووسیا، ئیتالیا، بەریتانیا، فەڕەنسا و کەنەدا تێیدا ئەندامن، ئابووری ئەو هەشت وڵاتە لە 65٪ی ئابووری جیهان پیکدێنێت و زۆرترین هێزی سەربازییان هەیە ( 7 تا 8 زۆرترین پێگەی خەرجی چەك و نزیکەی هەموو چەکی ناوەکی جیهان).

http://ar.wikipedia.org/wiki/

[2] -Kemal Krişci, "Turkey and United States…", Pp.22-23.

[3] - سالار اوسي ویوسف إبراهیم الجهماني، المصدر السابق، ص 49.

[4] - سالار اوسي ویوسف إبراهیم الجهماني، المصدر السابق، ص ص 50–51.

ئـەو بەشـدارییانەی کـە تورکیـا لـە چـالاکییەکانی پاراسـتنی ئاشـتی و پێشکەشکردنی یارمەتی مرۆیی جا چ ئەوانـەی بەسـەرکردایەتی نـاتۆ بـوون یا نەتەوە یەکگرتووەکان بوون، هەلێکی لەبار بوو بۆ پیشاندانی پلەی هەماهەنگی و هاوکـاری سـەربازی ئـەمریکی– تـورکی، کـە ئەمـەش لـە پرۆسـەی (دالّـدەی ئـارام)ی نیـسانی سـالّی 1991 دەسـتی پێکـرد، کـە پارێزگـاری کـوردی لـە کوردستانی عێراقی دابینکرد، هەروەها بەشداریکردنی لە هەولّەکانی ئەمریکا لە گەڕاندنـەوەی ئاشـتی و ئـارامی سـۆمالّ لـە سـالّی1992، هێزەکـانی نەتـەوە یەکگرتووەکان لەویّ لەژێر سەرکردایەتی ژەنەڕاڵێکی تورکی دانـران، سـەرباری بەشداریکردن لە جەنگ بـۆ سـەر یۆگسلاڤیا و پارێزگـاریکردن لـە بۆسـنە وەك پێـشتر باسمـان کـرد. ئـەمریکا، بەشـدارییەکانی تورکیـای لـەم ئەرکانـەدا، بەتایبەتی ئەوەی لە سۆمالّ لەسالّی 1992 و بـەلقانی ناوەڕاسـتی نـەوەدەکان سەرکردایەتی دەکرد، بە هاوبەشێك لە ناتۆ کە ناکرێـت دەسـتبەرداری بێـت لـە قەلّەمدا. بەشدارییەکانی هێزەچەکدارەکانی تورکیا لـە ئەرکـە سـەربازییەکانی ناتۆدا لـەم ناوچـانە، لەلایـەن دانیـشتوانە لۆکالّییەکانـەوە پێشوازی لێدەکرا، بەتایبـەتی لـە سـۆمالّ و بۆسـنە و کۆسـۆڤۆ، هـەروەها نامەیـەکی ئاشـکرا و پۆزەتیڤ بوو بۆ تەواوی جیهانی ئیسلامی[1].

رووخـسارەکانی هاوکـاری و هاوبەشـی ئـەمریکی—تـورکی لـە نـەوەدەکانی سـەدەی بیـستەم لـە لایەنـەکانی سیاسـی سـەربازی، رەنگدانەیـەکی گـەورەی لەسەر لایەنی ئابووری هەبوو، ئەمریکا لەسالّی 1993 بـووە دووەم گـەورەترین هاوبەشی بازرگانی تورکیا[2]، قەبارەی ئالّوێرە بازگانییەکانی نێوان هـەردوو لا بەرزبوونەوەیـەکی تونـدی بەخۆیـەوە بـینی، بەتایبـەتی دوای ئـەوەی تانـسۆ چـیلەر–Tansu Ciller[3]ی سـەرۆك وەزیرانـی تـورکی و کلینتـۆنی سـەرۆکی

(1) -Kemal Krişci, "Turkey and United States…", P. 32.

(2) - سالار اوسی ویوسف ابراهیم الجهماني، المصدر السابق، ص 106.

(3) - تانسو چیلەر: لە سالّی 1950 لە ستانبول دایکبووە، دەرچووی زانکۆی پسفورە، هەروەها لە هەمان زانکۆ مامۆستای ئابووری بووە. سەرۆکی پارتی رێگای راست بووە، یەکـەم ئـافرەت=



ئـەمریکا لـە کۆتـایی سـالّی 1993 چـاویان پێککـەوت، پێکهێنـانی لیژنەیـەکی تایبەتی پەرەپێـدانی پەیوەنـدی و هاوکـاری ئابوورییـان راگەیانـد، دوای ئەمـە راستەخۆ لە سـالّی 1994 ئـەمریکا، تورکیـای خـستە نـاو لیـستی دە باشـترین ئابووری روو لە گەشەی جیهـان، لـە مـاوەی سـالاّنی 1991–1997 بـە رێـژەی 780٪ قەبارەی ئالّوێری بارزگانی نێوان هەردوولا زیادی کرد[1].

لەسەر ئاستی پەیوەندییـە سـەربازییەکان، گەشـە و بوژاندنەوەیـەکی زۆری هـەبوو، لـە نیـسانی 1994 چـارلز فریمـان Charles Freeman ی یاریـدەدەری وەزیری بەرگری ئەمریکی رایگەیاند کە "**ئەمریکا بۆ پێدانی پیداویستی بەرگری، تورکیای لە پێشەوە داناوە**" و "**ئەمریکا پیشتریش بڕێکی زۆری لە چەکی بە تورکیا داوە بەبیّ دانانی کۆت و بەندی تایبەتی وەك ئەوەی بەسەر ولاّتانی دیکەدا دەیسەپێنیّ، هیچ هۆکارێکیش بۆ گۆڕینی ئەم هەلّوێستە لە ئارادا نییە**"، هەروەها رایگەیاند کە تورکیا مافی ئەوەی پێدراوە ئەو چەکە ئەمریکییانەی لێی زیـادن بـۆ بنێریتـەوە، بـەبیّ ئـەوەی مـەرج لەسـەر بـەکارهێنانی ئـەو چـەکانە دابنرێت[2]. هەرچەندە کۆنگرێس و رێکخراوە و کۆمەلّە کانی مافی مرۆڤ فشاریان بۆ سەر ئەمریکا هێنابوو کە کۆت و بەندی زیاتر لەسەر هەناردەکردنی چەك بـۆ تورکیا دابنرێت، بەلاّم واشنتۆن بە درێژایی نەوەدەکان سالاّنە بە تێکڕایی 800 ملیۆن دۆلار و بە رێژەی 99٪ی چەك و جبەخانە و پرۆگرامی سەربازی خۆی بە تورکیا داوە[3]، دامەزراوەی سەربازی لە هەموان زیـاتر بـە پەرۆشـەوە بـوو بـۆ بەهێزبوونی پـەیوەندییە سەربازییەکان لەگەلّ ئەمریکا، سەرۆك ئەرکانی تـورکی

=بوو پۆستی سەرۆك وزیران لە تورکیا وەرگرتووە (1993–1995)، و دووەمین ئافرەت بـووە لـە دووایـی بـەنازیر بوتـو لـە جیهـانی ئیـسلامیدا هـەمان پۆسـتی وەرگرتبێـت. چـوونی بـۆ هاوپەیمانەتی حکومی لەگەلّ ئەربەکان، کە ماوەکەی کورت بوو بۆتە ئەگەری بـە کۆتاییهێنـان بە ئایندەی سیاسی:

John Murray Brown, "Tansu Çiller and the Question of Turkish Identify", World Policy Journal. Volume: 11. Issue: 3., U.S, 1994. Pp.56-60.

(1) -Racheal Prager, Op. Cit., P. 8.

(2) - سالار اوسی ویوسف ابراهیم الجهماني، المصدر السابق، ص 84.

(3) -Rached Prager, Op. Cit., P. 9.

له ساڵی 1998 بەم شێوەیە وەسفی ئەم پەیوەندییانە دەکات، "**تاکەکانی هێزی چەکداری ئەمریکی لە روانگەی سەربازە تورکەکان**"[(1)]، لەبەرامبەر هەردوو وەزارەتی بەرگری و دەرەوەی ئەمریکا بەهێزترین لایەنگری بەرژەوەندییەکانی تورکیان لە ئیدارەی ئەمریکی. ئەو دوو دامەزراوە لە ماوەی دەیەی نەوەدەکانی سەدەی بیستدا تورکیایان بە "**ئۆمەتێك، کە ئەمریکا ناتوانێت دەستبەرداری بێت**" لەقەڵەم داوە، و بە هاوپەیمانی ئەمریکا کە بی ئەلتەرناتیڤە. هەریەکە لە وەلیم بیری W. Perry وەزیری بەرگری ئەمریکی (1993–1997) و وۆرن کریستۆڤەر W. Christopherی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (1993–1997) و مادلین ئۆلبرایت M. Albright ی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (1997–2001)، هاوڕا بوون لەوەی کە "**تورکیا یاریزانێکی یەکلاکەرەوەیە**" لە "**ناوچەکانی دەرەوەی ئەرکی ناتۆ**"، جا ئەم ئەرکە دابینکردنی ئارامی بێت لە بەلقان یا رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کەنداوی عەرەبی بێت[(2)]. مادلین ئۆلبرایت باس لەوە دەکات کە "**بەهۆی پێگەی [تورکیا] کە کەوتۆتە دووڕییانی ئەورووپا و قەوقاز و ئاسیای ناوەند و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەوا سیاسەتە ئایندەییەکانی تورکیا لە پێکهێنانی هێڵی دیکەی نوێی جیهانی یارمەتیدەر دەبێت، لە کاتێکدا ئێمە جەنگی سارد لە دوای خۆمان بەجێدێڵین و دەچینە ناو سەدەی بیست و یەکەوە**"[(3)].

لەماوەی دەیەی نەوەدەکان، هەوڵەکان و فشارە چڕوپڕەکانی بۆ سەر هاوپەیمانە ئەورووپییەکانی، وایکرد رۆڵێکی جیاواز لە بەرەوپێشچوونی کاروانی تورکیا بۆ دەستگرت بە یەکێتی ئەورووپییەوە، ببینێ، هەتاکو یەکێ لە شیکەرەوە سیاسییەکانی کاروباری تورکی دەڵێت "**دیپلۆماسییەتی ئەمریکی پرسی بەدەستهێنانی پلەی پاڵێوراو لای یەکێتی ئەورووپای یەکلاکردەوە**"[(4)].

(1) – هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص 386.

(2) -Ted Galen Carpenter, U.S. Policy toward Turkey: A Study in Double Standards, Washington, D.C., January 1999, via at: (http://www.hri.org/forum/intpol/carpenter.html).

(3) -U.S. Official Speaks on Turkey and the Kurdish Question , United States Information Service, 6 July, 1998. Via at: (http//:www.mtholyoke.edu/acad/intrel/kurdtur.htm).

(4) -Kemal Krişci, "U.S.-Turkish Relations…", P. 133.



پاڵپشتی ئەمریکی بۆ تورکیا لە پرسی چوونە پاڵ‌ەکێتی ئەورووپی لە سۆنگەی بەدیهێنانی گرنگترین ئامانجی ستراتیژی هاوپەیمانێکی نزیکیەوە، نەهاتووە، بەقەد ئەوەی کە بەشێك بووە لە ئامانجێکی فراوانی ئەمریکی، کە راستەوخۆ بە تورکیاوە تایبەت نییە، چوونە پاڵ سیستەمی ئەورووپی لە دیدی سیاسەتوانانی ئەمریکا بەواتای: دروستکردنی هەماهەنگی زیاتر لە نێوان ژێرخانی ئەمنی هاوپەیمانی ئەتڵەسی و و ژێرخانی ئەمنی یەکێتی ئەورووپی دێت. پاڵپشتیکردن لە فراوانکردنی یەکێتی ئەورووپی واتا کەمکردنەوەی بارگرانی سەر ئەورووپای رۆژئاوا "**کۆن**" بۆ سەرشانی ئەورووپای رۆژهەڵات "**نوێ**"، کە زیاتر توانای کاریگەربوونی بە ئەمریکا هەیە. فراوانکردنی یەکێتی ئەورووپی بە چوونە پاڵی تورکیا، وای لێدەکات زیاتر لە رووی ژێرخانی سیاسی و کلتوورییەوە فرەیی بێت و کەمتر لەبەرامبەر دەسەڵاتی ئەمریکی یەکگرتوو بێت، بەتایبەتی بە بوونی تورکیای هاوپەیمانی بەهێزی خۆی. هەروەها یەکێ لە فاکتەرەکانی پاڵپشتی ئەمریکا بۆ تورکیا ئەوە بوو جیهانی ئیسلامی دڵنیاکردەوە کە ئەمریکا دژایەتی ئیسلام ناکات، بەڵکو پاڵپشتی لە تورکیای وڵاتێکی موسوڵمانی عەلمانی دەکات، کە دەکرێت ببێتە نموونە بۆ وڵاتانی دیکەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیای ناوەند و قەوقاز، لە پەرەسەندنی ئابووری و سیاسی و پەیوەندییان بە رۆژئاواوە. هەروەها ئەم چوونە پاڵە، پاڵپشتییەك بۆ بەیەکەوە گرێدانی (تورکی– ئیسرائیلی) پێکدێنی، کە ئەمریکا لە سیاسەتەکانی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پشتی پێ دەبەستێ[(1)].

لەکانوونی یەکەمی 1997 یەکێتی ئەورووپی لە سەر زاری (جین کلۆد جونکەرJean Claude Junker ) سەرۆك وەزیرانی لۆکسمبۆرغ، پاڵاوتنی تورکیا بۆ ئەندامێتی تەواو لە یەکێتی ئەورووپی رەتکردەوە، ئەمەشی بەم شێوەیە دارشتنە: "**رێگە بەهیچ وڵاتیك نادرێت لەسەر مێزی یەکێتی ئەورووپی**

(1) - عقیل محفوض، المصدر السابق، ص ص 276–277.

**دابنیشێ، هێشتا پیادەی ئازاردانیش بکات"**[1]. کاردانەوەی ئەمریکی لەسەر بڕیارەکەی ئەورووپی خێراتر لە کاردانەوەی تورکی هات، پەرۆشی ئەمریکا بۆ نووسینی ناوی تورکیا لە لیستی پاڵێوراوانی ئەندامیتی ناتۆ، گەلێ جار پەیوەندییەکانی ئەمریکا بە ژمارەیەك بەرپرسی ئەورووپی شڵەژاندووە، ئەو بەرپرسانەی کە بە ئاشکرا بێزاری خۆیان لە لۆبی ئەمریکی سەبارەت بەم پرسە دەردەبڕی[2]. ئیدارەی کلینتۆن دەسەڵاتی ئەمریکی لەلای ژمارەیەك پایتەختی کاریگەر، بەکارهێنان. ئەنجامەکەی ئەوە بوو کە یەکێتی ئەورووپی بەشێوەیەکی سەیر هەڵوێستی لەبەرامبەر تورکیا لە لوتکەی هیلسنکی کانوونی یەکەمی 1999 گۆڕی کاتێ بڕیاری دا **"وەکو باقی وڵاتانی پاڵێوراو بۆ ئەندامێتی تازە لە یەکێتی ئەورووپا مامەڵە لەگەڵ تورکیا دەکرێت"**[3]. لە نامەی پیرۆزبایی کلینتۆن بۆ بولەند ئەجەویدی سەرۆك وەزیرانی تورکی هاتووە: **"بەردەوام باوەڕم وایە کە شوێنی تورکیا ئەورووپایە، بۆیە دەتوانیت پشت بە پاڵپشتی ئەمریکی لە بەدەستهێنانی ئەندامێتی تەواو لە یەکێتی ئەورووپا ببەستێ"**[4].

بەرزبوونەوەی **"تەوژمی ئیسلامی ئیسولی"** لە جیهانی عەرەبی، دوای رووخانی یەکێتی سۆڤیەت و سەرنەکەوتنی هەردوو نموونەی پاکستانی و جەزائیری لە پێشکەشکردنی نموونەیەکی سەرکەوتووی عەلمانییەت لە جیهانی ئیسلامی، ئاواتی ئەمریکا بە تورکیا دوو هێندە بووەوە، وایکرد نموونەی تورکی باوەڕپێکراو لای رۆژئاوا بۆ کۆمارە تورکییەکانی ئاسیای ناوەند باقی وڵاتە ئیسلامییەکان بنێرێت، کە بەرژەوەندی ئەمریکی تێدایە، بە گوێرەی

(1) -Soner Cagaptay, Turkey at Crossroads: Preserving Ankara's Western Orientation, Policy Focus (48), The Washington Institute for Near East Policy, Washington D.C., 2005, P. 3.

(2) -Sabri Sayari,Op. Cit.,P. 34; Omer Goksel lsyar, Op, Cit., P.36.

(3) -Soner Cagaptay, Op. Cit., P. 3.

(4) -Kemal Krişci, "U.S.-Turkish Relations…", P. 134.



دروستکەرانی بڕیار لە ئەمریکا، ئەوا تورکیا لەم بوارە هاوپەیمانێکی بنەرەتی و دوورگەی ئارامە لە بەشێکی شڵەژاوی جیهان[1].

ئەو بوارەی کە پەیوەندییەکانی هەردوولا تێیدا پەرەی سەندبوو، وای لە واشنتۆن کرد، سیاسەتێکی "دوو فاقی لە پێوانەکردن– Duble Standard Policy" بە شێوەیەکی ئاشکرا بۆ کێشە ناوەخۆیی و دەرەکییەکانی تورکیا بگرێتەبەر. ئەمەش لە لێدوانەکانی گەورە سیاسەتمەدارانی ئەمریکا رەنگیدابووەوە، کە زاڵبوونی بەرژەوەندی ستراتیژییەتی ئەمریکی لە سیاسەتەکانیان بەسەر گرنگی دیکەدا بەدەرکەوت، لێرەدا دەتوانرێت ئاماژە بە قسەکانی بیل کلینتۆنی سەرۆکی ئەمریکی بکەین کە لە ئایاری 1997 رایگەیاند و گوتی: **"تورکیا دیموکراتییەتی عەلمانی جێگیر بە ئاراستەی رۆژئاوا لەسەر هەوڵەکانی ئەمریکا کە ئامانجی بەهێزکردنی فاکتەرەکانی ئارامی لە بۆسنە و وڵاتانی تازە سەربەخۆ و رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، چەسپاندووە. هەروەها بۆ دەورەدانی هەریەکە لە ئێران و عێراق، پەیوەندییەکانی بە رۆژئاوا و پاڵپشتیکردنی لەسەرجەم ئامانجە ستراتیژییەکان لە هەستیارترین شوێنی جیهان گرنگییەکی یەکلاکەرەوەی هەیە. ئێمە لە پاڵپشتیکردن لە رۆڵی چالاك و بونیادنەری تورکیا لە چوارچێوەی هەریەکە لە ناتۆ و ئەورووپا بەردەوام دەبین"**[2].

واشنتۆن بەردەوام و چەندین جار ئەوەی دووپات دەکردەوە کە پاڵنەری فراوانکردنی پەیمانی ناتۆ، چەسپاندنی بەها دیموکراتی و ئازادییەکانە، لەسەر ئەم بنەمایە بەئەندامبوونی سلۆڤاکیای رەتکردەوە، بە بیانووی ئەوەی رژێمە سیاسییەکەی دیموکراتی نییە، بەڵام واشنتۆن لە حوزەیرانی 1997 کاتێ عەسکەر حکوومەتە هەڵبژێردراوەکەی ئەربەکانی لەکارخست هیچ بەیاننامەیەك یان نارەزایەتییەکی لەسەر کردەوەکە پیشان نەدا، لە وەزارەتی دەرەوەش هیچ کاردانەوەیەك نەبوو، هۆکارەکەی روون بوو، ئەویش پارتەکەی ئەربەکان یان حیزبی رەفاه کە مەیلێکی ئیسلامی هەبوو، لەگەڵ واشنتۆن سەبارەت

(1) -Ted Galen Carpenter, Op. Cit.,.

(2) - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص 12.

بەکێشە کۆمەڵایەتی و ئاراستەی سیاسەتی دەرەوەی تورکیا ناکۆك بوو[1]. لەو کاتەی کە ئەمریکا سەرۆکایەتی هاوپەیمانییەکی نێودەوڵەتی پێکهاتوو لە 32 وڵات بۆ دەرکردنی عێراق لە کوێت دەکرد، چاوی لە داگیرکردنی راستەوخۆی سەربازی تورکی بۆ باکووری قوبرس پۆشی، هەروەکو بەدرێژایی ماوەی نەوەدەکان چاویشی لە پیداویستییە بەردەوام و دووبارەکانی تورکیا لە سنووری باکووری عێراق هەبیبوو، پۆشی. هەروەها هیچ رەخنە یا ئامۆژگارییەکی تورکیای نەکرد، کاتێ لە تشرینی یەکەمی 1998 هەڕەشەی لە سووریا کرد، کردەوەی سەربازی دژی ئەنجام دەدات، بەهۆی داڵدەدانی عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی پارتی کرێکاران لەسەر خاکی سووری، لەهەمان کاتدا هەموو تواناکانی خۆی دەخستەگەر کاتێ ناکۆکی لە نێوان تورکیا و یۆنان لەسەر پرسێکی دیاریکراو دروست ببوایە، ئەمەش بۆ پاراستنی ئاشتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دەریای ناوەڕاست و وەك هەستکردن بە بەرپرسیاری بەرامبەر بە "**تاك جەمسەری**" و زلهێزی گەورەی جیهان[2]. بەشێکی زۆری سەرکەوتنەکانی دیپلۆماسییەتی تورکی لە زۆر بوار لە ماوەی نەوەدەکان، بۆ بەهێزی پەیوەندی تایبەتی بە ئەمریکاوە[3]، جا چ لە ژینگە ئەورووپییەکەی یا رۆژهەڵاتی ناوەڕاست یا بەلقان یا دەریای ناوەڕاست یا هەرێمی عەرەبی بێت، دەگەڕێتەوە.

لە ناوەڕاستی تشرینی دووەمی 1999 سەرۆکی ئەمریکی بیل کلینتۆن سەردانێکی مێژوویی بۆ تورکیا کرد و ماوەی پێنج رۆژی خایەند، لەمیانەی سەردانەکەیدا قسەی لەگەڵ دەستەبژێرە سیاسییەکانی تورکیا کرد، دیاریترین قسەی ئەوەبوو کە رۆژی 16ی تشرینی دووەمی 1999 لەبەردەم ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانی تورکی کردی و گوتی: "**دەرکەوتنی کۆماری تورکی، لە نیشانە دیارەکانی سەدەی بیستەمە، سەدەی بیست و یەکیش لەسەر ئەو پەرەسەندنانەی کە لە تورکیا و دەوروبەرەکەی روودەدەن، دروست**

(1) -Ted Galen Carpenter, Op. Cit.,.

(2) -Ted Galen Carpenter, Op. Cit.,.

(3) -George S. Harris, Op. Cit.,P. 198.



**دەبێت**"[1]، سەردانەکەی کلینتۆن بۆ تورکیا، وەك تاج دانان بوو بەسەر قۆناغێکی نوێی پەیوەندییەکانی بە تورکیاوە، کە سەرۆك خۆی بە ناوی (هاوبەشی ستراتیژی الشراكة الإستراتيجية–Strategic Partnership) وەسفی کرد، ئەمە هەمان دەستەواژەیە کە پێشتر بۆ یەکەم جار لە ساڵی 1995 لە پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیلدا بەکاریهێنا، بەگوێرەی قسەی باڵیۆزی ئەمریکی لە ئەنقەرە مارك پیرس Mark Parris(1997–2000)[2] و بەگوێرەی رۆبەرت پیرسۆن Robert Pearson یەکێ لە گەورە دیپلۆماتکاری ئەمریکی، ئەو "**سەردانە بەلگەی رێزگرتنی هەردوو دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردنی ئەمریکایە، بۆ ئەو بەرپرسیارە زۆرانەی تورکیا لەسەر هەردوو ئاستی هەرێمایەتی و جیهانی هەیەتی، هەروەها ئەمەش خواستی ئەمریکا لە تێکەڵاوکردنی ئابووری تورکیا بە ئابووری جیهانی و چوونە پاڵ ئەورووپا و بەهێزکرنی ئاشتی لە شوێنە نائارامەکانی جیهان دەردەبڕێ، ئەوەی باسی کرد، دیدگای وڵاتەکەی بۆ تورکیا و ئەوەی لێی چاوەڕوان دەکریت**"[3].

(1) - یاسر احمد حسن، المصدر السابق، ص 295.

(2) -Mark Parris, "The Hinted States and Turkey", in: Bruce Maddy-Weitzman and Asher Susser (Ed), Turkish-Israeli Relations in a Trans-Atlantic Context Wider Europe and the Greater Middle East, The Moshe Dayan Center for Middle Eastern and African Studies, Tel Aviv, 2005, P. 29.

(3) -Aylin Guney, Op. Cit., Pp. 346-347.

## بابەتی یەکەم: فاکتەرەکانی دەرکەوتنی پرسی کورد لە تورکیا

دۆرانی سەفەوییەکان لەبەرامبەر عوسمانییەکان لە شەڕی چالدێران لە ساڵی 1514 وایکرد بەشێکی گەورەی کوردستان بکەوێتە دەستی عوسمانییەکان، عوسمانییەکان بڕیاریاندا لەگەڵ ئەمیرە کوردەکان لە کوردستان پەیرەوی سیستەمەی لامەرکەزی بکەن و ئەوانیش لە ئیدارەی میرنشینە نیمچە سەربەخۆکانیان بهێڵرێنەوە، وەکو میرنشینی سۆران (سەرەتای سەدەی سێزدە–1836) و میرنشینی بابان (سەرەتای سەدەی سێزدە–1851) و میرنشینی بۆتان (سەرەتای سەدەی سێزدە–1847)[1]. ئەم ڕەوشە بەم شێوەیە تا سەدەی نۆزدە بەردەوام بوو، کاتێ لاوازی کەوتە گیانی دەوڵەتی عوسمانی، سوڵتان ەکان هەوڵیاندا ڕەوشەکە چاك بکەنەوە. هاوکات لەگەڵ ئەمە و وەك بەشێك لە پلانی چاکسازی، بڕیاردرا، پەیرەوی لە سیستەمی مەرکەزی لەسەرجەم وڵاتدا بکرێت، سوڵتان ە عوسمانییەکان هەستیان بە مەترسی گەشەی ئاواتی جوداخوازی لای میرنشینە کوردییەکان کردبوو، کە هاوکات بوو لەگەڵ پەرینەوەی بیری نەتەوەیی لە ئەورووپاوە بۆ دەرەوە، بە وڵاتی عوسمانیشەوە، کە ئەو کات بە قۆناغێکی لاواز و هەڵوەشاوە گوزەری دەکرد.

لەسەرەتادا دەنگدانەوەی بیری نەتەوەیی ئەورووپی لای هەندێ لە گەلانی ناموسوڵمانی دەوڵەتی عوسمانی کە کەوتۆتە بەشی ئەورووپاوە، بە توندی دەستی پێکرد. بە یۆنان کە لە 1832 لە دەوڵەتی عوسمانی جیابووەوە، دەستی پیکرد، دواتر بۆ گەلانی بەلقانی، دواتریش بۆ ئەرمەن گواسترایەوە، کە لە پەیماننامەی بەرلینی 1878 لای وڵاتانی ئەورووپییەوە گرنگییان پێدرا، کە

(1) - بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی سیستەمی ئیداریی عوسمانی لە کوردستان. سەیری: مارتن فان برونسن، الاغا والشیخ والدولة، البني السیاسیة والاجتماعیة لکردستان، ترجمة، امجد حسین، معهد الدراسات الإستراتیجیة، بغداد–اربیل–بیروت، 2007، ص ص 338–346.



باسی لەوە کردبوو، دەبێت چاکسازی لە ناوچە ئەرمەنییەکانی دەوڵەتی عوسمانی[1] تەنیشت ناوچە کوردییەکان بکرێت. سەبارەت بە کورد، هەرچەندە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا، زنجیرەیەك بزووتنەوەی چەکداری دژ بە دەوڵەتی عوسمانی بەرپا بوو، وەك بزووتنەوەکەی میر محەمەد پاشای ڕەواندوزی میری سۆران[2] و بزووتنەوەکەی بەدرخان پاشای گەورە میری بۆتان[3]، هەرچەندە دەستەواژەی گرنگی لەبارەی نەتەوەیی کوردی لەخۆیان گرتبوو، بەڵام تەنها "**منداڵدانێك بوو بۆ بیری نەتەوەیی کورد، نەوەك لە دایکبوونی**"[4].

دەرکەوتنی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری نەوەك هەر ئاماژەی بە لە دایکبوونی شێوازێکی نوێی لەسەرکردەی کوردی کرد، کە هەردوو دەسەڵاتی ڕۆحی و زەمەنی بەیەکەوە کۆبکاتەوە، بەڵکو ئەو بزووتنەوەیەی کە لە 1879 لە دژی عوسمانییەکان و دواتر لە 1880 لە دژی قاجارییەکان لە وڵاتی فارس سەرکردایەتی کردن، بەسەرەتایەکی ڕاستەقینەی هۆشیاری بیری نەتەوەیی کوردی لەقەڵەم دەدرێت[5]. کوردەکانی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و قاجاری لەو ڕاپەرینەکەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری بەشدارییان کرد. لۆرد کرزن Lord Curzon باسی لەوە کردووە کە "**وەك سەرکردەیەکی نەتەوەیی کوردی سەیری [شێخ**

(1) - م. س. لازاریف، "کُردستان عشیة انهیار الإمبراطوریة العثمانیة"، في، م. س. لازاریف وآخرون، تاریخ کُردستان، ترجمة عبدي حاجي، دار سبیریز للطباعة والنشر، دهوك، 2006، ص 155.

(2) - سەبارەت بە وردەکاری زیاتر لە بارەی ڕووخانی میرنشینی بۆتان سەیری: سعد بشیر اسکندر، قیام النظام الاماراتي في کُردستان وسقوطه مابین منتصف القرن العاشر ومنتصف القرن التاسع عشر، دار الشؤون الثقافیة العامة، بغداد، 2005، ص 287–298.

(3) - مارتن فان برونسن، المصدر السابق، ص ص 392–395.

(4) - سیامند زید عثمان، "ملاحظات تاریخیة حول نشأة الحرکة القومیة الکُردیة"، مجلة دراسات کُردیة، العدد 1، باریس، کانون الثاني 1984، ص 22.

(5)-Hacer Sozbir, The nature and Characteristics of The Major Kurdish Movements: An Analysis of the Kurdish Movements from the Bedirhan Rebellion (1847) to the Sheikh Said Rebellion (1925), M. A. Thesis, Ataturk Institute for Modern Turkish History, Bogazici University, 2006; P. 20.

**دەكرا"**[1]. شێخ عوبێدوڵلای نەهری بەخۆشی لە بەشێکی نامەیەك کە بۆ باڵیۆزی بەریتانی لە ئورمێ بە بەرواری 5ی تشرینی یەکەمی 1880 ناردبووی باسی لەوە کردووە کە **"گەلی کورد، کە لە زیاتر لە پێنج هەزار خانەوادە پێکدێت، گەلێ جیاوازە. ئایینیان [مەبەستی مەزهەبیانە] و دابونەریتیان و ڕێسایان جیاوازە...ئێمە گەلێکی دابەشکراوین، دەمانەوێت کاروباری خۆمان بەدەستی خۆمانەوە بێت..."**[2].

هەرچەندە چارەنووسی ڕاپەرینەکەی شێخ عوبێدوڵڵا هەرەسهێنان بوو، بەڵام دەستپێکی دەرکەوتنی بیری نەتەوەیی بە مانا نوێیەکەی لە بزووتنەوە و ڕاپەرینە کوردییەکانی سەدەی هاوچەرخ تۆمارکرد[3].

دوای لەناوبردنی ڕاپەرینەکەی شێخ عوبێدوڵلای نەهری، سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (1876–1909) بڕیاریدا، پەیرەوی لە سیاسەتیکی جیاواز لەبەرامبەر کورد بکات، تاکو زامنی زاڵبوون بەسەر کوردستان بکات. ئاغا و سەرکردە کوردەکانی لەخۆی نزیککردەوە و دروشمی "کومکاری ئیسلامی–الجامعة الاسلامية" بۆ خۆڕاکیشانی کورد و تەواوی نەتەوە ئیسلامییە ناتورکەکان بەرزکردەوە[4]. لەساڵی 1891 سوڵتان عبدولحەمید هێزێکی نا نیزامی لە تاکەکانی هۆزەکان بەناوی (سوارچاکی حەمیدیە–Hamidiye Alaylari) دامەزراند، ئەمەش لە دیارترین رووخسارە سیاسییەکانی بوو، بەرامبەر بەکورد، ئەم هێزانەی بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی خۆی لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر سنووری رووسیا، بەکارهێنا[5].

(1)-Wadie Jwaideh, The Kurdish National Movement, Its Origins and Development, Syracuse University Press, New York, 2006, P. 77.

(2) - جرجيس فتح الله، مبحثان على هامش ثورة الشيخ عبيد الله النهري، مؤسسة اراس للطباعة والنشر، اربيل، 2001، ص ص 59–60.

(3) - لقمان محوّ، الكُرد وكُردستان: بيبلوغرافيا مختارة ومعرفة، ترجمة، هفال، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، اربيل، 2007 ص 21.

(4)-Janet Klein, "Kurdish nationalists and no-nationalist Kurdists: rethinking minority nationalism and the dissolution of the Ottoman Empire, 1908–1909", Journal of Nations and Nationalism, No. 13 (1), 2007, Pp. 141-142.

(5) - ن. أ. خالفين، الصراع على كردستان: المسالة الكُردية في العلاقات الدولية خلال القرن التاسع عشر، ترجمة احمد عثمان ابو بكر، مطبعة الشعب، بغداد، 1969، ص 147.



لەلایەکی دیکەوە، هاوشان لەگەڵ سیاسەتە نوێیەکەی عەبدولحەمیدی دووەم بەرامبەر بەکورد، ئەوا چەند تاکێکی دەستەبژێری کوردی دانیشتووی ئەستەمبۆل، بەو گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕانەی کە ناوچەکە بەخۆیەوە دەبینی زوو کاریگەر بوون. کورد لە دەیەی کۆتایی سەدەی نۆزدە رۆڵێکی گەورەی لە جوڵاندنی رووداوە سیاسییەکانی دەوڵەتی عوسمانی هەبوو. دوو لە چواری ئەوانەی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقییان لە 1889 دامەزراند، کورد بوون، ئەوانیش عەبدوڵلا جەودەت و ئیسحاق سکۆتی بوون. بەشداریکردنی ئەم دوو کەسایەتییە لە دامەزراندنی ئەو کۆمەڵە یە، بەشداری کورد لە بەرەوپێشچوونی بزووتنەوەی چاکسازی و گۆڕانکاری لە پاڵ نەتەوەکانی دیکەی دەوڵەتی عوسمانی پیشان دەدات، وەك تورکی و عەرەبی و ئەلبانی و ئەرمەنی[1]. لە میانەی ئەو بەشدارییەی کورد، ئەوا بونیادنان و پەرەسەندنی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی لەسەر بنەمای هاوچەرخ وەکو تەواوی نەتەوەکانی دیکە بەردەوام بوو، ئەم پرۆسەیە لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیست خێراتر بوو، میقداد میدحەت بەدرخان یەکەم رۆژنامەی بەناوی (کوردستان) لەساڵی 1898 دەرکرد و تا ساڵی 1920 بەردەوام بوو[2]. هەریەکەی لە فیکری ئەفەندی دیاربەرکری و کوردی ئەحمەد رامز یەکەم کۆمەڵەی کوردی–رۆشنبیرییان لە ساڵی 1900 بەناوی (عزمی قوی كُردی)[3] دامەزراند.

سێ رووداوی گرنگ لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کاری لە سەرجەم گەلانی ناوچەکە بەگەلی کوردەوە کرد، بزووتنەوە نەتەوەییەکانی بەرەوپێش برد. یەکەم رووداو، شۆڕشی رووسی (1905–

(1) - هوكَر طاهر توفيق، دور الصحافة الكُردية في تطوير الوعي القومي الكُردي 1898–1918، دار سبيريز للطباعة والنشر، دهوك، 2004، ص ص 33–34.

(2) -Martin Strohmeier, Crucial Image in the Presentation of Kurdish National Identity, Bril, Leiden-Boston, 2003, P. 21-26.

(3) - زنار سلوبي، مسالة كُردستان، 60 عاماً من النضال المسلح للشعب الكُردي ضد العبودية، تنقيح وتقديم، عز الدين مصطفى رسول، رابطة كاوه للثقافة الكُردية، ط 2، بيروت، 1997، ص 36.

1907) دژ بە رژێمی قەیسەر بوو، کە هانی بزووتنەوە نەتەوەییەکانی ئێران و دەوڵەتی عوسمانی دا کە داوا و خەبات لە پێناوی مافە نەتەوەییەکانیان بکەن[1]. رووداوی دووەم شۆڕشی دەستووری (مەشرووتیەت) لە ئێران لە ساڵی 1906–1911 دژی قاجارییەکان بوو. کە لە شۆڕشی مەشرووتەدا کورد هاوکاری نەتەوەکانی دیکەی کرد و لەلای خۆیانەوە کۆمەڵە کانیان (انجومنات) لە مەهاباد و کرمانشان و سنە دامەزراند[2].

هەرچی رووداوی سێیەمە، گەورەترین کاریگەری لەسەر کورد بەشێوەیەکی تایبەت هەبوو، ئەوا کودەتای ئیتیحادییەکان بوو لە 23ی تەمووزی 1908، کە لە کۆتاییدا، دوایی بە دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم هێنا و بەڵێنی چاکسازی دەستووری و ژیانی پەرلەمانی راستەقینەی دا. کورد وەکو تەواوی نەتەوەکانی دیکەی دەوڵەتی عوسمانی سوودی لە رەوشی کرانەوەی سیاسی و "بەهاری تورکیایی گەنجەکان[ترکیا الفتاة]"، وەرگرت[3]. هەرچەندە ئەم کرانەیەوە تەمەنی کورت بوو، بەڵام ناوەندە کوردییە جیاوازەکان هەوڵی دامەزراندنی ئەو پارت و رێکخراوانەیان دەدا، کە هەریەکە لەلای خۆیەوە رۆژنامە و گۆڤاری تایبەت بەخۆی دەردەکرد و کلتوور و هۆشیاری نەتەوەیی لەنیو کوردا بڵاودەکردەوە. (کۆمەڵەی هاوکاری و تەرەقی کوردی–کُرد تعاون و ترقی جمعیتی) یەکەمین کۆمەڵەی سیاسی کوردی ئاشکرا بوو[4]، لە ساڵی 1908 کۆمەلی سیاسەتمەدار و رۆشنبیری کورد لە ئەستەمبۆل دایانمەزراند. ئەو کۆمەڵە یە گۆڤاری (کرد تعاون و ترقی غەزەتەسی) دەکرد و لە ویلایەتەکانی بەتلیس و موسڵ و دیاربەکر و ئەرزەروم لقیان کردەوە[5].

(1) - جليلي جليل، نهضة الاكراد...، ص 57.

(2) - جرجيس فتح الله، يقظة الكُرد: تاريخ سياسي 1900–1925، مؤسسة اراس للطباعة والنشر، اربيل، 2002، ص 36.

(3) - كندال، "الاكراد في ظل الإمبراطورية العثمانية"، في حركة التحرير الفلسطينية (فتح) التعبئة والتنظيم "الدراسات"، الاكراد وكردستان، د.م، 1982، ص 53.

(4) -Hacer Sozbir, Op. Cit., P. 32 .

(5) -JANET KLEIN, Op. Cit., P. 140.



هەروەها کۆمەڵە رۆشنبیری کە لە کۆمەڵەی هاوکاری و تەرەقی کوردی جیابووەوە، یەکەم قوتابخانەی کوردییان لە ساڵی 1910 لە ئەستەمبۆل بەناوی (قوتابخانەی نموونەیی کوردی مەشروتی– کُرد نمونە مکتب ابتدائسی مشروتیەت) دامەزراند[1].

لابردنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە دەسەڵات بەیەکجاری لە کۆتایی نیسانی 1909 لەلایەن کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرقییەوە، رێگای بۆ نەتەوە پەرستەکانی تورك خۆشکرد بەسەر ئاراستەکانی ئەو کۆمەڵە یە زاڵ بن. سەرکردە تازەکانی دروشمەکانی "**ئازادی و عەدالەت و یەکسانی**"یان کە پێشتر زۆر رەواجیان بۆ دەکرد، کە شۆرشیان کرد، وەلانا. ئەوکاتەش ئامانجی کەسایەتی و سەرکردە کوردەکان کە رێکخراو و بەپەرۆش بوون بۆ حوکمی ئیتیحادییەکان تاکو مافە نەتەوەییەکانیان لەبۆتەی نیشتمانی عوسمانی بەدەست بخەن، بووە ئاواتیکی دوورە دەست. ئیتیحادییەکان دوورخستنەوەی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم، پێگەی خۆیان لە دەسەڵات قاییم کرد و یانە و کۆمەڵە کوردییەکانیان بە قوتابخانەکەی ئەستەمبۆلیشەوە داخست، هەڵمەتێکی دەستگیرکردن و تەنگپێهەڵچنینی کەسایەتییە سیاسییە چالاکەکانی ئەستەمبۆل دەستی پێکرد، ئەمەش ژمارەیەکی ناچارکردن وڵات جێبهێلن و رووبکەنە دەرەوە. ئەم رووداوانە کۆتایی "**بەهاری کورتی کوردی**" دیاریکرد[2]، هەروەها ئیتیحادییەکان لە رێگەی نێردراوەکانی بۆ کوردستان دەستی بە بڵاوکردنەوەی تۆوی جیاوازی و ناکۆکی لە نێوان کورد و ئەرمەن و خودی سەرکردە کوردەکان کرد، دوایی بریاریاندا سوود لە فەوجەکانی سوارچاکی حەمیدیە وەربگرن، کە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم دایمەزراندبوو و ناوەکەیان بۆ (فەوجەکانی چەکی سوکی سوارچاك لە گەرۆك)[3] گوڕا بوو.

(1) - هوكَر طاهر توفيق، الألف باء الكُردية: نشأتها وتطورها، دار سبيريز للطباعة والنشر، دهوك، 2005، ص 31.

(2) -Naci Kutlay, Ittihat Terakki ve Kurtler, Beybun Yayinlari, Ankara, 1992, S. 230.

(3) - م. س. لازاريف، "كُردستان عشية انهيار الامبراطورية العثمانية"، ص 167

کورد هەر زوو نارەزایەتییان لە رەوشە نوێیەکە پیشاندا، وەڵامیاندایەوە کە زنجیرەیەك بزووتنەوەی چەکداری و یاخیبوون لە تەواوی کوردستان دەستپێدەکەن. یەکەم کاردانەوەی کوردی لەسەر سیاسەتی ئیتیحادییەکان لە عەشیرەتەکانی میللی بەسەرکردایەتی ئیبراهیم پاشای میللی لە 1909 هات[1]، دوای ئەمەش لە کۆتایی 1909 و سەرەتای 1910 شێخ عەبدوسەلامی بارزانی بزووتنەوەیەکی دژی عوسمانییەکان کرد و کۆمەڵێ داخوازی پێشکەشکرد[2]. شانبەشانی ئەمەش، کوردانی دیرسیم و سلێمانی بەسەرکردایەتی شێخ سەعید بەرزنجی یاخیبوونیان بەسەر ئیتیحادییەکان راگەیاند[3]، سەرباری راپەرینی کوردانی ئاگری لە عەشیرەتەکانی حەیدەر ئانلی، ئەوانەی پێشتر لە سوپای حەمیدیە رێکخرابوون[4]. بزووتنەوەی بەدلیس کە ساڵی 1913 بە سەرکردایەتی مەلا سەلیم بەدلیسی، باری رەتکردنەوە و نارەزایی کوردی لەسەر هەڵسوکەوتەکانی ئیتیحادییەکان بە شێوەیەکی روون دەربری[5]. دوای ئەوەی حکوومەتی ئیتیحادی بریاریدا دەوڵەتی عوسمانی دەچێتە ناوجەنگی یەکەمەوە، دەوڵەتی عوسمانی ساڵی 1914 چووە ناو قۆناغێکی مەترسیدارەوە، ئەمەش بۆ هۆکاریك نەبووە، بەڵکو بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی خەیالی بوو لە دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتێك کە رەگەزی تورکی لە ئەدریاتیکەوە تا دیواری چین لەخۆ دەگریت، ئەمەش لە وتەکەی (زیا کۆك ئەلب)ەوە هاتووە، کە دەڵێت: "**نیشتمان بۆ تورکان هەر نە تورکیا نە کوردستانە. نیشتمانەکەی وڵاتیکی پانوپۆر و بەردەوامە، ئەویش تۆرانە**"[6].

(1) - م. س. لازاریف، المسألة الكُردية 1917–1923،ترجمة عبدي حاجي، دار الرازي، بيروت، 1998، ص ص 220–221.

(2) - جرجيس فتح الله، يقظة الكُرد، ص ص 66–67.

(3) - ينظر، كندال، المصدر السابق، ص ص 54–55.

(4) -Ersal Yavi, Kurdistan Utopyasi, 1 Dosya, Yazci Yayinevi, Izmir, 2006, S. 47.

(5) - كمال مظهر احمد، كُردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ترجمة محمد الملا عبد الكريم، دار افاق عربية للطباعة والنشر، ط2، بغداد، 1984، ص ص 110–112.

(6) - كندال، المصدر السابق، ص 56.



کورد وەك باقی گەلانی دەوڵەتی عوسمانی بەناچاری بەشداری لە جەنگی یەکەمدا کرد و قوربانی گەورەی دا، 300 هەزار پیاو لەوانەی لە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی بەشداری جەنگەکەیان کرد، کوژران[1]. هەروەها نزیکەی 500 هەزار مەدەنی کوژران[2]. بەرگەی وێرانکاری و خاپورکردنی شار و گوندەکانیان گرت، کە زۆربەیان بەتەواوی خاپور بوون، ئەمەش بەهۆی ئەوەی ببووە گۆرەپانی چالاکی جەنگی و شەڕەکانی جەنگی جیهانی، بەتایبەتی لە بەرە رووسییەکەی[3].

هەرچۆنێ بێت ئەنجامەکانی جەنگەکە، بۆ دەوڵەتی عوسمانی و گەلانی ماڵ وێرانکەر بوو. ئەمەش بۆ پیشاندانی مەودای ئەو هەڵە و سەرکێشییە دۆڕاوەی کە جەمال پاشا و ئەنوەر پاشا و تەلعەت پاشا و ئەوانی دوای راستەوخۆ دۆرانەکە لە وڵات هەڵاتن، بەس بوو. بەکردەوە دەوڵەتی عوسمانی لە نەخشەی سیاسی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست نەما، لە (کۆنگرەی ئاشتی پاریس Peace Conference of Paris) بریاردرا چارەنووسی گەلانی عوسمانی دیاری بکرێت. بە رێککەوتنی لایەنە بەشدارەکان کۆنگرەکە لە 18ی کانوونی دووەمی 1919 لە پاریس کرایەوە[4]، هەموو چاوەکان کەوتە سەر دەوڵەتی عوسمانی، چونکە ئەوە دەوڵەتی عوسمانییە سەرلەنوێ نەخشەی سیاسی دەکێشێ و چارەنووسی ژمارەیەك گەلیش دیاری دەکات[5].

سەبارەت بە کوردیش، پێ دەچوو سەرکردەکانی بە پەرۆشەوە بن بۆ کۆنگرەکە، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە هاوپەیمانان لە میانەی جەنگەکە و

(1) - محمد امين زكي بك، خلاصة تاريخ الكُرد وكُردستان منذ اقدم العصور حتى الآن، نقله الى العربية محمد علي عوني، تقديم، كمال مظهر احمد، ط2، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، 2005، ج 1، ص 65.

(2) -Robert Olson, The Emergence of Kurdish Nationalism and Sheikh Said Rebellion, Austen, 1989. P. 29.

(3) – بۆ زیاتر پێزانینی لە سەر کاولبوونی کوردستان لە کاتی شەری جیهانی یەکەم، سەیری، کمال مظهر احمد، کردستان...، ص ص 197–234.

(4) -Paul C. Helmriech, From Paris to Sevres, U.S, 1974, P.3.

(5) -H.W.V. Temperley, A History of the Peace Conference of Paris, Oxford, 1969, Vol. I, P. 145.

راستەوخۆ دوای جەنگەکەش لێدوانیان لەبارەی بەخشینی مافی چارەنووس بە گەلانی ناتورکی دەوڵەتی عوسمانی داوە. چواردە بەندەکەی سەرۆکی ئەمریکی ودرۆ ویلسن لە کانوونی دووەمی 1918[1] و لێدوانی بەریتانی–فەڕەنسی لە 7ی تشرینی دووەمی 1918، کە راگەیەنرا بوو کە ئامانجی جەنگەکە لە بەرەکانی رۆژهەڵات بۆ هەردوو حکوومەتەکە بەریتانی–فەڕەنسی **"رزگارکردنی تەواو و کۆتایی ئەو گەلانەیە کە ماوەیەکی درێژە رووبەڕووی سەرکوتی تورکی بوونەتەوە، هەروەها دامەزراندنی حکوومەت و ئیدارەی نیشتمانییە کە دەسەڵاتەکەی لە خواستی دانیشتوانەکەی وەرگرتبێ"**[2]، ئەمانە لە دیاریترین ئەو لێدوان و بەڵێنانە بوون.

شانبەشانی زۆری گفتوگۆ لەبارەی کوردستان و رزگاری کورد لە رێگەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی سەربەخۆ بۆ خۆیان[3]. لەهەمان رێرەودا لوید جۆرج Lloyd George ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانی لەبەردەم ئەنجوومەنی عمومی بەریتانی لە 18ی تشرینی دووەمی 1918 رایگەیاند: **"کورد، زوڵم و زۆری تورکیای چێشتووە، مافیان هەیە لە سنووری نەتەوەیی"**[1]. لەم سەروبەندەدا، کۆمەڵە و رێکخراوە کوردییەکان، دەستیان بە چالاکی و هەوڵدانی گەورە کرد، کە وایکرد ژەنەراڵ شەریف پاشا بە نوێنەری کورد لەلای هاوپەیمانان دانرا[2]. دوای ئەوەی شەریف پاشا[3] خۆی وەك نوێنەری کورد پێشکەشکرد، دوو یادداشتی (یەکێکیان لە 22ی ئازار و ئەوەی دیکەیان لە 1ی ئازار) بۆ کۆنگرەی ئاشتی بەناوی کورد، بەرزکردەوە، کە داخوازییەکانیان بە نەخشەیەکی کوردستانی پێوە لکێنرابوو، لە خۆگرتبوو[4].

ئەو رووداو و لێدوانانە بۆ واقیع لە کۆنگرەی ئاشتی (18ی کانوونی 1919 – کانوونی دووەمی 1920) بە دیاریکراوی لە 30ی کانوونی دووەم، وەرگێردران، کاتی هاوپەیمانان پیشنیازێکیان بە لوید جۆرج پێشکەشکرد، لەسەر ئەوەی کە **"هاوپەیمانان و وڵاتانی هاریکار، لەسەر ئەوەی کە دەبێت ئەرمینا و سووریا و وڵاتی نێوان دوو رووبارەکە و کوردستان و فەلەستین و دورگەی عەرەبی بە**

---

(1)- بو بینینی ئەو بەندانە سەیری، کمال مظهر احمد، أضواء علی قضایا دولیة في الشرق الأوسط، بغداد، 1978، ص55 وما بعدها. ئەوەی لێرەدا پیویستە ئاماژەی بۆ بکرێت کە سەرکردە کوردەکانی ئەو کاتە، داخوازییەکانی گەلەکەیان بەو بەلێنانە پشت ئەستور دەکرد، بۆئەوەی سیفەتێکی یاسای نێودەولەتی بدەنێ، ئەمەش بەوپێیەی لە لای سەرۆکی هێزێکی گەورەوە هاتووە، ئارنۆلد ویلسن لە سەردانەکەی بۆ لای شێخ مەحموود، کە دوای بریندار بوونی لە شەڕی دەربەندی بازیان لە 1919 و دواتر بەندکردنی، بۆمان دەگێڕێتەوە کە لەمیانەی سەردانێکی بۆلای شێخ لە شوێنی دەستبەسەرکردنی لە نەخۆشخانە 14 بەندەکەی سەرۆك ویلسن و لێدوانی بەریتانی– فەڕەنسی بۆ خویندۆتەوە کە دانە وەرگێڕدراوە کوردییەکەی لەسەر قورئانیك کە بەبن هەنگڵیەوە وەك نوشتە بەسترا بوو، نووسرابوو. جرجیس فتح الله، یقظة الکُرد، ص 221.

(2) – بو دیتنی تێکستی ئە بەیاننامە سەیری، فیلیب ویلارد ایرلاند، العراق: دراسة في تطوره السیاسي، ترجمة: جعفر الخیاط، بیروت، 1949، ص 263.

(3) - برهان الدین ابابکر یاسین، کُردستان في سیاسة القوی العظمی 1941–1947، ترجمة هوراس سوار، مطبعة هاوار، دهوك، 2000، ص ص 39–40.



(1) - وەرگرتووە لە: قاسم خلف عاصي الجمیلي، تطورات واتجاهات السیاسیة الداخلیة الترکیة 1923–1928، رسالة ماجستیر مقدمة إلی کلیة الآداب، جامعة بغداد، 1985، ص 128.

(2) - م.أ.حسرتیان، القضایا القومیة في ترکیا، ترجمة: سیامند سیرتي، مراجعة وتقدیم عزیز داود محمد، سوریا،1991، ص 11.

(3) - شەریف پاشا، کوری سەعید پاشای خەندانە، لە نێوان سالانی 1898 تا 1908 پۆستی بالیۆزی دەولەتی عوسمانی لە سوید وەرگرتووە، لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی هاوکاری و تەرەقی کوردی دەژمێردرێت، ناوی بە کێشەی کورد لە کۆنگرەی ئاشتی پاریس گریدراوە، کە نوێنەرایەتی کوردی تێدا کردووە، بۆ وەدەستهێنانی مافەکانی کورد لە دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ، لەلای نوێنەرانی هاوپەیمانان و ئەرمەن چالاك بووە. روهات الاکوم، شریف باشا سنوات عاصفة لدیبلوماسي کُردي، ترجمة: شکور مصطفی، کُردستان العراق، 2004، ص ص 17–23.

(4) – بو دیتنی ناوەروکی هەردوو یادداشت، سەیری، فؤاد حمە خورشید مصطفی، القضیة الکُردیة في المؤتمرات الدولیة، مؤسسة موکریاني، أربیل، 2001، ص ص 115–131؛ إبراهیم الداقوقي، اکراد ترکیا، دار المدی، دمشق، 2003، ص ص 172–173؛

– Harry N. Howard, The Partition of Turkey 1913-1923, New York, 1966, Pp. 226-227.

**شێوەیەکی کۆتایی لە ئیمپراتوری تورکی [واتە عوسمانی] دابڕێت، بەڵام دەبێت ئەم چارەسەرییە کار لە بەشەکانی دیکەی ئیمپراتۆرەکە نەکات"**[1].

باسکردنی ناوی کوردستان لە کۆنگرەی ئاشتی وەك قەوارەیەکی خودان کەسایەتی سەربەخۆ، ئاماژەیەك بوو لەسەر ئەوەی کە پرسی کورد مۆرکێکی یاسایی وەرگرتووە، هەروەها جەختیشی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە پرسی کورد لە نێوەندە نێودەوڵەتییەکان ئەو دەست ئەو دەست دەکرێت و بڵاوە[2].

کۆنگرە و کۆبوونەوەکانی نێوان وڵاتانی هاوپەیمان دارشتنی پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی بەرجەستەکرد، پەیماننامەی (سیڤەر) کە لە 10ی ئابی 1920، لە بەشی سێیەمی بەندی دووەمدا ناوی (کوردستان) بردووە.

لە نێو بەندەکانی مافی دامەزراندنی ئۆتۆنۆمی لەو ناوچانەی کە زۆرینەی کوردن لە تورکیا پەسندکرد، دواتر پەرە بەم ئۆتۆنۆمییە بۆ سەربەخۆیی تەواو دەدرێت، ئەگەر دانیشتوانەکەی حەز بکەن[3]. بەڵام پەیمانی سیڤەر هەرگیز

(1) -Harry N. Howard, Op. Cit., P. 221; Paul C. Helmerich, Op. Cit., Pp. 26-27.

(2) - م. أ. حسرتيان، القضايا القومية في تركيا، ترجمة، سيامند سيرتي، مراجعة وتقديم عزيز داود محمد، سوريا،1991، ص 11.

(3) - پەیمانی سیڤەر لە سێ ماددەکانی 62و 63و64 بەشی سێیەمدا باسی لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی کردووە، هەروەها بریاردرا، لیژنەی هەڵسەنگاندن لە ئەستەمبۆل پێکبهێنرێت و بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتالیا نوینەریان لە لیژنەکەدا هەبوو، دەبوو لیژنەکە لەماوەی شەش مانگی دوای مۆرکردنی پەیمانەکە پلانی ئۆتۆنۆمی لەو ناچانەی زۆربەی کوردن پێشکەش بکات، بۆ بەدیهێنانی ئەمە لیژنەیەکی دیکە کە نوێنەرانی بەریتانیا و فەڕەنسا و ئێران و نوێنەریکی کوردی لە خۆگرتبوو، بەمەبەستی گەران و وەگەڕدان و چاکسازی ناوچەکە دەکەن، بەڵام دەبێت حکوومەتی عوسمانی رازی بێت بریارەکانی هەردوولا جێبەجێ بکات. ئەگەر کوردان لەماوەی ساڵێ کی داوای جێبەجێکردنی پەیمانەکە داوای سەربەخۆیی بکەن، دوای ئەوەی بە (کۆمەڵەی گەلان–عصبە الامم) رادەگەیەنرێت، ئەوا بەپێی ئەم وەسیقەیە پێویستە تورکیا (لەسەر بەدیهێنانی ئەم ئیمتیازاتانە رازی بێت و لەهەموو مافێك و ناوێك کە لەو ناوچانە هەیەتی واز بێنێت. کاتێ ئەم دەستبەرداربوونە ئەنجام درا، ئەوا هاوپەیمانان هیچ لاریەکی لە ئاوێتە بوونیکی ئارەزوومەندانەی دانیشتوانی ئەو بەشەی کوردستان کە لە ویلایەتی موسڵدان لەگەڵ ئەو دەوڵەتە کوردییە سەربەخۆیەی کە دروست دەبێ. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر=



جێبەجێنەکرا، **"ئەو وەسیقەیە لەو ساتەوەی کە مۆرکرا، مردبوو"**. چونکە دژایەتی تێدابوو. حکوومەتی سوڵتان کە پەیمانەکەی مۆر کردبوو، دەسەڵاتەکەی، بەگوێرەی دەستەواژەی میژوونووسێك، **"لە مەودای بینینی منارەکانی ئەستەمبۆلەوە تێپەری نەدەکرد"**[1]. هەروەها ململانێی توند لەسەر بەرژەوەندی لە نێوان وڵاتە گەورەکان رۆڵێکی گرنگی لە لەگۆڕنانی پەیمانەکە هەبوو. بەڵام ئەوەی گومانی تێدانییە، ئەوەیە کە حکوومەتی کەمالییەکان کە پێشەوایەتی جەنگی سەربەخۆیی تورکیای (1919–1922) کرد، رۆڵێکی گەورەی لە دووبارە رێکخستنەوەی رەوشە نوێیەکە و تێکەڵاوبوونی پەڕاو و لێکدانەوەکان هەبوو[2].

مستەفا کەمال، لە میانەی جەنگی سەربەخۆیی لە زۆر وتاردا ئاماژەی بە برایەتی تورکی–کوردی و یەکسانی و خەباتی هاوبەش کردووە[3]. لەمەشدا فاکتەرە ئایینی و بانگەشەکانی جیهادیان بەکارهێنا و بەڵێن بە وەرگرتنی مافە نەتەوەییەکانی کوردان دران، لە یەکێ لە وتارەکانی لە ناوچەکانی کوردستان بانگەشەی **"رزگارکەری کوردستان"** و بەرگری کردن **"لە خەلیفە...و بەندکردنی هێزی داگیرکەر، هەروەها لەبارەی پیسکردنی خاکی ئیسلامی لەلایەن کریستیانە خوانەناسەکان"** دەکرد[4]. هەروەها جەختی لەسەر

=پەیمانەکە سەیری، Osman Olçay, Severs AndlaŞmasina DoĞru, (Çesitli Konferans ve Toplantilarin Tütanaklari ve Bünlara IliŞkin BelĞeler) , Ankara. University , Turkey, 199;

هەروەها سەیری، زهير عبد الملك، الأكراد وبلادهم كردستان بين سؤال وجواب، دار ابيك، السويد، 1999، ص ص 160–161.

(1) - كمال مظهر احمد، كُردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى، ص350.

(2) – سەیری، بيار مصطفى سيف الدين، السياسة البريطانية تجاه تركيا واثرها في كردستان، الدار العربية للموسوعات، بيروت، 2006، ص ص 69–70.

(3) - Abdurrahman Arslan, Samsun'dan Lozan'a Mustafa Kemal ve Kurtler (-1919 1923), Doz Yayinlari, Istanbul, 1991, Ss,

(4) - بۆ زانینی زیاتر لە بارەی ئەو وتارانەی کە مستەفا کەمال پێشکەشی کردوون، سەیری، Dogu Prerincek, Kemalist Devrim (4): Kurtulus Savasinda Kurt Politikasi, Kaynak Yayinlari, Istanbul, 1999.

دامەزراندنی نیشتمانێکی هاوبەشی بۆ تورك و کورد کە هەردوولا مافی یەکسانیان دەبێت، کردەوە. هەروەها پەرلەمانی Buyuk Millet Meclisi–ی تورکی لە 10ی شوباتی 1922 پرۆژە یاسایەکی تێپەراند کە رازیبووە لەسەر ئەوەی حوکمی زاتییەکی سادە بە کورد بدات[1].

کۆتایی جەنگی سەربەخۆیی تورکی و بەدەستەوەگرتنی جلەوی دەسەڵات لەلایەن کەمالییەکانەوە، نیشانەی دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێ بوو لە پرسی کورد لە تورکیا، ئەو قۆناغە بە پاشەکشەی دەوڵەتانی هاوپەیمان لە پاڵپشتیکردن لە کێشەی کورد دەناسرێتەوە، ئەمەش بە روونی لە پەیمانی لۆزان دەرکەوت، کە لە 24ی تەمووزی 1923 مۆرکرا، کە هەرچەندە گرەنتی وردی لەبارەی مافی کەمینە ناموسوڵمانەکانی پێشکەش کردبوو، بەڵام پەیمانەکە ئاماژەی بە کورد نەکردووە[2]. بە مۆرکردنی پەیمانە نوێیەکە و چارەسەکردنی زۆربەی پرسە ناکۆکەکانی لەگەڵ تورکان، وڵاتانی رۆژئاوا دابینکردنی بەرژەوەندییەکانی پێ باشتر بوو لە گەڕان بەدوای بەدیهێنانی بەڵێن و دروشمەکانی لەبارەی ئازادی و مافی چارەنووسی ئەو گەلانەی ژێر دەسەڵاتی تورکان دەیان ناڵاند پێش گوتایی شەری جیهانی ئێکەم[3]. ئەو بەرژەوەندییانەی کە وای دەخواست دووبارە پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ تورکیا **"بونیاد بنرێت"**، ئەو تورکیایەی کە ئاراستەی داهاتوویدا رۆژئاوای هەڵبژاردووە. لە پەیمانی لۆزانەوە، وەك بڵێی پرسی کورد بۆ خاڵی دەستپێکی گەڕاوەتەوە، دووبارە لە کێشەیەك کە نێوەندە نێودەوڵەتییەکان باوەڕپێکراوەکان و کۆمەڵەی نەتەوەکان دانی پێنرا، بۆ بابەتی نێوخۆیی

(1) - لقمان محو، المصدر السابق، ص 119؛ Ersal Yavi, Kurdistan Utoyasi (2 Dosya), Yazici Yayinvi, Izmir, 2006, P. 531.

(2) - مافی کەمینە نا موسوڵمانەکانی تورکیا لە بەشی یەکەم (حوکمە سیاسییەکان) ماددەکانی (37–45) هاتووە، سەیری: لوزان صلح معاهدة نامه سی، مقاولات وسندات سائرة، 24 تموز 1339–1923، مطبعه احمد إحسان وشركاسى، استانبول، 1340، ص ص 15–18.

(3) -Ismael GüldaŞ, A.G.E, S. 118.



لۆکاڵی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە، وە کێشەیەکی نێوخۆیی تایبەت سەیرکرا[1]. لەو کاتەوە لەسەر کورد ئەوانەی کە **"بە قوربانییەکانی چارەسەری جەنگ"**[2] وەسفکران، پێویست بوو، رووبەڕووی زنجیرەیەکی بەهێز لە رێوشوێنی سەرکوتکردن لەلایەن ئەو حکوومەتانەی زەوییەکانیان دابەشکردووە، ببنەوە. هەر وڵاتێك لەمانە پرسی زاڵبوون بەسەریان و هەوڵدان بۆ لە خۆگرتنیان و تواندنەوەیان بەگوێرەی رێگای خۆیان چارەسەرکرد کە لەهەریەکە لەمانە جیاوازن، "کە وڵاتانی **رۆژئاواش هیچ سکالایەکیان نەبوو**"[3].

ئەوەی بە کوردەوە پەیوەستە، ئەوا خۆیان لەبەرامبەر دەسەڵاتێکی نوێ کە سیاسەتەکی توندی بەرامبەر فرەیی ئەتنی گرتەبەر، هەرچەندە پێکهاتەی دانیشتوان لە تورکیا پلەیەکی بەرز لە فرەیی ئەتنی و زمان و ئایین دەردەخات، بەشێوەیەك دەکرێت 47 کۆمەڵەی ئەتنی جیابکەینەوە، کوردان لە تورکیا بەشی شێریان لەم سیاسەتە بەردەکەوت، چونکە گەورەترین گرووپی زمانی و ئەتنی دوای تورکانن[4]. ئەم سیاسەتانە بۆ یاسا و دواتر خزێنرانە نێو سێ دەستوورەکەی (1924 و 1961 و 1982) تورکیا، هەروەها کۆمەڵێکی گەورە لە یاسا و رێسا بۆ تواندنەوەی کورد لە بۆتەی نەتەوەی تورکی دارێژران.

زۆربەی ئەو کوردانەی کە بەدەنگ بانگەوازەکەی مستەفا کەمالەوە چوون، لە زۆربەی جەنگەکانی سەربەخۆیی بەشدارییان کرد، چاوەڕێی یەکسانی و هاوبەش پێکردنیان لە ئیدارەی دەوڵەت دەکرد، ئەوانە تووشی بێ ئومێدی بوون، رێك لەبەرامبەر رژێمیکی نەتەوەپەرست، کە سوورە لە نێو ئومەتی

(1) - م.س.لازاريف، المسالة الكُردية 1917–1923، ص 280.

(2) -Gidon Gottlieb, "Nation without States", Journal of Foreign Affairs, No. 73, May-June, U.S. 1994, P. 104.

(3) - لقمان محو، المصدر السابق، ص 22.

(4) - گولستان گوربای، "تطور الحركة القومية الكُردية في تركيا منذ ثمانينات القرن العشرين"، في: القضية الكُردية في تركيا، هنري باركي وآخرون، ترجمة، هفال، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، اربيل، 2007، ص 39.

تورکی لەڕێگای کلتوور و هێزی چەکداری بەیەکەوە، بیانتوێنێتەوە[1]. لە 3ی ئازاری 1924، واتە لەهەمان رۆژی هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت، بریاری قەدەغەکردنی سەرجەم قوتابخانە و کۆمەڵە و بڵاوکراوە کوردییەکان دەرکرد، بەهەمان رێگاش دامەزراوە و قوتابخانە ئایینییەکان قەدەغەکران[2]، هەروەها لە هەمان ئەو رۆژەدا حکوومەتی نوێ یاسای تایبەت بە **"کوردستانی سەربەخۆ"** کە پەرلەمان پێشتر پەسندی کردبوو، هەلوەشاندەوە[3].

لە نیسانی 1924 پەرلەمانی تورکی دەستوورێکی نوێی پەسند کرد، ماددەی (11) باس لەوە دەکات کە هەر ژن و پیاوێکی تورکی تەمەن 30 ساڵ مافی ئەوەی هەیە خۆی بپاڵێوێ. لە ماددەی (68) باس لەوە دەکات کە هەموو ئەوانەی بە تورکی لە دایك دەبن، ئازادن،. ماددەی (69) دەڵێت **"هەموو تورکان لەبەرامبەر یاسادا یەکسانن"** و لە مادەی (88) هاتووە کە **"هەموو ئەوانەی لە تورکیا لە دایك دەبن بەبێ لەبەرچاوگرتنی رەچەلەك و ئایینەکەی ئەوا تورکییە"**. هەروەها دەستوورەکە پێویستی کردووە کە (سوێندی یاسایی) سەرۆکی تورکی دەبێت بەم شێوەیە بێت **"سوێند بەشەرەفم دەخۆم کە پارێزگاری لە یاساکان و بنەماکانی کۆمار بکەم،... و بەهەموو هێزێکی هەموو کار بۆ دلخۆشی ئۆمەتی تورکی بکەم"**. هەر بەگوێرەی ماددەی (2)ی دەستوورەکە قسەکردن بە زمانی کوردی لە شوێن گشتییەکانی قەدەغەکردووە **"زمانی تورکی تاکە زمانی فەرمی دەوڵەت دەبێت"**[4]. هەرچی یاسای 1505 بوو، وایکرد زەوییەکانی گەورە موڵکداران دەستبەسەردا بگرێت

[1] - هنري باركي وغراهام فولر، المسألة الكُردية في تركيا: انعطافات حاسمة وفرص ضائعة، شؤون الأوسط، العدد (66)، تشرين الأول/اكتوبر 1997، ص 107.

[2] - كندال، المصدر السابق، ص 92؛ Ersal Yavi, A.G.E., S. 532.

[3] -Ersal Yavi, A.E.G, S. 532

[4] - م.ا. حەسرەتیان، یاسا دەستورییەکانی تورکیا و کورد لە سەردەمی نوێدا، وەرگێڕانی دلێر ئەحمەد، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی، 2007، ل ل 21–22؛ جبار قادر، قضايا كُردية معاصرة: كركوك، الانفال، الكُرد وتركيا، مؤسسة اراس للطباعة والنشر، اربيل، 2006، ص ص 238–239.



و بە جێنشینە نوێیە تورکەکانی کوردستانی بدات[1]. بەم شێوەیە زاراوەی **"هاووڵاتی"** و **"هاووڵاتی بوون"** کە لە دەستوورەکەدا هاتبوو، **هاوواتای** ئینتیما بوو بۆ تورکیا. بە گوێرەی ئەمەش وەسیقەکە رایگەیاند کە دەبێت مرۆڤ تورکی بێت، بۆئەوەی ببێتە ئەندامی پەرلەمان یا لە هەر دامەزراوێکی فەرمی حکوومی دابمەزرێ، دەکرێت کورد بە **"تورك"** وەسف بکرێت، ئەگەر نکۆڵی لە ناسنامەی ئەتنی خۆی کرد[2]. توێژەرێك لەمبارەیەوە دەڵێت: **"گرفتەکە ئەوە نییە کە تورکیا کورد وەك هاووڵاتی تورك رەت دەکاتەوە، بەڵکو گرفتەکە بەدیاریکراو ئەوەیە کە تورکیا هەوڵدەدات کورد ناچار بکات وەك تورك خۆیان ببینن"**[3].

رژێمی نوێ هەوڵیدا تورکیا بۆ وڵاتێکی نەتەوەیی بگۆڕێت و کەمە نەتەوەییەکان وەك بەربەستێك لەبەردەم پرۆژەکانی تایبەت بە دروستکردنی وڵاتێکی هەماهەنگ دەزانی، بە سەپاندنی زمانی **"نەتەوەیی"** و داهێنانی شێوازی تاك کلتووری. کورد، لەسەردەمی پێشووی عوسمانی بەشێك بوون لە زۆرینەی موسوڵمانی باڵادەست، ئێستا بۆ کەمینەیەك کە رەوشێکی یاسایی وایان نییە مافەکانیان پێ ببەخشێ[4]. ئەوە روون و ئاشکرا بوو کە سەرانی رژێمی کەمالی ئەو کوردانەی نەبوونە تورك وەك رەگەزێکی جیاواز و هەرەشەیەکی شاراوە بۆ سەر یەکێتی خاکی ئەو دەوڵەتەی بەنیازی دروستی بکەن، سەیر دەکرد. ئەمەش وایکرد گرفتەکە ئاوێتە ببێت، بریاری رژێمی نوی بە دەستبەرداربوونی لە ئایینی ئیسلامی، کە رەگەزێکی سەرەکی

[1] -Bulent Gokay, "The Kurdish Question in Turkey: Historical Roots, Domestic Concerns and International Law", in, Nazila Ghanae and Alexandra Xanthaki (eds.), Minorities, People and Self-determination, Martinus Nij hof Publishers, Leiden, 2005, P. 321.

[2] – سەیری، م.ا. حەسرەتیان، سەرچاوەی پێشوو، ل 21.

[3] -Will Kymlicka, Politics in the Vernacular: Nationalism, Multiculturalism and Citizenship, Oxford University press, Oxford, 2001, P. 247.

[4] -Hamid Bozarslan, "Why the Armed Struggle: Understanding the Violence in Kurdistan of Turkey", in, Ferhad Ibrahim and Gulistan Gurbey, The Kurdish Conflict in Turkey, LIT Verlag, Berlin, 200 , P. 23.

نزیکبوونـەوەی کـورد و تـورك بـوو بەدرێـژایی سـەردەمی عوسمـانی، لـەپاڵ هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت لە ئاڤاری 1924، پێ دەچوو پەیوەسـتێکی دیکـە کـە دوو نەتەوەکـەی بەیەکـەوە گرێـدەدا بپـچڕێ، ئەمـەش وایکـرد گـەورە و سەردارانی کورد وەکو تەواوی چین و توێـژ و دەسـتەبژێرە کوردییـەکانی دیکـە هەست بە نارەحەتی لە سیاسەتی کەمالی بکەن[1].

بەرەبەرە هەڵمەتەکانی بە تورککردن شـێوەیەکی ڕێکخـراوی لـە کوردسـتان وەرگرت، تا گەیشتە ئیدارەش، کارمەندانی تـورك یـا ئـەو کوردانـەی کۆکبـوون لەگەڵ سیاسەتەکانی کەمالییەکان بـۆ تواندنـەوەی کـورد لـە بۆتـەی نەتـەوەی تورك، دادەمـەزران، بەرەبـەرە نـاوی کوردسـتان لـە هـەموو کتێـب و ئەتڵەسـە جوگرافییەکان رەش دەکرانەوە و لادەبران و ناوی تورکی لە بری ناوە کوردییە رەسەنەکەی لێدەنرا[2]، دەستی ئەو رێوشوێنانە گەیشتە ئەو کوردانەش کە لـە سـوپای تـورکی خزمـەتیان دەکـرد، کەرامـەتیان پێـشێل دەکـرا[3]. هـەروەها هەرەسهێنانی کۆنگرەی (تورکی–کوردی) لە دیاربەکر لە یەکی ئابی 1924[4]، یەکەم ئاماژە بوو بۆ دەستپێکی قۆناغێکی تازە لـە پەیوەندییـەکانی تـورکی–کوردی کە مۆرکێکی توندوتیژی و شەڕی بەسەریدا زالبوو.

شانبەشانی پرۆسەی قەدەغەکردنی بەکارهێنانی زمـانی کـوردی لـە شـوێنە گـشتییەکان هەڵمـەتێکی دەستبەسـەرداگرتنی زەوی و زاری کـوردان و دابەشکردنی بەسەر ئـەو تورکانـەی لـە کوردسـتان نیـشتەجێکرابوون، دەسـتی پێکـرد، لەبەرامبـەردا هـۆزە کوردییـەکان بەتـەواوی بـۆ ناوچـە ناوخۆییـەکانی ئەنادۆڵ لە ناوەڕاستی جووتیارانی تورکی کۆچیان پێکرا، هـەر لەوکاتـەوە لـە سییەکانی سەدەی بیستەم تورکان نەیانویست دان بـەمافی کـورد وەك گـەلێکی جیا بنێن، بۆیـە نـاوی "**تـورکی شـاخی**"[1] یـان بەسـەردا بـڕین. تـا وایلێهـات زۆربەی کورد بوونە کەسانی نائامادە لە فەرهەنگی سیاسـی تـورکی، پرۆسـەی لابردنـی هـەموو ئاماژەیـەك بـۆ کـورد وەك گرووپێکـی جیـا لـە کۆمـەڵگا، بەشێوەیەکی خێرا دەستی پێکرد، بـە تێپـەربوونی کـات بـەکارهێنانی وشـەی (کـوردی) لـە رۆژنامـە یـا هـەر چـاپکراوێکی فـەرمی بـە پەرتووکـەکانی

(1) -Henri J. Barkey and Graham E. Fuller, Turkey's Kurdish question, Rowman & Littlefield Publishers, Inc., Lanham - Boulder - New York - Oxford, 1998, P. 10.

(2) - بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بـە سیاسـەتەکانی کەمالییـەکان سـەیری: ئیحسان نـوری باشـا، شورەشی نـەتەوەیی کورد لــە تورکیـا، وەرگــێڕان: م. جـەمیل روژبیـانی، بــەغدا، 1993، ل 21–22

Erik. J. Zürcher, Turkey: A Modern History, I.B. Tauris Publishers, New York-London, 1997, P. 44; Ersal Yavi, A.E.G., S. 532.

(3) - هارفي موريس وجون بلوج، لا أصدقاء سوى الجبـال، ترجمـة: راج آل محمـد، بـيروت، 1996، ص163.

(4) - کۆنگرەکە هەولێك بوو لەلای تورکەکان بۆ ئارامکردنەوەی ترسی کوردان کە، ئەو ترسە لـەلای نێوەندە نەتەوەیی هەمەجۆرەکان لـەبارەی رێوشـوێن و یاسـا دەرچـووەکانی حکوومـەت، کـە راستەوخۆ یەکانگیری مافە نەتەوەییەکانی کورد دەبووەوە، گوزارشتی لێکرا. کۆنگرەکە لەلای حکوومەتی تورکییەوە گرنگییەکی زۆری پێدرا و شاندێکی بۆ دیاربەکر نارد و چاوی بـە پیـاوە ماقول و سەرکردە وە کلاسـیکییە کوردییـەکان کـەوت، هـەروەها دانیـشتەکانی کۆنگرەکـە بـە نهێنی مایەوە و هیچ چاپکراوێکی فەرمی حکوومی ئاماژەی پێ نـەکرد. دیـاریترین داخـوازی=کورد، پێویست بوونی دامەزراندنی ئیدارەیەکی زاتی تایبەت بوو لە کوردستان، ئەمەش وەك زامنێك بۆ پاراستنی مافەکانی گەلی کورد، لەپاڵ داخوازی دیکە، کە بە دادگا شـەرعییەکان و جووتیارانی کوردەوە پەیوەست بوون. تورکەکان داخوازییـەکانی کوردانیـان رەت نـەکردەوە، بەڵام درێژەیان بە وەڵامدانەوەی دا، چونکە کێشەی موسڵ هێشتا لە گۆڕێ بوو، ئەوانیش (تورك) باش لە گرنگی فاکتەری کوردی لە یەکلاییکردنەوەی کێشە، گەیشتبوون، بۆیـە لـە گوتنـەوەی دروشمی برایەتی کوردی –تورکی بەردەوام بوون، هەندێ رێوشـوێنی شـێوەییان گرتەبـەر کـە بەشێك بوو لە داخوازییەکانی کورد، وەکو راگەیاندنی لێبووردنی گشتی و دواخستنی کارکردن بە هەندێ بریاری تایبەت بە دادگا شەرعییەکان، بۆ زانیاری زیاتر سەیری:

Henderson to Macdonald, Constantinople, 16-9-1924, in: Ingliz Belğelerile Türkey'de Kürt Sorünü (1924-1938), Hazirlayan B. N. Şimşir, Ankara, 1991, No.685, P. 13; Robert Olson, The Emergence of Kurdish Nationalism and Sheikh Said Rebellion, 1880-1925, University of Texas Press, Austen, 1989,P. 45; L. Macfie, Atatürk, Longman Publishing, London-New York, New York, 1994, P. 164.

(1) - خليل علي مراد، "القضية الكردية في تركيا 1919–1925"، في: خليل علـي مـراد وآخـرون، القضية الكردية في تركيا وتأثيرها على دول الجوار، مركز الدراسات التركية، جامعة الموصل، التداول محدود، 1994، ص 29.

قوتابخانەشەوە نەما[1]. سەرچاوە کوردییەکان ژمارەی ئەو خانوانەی لە گوندە کوردییەکان لە زستانی 1926 تا 1927 رووخێنراون بە 13 هەزار خانوو مەزەندە دەکەن، لە ماوەی ساڵانی 1925 تا 1928، 10 هەزار خانوو و 15 هەزار کوژراو، لەهەمان کاتدا نزیکەی نیو ملیۆن کەس کۆچیان پێکراوە، کە 200 هەزاریان مردن [2]. بەهۆی کەڵەکەبوونی سەرکوتکردن، رق و بێزاری کورد و دژایەتییان بۆ حکوومەتی تورکی زیاد بوو، هەروەها هەستی سەربەخۆیی لە هەمووکات زیاتر لەلایان بەهێز بوو، بەڵام لەلایەکی دیکەوە راپەرینەکانی کوردان، رۆڵێکی گرنگی لە بەهێزکردنی مەیلی نەتەوەپەرستی تورکی گێرا، ئەمەش لەشێوەی لێدوان و بەیاننامانەی گەورە بەرپرسانی تورک کە دوای هەموو بزووتنەوەیەك یا راپەرینێك بە جوانی بەدەردەکەوێت، لە نیسانی 1925 لەسەروبەندی تێکشکاندنی راپەرینەکەی شێخ سەعیدی پیران، عیسمەت ئینونۆ بەگ سەرۆك وەزیرانی ئەوسا، ئەم بەیاننامەی خوارەوەی دەرکرد: **"بە راستی ئێمە نەتەوەیین... نەتەوەیی رەگەزی بەیەکەوە گرێدانی ئێمەیە، هەموو رەگەزەکانی دیکە لەبەرامبەر زۆرینەی تورکی هیچ کاریگەرییەکی نابێت،. دەبێت دانیشتوانی ئەم وڵاتە بتورکێنین و هەرکەسی بەرپەرچی تورك و بەتورککردن بکات، لەناوی دەبەین"**[3]. دوای سێ ساڵ لە لێدوانەکەی ئینونۆ لە 1928، توفیق روشدی ئاراسی وەزیری دەرەوەی تورکیا، لە گفتوگۆیەکی لەگەڵ جۆرج کلارك–George Clarkی بالیۆزی بەریتانی هۆکاری خراپبوونی رەوشی کەمینە ئەتنیەکانی بۆ ئەمە گێرایەوە کە **"کورد رووبەرووی چارەنووسێکی رەش بوونەتەوە کە بواری خۆلادانی نییە، ئاستی رۆشنبیرییان نزمە، و عەقلیان ئەوەندە دواکەوتووە، کە بە ئاسانی ناتوانرێت لە جەستەی**

[1] - هنري باركي وغراهام فولر، المصدر السابق، ص 108.

[2] -Hoyboon, The Case of Kurdistan against Turkey, Second Print, Stockholm, 1995, Pp. 62-68.

[3] -Robert Olson, The Kurdish Question and Turkish-Iranian Relations: from World War I to 1998, Mazda Publishers, U.S.A, 1998, P. 18.



**سیاسی تورکی وەریگێرین"**[1]، لە راستیدا سیاسەتی حکوومەتی تورکی بەرامبەر کورد گەیشتە ئەو رادەیەی کە وای لە بالیۆزی بەریتانی کرد، سیاسەتی حکوومەتی تورکی ساڵی 1927ی بە **"هەمان سیاسەت بەراورد کرد کە تورکیا بەسەرکەوتوانە کەمینەی ئەرمەنی لە ساڵی 1915 لەناوبرد"**[2].

زاڵبوون بەسەر کوردستان و جاردانی کوردستان بە ناوچەی سەربازی و رێگرتن لە هاتنی بیانی بۆ کوردستان لە نێوان ساڵانی 1925–1965 ببووە ئەرکی سەرەکی سوپا[3]. بە شێوەیەك کە یەك لە هەشت پێکدادان لە نێوان سوپا و کورد لە نێوان ساڵانی 1924 تا 1938 لە دەرەوەی کوردستان، دوای ساڵی 1925 هوە جگە لە بەشداریکردنی هێزیکی سەربازی تورکی لە جەنگی کۆری (1949–19529) و داگیرکردنی قوبرس لە ساڵی 1974، سەرجەم چالاکییەکانی ئەو سوپایە لە دژی کورد جەختی کردۆتەوە و بەردەوامبووە[4].

مردنی ئەتاتورك لە ساڵی 1938 گرفتەکانی ژێرخانی دەوڵەتی تورکی بەشێوەیەکی گشتی و پرسی کورد بەتایبەتی ئاڵۆزکرد. تاکە کەس بوو بتوانێت رەوشی سیاسی و رۆشنبیری بەهۆی کەسایەتییە بەهێزەکەی و ئەو پاڵپشتییە گەورەیەی کە هەیبوو، بە ئاراستەی نەرمی نواندن و سوککردنی توندی لەسەر کورد و سازشکردن لەبارەی سەربەخۆیی یا مافەکان بگورێت. دەوڵەتی تورکی دوای مردنی تووشی بەستەڵۆك هات، دوای ئەوەی جێنشینەکانی هەوڵیاندا لە رێگەی بەردەوامیدان بە سیاسەتەکانی رەوایەتی وەربگرن. تا وایلێهات دارشتنەوە یا پرسیارکردن لە هەندێ پرەنسیپی کەمالی یەکسان کرابوو بە خیانەتی سیاسی. بۆیە تۆی نەتەوەیی کورد بەهێزتر لەماوەی سەردەمی کەمالی وەك کاردانەوەی سەپاندنی بەزەبری نەتەوەیی تورك چێنرا. ئەنجامەکەشی ئەوە بوو کە کەمالییەکان دوو نەتەوەی جیاوازیان (تورکی و کوردی)یان داهێنا[5].

[1] - هنري باركي وغراهام فولر، المصدر السابق، ص 108.

[2] -David McDowall, Op. Cit., P. 199.

[3] -Ersal Yavi, A. G. E., S. 532.

[4] -David McDowall, Op. Cit., P. 198.

[5] - هنري باركي وغراهام فولر، المصدر السابق، ص 108.

هەرچۆنی بێت، ئەوا چارەسەری سەربازی سەرکەوتوو نەبوو، رێگە لە سەرهەڵدانی نەتەوەیی کوردی بگرێت، هەروەها جەنگی لیبڕالی رێژەیی کە لەماوەی پارتی دیموکرات (1950–1960) لە تورکیا باو بوو، هەرچەندە لەسەیرکردنی بۆ پرسی کورد لەگەڵ بیری کەمالیزم کۆك و تەبا بوو، ئەم ماوەیە بە کودەتای 27ی ئایاری 1960 کۆتایی هات و دەسەڵات کەوتە دەست سەرباز، ئەمەش واتا گەڕانەوە بۆ بیروباوەری توندرەوی کەمالیزمە بەشێوەیەکی گەورەتر. ئەو دەستوورەی کە بە سەرپەرشتی کودەتاچییەکان نووسرایەوە لە تەمووزی 1961 بریاری کارپێکردنی درا، لە رووی ناوەڕۆکەوە هیچی لە دەستوورەکەی 1924 سەبارەت بە کێشەکانی سیاسەتی نەتەوەیی، جیاواز نەبوو. هیچ ئاماژەیەکی بۆ نەتەوەی کورد یا هەر نەتەوەیەکی دیکە نەکردبوو، بەڵکو لە ماددەی 3 جەختی لەسەر ئەوە کردبووەوە، کە **"وڵاتی تورکیا بەخاك و گەلەکەیەوە، یەکەیەکی تەواوە و ناکرێت پارچە بکرێت و زمانە فەرمییەکەی زمانی تورکییە"**. ماددەی 4 ی دەستوورەکە دەڵێت **"دەسەڵاتی باڵا لە وڵات بەتەواوی بۆ گەلی تورکی دەگەڕێتەوە"** لە ماددەی 54 هەر داننانێك بەنەتەوەکانی ناتورك هەڵدەوەشێنێتەوە، کاتێ کە وای لەقەڵەمدا کە **"هەموو کەسێ بە پەیوەستی هاووڵاتی تورکی بە دەوڵەتی تورکییەوە کرێدەدرێت"**. ماددەی 58 جەخت لەسەر مافی هەموو تورکێك لە وەرگرتنی هەر پۆستێکی دەوڵەت دەکاتەوە، لە ماددەی 68 مافەکانی کورد و باقی نەتەوە ناتورکەکانی دیکە بەتەواوی هەڵدەوەشێنێتەوە، کاتی دەڵێت **"ئەوانەی ناتوانن بەزمانی تورکی بنووسن بخوێننەوە، مافی خۆپاڵاوتنیان بۆ ئەنجوومەنی گەورەی نیشتمانی تورکی نییە"**[1].

توندی هەڵوێستی حاکمە نوێیەکان بە دەرکردنی یاسای ژمارە (1587)، گەیشتە بوارێك کە بەهۆیەوە بەشێوەیەکی بەرنامە بۆدارێژراو دووبارە ناو لەو گوند و شوێنە کوردییانە نرانەوە کە بە گوێرەی یاساکە **"بۆ رای گشتی خراپە و لەگەڵ کلتووری نەتەوەیی و بەها ئەخلاقییەکان و دابونەریتی تورکیا، ناگونجێ"**، ئەم یاسایەش لە لیژنەی یەکێتی نیشتمانی کە لەو ئەفسەرانە پێکهاتبوو کە پێشەوایەتی کودەتای ئایاری 1960یان کرد، دەرچووە[1]. یاسایەکی دیکە بۆ بونیادنانی قوتابخانەی ناوەخۆیی بە مەبەستی تواندنەوەی کورد، دەرچوو[2]، لە تشرینی یەکەمی 1960 یاسای ژمارە (2510) و یاسای ژمارە (105)، کە بەهۆیانەوە خێزانە کوردەکان لەناوچەی نیشتەجێبوونیان بۆ رۆژهەڵاتی وڵات لە ناوچەی جیاجیا راگوێزران. هەروەها بەپێی یاسای ژمارەی (114) زانکۆکان لە رەگەزی ناحەز پاککرانەوە، 147 مامۆستای زانکۆ و وانەبێژ فەسڵ کران و تۆمەتی چالاکی نواند بۆ دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ ئاراستەی هەندێکی دیکەش کرا[3].

شانبەشانی سیاسەتی فەرمی وڵات لە نکۆڵیکردن و پشتگوێخستنی کورد، هەندێ هەڵوێستی فەرمیش لە ژمارەیەك بۆنەدا تۆمارکراون، لەوانەیە دیارترینیان رووداوی بومەلەرزە گەورەکەی ساڵی 1976ی کوردستان بێت، کە زەرەر و زیانی ماددی و مرۆیی گەورەی گەیاند، حکوومەتەکەی دێمیرێل هەڵوێستێکی بە ئاشکرا نێگەتیڤی لەو کارەساتە سروشتییە نواند. تیمەکانی بەهاناوە هاتنی بۆ لێقەوماوان نەنارد، بەڵکو حاکمی سەربازی دیاربەکر دوای دوو رۆژ لە روودانی کارەساتەکە رایگەیاند و گوتی: **"لێگەرێ ئەمانە با بمرن، ئەوانە دوای هەموو شتێ کوردن"**، رێکخراوە نێودەوڵەتی و میدیاکانی جیهان ئەم هەڵوێستەی دەسەڵاتدارانی تورکیایان شەرمەزار کرد، هەروەها رۆژنامە جیهانییەکان بەتوندی هێرشیان بۆ سەر سیاسەتی حکوومەتی تورکی بەرامبەر بەکورد بە گشتی هێنا[4].

---

(1) – سەیری، م.ا. حەسرەتیان، سەرچاوەی پێشوو، ل 77؛ وصال نجیب عارف العزاوي، القضية الكُردية في تركيا، أطروحة دكتوراه مقدمة الى كلية العلوم السياسية، جامعة بغداد، 1994، ص 86.



(1) - سەیری، وصال نجیب عارف العزاوي، المصدر السابق، ص 85؛
Michael Gunter, The Kurds and The Future of Turkey..., P. 6.

(2) - تا ساڵی 1970، 70 قوتابخانە لەم جۆرە دامەزرا، شەستیان لە کوردستان و ئەوانی دیکە لەو شوێنانەی کە رەوندی کوردی تێدایە لە دەرەوەی کوردستان. David McDowall,Op. Cit., P.

(3) - وصال نجیب عارف العزاوي، المصدر السابق، ص ص 84–85.

(4) - المصدر نفسه، ص 148.

ئەو سیاسەتی نکۆڵیکردنە بە کودەتای سەربازی 12ی ئەیلولی 1980 گەیشتە مەودایەك، کە دوای ئەوەی کودەتاچییەکان دەستوورێکی نوێیان دارشت و لە راپرسییەکی میللی لە 7ی تشرینی دووەمی 1982 پەسندیان کرد، هەموو ئەو ئازادییانەی سەندەوە کە دەستووری 1961 باسی کردبوون، یا ئەو هەموارکردنانەی کە لە دوای 1971 ئەنجامدران، درێژکردەوە. دەستوورەکە بۆ کورد بە کردەوە دژ بە پرەنسیپەکانی یەکسانی و ئازادی و مافە سەرەکییەکانیان بوو. ماددەی (3)ی دەستوورە نوێیەکە تایبەت بوو بە پرەنسیپی **"یەکێتی ئەو گەل و وڵاتەی کە ناکرێت پارچە بکرێت"** و چەمکی **"رۆشنبیری نەتەوەیی"** کە بەکردەوە هەموو قەسەکردنێك لەبارەی بەخشینی مافە کلتوورییەکان یان **"مافی چارەنووس"** یا ئۆتۆنۆمی کەمینەکان، دەبەزێنێ، ماددەی (66) جەختی لەسەر ئەوەکردەوە کە هەرکەسێ هەڵگری رەگەزنامەی تورکی بێت، واتە لە رێگەی رەگەزەوە بە دەوڵەتی تورکییەوە گرێدرابێت، ئەوا ئەو کەسە تورکییە[1]. ماددەی (125) لە یاسای تاوان، سزای مەرگ بەسەر هەموو ئەوانەدا دەسەپێنێ کە بەتوندوتیژی یان بەبێ توندوتیژی هەوڵی دابڕاندنی پارچەیەك لە خاکی دەوڵەت بدەن یا لە دەسەڵاتی حکوومەتی مەرکەزی دەربچن[2]. ماددەی (14)ی دەستووری 1982 راستەوخۆ یەکانگیری کورد بووە، کە دەڵێت، نابێت هیچ مافێك لەو مافانەی کە لەدەستوورەکەدا هاتوون، بە ئامانجی دەستگەیاندن بە یەکێتی دەوڵەت و ئۆمەت پیادە بکرێت، یا بۆ داهێنانی جیاوازی لە زمان و رەگەز و مەزهەب بەکاربهینرێت. هەردوو ماددەکانی (141) و (142)ی یاسای سزادانی تورکی دەنگ و ناوبانگی لە جیهان پەیداکرد، چونکە هەردوو ماددەکە لە یاسای سزادانی ئیتاڵی کە مۆسۆلینی دایرشتبوو وەرگیراون، چەندین جار لەسەر کورد و چەپەکان جێبەجێکراون. هەردوو برگەکانی (4) لە ماددەی (141) و برگەی 3 لەماددەی

(1) -Salat M. Gavrielides, Kurdish Ethno nationalism: A Threat to Turkish Security, M. A Thesis, McGill University, Montreal, 1997, Pp. 56-57.

(2) - کمال بورقاي، "النظام القانوني التركي والأكراد"، مجلة دراسات کُردية، العدد (4)، السنة التاسعة، (باريس)، 1993 ص 122؛ گولستان گوربای، المصدر السابق، ص40.



(142) لەبارەی رەوشی کوردەوەن، کە باس لە **"مافەبەخشراوەکان بەهۆی جیاوازی رەگەزی یا هەڵمەتی ناوزڕاندن یا دروستکردنی رێکخراوێك بە ئامانجی لاوازکردنی هەستی نەتەوەیی، دەکەون"**، لەسەر ئەم بنەمایە تەنها قسەکردن لەبارەی کورد و کوردستان هەتاکو گۆرانییەکی کوردی بە دەستدان لە یەکێتی نیشتمانی لەقەڵەم دەدرێت و کەسەکە دەهێنرێتە بەردەم دادگای ئەمنی دەوڵەت[1].

یەکێ لەسەرسوور هینەرترین شتە سەیرەکانی دەستووری 1982 لە ماددەی 26 کە چەمکی **"زمانی قەدەغەکراو"**ی داهێنا، کە تێیدا هاتبوو **"ناکرێت هیچ زمانێك بەکاربهێنریت ئەگەر هاتوو یاسا قەدەغەی کردبوو"، "نووسین و چاپەمەنی و کاسێتی دەنگی و بینراو و سەرجەم ئامرازەکانی دەربڕینی دیکە، کە حوکمەکانی ئەم ماددەیە نایانگرێتەوە، دەچێتە ژێرباری یاساوە"**[2]. ئەو ماددانەی سەرەوە هەموویان بە دژی زمانی کوردی ئاراستە کرابوون، هەرچی یاسای ژمارە (2932)ە کە لە تشرینی یەکەمی 1983 دەرچووە، دەڵێت: **"هەر زمانێك لە زمانی ئەو وڵاتانە نەبێت کە تورکی دانی پیاناون، بەزمانێکی قەدەغەکراو دادەنرێت"**[3]. ماددەی 23 بۆ کۆچپێکردنی دانیشتوان و تاك و کۆمەڵەکان بەمەبەستی نەهێشتنی تاوان یان ئامانجی ئابووری یا دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی پەرەسەندوو، دارێژرابوو. ئەم ماددەیە بە بەردەوامی لەسەر کوردستان کە زۆربەی ویلایەتەکانی لە زۆربەی کات باری لەناکاوی تێدا باو بووە، بەکارهاتووە[4].

ترسناکترین لایەنی دەستووری 1982 و کاریگەرترینیان لە پرسی کورد لە تورکیا، زیادبوونی دەسەڵاتی سوپایە لە سیاسەت، لە رێگەی ئامراز و ئامێری دەستووری–یاساییەوە. سوپا پێگەیەکی زامنکراوی دەستووریی لە

(1) - کمال بورقاي، المصدر السابق، ص 123.

(2) -Omer Tspinar, Kurdish Nationalism and Political Islam in Turkey, Routledge, New York, and London, 2005, Pp. 96-97; Ersal Yavi, A.G.E, Ss. 535-536.

(3) – م م.ا. حەسرەتیان، سەرچاوەی پێشوو، ل 111؛

Bulent Gokay, Op. Cit., P. 323.

(4) - م.ا. حەسرەتیان، سەرچاوەی پێشوو، ل 112؛ کمال بورقاي، المصدر السابق، ص 126.

(ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی) پێ بەخشرا، بەم شێوەیە دوای ئەوەی بەشداری سوپا بەشدارییەکی سادە بوو، بەشداری سوپا لە جێبەجێکردنی دەسەڵاتی سیاسی بەگوێرەی یاسای 118 بوو بە یاسا[1]. دەستووری 1982 دوو ئەرکی گرنگی بۆ ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بە گوێرەی یاساکە دیاریکرد، یەکەم پاراستنی "**ئاسایشی نەتەوەیی**" و بەرگری لێی لەدژی مەترسی ناوەوە و دەرەوە، و "**پێناسە و راپۆرتدان و جێبەجێکردنی سیاسەتی ئاسایشی نەتەوەیی**" کە لەسەر بنەمای پرەنسیپی "**یەکێتی گەل و وڵاتی کە ناکرێت پارچە بکرێت**". بۆیە ئەرکەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی زۆر فرە لایەنە، سنوورەکانی ئەو ئەرکانە نادیار و نا رۆشنە، کە ئاسایشی نەتەوەیی و بەرگری بۆ رێکخستنی تەواوی لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگا دەبەزێنێ، ئەمەش بەیارمەتی دارشتنی "**ئارامی و ئاسایشی کۆمەڵگا**". چەمکی (ئاسایشی نەتەوەیی) بەشێوەیەك بەکارهات کە نزیکەی هەموو کێشەکانی کە دەکەونە ژێر بەرپرسیارێتی حکوومەت، لەخۆ بگرێت. بەشێوەیەك دەستەیەکی نوێی دروستکردنی بریار هاوشانی ئەنجوومەنی وەزیرانی پێکهینا، بە گوێرەی ئەو دەرەنجامەی کە مومتاز سۆسیالی– M.Sosyal وەزیری پێشووی دەرەوەی تورکی پێگەیشتووە، کە سوپا بەرپرسیاریتی سیاسییان لە ئەستۆ ناگرین[2]. بەم شێوەیە بەهۆی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لەلایەك و دەستەی ئەرکانی گشتی کە دەسەڵاتێکی زۆری هەیە[3]، لەلایەکی دیکەوە و بەهۆی رژێمی یاسایی تایبەت،

---

(1) -Michael Gunter, The Kurds and The Future…, P. 9.

(2) - گولستان گورباي، المصدر السابق، ص 44.

(3) - دەستەی ئەرکان رۆلێکی پێشەنگ و دەسەڵاتێکی فراوانی هەیە، بەشێوەیەك خودان سەربەخۆییەکی گەورەیە لەناو دەوڵەت و بونیادی سیاسی بەگشتی، هەموو ئەمانەش بە یاسا و دەستوور چەسپێنراون. شایەنی ئاماژە بۆکردنە کە ئەم دامەزراوە تاکە دامەزراوە کە مافی ئەوەی هەیە ناوەرۆکی سیاسەتی بەرگری دیاری بکات، بە پرچەککردن و ستراتیژی سەربازی، واتا هەموو چەمك و بیروراکان لەم بوارەدا بۆ سوپا دەگەرێتەوە. میشال نوفل، "مدخل مفهومي للازمة التركية: البنية السياسية والحركة الإسلامية"، شؤون الأوسط (دورية)، العدد (64)، بيروت، آب، 1997، ص 26.



بەهۆی هەموو ئەمانە دامەزراوەی سەربازی لە دروستکردنی بریاری سیاسی جۆرێك لە تاکلایەنی هەیە. لێرەوەیە کە بەردەوام سوپا ئامۆژگاری بەسەر رژێمی سیاسی تورکییەوە، هەیە[1]. لەبەرئەوەی بەگوێرەی پێناسەی سیاسەت و سوپای تورکی، کێشەی کورد، پرسێکی نەتەوەییە و سەرچاوەی هەرەشەیە، بۆ پرەنسیپی "**یەکێتی گەل و خاکی وڵات، کە پارچەبوون قەبوول ناکات**"، لەبەرئەوەی دیدی پێشوەختە بەرامبەر داخوازییەکانی کورد، بە هەرەشەی "**جوداخوازی**" دانراوە، بۆیە ئاشکرایە کە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی دروستکەری سەرەکی بریارە لە بابەتی پرسی کوردی[2].

سەربازی دەستوور، ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەیاسا هەن، کە دژی کوردن و لەوەتەی کۆماری تورکی لە ساڵی 1923وە دامەزراوە، دەرچوون. لەوەتەی راپەرینی 1925ی کوردان روویداوە، حکوومەتی تورکی یاسا و مەرسومێکی زۆری بۆ نەهێشتنی کورد و سەرکوتکردنی هەر بزووتنەوەیەکی سیاسییان دارشتووە[3].

هەتاکو دوای گەرانەوەی دەسەڵات بۆ پیاوانی مەدەنیش، لە چارەسەرکردنی پرسی کوردی حکوومەتەکانی تورکیا پەنایان بۆ هێزی سەربازی بردووە، لە بەرنامەی پارتە سیاسییەکانی تورکیا ئەوانەی لە دوای 1983 دامەزراون، داوای وەرگرتنی رێوشوێنی سەربازی توند دەرهەق بەوانەی کە بە "**تاقمی تیرۆریستی جوداخواز**" وەسفی کردوون، کردووە[4]. ئەو حکوومەتەی تورگوت ئۆزال لەدوای تشرینی دووەمی 1983 دایمەزراند، دیدگای کلاسیکی عەسکەری لە مامەڵەکردنی لەگەڵ رەوشی کورد وەرگرت[5]، ئۆزال لە

---

(1) - المصدر نفسه، ص 27.

(2) - گولستان گورباي، المصدر السابق، ص 45.

(3) - جبار قادر، المصدر السابق، ص 244.

(4) - وصال نجيب عارف العزاوي، المصدر السابق، ص 184.

(5) - حکوومەتەکەی نەیتوانی لە ئایدیۆلۆژای کەمالیزم لەمامەڵەکردنی لەگەڵ پرسی کورد، دەربچێ، بۆیە سووربوو لەسەر مامەڵەکردن لەگەڵ پرسەکە، بەگەرانەوەی بۆ پرەنسیپەکانی کەمالیزم وەك ئەوەی حکوومەتەکانی بەرلەخۆی کردوویانە، لەچوارچێوەی بەهێزکردنی پاراستنی یەکێتی خاکی تورکی، جەختی لەسەر پێویستی ئەنجامدانی چاکسازی ئابووری لە باشووری رۆژهەڵاتی=

میانەی جاردانی بەرنامەی حکوومەتەکەی لەبەردەم پەرلەمان رایگەیاند کە نیازی وایە کە **"خەباتێکی بەردەوام و چالاك دژ بە تیرۆریست و ئەنارچیست و توندرەوی بکات"**، وەك ئاماژەیەکی شاراوە بۆ شێوازی مامەڵەکردنی لەگەڵ رێکخستن و پارتە کوردییەکان[1].

جاڕدانی جەنگی پارتیزانی لەلایەن پارتی کرێکارانی کوردستان لە ئابی 1984، زەنگی دەستپێکردنی رووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆی چەکداری بۆ یەکەمجار لەوەتەی جەنگی جیهانییەوە لە نێوان سوپای تورکی و کورد، لێدا. پارتی کرێکاران، وەك بەهێزترین و بەتواناترین رێکخستنی کوردی کە توانای رووبەڕووبوونەوەی هەبێت، خۆی چەسپاند، پەیرەوی لە خەباتی چەکداری و توندوتیژی شۆڕشگێڕانە کرد وەك رێگایەك بۆ بەدیهێنانی خواستە نەتەوەییەکانی کورد. رووبەڕووبوونەوەکانی نێوان پارتی ناوبراو و سوپا بۆ جەنگێکی بەردەوام لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا، گۆڕا. سوتەمەنی و دۆڕاوی گەورەی جەنگەکە هاوولاتیانی مەدەنی لە دانیشتوانی ناوچەکە بوون. هەروەها جەنگەکە کارکرد و دەرەنجامی لەسەر ناوچەکە و نێودەوڵەتی دانا.

کاتێ لە 10ی شوباتی 1991 ئۆڵتان سونگورلو–O. Sungurlu وەزیری دادی تورکی لەلایەن گۆڤاری (نوکتا Nokta) پرسیاری لەبارەی کورد کێن لێکرا، وەڵامی دایەوە و گوتی: **"من دەزانم ئەوان لقێکن لە تورك"**[2].

=وڵات کردووە. بەهەر حاڵ حیزبەکەی ئۆزال (حیزبی نیشتمانی دایك) هیچ هەوڵێکی بۆ دانانی نوێنەرێکی سیاسی کوردی لە حیزبەکەی یا لە سیاسەتی نیشتمانی بەگشتی نەدا. بەڵکو بەرنامەی نوێکردنەوەکەی ئۆزال تەنها ترسی کوردی لە سیاسەتەکانی دەوڵەتی تورکی، کە سوورە لەسەر بە تورککردنی ناوچە کوردییەکان، زیاد کرد. کاتێ ئەمە لەگەڵ ئەم راستییە هاوشان بوو، کە حکوومەتەکەی ئۆزال رەتیکردەوە یاسای قەدەغەکردنی بەکارهێنانی زمانی کوردی کە عەسکەر لە ساڵی 1982 سەپاندنی، بکشێنێتەوە. هەر ئەمەش بوو وای لە حکوومەتەکەی ئۆزال کرد لەبەدەستهێنانی لایەنگری سیاسی کورددا، سەرکەوتوو نەبێت. سەیری،

Wayne S. Cox, A Crisis in Conflict for International Relations, The Case of the Turkish/ Kurdish War through Neogramscian Lenses, Ph.D Thesis, Queens University-Ontario, 2000, Pp. 236-237.

(1) - حامد محمود عیسی، القضیة الکُردیة في ترکیا، مکتبة مدبولي، القاهرة، 2002، ص 314.

(2) -Ersal Yavi, A. G. E., S. 534.



پشتگوێخستنی بوونی کورد و داخوازییە سیاسی و کلتوورییەکانیان لە تورکیا و بەکارهێنانی رێگاچارەی سەربازی دەرهەقیان، وایکرد ئاراستەکانی رادیکالیزمێکی بەهێز لە نێو کورددا زیاد ببێت، دیاردەی پارتی کرێکارانی کوردستان بەڵگەیەکی روونی ئەمە بوو.

ئەو راپرسییەی کە ساڵی 1992 ئەنجامدرا، دەریخست کە رێژەی لە 70٪ی کوردی تورکیا جیابوونەوەیان ناوێت[1]. لە ساڵی 1995 ژووری بازرگانی و پیشەسازی تورکی توێژینەوەیەکی گرنگی سەبارەت بە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا سازکرد، کە توێژەری تورکی (دوغو ئەرگیل-Dogu Ergil) سەرپەرشتی دەکرد، لە رێگەی راپرسی زۆر لە کوردان سەبارەت بە باشترین چارەسەری سیاسی بۆ ململانێ، دەرکەوت کە تەنها لە 12٪ی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆیان دەوێت[2].

هەرچۆنێ بێت، دیدی نێوەندەکانی بریار لە تورکیا، هەر دیل و پاشکۆیی ئایدیۆلۆژیای کەمالی و رێگاچارەی سەربازی بوو، نەیتوانی مافە کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و سیاسییەکانی کوردی لەخۆ بگریت، بەردەوام وەك پرسی **"ئاسایشی نەتەوەیی"** و **"جوداخوازی"** مامەڵەی لەگەڵ دەکرا. حکوومەتە تورکییە یەکبەدوای یەکەکانی تورکیا جیاوازیکردن لە نێوان جەنگاوەرانی پارتی کرێکارانی کوردستان و ئەو هاوولاتییە مەدەنییانەی داوای مافە رۆشنبیری و سیاسییەکانیان دەکرد، نەدەکرد، بەڵکو ئەو حکوومەتانە بەدرێژایی ساڵانی هەشتاکان و نەوەدەکانی سەدەی بیستەم، هەموو ئامرازێکیان بۆ لەناوبردنیان بەکارهیناوە.

بە گوێرەی ئەوەی کە توێژەری ئەلمانی (هاینتس گرامەر) پێیگەیشتووە، پرسی کورد لە تورکیا، هەر ئەوە نییە کە گەورەترین گرفتی دواکەوتەیی

(1) -Ugo M. Amoretti and Nacy Gina Bermeo, Federalism and Territorial Cleavage, John Hopkins University Press, Baltimore, 2004, P. 406.

(2) - Ugo M. Amoretti and Nacy Gina Bermeo, Federalism and Territorial Cleavage, John Hopkins University Press, Baltimore, 2004, P. 407.

ئابووری– کۆمەڵایەتی بێت، یا جوڵانەوەیەکی جوداخوازی کە پـارتی کرێکـاران پێشەوایەتی دەکـات، وەك ئـەوەی دەوڵـەتی تـورکی بانگەشـەی بـۆ دەکـات و دەیڕازێنێتەوە. بەڵکو پرسێکە پەیوەندییەکانی ئاڵۆزە و سەختە، پەیوەندی بە چۆنیەتی ڕێکخستنی کۆمەڵگایەکی فرە ئەتنی و کلتوورەوە هەیە، بەبێ ئەوەی ڕەوایـەتی قـەوارەی سیاسـی و دەوڵـەت بخاتـە مەترسـییەوە. هـەتاکو دوای شکستهێنان بە پارتی کرێکارانیش کێشەکە کۆتایی نایـەت، مـادام دەوڵـەت لـە مامەڵـەکردنی لەگـەڵ کێـشەکە ڕێگایـەك هەڵنابـژێرێت خـەلك پێـی رازی بێـت. هەرێمـەکانی باشـووری ڕۆژهـەڵات و ڕۆژهـەڵاتی ئـەنادۆڵ خۆشـی چارەسـەری خواستراو نابینن، ئەگەر ئەو چارەسەرییە لـە عـەقڵی تاکـەکانی دەسـتەبژێری تورکی دەست پێنەکات[1].

---

[1] - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص 103.

## بابەتی دووەم: رووخسارەکانی پرسی کورد لە تورکیا بەر لە 1991

لەو رۆژەوەی کۆماری تورکیا لە 1923 دامەزرا، سیاسەتی نکۆڵی کردن و پشتگوێخستن رۆژ بەڕۆژ، لە هەناوی سیاسەتی ناوەخۆی تورکی و فیکری سیاسی دەستەبژێری دەسەڵاتدارانی تورکی رەگی داکوتاوە. هەر لەوکاتەوە، وەك سیاسەتێکی چەسپاو بەرامبەر بە کورد مامەڵەی کرد.

ئەم سیاسەتە رووبەڕووی کاردانەوەی توندی کورد هات، رووخسارەکانی لە نێوان رووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆی سەربازی و تێوەگلان لەکاری سیاسی لەهاتوچۆدا بوو، ئەمەش بە سوود وەرگرتن لەو دەروازە بچووکەی ئازادی، کە تایبەت بوو بە کاری سیاسی، جا چ لە نێو پارتە تورکییەکان بێت یا بە دامەزراندنی پارتی کوردی بێت.

یەکەم کاردانەوەی چەکدارانەی کورد، راپەرینی کوردانی قۆجکیریی بوو، دژ بە دەسەڵاتدارانی کەمالی لە سیواس لە ساڵی 1924. ئەم راپەرینە تەنها ئاماژەیەك بوو بۆ بەدەرکەوتنی پرسی کورد بەشێوەیەکی بەهێز و کاریگەر لەسیاسەتی دەرەوە و ناوەوەی تورکیا، کە خۆی لە راپەرینی کوردی ساڵی 1925 دا بینییەوە، ئەو راپەرینە بە ناوی سەرکردەکەیەوە شێخ سەعیدی پیران[1] ناسراوە، کە بوژاندنەوەیەکی نوێی پرسی کورد بوو، دوای ئەوەی پەیمانی لۆزان مۆر کرا دەنگی کزکرا[2].

شێخ سەعیدی پیران سەرکردایەتی راپەرینێکی کرد، کە ژمارەی ئەوانەی بەشدارییان تێدا کرد بە 20 هەزار چەکدار مەزەندە کرا، ئەوانە توانییان گەمارۆی شاری دیاربەکر بدەن[3]. بەڵام ئەو رێوشوێنانەی کە دەسەڵاتدارانی

---

(1) - ینظر: كمال مظهر احمد، انتفاضة 1925 في كردستان تركيا، رابطة كاوة للثقافة الكُردية، بيروت،2001، ص ص 52–54.

(2) - ینظر: بيار مصطفى سيف الدين، السياسة البريطانية...، ص 289.

(3) -Nader Entessari, Kurdish Ethnic Nationalism, Lynne Rienner Publishers, London, 1992, P.83; كمال مظهر احمد، انتفاضة 1925...، ص ص54–57.



تورکی گرتیانە بەر بەس بوو بۆ سەرکوتکردن و کوژاندنەوەی خێرایی راپەرینەکە، ئەو هێزانەی کە بۆ ناوچەی شۆڕش نێردران بە نزیکەی 52 هەزار دەژمێردران، واتە زۆر کەمتر لە نیوەی ژمارەیەی کە لەکاتی ئاشتی ئەو سوپایە هەیەتی[1]. لەپاڵ ئەمەش حکوومەت دەستی بە دارشتنی یاساکانی لەناکاوی کرد، کە لە زۆر لایەنیدا وەحشیگەر و قیزەوەن بوو، وەك (یاسای پاراستنی کشتی رژێم Takirir Sukun) و (دادگا سەربەخۆەکان Mehkemeleri Istiklal)[2]، کە دەسەڵاتی فراوانی بە دەسەڵاتدارانی سەربازی بەخشی بۆ دەرکردنی حوکمی دەستبەجێی لەسێدارەدان، ئەو دادگایە بەهۆی توندییەکەی و سەیری رێوشوێنەکانیەوە، ناوبانگێکی فراوانی پەیداکرد[3]. دەرەنجامی ئەو رێوشوێنانە زۆر کاریگەر بوون، شێخ سەعید و زۆربەی سەرکردەکانی راپەرینەکە دوای بەدیل گرتنیان لەسێدارەدران و راپەرینەکە هەرەسیهێنا[4].

راپەرینەکەی ساڵی 1925 یەکێ لە رووخسارە دیارەکانی مێژووی پرسی کوردییە لە تورکیا، بە خاڵی وەرچەخان لە پەیوەندییەکانی نێوان کورد و تورك دادەنرێت، هەروەها پرۆسەی بەتورککردنی بەهێزتر و زەقتر کرد و بە گوێرەی دەربڕینی دیڤید ماکدۆل سەرەتای **"کەمالیزمی توندرەوی"** نەخشاند. لەوکاتەوە راگوێزانی بەرنامە بۆ داریژراو ویرانکردنی گوندەکان و کوشتنی

---

(1) -David McDowall, A Modern History Of Kurds, Published by I.B. Tauris & Co Ltd, London, 1996, P. 195.

(2) - دادگا سەربەخۆکان بریاری تۆلەسەندنەوەی وەحشیگەرییانەیان دەرکرد، لەناوەڕاستی نیسانی 1925، 30 لە سەرانی راپەرینەکە لەسێدارەدا، هەروەها بریاری لەسێدارەدانی بە گواستنەوەی دادگا سەربەخۆکان لە شارێك بۆ یەکێکی دی دوو هێندە بووەوە، لە 4ی ئەیلولی 1925 شێخ سەعید و 46ی دیکە لە دیاربەکر لە سێدارەدران، و ئەو دادگایە لەماوەی کارکردنیدا 7500 گومانلێکراوی دەستگیرکرد و 660 یانی لەسێدارەدا.

(3) -Ergun Aybars, Istiklal Mahkemeleri, Zeus Kitabevi, Izmir, 2006, Ss. 203-217;Patrick Kinross, Ataturk: The Rebirth of Nation, Remzi Kitabvi, Istanbul, 2004, Pp. 400-401; Bernard Lewis, The Emergence of Modern Turkey, Oxford University press, Oxford-London-New York, 1968, P. 266.

(4) - خليل علي مراد، "المسألة الكُردية..."، ص 29.

بێتاوانان و یاسای لەناکاو و رژێمی تایبەت بە کوردستان دیمەنێکی باو بوو بۆ کورد، هەرکاتێ کە دەستدرێژی بۆ سەر دەوڵەت بکات[1].

سیاسەتی حکوومەتە تورکییەکان لە ساڵی 1925ەوە بۆ جەنگێکی بەردەوام بۆ سەرکورد گۆڕا، سەرلەنوێ لە ساڵانی (1927–1930)[2] و (1937–1938)[3] راپەرینی گەورە روویدا، بەتوندی سەرکوتکردنی دوایین راپەرینی کورد لە دەرسیم، وای لە هەندێ توێژەر کرد، بە جینۆساید یا لەناوبردنی رەگەزیی لەقەڵەمی بدەن[4]، سەرجەم ئەو هێزەی کە لە دەرسیم

(1) -David McDowall, Op. Cit., P. 198.

(2) - راپەڕینی ئارارات (1927–1931) یان راپەرینی ئاگری یا خۆیبوون، سەرچاوەکان لەبارەی ناوەکەی جیاوازن، بەهۆی ئەوانەی پێی هەڵساون، یا ناوەکەی بۆ شوێنی هەڵگیرسانەکەی دەگەرێننەوە. ئەم شۆڕشە وەك کاردانەوە لە دژی چالاکییەکانی تورکیا لە کوردستان هات، دوای ئەوەی راپەرینەکەی شێخ سەعیدی پیران هەرەسی هێنا. ئیحسان نوری پاشا سەرکردایەتی ئەم شۆڕشەی بە دەستخۆشی کۆمەڵەی خۆیبوون کرد و بۆماوەی چوار ساڵ بەردەوام بوو، لە ساڵی 1931 هێزەکانی تورکیا بە یەکجاری لەناوی برد. إحسان نوري باشا، مذكرات –انتفاضة اكَرى 1926–1930، ترجمة صلاح برواري، بيروت، 1990، ص 9 وما بعدها؛ روهات الاكوم، خويبون وثورة اكرى، مراجعة، شكور مصطفى، اربيل، 1999، ص 5 وما بعدها.

(3) – بزووتنەوەی دەرسیم (1937–1938)، هەروەها جەنگی سێیەمی کوردیشی پێ دەڵێن، سێیەم بزووتنەوەی گەورەیە کە کورد دژ بە کۆماری تورکیا دوای راپەرینی شێخ سەعید و شۆڕشی ئارارات، ئەنجامی داوە، سەید رەزا سەرکردایەتی ئەو شۆڕشەی کردووە کە ماوەی دوو ساڵی خایەند. وابڵاوبووەوە کە هێزەکانی تورکیا چەکی ژەهراوی لە دژی شۆڕشگێڕانی کورد بەکارهێناوە، کە ئەمەش پێشینەیەکی ترسناك بوو لە مێژووی بزووتنەوە کوردییەکان.
بۆ زانیاری زیاتر سەیری: د.نوری دەرسیمی، دەرسیم لە مێژووی کُوردستاندا، وەرگێڕانی: ئەحمەد فەتاح دزەیی، هەولێر، 2001، ل 18؛ فەیسەڵ دەباغ، کُوردستان لە چاپکراوە عوسمانلییەکاندا، هەولێر، 2004، ل ل 307– 325؛ م. رەسوول هاوار، کُورد و باکووری کُوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووهەمی جیهان، بەرگی سێهەم، سلێمانی، 2004، ل ل 275 – 277.

(4) -Martin van Bruinessen, "Genocide in Kurdistan? The suppression of the Dersim Rebellion in Turkey (1937-38) and the chemical war against the Iraqi Kurds (1988)", in: George J. Andreopoulos (ed.), Conceptual and historical dimensions of genocide. University of Pennsylvania Press, 1994, Pp. 141-170.



کۆکرابووەوە لە سێ فەیلەق پێکهاتبوو، ژمارەکەی بە 50 هەزار پیاو، کە 40 فرۆکەی چاوساغ و شەڕکەر پاڵپشتی لێدەکردن، مەزەندە دەکران. ئەو هێزانە گەمارۆی دەرسیمیان دا و گوندەکانی سووتاند و رایگەیاند کە **"ناوچەیەکە بۆ نیشتەجێبوون ناشێ"**، ژمارەی ئەو کوردانەی لە میانەی چالاکییەکانی سوپا گیانیان لە دەستدا بە نزیکەی 40 هەزار و کۆچپێکراوانیش بە 3 هەزار کە خانەدانەکان بوون، مەزندەکرا. لە هەمان کاتدا ئەوانی دیکەش خرانە ژێر چاودێری پێگە سەربازییە لۆکالییەکان، هەروەها لیوایەکی چیایی بەشێوەیەکی بەردەوام لە دەرسیم جیگرکرا[1]. ئەوساکە کوردستان بە **"ترسناك بەهەموو مانای وشە"** وەسفکرا، پرسی گۆڕینیان بۆ **"تورکە باشەکان"** یان بەمانایەکی دی **"ئەو تورکە چیاییانەی کە زمانی دایکیان لە بیرکردووە"**، بەردەوام بوو، هەروەك ئەوەی لەوەتەی سییەکانی سەدەی رابردوو وا وەسفکراون[2]. رێوشوێنە گرتنەبەری تورکەکان بۆ تەسککردنەوەی مافەکانی کورد گەیشتە رادەیەك، بۆنموونە بەئاشکرا سزای دارایی بەسەر ئەو خەلکانەی کە بە کوردی قسە دەکەن سەپاند، پێنج قروشی بۆ هەر وەشەیەك وەردەگرت[3]. کەندال لە وەسفی ماوەی (1925–1938) لە مێژووی کوردستان نووسیویەتی و دەڵێت:

**"لەو ماوەی (13 سال) لە سەرکوت و ململانی و شۆڕش راگواستن... زیاتر لە یەك ملیۆن و نیو کورد کوژران و راگوێزران... هەموو ئەو ناوچانەی کەوتوونەتە پشت رووباری فوراتەوە، بە ناوچەیەکی قەدەغەکراو تا ساڵی 1965 بۆ بیانییان دانرا و تا ساڵی 1950 لەژێر باری گەمارۆ مایەوە"**[4].

هەڵگیرسانی دووەم جەنگی جیهانی (1939–1945) و تورکیا هەڵوێستێکی بێ لایەنی لەبەرامبەر هەردوو لایی جەنگەکە وەرگرت، ناوچەی کوردی باجی

(1) -David McDowall, Op. Cit., P. 209.

(2) -Michael M. Gunter, The Kurds and The Future of Turkey, St. Martin's Press, New York, 1997, P. 6.

(3) -Henri J. Barkey and Graham E. Fuller, Op. Cit., P. 19.

(4) - كندال، المصدر السابق، ص 102؛ لقمان محو، المصدر السابق، ص 23.

زۆری ئەم جەنگەی دا، ماوەی سالآنی جەنگەکە لە کوردستان بە ماوەی تاریک وەسفکراوە[1]. سیاسەتی ملکەچپێکردنی کوردستان بەشێوەیەکی وەحشیگەرانە، بەردەوام بوو، سەرباری شاردنەوەی راگەیاندنی تەواو لە سەر ئەو رووداوانە، دەنگۆی ئەوە لەبارەی راپەرینەکان بە هاندانی سۆڤیەت لە رۆژهەلآتی ئەنادۆڵ لە کۆتایی 1940 بلآبووەوە. لە بەهاری 1945، کۆبوونەوەی کوردەکانی دیاربەکر و گاڤیار Giavar کە سەربازانی تورک هەلمەتێکی فراوانی دەستگیرکردنیان تێدا ئەنجامدا، لەمیانەیدا 120 لە بەشداربوانی ئەو کۆبوونەوانە لە سێدارەدران[2]. سەرچاوەکان باس لە زۆری ژمارەی ئەوانەی لەو ویلایەتانە کە زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردن، حوکمدراون. لە ساڵی 1939 لە قارس ژمارەکەی لە 524 بۆ 842 لە ساڵی 1942 زیادی کرد، لە دادگاکان ژمارەی سکاڵا کەسییە ترسناکەکان لە 19 بۆ 53 زیادی کرد. لە دادگاکانی دیاربەکر ژمارەی سکاڵای ترسناک لە 59 سکاڵا بۆ 73 زیادی کرد، لە دادگاکانی هەرێمەکانیش لە 117 بۆ 294 چوو، لە الازیگ Elazig ژمارەکە لە 42 بۆ 239 و لە ئەرزەروم ژمارەکە لە 121 بۆ 954 و لە هەکاری لە 14 بۆ 23 و لە سیرت لە 117 بۆ 172 و لە ترابزۆن لە 336 بۆ 390 و لە وانیش لە 41 بۆ 117 زیادیان کرد. لە ساڵی 1942 ژمارەی حوکمدراوان بە گوێرەی **"یاسای تایبەت"** دوو هێندە بووەوە و لەچاو ساڵی 1935 حەوت جار زیاتر بوو. لە ساڵی 1939 سێ هێندەی زیاد کردووە، لە ساڵی 1942 بۆ زیاتر لە دوو هێندە چوو[3]. لەهەمان کاتدا ئەمە دەربڕی زیادبوونی هێزی هەستی نەتەوەیی کوردیی بوو، هەروەها بەلگەی بەهێزی و توندی چەپەلۆکی دەوڵەتیش بوو.

سروشتی بزووتنەوە نەتەوەییە چەکدارییە کوردییەکان لە تورکیا لە نێوان هەردوو جەنگەکە، مۆرکێکی لادێی پێوە دیار بوو، هەرچەندە چەمکی

(1) - ابراهيم الداقوقي، اكراد تركيا، المصدر السابق، ص 209.

(2) -David McDowall, Op. Cit., P. 395.

(3) - م. س. لازاريف، المسالة الكُردية (1923–1945): النضال والإخفاق، ترجمة، عبدي حاجي، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، اربيل، 2007، ص 354.



ئۆپۆزسیۆنی کوردی لەسەرەتادا لە نێوان ئەفسەرانی پێشوو و رۆشنبیرانی کورد بلآوبووەوە[1]، بەلآم پشتی بە کۆمەلگەی کلاسیکی کوردی دەبەست. عەشیرەتەکان و فاکتەرە ئایینییەکان دەرامەتی بنەڕەتی مرۆییان بۆ ئۆپۆزسیۆنی کوردی لە دژی حکوومەتی کەمالی دابینکرد. بەلآم ئەو رەوشە لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم گۆڕانی بەسەرداهات، بە شێوەیەك توندوتیژی سیاسی و جەنگی پارتیزانی شوێنی راپەرینی چەکداری کورت ماوەی گرتەوە. ئەوکاتەش بزووتنەوەی کوردی تاڕادەیەکی زۆر مۆرکێکی شارستانی وەردەگرێت، توانای کۆکردنەوەی دانیشتوانی ئەو شارانەی کە بۆماوەیەکی دوور و درێژ بێ دەنگ بوون، هەیە[2]. سەرنەکەوتنی بزووتنەوە چەکدارییە کوردییەکانی بیست و سییەکانی سەدەی بیست وایکرد سیستەمێکی تەواو لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی لە تورکیا بۆ ماوەی 30 ساڵ بێتە ئاراوە[3].

کرانەوەی رژێمی فرەیی حیزبی لە تورکیا، بەهۆی بردنەوەی پارتی دیموکرات لە هەڵبژاردنەکانی 1950، ئەو فشارەی کە لە ماوەی دەسەلآتی پارتی گەلی کۆماری لە سەردەمی مستەفا کەمال (1923–1938) و جێنشینەکەی عیسمەت ئینونۆ (1938–1950) رووبەڕووی کورد ببووەوە، سوك بوو. هەرچەندە دیموکراتەکان بە رچەڵەك و ئایدیۆلۆژیای کەمالییان دەرنەچوون، لەمیانەی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن بەلێنیاندا هەندێ لە سیاسەتەکانی عەلمانی توندرەوی دەوڵەت سوك بکەن، ئەویش بە لابردنی **"کۆت و بەندی رۆشنبیری لە رۆژهەلآت "**، واتا لە ناوچە کوردییەکان و کەمکردنەوەی کردەوە سەرکوتکارییەکانی هێزەکانی ژەندرمە لە ناوچە لادێیەکان کە زیاتر لە 80٪ی دانیشتوانەکەی هەستیان بە ئازار و بێزاری لە سیاسەتەکانی کەمالییەکان کردووە. هەروەها پارتی دیموکرات چەند کەسێکی

(1) -Ferhad Ibrahim, "The Kurdish National Movement and the Struggle for National Autonomy", in, Berch Berberoglu, The National Question, Temple University Press, Philadelphia, 1995, P. 40.

(2) -Hamid Bozarslan, Op. Cit., P.17.

(3) -Ferhad Ibrahim, Op. Cit., P. 41.

له چینەکانی ئاغاکان و سەرۆکی خانەوادە دیارەکانی کوردی لە نێو لیستی پـارتی دیموکرات بۆ ناوچەکانیان پاڵاوت[1]. پارتی دیموکرات لـە ناوچـەکانی ڕۆژهـەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات ، کە زۆرینەی کوردن، سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا. بـە گوێرەی مەزەندەکانی دیڤید ماکدوال، پارتەکە لـە هەڵبژاردنـەکانی 1954 لـە کۆی 40 کورسی 34 کورسی ناوچەکانی کوردستانی بردووە[2].

زۆری پێنەچوو کورد تووشی بێ هیواییەکی گەورە بـوو، دەرکـەوت کـە ئـەو وەرچـەرخانە بـۆ ئـەوان خەیاڵـە. دیموکراتـەکان لـەو دروشمانـەی کـە پێـشتر بەرزیان کردبووەوە، وازیان هێنا و هەمان ئەو سیاسەتەیان گرتەبەر کە حیزبـی گـەلی کۆمـاری لـە نێـوان (1923–1950) گرتیانەبـەر، لـە سـاڵی 1956ەوە پێشێلکارییەکانیان بۆ ئازادییە گشتییەکان و ڕۆژنامە لە تورکیا گەیشتە لوتکە. حزبی دیموکرات لەم سیاسەتەی کوردی بێ بەش نەکرد، لە یەکێ لە گـرنگترین دادگاییکردنەکانی لەماوەی دەسەڵاتی ئەو حیزبەدا بەرێوەچوو، 49 ڕۆشـنبیری دیاری کوردی بە تۆمەتی هاندان بۆ ئاشوب و یاخیبوون و بڵاوکردنەوەی مەیلی جوداخوازی، بە بەندی بۆ ماوەی سێ تا چوار ساڵ حوکمدا. هـەروەها زۆربـەی ئەو خوێندکارانەی کە لە ئازاری 1960ەوە لە خۆپێشاندانێك دژ بە حکوومـەتی پـارتی کۆمـاری بەشـدارییان کـرد، دەسـتگیرکرا، بەتایبـەتی لـە ویلایەتـەکانی هەکاری و ئەرزەروم و سەعرەت و ئەنقەرە. لە 24ی نیسانی 1960 بە تۆمەتی کارکردن بۆ دامەزراندنی دەوڵـەتی کوردسـتان بـە دابڕانـدنی بەشـێك لـە خـاکی نیشتیمان، دەستگیرکردنی 50 هاووڵاتی ڕاگەیەنرا، کە زۆربەیان لـە ڕۆشـنبیران و ڕۆژنامەنووسان و خوێنـدکاران و کرێکـاران بـوون، داواکـاری گـشتی داوایکـرد سزای لەسێدارەدانیان بەسەردا بسەپێ[3].

دەیەی شەستەکان بۆ کورد قۆناغێکی زۆر گرنگ بوو. ئـەو حکوومەتـەی لـە دوای کودەتا سەربازییەکە پێکهێنـرا، کـە حکوومـەتی دیموکراتـەکانی لـە 27ی

(1) -Henri J. Barkey and Graham E. Fuller, Op. Cit., P. 14; David McDowall, Op. Cit., Pp. 396-397.

(2) -David McDowall, Op. Cit., P. 398.

(3) - ابراهيم الداقوقي، المصدر السابق، ص ص 217–219.



ئـازاری 1960 ڕووخانـد، لەلایـەن (لیژنـەی یـەکێتی نیـشتیمانی–NBC) بەڕێوەدەبرا، ئەم لیژنەیـەش لـە 38 ئەفسەر بەسـەرۆکایەتی ژەنـەراڵ جـەمال گورسـەل C.Gürsel پێکـدەهات، ئـەو لیژنەیـە زیـاتر سیاسـەتی نکـۆڵیکردن و پشتگوێخـستنی کـوردی گرتەبـەر. گورسـەل، کـە دواتـر سـەرۆکایەتی کۆمـاری وەرگـرت[1]، لـە 16ی تـشرینی دووەمـی 1960 لـە لێدوانێکـدا گـوتی: "**ئەگـەر تورکـانی چـیا [واتـە کـورد] ئـارام نەبنـەوە، ئـەوا سـوپا دوودڵ نابێـت لـە بۆردوومانکردن و خاپوورکردنی شار و گوندەکانیان. ئەو کاتەش حەوزێك لە خوێن دروستدەبێ، خۆیان و وڵاتەکەیان تێیدا دەخنکێن**"[2]. لـە لێـدوانێکی دیکە لە ساڵی 1961 گوتی: "**ڕاستییەکەی کورد لە ڕەگـەزی تـورکین و هـیچ شتێك نییە ناوی گەلی کورد بێت**"[3].

لەلایەکی دیکەوە، دەرەنجامە ئابوورییەکانی سیاسەتی پارتی دیموکرات لـە مـاوەی پەنجاکانـەوە، بەتایبـەتی لـە بـواری بـەئامێرکردنی لادێ، ئەمـەش بەشێوەیەکی ڕوون لـە مـاوەی سـاڵانی شەسـتەکان بەدەرکـەوت. بـەکارهێنانی ئامێری کشتوکاڵی بە شێوەیەکی چڕ و بەربڵاو لە کوردستانی تورکیا، پـاڵی بـە سەدان کوردەوە نا کە زەوییەکانیان بەجێبێڵن و بەرەو شارۆچکە لۆکاڵییـەکان دواتـر بـەرەو دەرەوەی کوردسـتان بـچن. لـە ناوەڕاسـتی پەنجاکانـەوە لـە

(1) – حکوومەتیکی مەدەنی بەسەرۆکایەتی عیسمەت ئینیۆ لـە 20 تـشرینی دووەمـی 1961 دوای هەڵبژاردنەکانی تشرینی یەکەم 1961، پیکهات. جمال گورسەل بووە سەرۆك کۆمار. سەیری: Erik J. Zurcher, Op. Cit., Pp. 258-259.

(2) - محمد نور الدين، تركيا في الزمن المتحول: قلق الهوية وصراع الخيـارات، ريـاض الـريس للكتـب والنشر، بيروت، 1997، ص 97. جێگایی باسە کە گورسەل سەرنجی خویی لـە بـارەی کتـێبی (مێژووی ویلایەتەکانی ڕوژهەڵات و ڤارتو –*Dogu Illeri ve Varto Tarihi*) کە لـە نوسـینی شەریف فوراتە لە ساڵی 1948 کە گۆرسەل پێشەکی چاپی دووەم کە لە سـاڵی 1961 بـەلاو بووە بووی نوسیووە. ئە مەش کتێبەکە کە شەریف فورات هـەوڵی داوە کـە دوپـات بکـات کـە کورد لە نەژادی تورکەکانن، و هیچ شتێك نییە بە ناوی میللەتی کورد". سەیرکە:
Michael Gunter, The Kurds and The Future of Turkey..., P. 6.

(3) -Bulent Gukay, Op. Cit., P. 322.

ناوچەکانی دەوروبەری دیاربەکر (بەرێژەی 25٪) و ئالازیگ (بەرێژەی 16٪) و سیرەت (15٪) و ئورفە (8٪) کۆبوونەوە. ئەوانەشی بۆ ئەودیوی کوردستان چوون، (41٪)یان بۆ ئەستەمبۆل و (18٪) یان بۆ ئەنقەرە و (15٪) بۆ ئەدەنە و (4٪) بۆ ئەزمیر گواستیانەوە. لەماوەی چەند ساڵێك ژمارەی کۆچکەران زیادی کرد، بە شێوەیەك راستی بەیەکەوە ژیانیان لەگەڵ یەکتری بەدرێژی و پانی کۆمار ببووە قەڵای ناسنامەی کوردی، ئەم بوونەی کورد وای لە پرسی کورد کرد هەتاکو بۆ دانیشتوانی ئەستەمبۆلیش ببێتە راستییەکی واقیعی، کە بە 800 میل لە کوردستانەوە دوورە[1].

ساڵانی شەستەکان بە ساڵانی بوژاندنەوەی بیری نەتەوەیی کوردی لە تورکیا دادەنرێت، گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەکان، سەرباری کاریگەرییە هەرێمایەتییەکان، رۆڵێکی گرنگی لەم بوژاندنەوەیە هەبوو. کۆتایی حیزبی کۆماری هاوکات بوو لەگەڵ گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزانی سەرکردەی کورد، لە تاراوگەکەی لە یەکێتی سۆڤیەت، لە 16ی نیسانی 1959 بۆ عێراق[2]، ئەو گەڕانەوەیە سەرلەنوێ گیانی هیوای بۆ نەتەوەی کورد لەوێ (کوردستانی عێراق) گەڕاندەوە[3]. ئەو ئەفسەرانەی پێشەوایەتی کودەتای 1960یان کرد، هەوڵیاندا دەستوورێکی لیبڕاڵی دابنێن[4]، گۆڕانکارییە لیبڕاڵی و دیموکراسییەکان سەرباری رێژەیی بوونەکەشی لەبەرچاوگرت، کە

(1) -David McDowall,Op. Cit., Pp. 401-402.

(2) - عزیز حسن عزیز، الولایات المتحدة الامریکیة والمسالة الکُردیة في العراق 1961–1975، اطروحة دکتوراه مقدمة الی جامعة صلاح الدین، اربیل، 2007، ص ص 4–5.

(3) -Henri J. Barkey and Graham E. Fuller, Op. Cit., P. 14.

(4) - دەستووری 1961 کە لە 27ی ئایاری هەمان ساڵ دارێژرا، بە لیبراڵیترین دەستوور لەچاو دەستوورەکانی پێشوو و دواتریش لە مێژووی کۆمار دادەنرێت. لەبەرئەوەی رێگەی بە ئازادی بیرکردنەوە و رادەربڕین، کۆبوونەوە و بڵاوکردنەوە دا و بەڵێنی بە مافە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان دا، هەروەها مافێکی دیاریکراو بە سەندیکا بازرگانییەکان دا لە مانگرتن. سەیری: فلادیمیر ایفانوفیتش دانیلوف، الصراع السیاسي في ترکیا، ترجمة، یوسف ابراهیم الجهماني، دار حوران، دمشق، **1996**، ص ص 132–135.



لەماوەی دەسەڵاتی حیزب هاتنە کایەوە، کە تاڕادەیەك هێزی بە رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بەخشی، هەروەها هەلێکی راستەقینەی بۆ بەدەرخستنی ئازارەکانی کورد و وڵامدانەوەی هەندێ لەم ئازارانە، هێنایە پێش[1]. رۆشنبیرانی کورد هەر زوو حوکمی تازەیان جەرباند و رۆژنامەی مانگانەی (دیجلە — فورات) بە هەردوو زمانی کوردی و تورکی دەرکرد، لەماوەی ساڵانی (1962–1963) تەنها سێ ژمارەی لێدەرچوو، هەروەها رۆژنامەی (دەنگ Deng) و چەند رۆژنامەیەکی دیکەیان دەرکرد، ئەو رۆژنامانە جەختیان لەسەر بەدەرخستنی ناسنامەی کورد و راستی بوونی کورد لە تورکیا دەکردەوە. شایانی باسکردنە، کە زۆرینەی هەرە زۆری ئەو رۆژنامانە لە ئەستەمبۆل دەردەچوون[2].

ئەو پەرەسەندنانەی کە پرسی کورد لە تورکیا بەخۆیەوە بینی، هەروەها لەژێرکاریگەری و بە پاڵپشتی راستەوخۆی پارتی دیموکراتی کوردستان لە عێراق بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی، رێگەی بۆ دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان لە تورکیا، لە 11ی تەمووزی 1965 خۆش کرد، بەسەرکردایەتی فائیق بوجاقی پارێزەر. حیزبەکە خۆی بە نوێنەری کوردی تورکیا لەقەڵەم دا[3]. پارتەکە ئایدیۆلۆژیای مارکسی–لینینی بۆ کێبرکێی پارتە چەپە چالاکەکانی دیکە لە تورکیا، داوای سەربەخۆیی کوردستانی کرد، هەرچەندە پارتەکە بۆ رووی ئایدیۆلۆژی وەرگەرا، بەڵام هەر بە هاوپەیمانی لەگەڵ عەشیرەتە کوردەکان مایەوە، تەنها لە ناوچە لادێیەکان قەڵەمڕەوی

(1) -David McDowall, Op. Cit., P. 405.

ابراهیم الداقوقي، المصدر السابق، ص 231–232.

(2) -David McDowall, Op. Cit., P. 405.

(3) - نشرة تاریخیة عن الأحزاب الکُردیة في کُردستان الشمالیة، مکتب علاقات الفرع الأول للحزب الدیمقراطي الکُردستاني، مطبعة مکتب التنظیم/ الفرع الأول، أیار 1996، ص ص 9–12؛ "الحزب الدیمقراطي الکُردستاني الترکي"، المکتب السیاسي للحزب الدیمقراطي الکُردستاني (العراق)، مرکز الدراسات والبحوث، (اربیل، د. ت)؛

Michael M. Gunter, Historical Dictionary of Kurds, Scarecrow Press, Inc., Lanham, Maryland, and Oxford, 2004, P. 111.

هەبوو[1]. هەرچەندە ئەو دەربڕینە نەتەوەییە کوردییە، زۆر سوودی لەو لیبڕالییە سیاسییە وەرنەگرت، چونکە زۆربەی زۆری ئەو رۆژنامانە دوای ماوەیەکی کورت داخران و ئەندام و لایەنگرانی، پارتەکە دەستگیر و تیرۆر و دادگایی کران، کەس لە توانای دا نەبوو، بانگەشەی ئەوە بکات کە "**پرسی کورد لە تورکیادا بوونی نییە** ".

لە سایەی ماوەی ئەو پەشێوییە سیاسییانەی کە قۆناغی شەستەکان بەخۆیەوە بینی، کە بە ماوەی بارگاوییبوونی چەپ دادەنرێت، زۆربەی کورد ئەوانەی بەدوای "**مافە نەتەوەییەکانیان**" دەگران بەهیوای دانان بە ناسنامەی نەتەوەییان[2]، بەبێ دوودڵی چوونە ناو ریزەکانی پارتی کاری تورکی Turkiye Is Partisi[3]. لەبەرئەوەی چەپی تورکی و پارتەکانی هەڵوێستێکی روون و پابەندی بەرامبەر کورد وەرنەگرت[4]، لە کۆتاییدا وایکرد کۆمەڵێ چالاکی کوردی نێو پارتی کاری تورکی، لە نێوانیاندا تاریق زیا ئاکەنجی شانەی سەربەخۆ لە ساڵی 1966ەوە دابمەزرێنن، دوای ئەوەی تاریق زیا ئاکەنجی T.Z.Ekinci لە ساڵی 1968 و هاوڕێکەی محەمەد عەلی ئەسلان لە ساڵی دواتر بوون بە سکرتێری حیزب، ئاراستەی حیزب بەرەو دانان بە پرسی کورد چوو، لە کۆنگرەی چوارەمی حیزب کە لە تشرینی یەکەمی 1970 بەسترا،

(1) -Ferhad Ibrahim, Op. Cit., P. 41.

(2) -Henri J. Barkey and Graham E. Fuller, Op. Cit., P. 15.

(3) - پارتەکە ئاراستەیەکی سۆسیالیستی هەبوو، لە 13ی شوباتی 1961 دامەزرا، پارێزەر محەمەد عەلی بەیار لە شوباتی 1962 ەوە سەرکردایەتی دەکرد. پارتەکە لە هەڵبژاردنەکانی 1965 لە 3٪ ی دەنگەکان و 15 کورسی پەرلەمانی بەدەستهێنا. بۆ زانیاری زیاتر سەیری: فلادیمیر ایفانوفیتش دانیلوف، المصدر السابق، ص ص 154–159؛ حسين عبد فياض العامري، دراسة في الحركة الشيوعية في تركيا (1960–1980)، رسالة ماجستير مقدمة الى معهد الدراسات الافرو اسيوية (سابقاً)، بغداد، 1990، ص ص 56–74.

(4) - پارتی کۆمۆنیستی تورکی سەبارەت بە کێشەی کورد لەگەڵ بیروباوەری کەمالی یەکیگرتەوە، تا ساڵانی حەفتا پرسی کوردی نەکردە ناو بەرنامەی خۆیەوە، ئەم پارتە لە توانای دانەبوو، کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر چینی کارگەری تورکی نەبووە. سەیری: Ferhad Ibrahim, Op. Cit., P. 41



جەخت لەسەر ئەوە کرایەوە کە "**گەلی کورد لە رۆژهەڵاتی تورکیا بوونی هەیە، دەسەڵاتی فاشیزم کە خۆی لە چینی دەسەلاتدار دەنوێنێ گەلی کوردی خستۆتە ژێر سیاسەتی تێکەڵکردن و تۆقاندن کە زۆربەی کات شێوەیەکی سەرکوتی خۆیناوی وەرگرتووە**"[1]. گرنگترین گرووپ کە لەناو پارتی کاری تورکی دەرکەوت، ئەویش پارتی سۆسیالیستی کوردستان Socialist Party of Turkey-Kurdistan[2]، بوو، لەلایەن کۆمەڵێ رۆشنبیر کە لە دەورەی کەمال بۆرقای[3] کۆنە سەرکردەی حیزبەکە کۆببوونەوە، دامەزرابوو، ئەو پارتە لە ساڵی 1970ەوە رۆژنامەی (رێگای ئازادی Ozgurluk Yolu) دەردەچواند[4].

هەروەها چەندەها گرووپی سەربەخۆی چەپخوازانەی کوردی لەسەردەستی لاوانی زانکۆکان دامەزران، لەوانەیە بەناوبانگترینیان ئەوەیان بێت کە ناوی لەخۆنابوو (ئاگردانی کلتووری شۆڕشگێڕی رۆژهەڵات –DDKO)[5]، کە ئەو

(1) - كندال، المصدر السابق، ص 102–103.

(2) - "الحزب الاشتراكي الكُردستاني التركي"، المكتب السياسي للحزب الديمقراطي الكُردستاني (العراق)، مركز الدراسات والبحوث، (اربيل، د. ت).

(3) – کەمال بۆرقای سیاسەتمەدار و شاعیری کوردی لە گوندی قزلقایەی سەربە دەرسیم لە ساڵی 1937 لەدایکبووە، لە ساڵی 1960 کۆلیژی یاسای تەواوکردووە، کاری پارێزەری لە یازك و ئەنقەرە کردووە، لە ساڵی 1965ەوە چۆتە ریزی پارتی کاری تورکی لە ساڵی 1968ەوە لە دەسەڵاتی جێبەجێکاری حیزبەکە هەلبژێردرا، دوای کودەتای ئازاری 1971 دەستگیر کرا، دوای ئازادکردنی لەگەڵ ژمارەیەك هاوڕێی خۆی پارتی سۆسیالیستی لە کوردستانی تورکیا دامەزراند، دواتر بووە بە سکرتێری گشتی، دوای کودەتای 1980 تورکیای بەجێهێشت، لەو کاتەوە پەنابەری سیاسییە لە ولاتی سوید، ژمارەیەك پەرتووکی لەبارەی پرسی کورد و شیعر و رۆمانی کوردییەوە نووسیوە. Michael M. Gunter, Historical Dictionary…, P. 29.

(4) - نشرة تاريخية عن الاحزاب الكُردية في كُردستان الشمالية، المصدر السابق، ص 15؛ Ferhad Ibrahim, Op. Cit., P. 41 .

(5) - ئەمەش کورتکراوەی ناوی (Devrimci Doğu Kültür Ocaklari)، سەنترەکەیان لە دیاربەکر و وارگنی و سلیڤان و کولوك و باتمان بوو. ئامانجی بنەرەتییان رازیکردنی حکوومەتی تورکی بوو، کە دان بە مافە کلتوورییەکانی کورد بنێ و دان بە زمانی کوردی بنێ. سەرکردەکانی ئەو کۆمەڵە و رێکخراوانە، گوتاری رادیکالی و شۆڕشگێڕانەی سەرکوتکەرانەیان پێشکەش=

لانەیەی پیکهێنا کە زۆربەی ڕێکخستنە شۆڕشگێڕییەکانی دەیەی حەفتاکانی سەدەی بیستی لێ لە دایکبوو[1]. ساڵی 1967 ئاماژەیەکی گرنگ بوو لەسەر وەرگرتنی "**پرسی کورد**" وەك سیفەتێکی نوێی بەرپەرچدانەوە، بۆیەکەمجار لەوەتەی بزووتنەوەی دەرسیم لە ناوبرا، کۆمەڵە و یانە و ڕێکخستنە کوردییەکان، خۆپێشاندانی جەماوەرییانە لە 19 شار و شارۆچکەی کوردی ئەنجامدا، کە لە دیاربەکر ژمارەی خۆپیشاندەران گەیشتە 25 هەزار کەس و لە سلیڤا 10 هەزار، بۆ نارەزایی لەبەرامبەر سیاسەتی چەوساندنەوە و پشتگوێخستن کە لە دژی پیادە دەکرێت[2]، دروشم و هاواریان بۆ **"گەلانی تورکیا"** و ناونانی مندالانی کورد، بەناوی کوردییەوە دەکێشا، ئەمەش وەك جۆرێك لە ڕووبەڕووبوونەوەی دەسەڵاتدارانی تورکی و شانازیکردن بە ناسنامەی نەتەوەیی کوردیی[3]. لەوکاتەی کە ئەو نارەزایەتییانە وەرچەرخانی کوردی بۆ داواکردنی مافەکانی بە ڕێگەی سیاسی دەردەبری، لەهەمان کاتیش ئاماژەیەکی گرنگیش بوو بۆ گواستنەوەی ئەرکەکە لە ئاغاکانەوە بۆ جوتیاران و لاوانی خوێندەواری شارنشین، لە نێوانیشیاندا کوڕانی خانەوادە ئاغاکان، ئەوانەی وازیان لە بەها بۆماوەییەکانیان هێنابوو، ئەوانە خانەی سەرکردایەتییەکی بۆرژوازی خوێندەواریان پێکهێنا، کە بەشێوەیەکی گشتی خودان مەیلێکی چەپرەوانەی میانرەو هەستی نەتەوەیی روو لە زیاد بوون[4].

=دەکرد، ئەم ڕێکخستنانە لە گفتوگۆ ئایدیۆلۆژییەکان ڕێگەیان بۆ دووبارە گەڕانەوەی چەپی کوردی لە نەوەدەکان خۆشکرد، شوێن پەنجەی ئەمەش بە ئاشکرا لە قۆناغی نەوەدەکانەوە دیارە، پارتی کرێکارانی کوردستانیش یەکێ لەو ڕێکخستنانەیە کە سوودی لەمە وەرگرتووە، سەیری:
Henri J. Barkey and Graham E. Fuller, Op. Cit., P. 15;
عبد الله أوج الان، الدفاع عن الشعب، ترجمة، زاخوشيار، مؤسسة اوج الآن للثقافة البحث العلمي، بغداد، 2005، ص 344.

(1) -Henri J. Barkey and Graham E. Fuller, Op. Cit., P. 15.

(2) -Chris Kutschera, "Mad Dreams of Independence: The Kurds of Turkey and the PKK", Middle East Report, No. 189, July-August, 1994, P.12.

(3) - ابراهيم الداقوقي، المصدر السابق، ص 240.

(4) -David McDowall, Op. Cit., P. 409.



دیاردەی گرنگی حەفتاکان وەرچەرخانی پارتە سیاسییە کوردییەکان بوو بەرەو رادیکالیزم. هەروەك توێژەری ئەڵمانی مارتن فان برۆنسن، تێبینی کردووە، فاکتەری گرنگی ئەو وەرچەرخانە، شارستانی بوونە کە بەهۆی زۆری ژمارەی کۆچی بەزۆرە ملێ و کۆچی بەخواستی لادێیەکانی کورد بۆ شارەکان و بێ توانایی ئابووری تورکی لەسەر وەرگرتنی ئەمانە. هەر زوو کۆچکەران هەستیان بەو جیاوازییە گەورەیەی کە لە نێوان ناوچەکانی رۆژئاوای تورکیا و ناوچەکانی رۆژهەڵات کرد. توانای بەراورد لە نێوان رەوشی خۆیان و برا تورکەکانیان، لە وریابوونەوەی هۆشیاری کوردی یارمەتیدان بۆ مەودای ئەو تەنگژەیەی کە لەژێر حوکمی تورکی دەژین. ئەمەش لە کۆتاییدا وایکرد کۆببنەوە بەگوێرەی هێڵە ئەتنییەکانی کاری سیاسی[1]، واتا دەرچوون لە پارتە تورکییەکان و حەزکردن لە دامەزراندنی ڕێکخستنی سیاسی لەسەر بنەمای ئەتنی.

بەدەرکەوتنی دەیەی حەفتاکان، تورکیا و ناوچەکە پەرەسەندنی گرنکی لەسەر هەردوو ئاستی ناوەخۆیی و هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی بەخۆیەوە بینی، هەڵبژاردنەکانی 1969ی تورکیا، هیچ حیزبێك سەرکەوتنی بۆ پێکهێنانی حکوومەت بەتەنیا بەدەست نەهێنا. راست و چەپی تورکی دابەشبوونی گەورەی بەخۆیەوە بینی، بەشێوەیەك جیاکردنەوەیەکی توندی سیاسی لە گۆڕەپانی تورکی لێکەوتەوە، ئەو ململانێ ئایدیۆلۆژییانەی کە ئەو هێزە چەپ و راستانە بەرپایان کرد، بەردەوام بوو و لەلایەن هێزی بیانی دەرەکییەوە پاڵپشتی دەکران، ئەو ململانێیانە تا رادەیەك توند و تیژ بوو گەیشتە پلەیەك تێکگەیشتنی نێوانیان بووە، کارێکی ئەستەم، چونکە هەر لایەکیان باوەری وایە کە بیرۆکەی ئەو راستیە و ڕێگای خەباتی ئەو ڕێگایەکی نموونەییە و گرووپەکەی ئەو بەهەشتییە، هەر کەسێ باوەری پێنەهێنێ ئەوا خیانەتکار و بەکرێگیراوە و دەبێت لەناببرێت[2].

(1) -Stala M. Gavrielides, Kurdish Ethno nationalism: A Threat to Turkish Security, M.A Thesis, McGill university-Montreal, 1997, Pp. 35-36.

(2) - ابراهيم الداقوقي، المصدر السابق، ص ص251–252.

لەمیانەی ئەمەدا و لە ماوەی ساڵانی 1969–1971، لەوکاتەی مەیلی نەتەوەیی لە ڕۆژهەڵات  رووی لە زیادی بوو، مەشقکارانی تورك و کورد لە سەربازگەکانی ڕێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستینی (فتح) لە لوبنان گەرانەوە، بۆئەوەی خەباتی چەپگەرانە لە ئەستۆ بگرن. لە ساڵی 1969 تۆڕێك لە یانەی رۆشنبیری لە کوردستان لە ئەنقەرە و ئەستەمبۆل  بەناوی (ئاگردانی کلتووری شۆڕشگێڕی رۆژهەڵات  –DDKO)[1] دامەزرا، کە لە بەرنامەی رۆشنبیرییەکەیدا جەختی لەسەر ئازادییە مەدەنییەکان و مافە سیاسی و مەدەنی و ئابوورییەکان و چاکسازی کۆمەڵایەتی کردبووە، ئەمە سەخت نەبوو بزانرێت کە ئاگردانی کلتووری شۆڕشگێڕی رۆژهەڵات  بە شێوەیەکی نادیار لەپاڵ بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی لە تورکیا دەوەستا، بەتایبەتی بەشێوەیەکی چڕ باسی لە دروشمەکانی "ڕێحەزی ڕۆژهەڵات – النزعة الشرقية" و "ناسنامەی ڕۆژهەڵات ی" دەکرد[2].

ئەو پەرەسەندنە گرنگانەی کە گۆرەپانی عێراقی بەخۆیەوە بینی، کە خۆی لە هاتنە سەرکاری حیزبی بەعسی عەرەبی لە ساڵی 1968 بۆ دەسەڵات دەبینیتەوە، دواتر مۆرکردنی رێککەوتننامەی ئازاری 1970، کە گۆڕانکارییەکی جۆری لە خەباتی کورد لە عێراق بەتایبەتی و خەباتی کورد لە باقی پارچەکانی دیکە بەگشتی پەیدا کرد، ئەو رێککەوتنە بۆ یەکەمجار دانی بە مافی کورد لە دامەزراندنی ئۆتۆنۆمی خاوەن مۆرکی نەتەوەیی کوردی نا[3]. لەڕاستیدا رێککەوتنەکە پاڵنەرێکی بەهێز بوو بۆ نەتەوەخوازەکانی کورد لە ئێران و تورکیا بۆ ئەوەی کار بۆ هەمان داخوازی نەتەوەیی لەسەر شێوەی ئەوەی لە عێراق روویدا بکەن. هیچ گومانی تێدا نییە کە ئەو رێککەوتننامەیە هانی زۆرێك لە کوردی دابێت چ وەك تاك یا وەك رێکخستن لە تورکیا، بۆ دووهێندکردنەوەی چالاکی و کار  لەپێناوی دەستکەوتنی داننان بە بەشێك لە مافە مەدەنییەکان.

(1) - عبد الله أوج الان، المصدر السابق، ص 344.

(2) -David McDowall, Op. Cit., P. 409.

(3) - للإطلاع على نص الاتفاقية ينظر: شاكرو خدو محوي، المسالة الكُردية في العراق المعاصر، دار سبيريز للطباعة والنشر، دهوك، 2007، ص ص 355–379.



لەوانەیە ئەوە، ئەو تەوژمە نوێیەی رێوشوێنی توند و سەخت کە ئەنقەرە لە دژی کوردی گرتەبەر، روونبکاتەوە[1]. ئەو رێوشوێنانەی تورکیا بە روونی لە رۆژنامە تورکییەکان دەنگیدایەوە، کە یەکێ لەو رۆژنامانە داوای "**لەناوبردنی رژێمی هۆزەکان**" کرد و بە "**دروستکردنی نیشینگەی گەورەی تورکی لەوێ بۆئەوەی مۆرکی رۆژهەڵات  بگۆڕێت... لە دوایی چیاکان**"[2]، چالاکییەکانی سلیڤان، کە حکوومەت هێزێکی تایبەتی بە پاڵپشتی فرۆکە و زرێپۆش ناردە ئەوێ بۆ "سزادانی کورد" و ترساندن و پشکنینی شارەکە جگە لە کاردانەوەی دەستبەجێی حکوومەت[3] نەبێ هیچی دیکە نەبوو، لەسەر نزیکبوونەوەی کورد و حکوومەتی عێراقی بۆ داننان بە مافی کورد لە دامەزراندنی شێوەیەك لە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی عێراق.

پێ دەچوو حکوومەتەکەی دیمیریل بەتەواوی لە چارەسەرکردنی هەڵوێست و رەوشەکە بێ توانا بێت، رێوشوێنەکانی جاردانی باری لە ناکاو و ئەحکامی عورفی و داخستنی سەندیکاکان و سەرکوتی کۆبوونەوە و خۆپیشاندانەکانی چەپەکان، هیچ سوودی نەبوو. پرۆسەی رفاندنی بیانییان و هێرشکردنە سەر بانکەکان و سەرنەکەوتنی لە سەرکوتکردنی چالاکی سیاسی کوردی و بزووتنەوەی دیموکراتی تازەگەشەسەندووی تورکیا، سەرباری شکستی حکوومەت لە چارەسەکردنی گرفتە ئابوورییەکان و پەشیوەییەکانی کرێکاران و قوتابیان و ململانێی توند و بەردەوامی نێوان هەردوو پارتی سەرەکی (عەدالە و گەل) لەسەر دەسەڵات[4]. لە 12ی ئازار 1971 سوپا هاتە ناو کێشەکان لە

(1) - رێککەوتننامەی ئازار لە وەحشییەتی حکوومەتی تورکی زیادکرد، چونکە کاریگەری نەتەوەیی لەسەر پارێزگاکانی رۆژهەڵاتی تورکیا هەبوو، بۆ بەدواگەران بەدوای جوداخوازان کۆماندۆزی بۆ ناوچەکە نارد، لە تشرینی یەکەمی 1970 زۆربەی سەرکردەکانی ئاگردان دەستگیرکران و چەندین ساڵ بەند کران و رێکخراوی ئاگردانیش داخرا .

Omer Taspinar, Op. Cit., P. 93.

(2) -David McDowall, Op. Cit., Pp. 14-613.

(3) - ابراهيم الداقوقي، المصدر السابق، ص 253

(4) - وصال نجيب عارف العزاوي، المصدر السابق، ص 144.

کودەتایەکدا دیمیریلی لەکارلادا و ئەحکامی عورفی لە 12 ویلایـەت لـە کـۆی 67 ویلایەت راگەیاند، بە دیابەکر و سیرتەوە. هەڵمـەتێکی فراوانـی رەشـبگیری لـە کوردسـتان دەسـتی پێکـرد و بـە هـەزاران کـەس لـە دیاربـەکر و ئـەو شـارانەی زۆربــەی دانیــشتوانەکەی کــوردن لــە رۆژهــەڵاتی وڵات، دەســتگیرکران[1]. لــە بەیاننامەیەکی وەزارەتی ناوخۆدا هاتووە، کە سێ هۆکار لە دواوەی کودەتاکەوە بوون: یەکەم، دروستبوونی چەپی توندرەو و پیاوی شەڕی پارتیزانی مـەدەنی، دووەم، کاردانـــەوەی راســـترەوە تونـــدرەوەکان و ئەوانـــەی حـــەزیان لـــە دیکتاتۆرییەتە، سێیەم پرسی جوداخوازی لە رۆژهەڵات ، کە برێکی یەکجار زۆر لە چەکی تێدا دۆزرایەوە، ئەو چەکانە بە گوێرەی مەزەندەی وەزارەتی ناوخۆ بە **"یارمەتی مەلا مستەفای بارزانی گەیشتۆتە جوداخوازان"**[2].

سـەرانی کودەتاکـە هـەموو رێکخراوە سیاسـییەکان و گردبوونـەوەکانی چـەپی کوردی و تورکیان وەك پارتی کاری تورکی و ئاگردانیان هەڵوەشاندەوە، لە یاسـای حیزبەکاندا 81 ماددەیان دارشت، کە باسی ئەوەی کردبوو، کـە هـیچ پارتێـك بـۆی نییە جگە لە ناوی تورکی نـاوی نەتـەوەیی بەخۆیـەوە بلکـێنێ، هـەروەها جگـە لـە کلتـــووری تـــورکی هـــەڵبگریت[3]. پرۆســـەیەکی بـــەرفراوانی دەســـتگیرکردنی سیاسـەتمەداران و نوێنـەرە رۆشـنبیرییەکان ئەنجامـدرا. دوای جـاڕدانی بـاری لەناکاو، ژمارەی دەستگیرکراوان لـە دیاربـەکر و سـلیڤان گەیـشتە چـوار هـەزار کەس. بە درێژایی ساڵی 1971 رەشبگیری بەردەوام بوو، تا گەیشتە 10 هـەزار کەس، کە 10 هەزار و 320 کەسیش لە رێگەی زمان لێدانەوە دەستگیرکران، بە گـوێرەی بەیاننامەیـەکی (سـەرکردایەتی بـاری لـە ناکـاو)ەوە، تۆمـەتی بانگەشەکردن بۆ کۆمۆنیزم و مەیلی جوداخوازی کوردیان خرایە پاڵ[4].

(1) -Omer Taspinar, Op. Cit., P. 93.

(2) - کندال، المصدر السابق، ص 121.

(3) - کمال بورقاي، النظام القانوني الترکي والاکراد، مجلـة دراسـات کُردیـة، العـدد 4 (8)، الـسنة التاسعة، باریس، 1993، ص 126.

(4) - شاکرو محوی، کُردستان في السبعینات، في: لازاریف وآخرون، تاریخ کُردسـتان، ترجمـة عبـدي حاجي، دار سپیریز للطباعة والنشر، دهوك، 2007، ص 231.



دەرەنجامە نا یەکلاکەرەوەکانی ئەو هەڵبژاردنەی کە لە 1973 کـرا، وایکـرد حکوومــەتێکی ئیئتــیلافی تــا ســاڵی 1977 دەســەڵات وەدەســت بگرێــت، لــە سەرەتای ساڵی 1974ەوە بولەند ئەجەویدی سەرۆکی پارتی گـەلی کۆمـاری و پارتی سەلامەتی نیشتمانی-کـە ئاراسـتەیەکی ئیـسلامییانەی هـەبوو- یەکـەم حکوومەتی دوای کودەتای 1971ی پێکهێنا. ئەجەوید دوای ئەوەی سوپای بـۆ بەشی باکووری قوبرس نارد و سەرکەوت لە داگیرکردن، ئەجەوید جـەماوەرێکی گەورەی لە تورکیا هەبوو، سەرکەوتنی لە هەوڵەکانی بۆ رازیکردنی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکی[1] بۆ پەسەند کردنی یاسـای لێبـوردنی گـشتی کـە بەهۆیەوە ژمارەیەکی زۆر لە سیاسەتمەدارانی کورد ئازادکران[2].

هەرچەندە دەست لەکار کێشانەوەی حکوومەتەکەی ئەجەوید، تورکیا پـێـی نایـە قۆنـاغێکی تـازەی تەنگـژەوە، بەهەشـت مـانگ دوای دامەزرانـدنی، بـەڵام ئــەوەی دەکرێــت تێبــینی بکرێــت ئەوەیەکــە لــە ناوەڕاســتی حەفتاکانــەوە بزووتنەوەی کوردی لە تورکیا بوژاندنەوەیەکی گەورەی بەخۆیەوە بینی، کە لە

(1) - ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، دامەزراوەیەکی نوێ بوو بەگوێرەی دەستووری 1961 ەوە دامەزرابوو، سوپا لەم ئەنجوومەنە رۆڵێکی سیاسی دەگێرا، ئەم ئەنجوومەنە لە سەرۆك وزیـران و وەزارەتەکانی دەرەوەو ناوەوە بەرگری و سەرۆکی ئەرکان و سەرکردەکانی لقە سەرەکییانی هێزە چەکدارەکان و سەرکردەی گشتی هێزی ژەندرمە، پێکهاتبوو، ئەنجوومەنەکە لـەکاروباری پەیوەندیدار بە ئاسایشی نەتەوەیی دەکۆڵییەوە و لەبارەیانـەوە راسـپاردەی بـە ئەنجوومـەنی وەزیران دەدا، ئەویش لەسەری بوو رێوشوێنی زەروری وەربگریـت بـۆ پاراسـتنی سـەلامەتی و ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەت . جارجارەش گفتوگۆکانی ئەو ئەنجوومەنە سنوورەکانی خۆی بۆ کاروبارەکـانی ئـابووری و پـەروەردەیی و رێگاوبـان دەبەزانـد. هەرچـەندە راسـپاردەکانی بـۆ حکوومەت بەزۆرە ملێ نەبوو، بـەڵام وا رێکنەکـەوت لـە حکوومەتـە یەکبـەدوای یەکـەکان هـیچ راسـپاردەیەکی رەت بکەنـەوە. ولـیم هیـل، "الجیش الترکـي والـسیاسة"، في: ترکیـا المجتمـع والدولة، تحریر: اندرو فنکل ونوکهت سیرمان، ترجمة: حمدي حمید الدوري، دار الحکمة، بغداد، 2002، ص ص 67–97؛ محمـد نـور الـدین، ترکیـا: الجمهوریـة الحـائرة: مقاربـات في الـدین والـسیاسة والعلاقـات الخارجیـة، ریـاض الـریس، بـیروت، 1998، ص ص 81–86؛ مخلـوف سلیمان، المؤسسة العسکریة الترکیة: رصد ودراسة تحلیلیة، دار حوران، دمشق، 2001.

(2) - وصال نجیب عارف العزاوي، المصدر السابق، ص 146.

شێوەی گرووپ و سەندیکاکان، کە هەندێکیان مارکسی لینینی بوو، خۆی دەربڕیوە، بەڵام زۆربەیان مۆرکی ماویان –کە بۆ سەرکردەی کۆمۆنیزمی چینی ماوتسی تۆنگ 1949–1976 دەگەڕێتەوە– پێوە دیار بوو. هەندێکیشیان بریتی بوون لە ڕێکخستنە ڕێگەپێدراوەکانی لاوان وەك سەندیکا شۆڕشگێڕەکانی کرێکاران،. هەندێکیشیان رووخساری ڕێکخستنە ڕێگە پێنەدراوەکان بوون، ژمارەی ئەو ڕێکخستنە کوردییانە بە زیاتر لە 12 ڕێکخراو مەزەندە دەکرا[1]. زۆربوونی ئاراستەی چەپخوازی لە نێو کوردی تورکیا لە ماوەی ساڵانی حەفتاکان، وایکرد بزوتنەوەی کوردی بە توندی گرێدراو بەو ئاراستەیە لە دایك ببێ.

ژمارەیەکی زۆر لە کورد لە ماوەی حەفتاکان هەستیان بە نارەزایەتی کرد لەو شێوازی مامەڵەیەی کە چەپی تورکی لەگەڵ کێشەکەیان لەسەر ئاستی نەتەوەیی کورد ئەنجامی دەدات، زۆربەی سۆسیالیستەکان و کۆمۆنیستەکانی تورکیا هێشتا بەلای ئەوەدا دەچوون، کە کێشەی کورد بەگوێرەی بیری مارکسی چارەسەر بکەن. بۆیە پێشوەختە دوژمنی نەتەوەیی کورد بوون، پێیان وابوو، بۆ یەکێتی ململانێی چینایەتی و شۆڕشی سۆسیالیزمی رووخێنەرە. لەبەرامبەر ئەمەدا چالاکانی کورد دەیانەوێت وەك هەرێم و گرووپی ئەتنی جیاواز کە لە توانای دا هەبێت شۆڕشی پرۆلیتاری تایبەت بەخۆی سەرکردایەتی بکات، دانیان پێبنرێت. دەرەنجامی ئەو لێکترازانە دەرکەوتنی ژمارەیەك کۆمەڵەی رادیکاڵی چەپخوازی کوردی بوو[2].

لەوماوەیەدا، لە ناوەڕاستی حەفتاکان، بە روونی هۆشیاری نەتەوەیی لەلای کورد لە باشووری رۆژهەڵاتی ولات رووی لە زیادی کرد، ژمارەیەکی زۆر لە لاوانی رۆشنبیری کورد، بیری مارکسیان وەردەگرت و لە چالاکی جوداخوازی

(1) - محمد نور الدين، حجاب وحراب: الكمالية وأزمات الهوية في تركيا، دار رياض الريس، بيروت، 2001، ص 109.

(2) -Omer Taspinar, Op. Cit., P. 94.



دەگەڵان[1]. هەروەها پارتی بچووکی کوردی نهێنی پێکهێنران و پارت و یانەکانی پێشووش دەستی بەکارکردەوە. لە ساڵی 1974 پارتی سۆسیالیستی کوردستان (یانەی میللی رۆشنبیری شۆڕشگێڕی– Devrimci Halk Kultur Dernegler)[2] دامەزراند. لە ساڵی 1977 کۆمەڵەی (رزگاری Rizgari) و لە ساڵی 1978 پارتی (نەتەوەپەروەرانی رزگارکەری کوردستان) و ڕێکخستنی دیکەی دامەزراند[3].

ئەمەش یارمەتی توندکردنەوەی ڕێحەزی نەتەوەیی کوردی دا، دواتریش ڕێکخستنەکانی چەپی کوردی ئەو عەقلییەتەی کە بەهۆیەوە ئایدیۆلۆژیای فەرمی دەوڵەتی تورکی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردووە، توندوتۆڵکردەوە. کە لەوەتەی کۆمار دامەزراوە هەر درێژەی بەسیاسەتی کلاسیکی لە نکۆڵیکردن و پشتگوێخستنی بەردەوامی کورد داوە، بۆنموونە سلێمان دێمیرێلی سەرۆکی پارتی عەدالە، کە دوای دەست لەکارکێشانەوەی ئەجەوید لە 1974 حکوومەتی پێکهێنا، لەمیانەی دەربڕینی بیروڕاکانی لەبارەی کورد گوتی: **"هەر کەسێ هەست بەوەناکات تورك نییە، یان دڵخۆش نییە، ئازادە بۆ کوێ دەچێت با بچێت"**[4]. دێمیرێل پەنای بۆ ڕێوشوێنێکی دیکەی مەترسیدار برد، ئەویش بەکارهێنانی ئەندامانی حیزبی بزووتنەوەی نەتەوەیی توندڕەو بوو بۆ بەدەستهێنانی مەرامی سیاسی خۆی. ئایدیۆلۆژیای ئەو پارتە جەختی لەسەر

(1) - تقرير السفارة الامريكية في انقرة الى وزارة الخارجية الامريكية في 10 ايلول 1979، منشور ضمن كتاب: تدخلات امريكا في البلدان الاسلامية: تركيا، وثائق الجاسوسية رقم (41)، منشورات الوكالة العالمية، بيروت، 1991، ص 137.

(2) - یانەکە لە نێوان ساڵانی 1975 تا 1979 بۆ مەبەستی بەهێزکردنی کلتوور و پەروەردەی کوردی لە هەموو شارۆچکەیەکی کوردی دامەزرا . دوای کودەتای 1980 داخرا و ژمارەیەك لە ئەندامەکانی دەستگیرکرا. سەیری :

Sheri J. Laizer, Martyrs, Traitors, and Patriots, Zed Books, London, 1996, P. 96.

(3) - نشرة تاريخية عن الأحزاب الكُردية في كُردستان الشمالية، مكتب علاقات الفرع الاول للحزب الديمقراطي الكُردستاني، مطبعة مكتب التنظيم/ الفرع الأول، دهوك، ايار 1996، ص 15.

(4) -Omer Taspinar, Op. Cit., P. 410

ئەوە دەکردەوە کە **"هەر کەسێ خوێنی تورکی نییە، هەتاکو جگە لە زمانی تورکی نەزانێ بەهیچ زمانێکی دیکەش قسە بکات"**، لەهەمان کاتدا واسەیری چەپەکانیان دەکرد کە ئەوان **"خەڵکانێکی بێ رەگەز و بێ قیمەتن و بنەچەیان دیار نییە، ئەوان تورک نین"**[1]. دێمیرێل داوای لە (گورگانی بۆر Buz Kurt)ی باڵی چەکداری حیزبەکە کرد، ئەرکی لەناوبردنی ئەوانەی کە بە **"دوژمنی ناوەخۆ"** وەسفی کردن لە کورد و کۆمۆنیزم، لە ئەستۆ بگرن. ئەوەی لێرەدا پێویستە باس بکرێت ئەوەیە کە توندرەوانی گورگانی بۆر لەلایەن ئیسلامییەکان–کە بەناوی حیزبی خەلاس بەسەرۆکایەتی ئەربەکان کاریان دەکرد و لەلایەن دەوڵەتەوە، زۆر پاڵپشتیکران[2].

بەر لە کۆتاییهاتنی دەیەی حەفتاکان، دوو راستی دیار لە گۆرەپانی سیاسی ناوەخۆی تورکی ئامادەبوون، یەکەم توندبوونەوەی تەنگژە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی تورکیا بەشێوەیەك گەیشتە ئاستێکی ترسناك، کە لە زیادبوون و بەردەوامبوونی رووداوی توندوتیژی سیاسی و لەناوبردنی جەستەیی رەنگی دایەوە. راستی دووەم، رق و بێزاری کورد لە حکوومەتەکانی تورکی زیادی کرد، ئەمەش وایکرد رێکخستنە چەپە کوردییەکان زیاتر پەنا بۆ کردەوەی توندوتیژی چەکداری ببن، وەك کاردانەوە لەسەر ئەو کردەوە دوژمنکارییانەی کە رێکخستنە راستڕەوەکان لە گورگانی بۆر لە دژیان ئەنجامی دا، بەڵام دەوڵەت کە لە زۆرجار هەولوێستی سەیرکەری لە رووداوەکان وەردەگرت، هەندێجاریش تەنها سوپای بۆ راوەدوونانی چەپەکان بۆ ناوچەی رووداو دەنارد[3]. بەمەش تورکیا دەستی بە کردنەوەی **"تاریکترین سەردەمی مێژوویی هاوچەرخی کرد"**[4]، ئامارە فەرمییەکان لەبارەی چالاکییە

[1] - للتفاصيل ينظر: عائشة نفين جاغلار، "الذئاب الرمادية كتعبير مجازي"، في: اندرو فنكل ونوكهت سيرمان (تحرير)، المصدر السابق، ص ص 99–119.

[2] -David McDowall, Op. Cit., P. 412.

[3] -Ibid.

[4] - فيروز احمد، صنع تركيا...، ص 381.



تیرۆریستییەکانی ماوەی نێوان (1978 تا 1980)، ژمارەی کوژراوان بە زیاتر لە 5 هەزار و بریندارەکانیش بە نزیکەی 20 هەزار کەس لەقەڵەم دەدەن[1].

لەسایەی بەردەوامی توندوتیژی کە لەلایەن هێزی راستڕەوەوە، بەتایبەتی لەلایەن گورگانی بۆرەوە، هەروەها فراوان بوونی مۆلگەی تیرۆر و پێکدادان بۆ ناوچە ئەتنییە جیاوازەکان، وەك سیواس و ئەرزەروم مەرعەش و مەلاتیە، ژیانی حیزبایەتی لە کوردستاندا، مەودایەکی نوێی وەردەگرت، کە پەرەسەندوتر و وردتر بوو لە رووی رێکخستنەوە، لەمیانەی ئەمەشدا بەشێوەیەکی بەهێزتر هۆشیاری نەتەوەیی کوردی دەستی بە دەرکەوتن و خۆ دەربرین کرد. سەبارەت بە بابەتی یەکەم، ژمارەیەك لە پارت و رێکخستنی کوردی دەستیان بە دروستکردنی شانەی شەڕکەری نهێنی بەمەبەستی هێرشکردنە سەر یەکەکانی سوپا و ژەندرمەی تورکی و ئاغاکانی کوردی سەر بەحکوومەت کرد[2]، پارتی کریکارانی کوردستانیش Partiya Karkeren Kurdistane بەشێوەیەکی روون ئەو ئاراستەیەی لە بزووتنەوەی کوردی دەربڕی، ئەو رێکخستنەیە کە عەبدولڵا ئۆجەلان[3] لە ساڵی

[1] - عايشة نيفين جاغلار، المصدر السابق، ص 99.

[2] - م.أ.حسرتيان، "الحركة القومية–التحررية الكردية في النصف الثاني من السبعينات والنصف الأول من الثمانينات"، في: جليلي جليل وآخرون، الحركة التحررية الكُردية في العصر الحديث، ترجمة عبدي حاجي، دار الرازي، بيروت، 1992، ص 286.

[3] – لەگوندی ئۆمەرلی سەربە ویلایەتی ئۆرفە ساڵی 1946 لە خانەوادەیەکی جووتیاری دەست کورت لە دایکبووە، حەوت برای هەیە. باوکی لە ژیاننامەی خۆی نووسیویەتی کە زمانی تورکی نەزانیوە، بەڵام لە قوتابخانە بەشێوەیەکی بەرەبەرە فێری بووە. ساڵی 1966 ئۆجەلان هەوڵیدا بچیتە ئەکادیمیای جەنگی، بەڵام نەیتوانی تاقیکردنەوەی وەرگرتن ببریت، بۆیە چووە کۆلیژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنقەرە. لە ساڵی 1970 دەستگیر کرا و بۆماوەی حەوت مانگ بەهۆی بەشداری لە خۆپیشاندانی خوێندکاران بەند کرا. ئەمەش خالێکی وەرچەرخان بوو لەژیانی ئۆجەلان، لەوکاتەوە لە ژێر کاریگەری هەریەکە لە دنیزکە زمش و مونیر جایان بوو بە مارکسی، ئەوانەش دوو سەکردەی بەناوبانگی چەپی تورکیای سەردەمی حەفتاکان بوون، ئۆجەلان لەگەڵ هاورێیانی لە کۆبوونەوەکانی (دیف گەنج) کۆمەڵەی خوێندنی باڵای لە ئەنقەرە پێکهینا، لە ساڵی 1975 ەوە بریاریدا جەخت لەسەر کێشەکانی کورد لە تورکیا بکاتەوە و بەرەبەرە لە رێکخستنی چەپەکانی تورکیا دوور بکەوێتەوە، ئۆجەلان لە 27ی تشرینی دووەمی 1987 پارتی کرێکارانی کوردستانی دامەزراند.
Michael M. Gunter, Historical Dictionary..., Pp. 153-154.

1987[1] دایمەزراند، وەك پەرچەکرداری سیاسەتەکانی دەوڵەتی تورکی بەرامبەر کورد. ئۆجەلان بەم شێوەیە سیاسەتەکانی تورکی دەربڕیوە: **"تورکان ئێمەیان ناچار کردووە، لە رەوشێکی خراپتر لە رەوشی ئاژەڵەکانیش بژین"**، لە پاساوەکانیشی بۆ گۆڕینی ئاراستەی خەباتی لە ریزی رێکخستنەکانی چەپی تورکی بۆ مەیلی نەتەوەیی کورد، لەمیانەی چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ رۆژنامەنووسێکی ئەمریکی دەڵێت **"لە وەرگرتنی ناسنامە کوردییەکەم ناخۆشی زۆرم دەبینی، ئەگەر بلێم من کوردم، واتا دەبێت ئامادەی رووبەڕووبوونەوەی خراپترین سەختی بم لە جیهان، دەمبینی دەرگاکان یەك بەدوای یەك لەسەرم دادەخران"**[2]. پارتەکە خۆی وەك سەکۆی چینە پەراوێزخراوەکان پێشکەش کرد[3]. پارتەکە لە بنەمایەوە لە قوتابیانی زانکۆ پێکهاتبوو، بە عەبدوڵا ئۆجەلانی دامەزرێنەریشەوە، هەموویان لادێی بوون و لە شارە گەورەکان خوێندوویان، لەسەرەتادا تورکیش لە نێو رێکخستنەکان هەبوو، کە باوەڕیان وا بوو کە کێشەکانی توورکیا هەر بەتەنها پشت بەستن بە تاکە ئەتنیەك چارەسەر ناکرێت[4].

پارتی کرێکارانی کوردستان لەمیانەی ئەنجامدانی زنجیرەیەك کردەوەی تیرۆورکردن لەدژی کەسایەتییە سیاسییەکان بوونی خۆی دەربڕی، لەدیاریترینیان هەوڵی سەرنەکەوتووی تیرۆرکردنی ئەندامی پارتی عەدالە و

(1) - سەبارەت بە مێژووی دامەزراندنی پارتی کرێکارانی کوردستان، سەرچاوەکان جیاوازییان هەیە، عومەر تاسبینار دەلێت لە 1977 دامەزراوە، ئەرسال یافی دەلێت لە ساڵی 1979 دامەزراوە، هەرچی عیسمەت ئیمەستە دەلیت لە 27ی تشرینی دووەم 1987، ئەمەش مێژوویەکی وردە. سەیری:
Omer Taspinar, Op. Cit., P. 94; Ersal Yavi, A.G.E., S. 533; Ismet Imset, The PKK, A Report on Separatist Violance in Turkey 1973-1992, Turkish Daily News, Ankara, 1992. Pp. 19-20 .

(2) - جوناثان راندل، المصدر السابق، ص ص 313–314.

(3) -Ferhad Ibrahim, Op. Cit., P. 42.

(4) -Dogu Ergil, "PKK: The Kurdish Workers Party", in, Mariann Heiberg and Others, Terror, Insurgency and the State, University of Pennsylvania Press, Pennsylvania, 1996, P. 329.



نوێنەری پارێزگای سەڤەرەك Severek بوو، کە دەرەبەگێکی کوردبوو بەناوی محەمەد جەلال بوجاق[1]. دەربڕینی ناسنامەی کوردی هەرتەنها لە نیوەندە میللییە نا فەرمییەکان سنووردار نەکرابوو، شەرەفەدین ئالجی وەزیری ئەشغالی تورکی لە نیسانی 1979 رایگەیاند کە **"کورد لە تورکیا هەیە، من خۆشم کوردم"**[2].

بە کۆتایی هاتنی دەیەی حەفتاکان، ئاماژەکان رۆژ بەڕۆژ ئەوەیان نیشاندەدا کە بزووتنەوەی کوردی پێ دەنێتە قۆناغێکی تازەوە، لەهەمان کاتدا رەوشی ناوەخۆی تورکیا رۆژ لە دوای رۆژ خراپتر و ناخۆشتر دەبوو، تا گەیشتە سەرەتای هەشتاکان وا پێ دەچوو کە رەوشەکە لە دەست دەرچوو بێت، پێ دەچوو حکوومەتە لەدوای یەکەکان گومڕا بن، رێوشوێنەکانی سەرۆکی نوێی حکوومەت سلێمان دیمیرل (12ی تشرینی دووەمی 1979 تا 12ی ئەیلولی 1980) رێگەی لە بەلاداچوونی ولات بەرەو شەڕی ناوەخۆ و داتەپین نەگرت، سەرباری بەهێزکردن و فراوانکردنی باری لەناکاو بۆئەوەی 20 ویلایەتی خاوەن زۆرینەی کورد بگرێتەوە، جگە لە ئەستەمبۆل و ئەنقەرە نەبێت، هەروەها دەسەڵاتەکانی سەرکردە سەربازییەکانی بەهێزتر کرد و هاوپەیمانی لەگەڵ (گورگانی بۆر) کرد. رۆژانە رێژەی چالاکییەکانی کوشتن لە 20 کەمتر نەبوو. لەوەش ترسناکتر ئەو چالاکییانە کەسایەتی دیاری وەك نیهاد ئایرەمی سەرۆك وەزیرانی پێشوو و کەمال تورکلەر و سەرۆکی سەندیکاکانی کرێکارانی شۆڕشگێڕ Disk و چەندانی دیکەی کردە ئامانج، هەروەها لەتەواوی وڵات کردەوەی توندوتیژی کە مۆرکێکی تایفی هەبوو، بڵاوبووەوە[3].

لەژێر سایەی بەردەوامی لەدەست دەرچوونی رەوشەکە لە دەستی پارتەکان و سیاسەتمەداران، هاتنە ناوەوەی سوپا بۆ گەڕاندنەوەی

(1) -Ismet G. Imset, Op. Cit., P. 20.

(2) - وصال نجيب عارف العزاوي، المصدر السابق، ص 180.

(3) - فيروز احمد، صنع تركيا ...، ص390–395؛ م.أ حسرتيان، "الحركة القومية–التحررية..."، ص 286.

کاروبارەکان بۆ شوێنی خۆیان کارێکی حەتمی بوو. هەر زوو سەرانی کودەتای 12ی ئەیلولی 1980 هەڵوێستیان لەبارەی پرسی کورد بە قسە و بە کردەوە دەربڕی، ژەنەراڵ کەنعان ئەڤرینی سەرکردەی کودەتاکە لە سەرەتای ساڵی 1981ەوە لە لێدوانێکی رایگەیاند کە **"هەموو ئاراستە جوداخوازییەکان بێ بە زەبیانە تێکدەشکێنرێت"**[1]. لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ رۆژنامەی دیر شپیگلی Der Speigel ئەلمانی لە 19ی تشرینی یەکەمی 1981ەوە هەڵوێستی خۆی روونتر لەبارەی کوردەوە ئاشکرا، کرد کاتێ گوتی: **"هەرکاتێ کۆماری تورکی لاواز دەبێت، کوردان شۆڕش دەکەن، ئەوان بەیارمەتی هێزی دەرەکی دەیانەوێت تورکیا دابەش بکەن"**. هەروەها گوتی: **"کورد هەن، بەلام رێگەیان پێنادەین تورکیا دابەش بکەن، ئەوان ناتوانن هیچ شتێ لە ئێمە ببەن، بەهەموو هێز و توانامان کار بۆ ریشەکێشکردنی ئەو پرسە دەکەین"**[2]. بولەند ئۆلوسۆ B.Ulusu سەکردەی هێزی دەریایی و سەرۆك وزیرانی نوێ، بەر لە ساڵێك لە کودەتاکە هۆشداری ئەوەی دا کە **"رۆژهەلات دەکولێ و کۆمۆنیست و کورد لەوێ بەتەواوی یارمەتی یەکتری دەکەن"**[3].

دوای کودەتاکە هەزاران کورد دەستگیرکران و زۆربەیان لەژێر ئازاردا مردن، هەزارانی دیکەش بۆ ماوەیەکی درێژ لە بەندیخانە پەستێنران[4]. ئەو تۆمەتانەی کە خرابووە پاڵیان ئەوە بوو، کە ناسنامە کوردییەکەی خۆیان راگەیاندبوو، یا بڵاوکردنەوەیان بە زمانی کوردی بڵاوکردۆتەوە، یان زۆربەیان بەتۆمەتی ئەندامبوون لە رێکخستنە کوردییەکان تۆمەتبار کرابوون، بە گوێرەی ماددەکانی (141 و 142)ی یاسای سزادانی تورکی حوکمدران، ئەو ماددەیە تایبەت بوو بە نواندنی کاروچالاکی سیاسی لەسەر بنەمای ئەتنی، کە وابکات

(1) - ابراهيم الداقوقي، المصدر السابق، ص 280.

(2) - م . أ. حسرتيان، "الحركة القومية–التحررية..."، ص 288.

(3) -Henri J. Barkey and Graham E. Fuller, Op. Cit., P. 16.

(4) - بۆ سەیرکردنی نموونەی لێپرسینەوە لەو بەندکراوانە سەیری: الحزب الطليعي لعمال كردستان PPKK، شهادات الناجين من سجن ديار بكر، الدراسة رقم (5)، د.م، 1985، ص 11 وما بعدها.



یەکێتی نیشتمان لاواز بکات[1]. پرەنسیپی نکۆڵیکردنی ناسنامەی کوردی لە نێوان ساڵانی 1980 تا 1982 بە دەستگیرکردنی 80 هەزار کەسیان [2]، گەیشتە لوتکە، ئەمەش بە گوێرەی مەزندەکانی کۆمەڵەی دەولی مافەکانی مرۆڤ[3]. وەزیری پەروەردەی بە حاکمانی ویلایەتەکانی رۆژهەلات و باشووری رۆژهەلاتی راگەیاند کە ناکرێت گۆرانی بۆ مەرامی ئەتنی یان جوداخوازی بگوترێت، فەرمانی دا دەبێت ئەو گۆرانییانە بە زمانی تورکی بگوترێن[4]. هەروەرها نزیکەی سێیەکی سوپای تورکی بۆ زامنکردنی ئارامی تێیدا، بڵاوکرایەوە، هەرچەندە کودەتاچییەکان بەفەرمی ئەمەیان رانەگەیاند[5].

لەلایەکی دیکەوە دوورخستنەوە و رێگەگرتن لە سیاسەتمەدارانی مەدەنی، لەدوای کودەتاکە، لەوەی چالاکی سیاسی بنوێنن، وایکرد سەرانی عەسکەر لە هەر ئامۆژگاری و شارەزایەك کە دەکرا سیاسەتمەداران پێشکەشیان بکەن، مەحروم بن، بەتایبەتی لە ناوچە کوردییەکان، دیدی ژەنەراڵەکان بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بوو بە سیاسەتی فەرمی دەوڵەت[6].

(1) -Ersal Yavi, A.G.E, S. 537.

(2) – کەمێك لە رۆژنامەنووسان توانییان ئامادەی دادگاییکردنەکانی دیاربەکر بن، نووسیویانە کە بەندی و دەستگیرکراوەکان، لەبەرئەوەی نەیان دەتوانی بە پێیان برۆن بە قەفەسی هەڵگیراو لەسەر عارەبانە بۆ دادگا دەهێنران، رەوشی بەندیخانە ئەوەندە سەخت بوو کە ژمارەیەك بەندی بۆ ماوەی زیاتر لە مانگێك مانیان لە خواردن دەگرت، هەندێکیشیان خۆیان دەکوشت، لە نەورۆزی 1982 مەزلوم دۆغان، کە کادیریکی پارتی کرێکارانی کوردستان بوو، رایگەیاند کە پێی باشترە لە بەندیخانە لەسێدارە بدرێت، نەوەك تەسلیم ببێ، دوای چەند هەفتەیەك چوار بەندی رۆژنامەی تەڕکراو بە بەنزینیان لە خۆ لولدا و ئاگریان لە خۆ بەردا، هاورێیانی نەیانهێشت بیانکوژێننەوە، گوتیان ئەمە ئاگری ئازادییە، سەیری:
Chris Kutschera, "Mad Dreams of Independence: The Kurds of Turkey and the PKK", P. 13.

(3) -David McDowall, Op. Cit., P. 414.

(4) -Bulent Gokay, Op. Cit., P. 323.

(5) -David McDowall, Op. Cit., P. 414.

(6) - هنري باركي وغراهام فولر، المصدر السابق، ص 118.

بەهاتنی ساڵی 1983، ئەو باوەڕە بڵاوبوو، کە پەشێوی سیاسی و دابەشبوونی ناوەخۆ و پرۆسەکانی رەشبگیری، لەناوبراوە، راپۆرتەکان ئاماژەیان بەکەمکردنەوەی ژمارەی کردەی تیرۆری سیاسی لە ساڵی 1981 بۆ 456 و لە ساڵی دواتریش بۆ 124 دەکرد[1]. لە دەستپێشخەرییەکی سوپای تورکیدا، کە لە 26ی ئایاری 1983 هوە ئەنجامیدا، ئەو سوپایە هێرشی بۆسەر بارەگاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان بۆ ماوەی 25 میل لە باکووری عێراق هێنا، بە هێزێکی نزیکەی 8 تا 10 هەزار سەربازەوە، ئەمەش دوای ئەوەی مۆڵەتی لە حکوومەتی ئەوسای عێراق وەرگرت. سوپاکە وای راگەیاند کە بەسەدان کەسی لەئەندامانی پارتەکە کوشتووە و دەستگیرکردووە[2]، پیاوانی عەسکەر، ئەوانەی سیاسەتمەدارانیان لە دەسەڵات دوورخستەوە، چاوەڕێیان دەکرد لەرێگەی سەرکوتی زیاتر و سیاسەتی لەخۆگرتنەوە، بە ئاسانی پرسی کورد چارەسەر بکەن.

پاشەکشەی ژمارەی چالاکییە تیرۆریستییەکان و ئەو ئارامییەی کە دوای ماوەیەکی کەمی دوای کودەتای 1980 باو بوو، گەشبینی و متمانەی بە توانای عەسکەر بەخشی لەسەر چارەسەرکردنی گرفتە ناوەخۆییەکانی تورکیا. بەهەرحاڵ ئەمە زۆری نەخایاند و لە ئابی 1984 رووبەڕووبوونەوەی کورد لەلایەکی نەناسراوەوە بەشێوەیەکی گەورە هات و وەرچەرخانێکی ترسناکی لە

[1] -David McDowall, Op. Cit., P. 418.

[2] – ئۆلسن گومانی لە کەوتنی هیچ کوژراوێك لە ئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستان هەیە، بەگوێرەی زانیاری و لێدوانەکانی پارتە کوردییە عیراقییەکان و راپۆرتی رۆژنامەگەرانی جیهانی، زۆربەی پێکانەکان لەنێو مەدەنییەکان و جەنگاوەرانی پارتە کوردییەکان بوون، هەروەها چالاکی بۆردوومانەکانی تورکیا هەندێ لە بارەگاکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی لە بادینان کردە ئامانج، پارتی دیموکرات لە 28ی ئایاری 1983 لەسەر زاری سەرۆکەکەی (مەسعود بارزانی) ئەو کردەوەیەی تورکی بەتوندی ریسوا کرد. الحزب الديمقراطي الكُردستاني/ العراق، الغزو التركي لكُردستان العراق، هكذا تم دحره، قسم الإعلام في الحزب الديمقراطي الكُردستاني، مطبعة خه بات، (دم. دت)، ص ص 9–18؛
Robert Olson, The Kurdish Question and Turkish-Iranian Relations: from World War I to 1998, Mazda Publishers, U.S.A, 1998, P. 31.



مێژووی تورکیا و پرسی کوردی کردەوە. ئەو رووبەڕووبوونەوەیەش ئەوە بوو کە پارتی کرێکارانی کوردستان رایگەیاند کە رێگای بەرخۆدانی نهێنی و خەباتی چەکداری بە پشتبەستن بە **"توندوتیژی شۆڕشگێڕانە"** دەگرێتەبەر، وەك ئامرازێك بۆ بەدەستهێنانی سەربازگیری و رزگاری، نەوەك هەرتەنها لە دژی حکوومەتی تورکی، بەڵکو لە دژی ئۆپۆزسیۆنە سیاسییەکانیش جا چ ئەوانەی لە ریزەکانی حیزب دەرچوو بن یان رێکخستنەکانی حیزبە کوردییەکانی دیکە یا سەرۆك عەشیرەتەکان بێت[1]. هەربۆیەکە لە هێنری بارکی و گراهام فاولەر گەیشتنە ئەوەی کە **"سیاسەتە توندەکانی ساڵانی سییەکان، وەك قەدەغەکردنی بەکارهێنانی زمانی کوردی و سەرشۆڕکردنی رۆژانەی دانیشتوانی ناوچە کوردییەکان لەسەردەستی فەرمانبەرانی مەدەنی حکوومەتی تورکی، هەموو ئەمانە لە جیاتی ئەوەی هەستی شاراوەی نەتەوەیی کوردی لاواز بکات، بەهێزی کرد و بەمەش بەشدارییان لە بەدەنگەوە هاتنی پارتی کرێکارانی کوردستان کرد"**[2].

پارتی کرێکارانی کوردستان، کە سەرکردە و کادیرانی لە سەروبەندی کودەتای 12ی ئەیلولی 1980[3] تورکیایان جێهێشتبوو، لە کۆنگرەی دووەمی ساڵی 1982، بڕیارياندا، خۆیان بۆ گەڕانەوە بە دارشتنی ستراتیژێکی سێ قۆناغی ئامادە بکەن: **بەرگری و هاوسەنگی و هێرش**[4]. بە یەکەم چالاکی چەکداری لە 15ی ئابی 1984 کە لەژێر ناوی "بتەقێنە و راکە" پارتی کرێکارانی کوردستان خۆی دەربری، ئەم چالاکییە بریتی بوو لە هێرشی دوو گرووپی تیپی ئازادی کوردستان (فرق حريه كُردستان–Kurdistan Freedom Brigades) کە

[1] - گولستان گورباي، المصدر السابق، ص63–64.

[2] -Henri J. Barkey and Graham E. Fuller, Op. Cit., P. 16.

[3] – بەگوێرەی ئەوەی عەبدوڵلا ئۆجەلان باسی کردووە، ئەوا پارتی کرێکارانی کوردستان، لەسەروبەندی کودەتاکە ژێرخانی سەرەکی پارتەکەی بۆ دەرەوەی وڵات بردووە، بەمەش خۆی لە گورزێکی کوشندە بەدوور گرتووە. سەیری : Ismet G. Imset, Op. Cit., P. 30.

[4] -David McDowall, Op. Cit., P. 420.

بالی چەکداری پارتەکە بوو، بۆسەر شاری شیرناغ و ئارۆخ و شیروانە لە ویلایەتی سیرت و شارۆچکەی شەمدینلی لە ویلایەتی هەکاری[1]. ئەو هێرشە سەرەتای رووبەڕووبوونەوەیەکی سەربازی دوورودرێژی نێوان حکوومەت و جەنگاوەرانی پەکەکە بوو، ئەمەش گرفتە ناوەخۆیی و دەرەکییەکانی تورکیای وا ئاڵۆز کرد، بەشێوەیەك کە پێشتر نموونەی نەبووە.

پارتی کرێکارانی کوردستان بەمەبەستی سەرنجراکێشانی کورد بۆ لای خۆی دەستیکرد بە بۆسەدانانەوە دژی هێزە ئەمنییەکان، لە تشرینی یەکەمی 1984 سێ ئەندامی یەکەی بەرپرسی پاسەوانەکانی سەرۆك کەنعان ئەڤرینیان لە یۆکسکۆڤا کوشت، دواتر لە بۆسەیەکدا لە هەکاری و چۆکورچا 8 سەربازی تورکیان کوشت، لە بەهاری 1985 دوای ئەوەی جەنگێکی گەورەی لە سویرەك سازکرد و لەنێوان هەردوولا 60 کەسی مەدەنی کوژرا، ئەمە وایکرد لەسەر ئاستی نەتەوەیی خەڵك ئاوڕ لێبدەنەوە. بەهاتنی مانگی ئابی 1985 واتە دوای نزیکەی ساڵێك لە دەستپێکردنی خەباتی چەکداری لە 70 رووداوی چەکداری نزیکەی 200 کوژراوی خستەوە[2].

چالاکییەکانی پارتەکە جەماوەریبوونی پارتەکەی بەرەو سەر برد، بەتایبەتی دوای ئەوەی پارتەکە بەشێوەیەکی بەرفراوان لایەنگیری خەڵکی بەدەستهێنا لە ساڵی 1985 بریاری دامەزراندنی (بەرەی رزگاری نیشتمانی کوردستان–National Liberation Front of Kurdistan)دا[3]، ئەمەش پاڵی بە سەرۆکی تورکی کەنعان ئەیڤەرینەوە نا کە رێوشوێنی دەستبەجێ لە دژی پەکەکە وەربگریت، راستەخۆ دوای چالاکییەکەی ئابی 1984 لە وتارێکی لە شەمدینلی رایگەیاند کە **"ئەو کردەوانە جگە لە پیلانگێڕییەك کە دەسەڵاتی**

[1] - ابراهيم الداقوقي، المصدر السابق، ص 138؛
Michael Gunter, The Kurds and The Future of Turkey..., P. 47.

[2] -David McDowall, Op. Cit., P. 421.

[3] -Michael M. Gunter, The Kurds in Turkey, A Political Dilemma, Westview Press, Boulder, San Francisco, Oxford, 1990, Pp. 75-76 .



**بیانی بەمەبەستی دابەشکردنی تورکیا دادەرێژن، هیچی دیکە نییە، ئەمەش لە رێگەی چەند خیانەتکارێك لەوانەی بۆ دەرەوەی وڵات رایانکردووە، ئەوانە هاوکاری دەسەڵاتی بیانی دەکەن..."**، لە 20ی ئابی 1984 پرۆسەیەکی سەربازی بەناوی (پرۆسەی رۆژ)[1] دەست پێکرد، کە زۆربەی ویلایەتە کوردییەکانی گرتەوە، ئەو چالاکییە سەربازییە سنووری تورکیای لەگەڵ ئێران لە رۆژئاوا و عێراق لە باکوورییەوە بە درێژی 22 کم بڕی، ئەمەش بە رەزامەندی هەردوو حکوومەتەکە[2]. بەگوێرەی ئەو چیرۆکەی حکوومەتی تورکی لەبارەی پرۆسەکە دەیگێڕیتەوە، 54 ئەندامی پارتی ناوبراو کوژراون و 84ی دیکەش بە دادگای سەربازی دیاربەکر دراون و 672ی دیکەش بەتۆمەتی دابینکردنی داڵدە بۆ ئەندامانی پارتی کرێکاران دەستگیرکراون[3].

لە رێوشوێنێکی حکوومەت بۆ رێگەگرتن لە زیاتر کێشکردنی دانیشتوانە لۆکالییەکان بۆ باوەشی پارتی کرێکارانی کوردستان، حکوومەت لە 4ی نیسانی 1985 دوو ماددەی دیکەی بۆ یاسای لادێیەکان زیاد کرد، بۆدابینکردنی

[1] - ابراهيم الداقوقي، المصدر السابق، ص ص 297–298.

[2] - هەردوو حکوومەتی عیراقی و تورکی پرۆتۆکۆلێکیان لە 15ی تشرینی یەکەمی 1984 بەناوی (راوەدوونانی گەرماوگەرم) مۆرکردووە، کە بەهۆیەوە رێگە بە تورکیا دەدرێت بۆماوەی 30 کم راوەدووی ئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستان و باقی رێکخستنە کوردییەکانی تورکیا بکات. بەهۆی ئەم بپۆتۆکۆلەوە حکوومەتی تورکی 3 چالاکی سەرەکی لەماوەی هەشتاکانی سەدەی بیستەم ئەنجامدا، کە لە هەموویان ئاگاداری بەغدا کراوەتەوە بەر لە جێبەجێکردنیان. عێراق ئەو پرۆتۆکۆلەی هەڵوەشاندەوە بەهۆی ئەوەی تورکیا رازی بوو کورد لە ئەیلولی 1988 پەنای بۆ بەریت، بەڵام تورکیا درێژەی بە رێککەوتنەکەدا و لە داگیرکاری کوردستانی عێراق لە ماوەی نەوەدەکان هەرپشتی بەو رێککەوتنە بەست. سەیری:
Robert Olson, The Kurdish Question and Turkish-Iranian Relations..., P. 3;
کرستيان مور، "الاكراد يبحثون عن استراتيجية جديدة، لوموند ديبلوماتيك، تشرين الاول 1988، في: ارشيف دار البعث (قسم التوثيق والمعلومات)، "المسألة الكُردية"، الرمز (97/1/9)، ص ص 2–5؛ جلال عبد الله معوض، صناعة القرار في تركيا والعلاقات العربية–التركية، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، 1998، ص 43.

[3] - ابراهيم الداقوقي، المصدر السابق، ص 144.

مەرجی پێویست بۆ بەکرێگرتنیان کە ناوی (پاسەوانانی لادێ–چەتەکانی لادێ–Koy Koruculari)[1]. بەگوێرەی یاسا نوێیەکە، داوا لە سەرۆك عەشیرەتە کوردییەکان کرا، کە میلیشیا لە پیاوانی خۆیان پێکبهێنن، حکوومەت موچەیەکی مانگانەی باش و چەکیان پێ دەدات، لەبەرامبەردا ئەوانیش راوەدووی ئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستان بنێن و سنووریك بۆ لایەنگری و جەماوەرێتی ئەو پارتە لە ناوچە کوردییەکان دابنێن. ئەو پرۆژەیە زۆر بە بەرنامە لادێیەکەی ڤیتنام دەچوو، کە ئەمریکییەکان لەماوەی جەنگی ڤیتنام جێبەجێیان کرد[2]. زۆربەی سەرۆك عەشیرەتە کوردییەکانی گوندەکان لە پێکهاتەی پاسەوانانی لادێ ئالا، **"بەتایبەتی ئەگەر ئەو مووچەیەی کە مانگانە بە پاساوانانی لادێ دەدرا بە فەرمی نزیکەی 230 دۆلار بوو، لە ناوچە هەژارەکان، کە تووشی بێکاری ببوون، کە داهاتی سالانەی تاك نزیکەی 400 دۆلار دەبوو"**[3]. بۆ زانین ئەم برە پارەیە یەکسان بوو، بە مووچەی دەرچوویەکی زانکۆ تورکییەکان[4]. زۆربەی جار خەڵکی لە نێوان **"پەیوەندیکردن بەو پێکهاتانە و بەجێهێشتنی وڵات ئازاد کرابوو"**[5].

شانبەشانی هەڵمەتە سەربازییەکە بۆ سەرکوردستان، پرۆسەکانی تواندنەوە و تێکشکاندنی ناسنامەی کلتووری و نەتەوەیی کورد چڕکرایەوە، دووبارە

(1) -Ismet Imset, Op. Cit., P. 107.

(2) -Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds, The Bulletin of the Atomic Scientists", March-April, 1999, P. 29 .

(3) -David McDowall, Op. Cit., P. 422.

رۆژنامەی لۆمۆندی فەڕەنسی لە ژمارەی 30ی تەمووزی 1992 باسی لەوە کردووە کە هەر یەکێك لە پاسەوانی لادێ لە سەرەتای نەوەدەکانەوە مووچەیەکی وەردەگرت یەکسان بوو بە هەزار فرەنکی فەڕەنسی (نزیکەی 100 جونەیهی ئیسترلینی)، ئەمەش دووهیندەی مووچەیە لە تورکیا. سەیری: حمید بوز ارسلان، "العصبية والسياسة الكُردية من منظور اجتماعي–تاريخي"، في: فالح عبد الجبار وهشام داود (تحرير)، الاثنية والدولة: الاكراد في العراق وايران وتركيا، ترجمة، عبد الاله النعيمي، معهد الدراسات الاستراتيجية، بغداد–بيروت، 2006، ص 228.

(4) - ابراهيم الداقوقي، المصدر السابق، ص 305.

(5) -Kevin McKiernan, Kevin McKiernan, "Turkey's War…", P. 31.



ناولێنانەوەی شوێنەکان لە گوندەکان، لەکۆی 3524 گوند 2824 گوندەکانی ئەدیامان و غازی عەنتاب و ئورفە و ماردین و دیاربەکری گرتەوە، بینرا ئەوانەی کە ناوی کوردی لە منداڵەکانیان دەنێن، لەگەڵ دەوڵەت رووبەڕووی گرفت دەبنەوە، لە دەقی یاسای 1587 هاتووە کە **"هەر ناوێك کە لەگەڵ ئەخلاق و دابونەریت و کلتووری نەتەوەیی و بە شەرمەزاری بۆ کۆمار لەقەڵەم بدرێت، ناکرێت بەشێوەیەکی یاسایی لە بەڵگەنامەکانی دایکبوون تۆمار بکرێت"**[1]. لە راستیدا هیچ کوردێك نەیدەتوانی خێرایی تەوژمی رێوشوێنەکانی دەوڵەت بۆ سرینەوەی ناسنامەی کوردی پشتگوێ بخات.

حکوومەتەکەی ئۆزال هەر باری لەناکاوی لە شەش ویلایەتە کوردییەکە (هەکاری، ماردین، دیاربەکر، بەتلیس، موش، سیرت) لە ساڵی 1986[2] نوێ نەکردەوە، بەڵکو لە تەمووزی 1987 بڕیاریدا پۆستێکی نوێی بەناوی **"حاکمی پایە بەرز"** دابهێنێت[3]، کە حاکمی ویلایەتە کوردییەکان دەکات، ئەو حاکمە هەموو دەسەڵاتێکی پێ دەبەخشرێت، تا رادەی **"راگرتنی هەموو پرۆژە یاسایەکی مافەکان و ئازادییە مەدەنییەکان"** و مەڵبەندی ئەو حاکمە شاری دیاربەکر بوو[4]، کاتێ ئەو رێوشوێنانە چووە باری جێبەجێکردنەوە، حاڵەتەکانی ئازاردانی جەستەیی گەیشتە لوتکە، حاڵەتەکانی دەستگیرکردن ببووە کارێکی ئاسایی، لێدانیش دیمەنێکی رۆژانەی رۆتینی بوو بۆ دانیشتوانی گوندەکان، بۆئەوەی ناچار بکرێن دان بەوە بنێن کە یارمەتی پارتی کرێکارانی کوردستانیان داوە[5].

(1) -David McDowall, Op. Cit., P. 425.

(2) -Omer Taspinar, Op. Cit., P. 100 ; 304 ابراهيم الداقوقي، المصدر السابق، ص

(3) - گولستان گورباي، المصدر السابق، ص 50.

(4) -Michael Gunter, The Kurdish in Turkey: Apolitical Dilemma, P.83.

(5) - ياوز ارقال، كيف حاربنا ضد الشعب الكُردي: مذكرات جندي في الجيش التركي، ترجمة، شوكت اقصو، مراجعة، نبال زيتونة، بيروت، 1992، ص ص 61–63. ولە سەر زاری یەکێك لە جوتیارەکان"من ئامادە بووم دانپێدان بە کوشتنی سەد کەس بکەم، لە بەر ئەوەی کە ژن و خوشکم هێنا و روتیا کرد لە جلەکانیان و هەرەشەیان لە من کرد کە دەستدرێژی لە گەل دەکەن لە پێش چاوی من". سەیر کە: David McDowall, Op. Cit., P. 425

یەکێ لە ترسناکترین لایەنەکانی سیاسەتی حکوومەتی تورکی بەرامبەر بە پرسی کورد و دانیشتوانی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات، پلانی "**چۆڵکردنی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ بوو لە دانیشتوانەکەی**"، ئەمەش بە چۆڵکردنی بەرەبەرەیی بۆ کۆمەڵگا نیشتەجێیە بچووکەکان و دامەزراندنی ئەوەی پێی دەگوترا "**گوندی ستراتیژی**"، ئەو گوندانە بریتی بوون لە ناوچەی داخراوی سەربازی، کە لە شوێنی ستراتیژی گرنگ بە ئامانجی بڕینی پاڵپشتی لۆجستی لە پارتی کرێکاران و هێشتنەوەی دانیشتوانە کوردەکەی لەژێر دەست و چاوی دەوڵەت و سوپادا دامەزرینرابوون[1]، پلانی چۆڵکردنی بەرەبەرەیی ناوچەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆل، بەشێوەیەك دەبێت کە تەنها دوو یان سێ ملیۆنی تێدا دەمێنێتەوە[2]. دۆغان گۆرەشی سەرۆك ئەرکانی تورکی پلانەکەی بە "**وشککردنی دەریا و دواتر گرتنی ماسی**" چواند[3]، ئامانجی کۆتایی حکوومەت دامەزراندنی ڕێڕەوێکی ئارام بوو، بە پانی 15 تا 40 کم بە درێژایی سنوورەکانی لەگەڵ تورکیا و سووریا ئێران. پلانەکە بەشێوەیەکی بنەرەتی لە ناوچەی بۆتان جێبەجێکرا[4].

شانبەشانی هەموو ئەو ڕێوشوێن و پلانانەی حکوومەت بۆ سەرکوتکردنی چالاکییەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان، ئەوا چالاکییە سەربازییەکانی تورکیا لە زستانی 1988 گەیشتە لوتکە، سەرکردەی سەربازی ناوچەکە ئەحکامی عورفی لەهەمان ساڵ ب بەڵێنی دا "**بزووتنەوەی پارتی کرێکاران لەماوەی 84 رۆژدا بکوژێنتەوە**"، لەم پرۆسەیەدا هەمەجۆر پۆلی سوپای تورکی و سەربازی پاسەوانانی لادێ ئەوانەی وەك ئامێری سوپا بەشدارییان کرد، هەروەها ژەندرمە و هەوالگرییش بەشدارییان کرد، تەکنەلۆژیا و فڕۆکە

(1) - گولستان گورباي، المصدر السابق، ص 51.

(2) - محمد نور الدين، تركيا في الزمن...، ص 96.

(3) - جوناثان راندل، أمة في شقاق: دروب كُردستان كما سلكتها، ترجمة فادي حمو، دار النهار، بيروت، 1997، ص 331.

(4) - گولستان گورباي، المصدر السابق، ص 51.



بەشێوەیەکی بەرفراوان لە چالاکییە جەنگییەکان دژ بە پارتی کرێکارانی کوردستان بەکارهات[1].

لەلایەکی دیکەوە پارتی کرێکارانی کوردستان، لە ڕێگادا بوو پاڵپشتی و سەرکەوتن و ریکخستنی زیاتر بەدەست بهێنێ، لە کۆنگرەی پارتەکە کە لە 25 تا 30ی تشرینی یەکەمی ساڵی 1986 بەسترا، ساڵی 1986 بە "**ساڵی پێشکەوتنی گەورە**" وەسفکرد[2]. ئۆجەلان رایگەیاند کە ئەو بەوەی حیزب تا ئیستا بەدەستی هیناوە دڵخۆشە. بۆیە پەنای بۆ ئەو هەنگاوانە برد کە ئامانجیەتی بەرەی رزگاری نیشیتمانی کوردستانی بەهێز بکات، کاتێ دامەزراندنی (سوپای رزگاری گەلی کوردستان- People Liberation Army of Kurdistan) ی راگەیاند، بۆئەوەی جێگەی تیمەکانی ئازادی کوردستان بگرێتەوە[3].

ئەوە روون بوو کە سیاسەتەکانی تورکیا ئەنجامی پێچەوانەی دا بەدەستەوە، بۆ بەرژەوەندی بەرزبوونەوەی هۆشیاری نەتەوەیی کوردی بەگشتی و بەرزبوونەوەی جەماوەرێتی پارتی کرێکارانی کوردستان بەتایبەتی، سەبارەت بە پێکهاتەکانی پاسەوانانی لادێ کە حکوومەت زۆر هیوای پێیان بوو، بووە کۆسپێکی دیکەی و ئەرکەکانی حکوومەتی تورکی ئاڵۆز کرد. تاکەکانی پاسەوانانی لادێ بوونە هۆی پەیداکردنی بازنەیەکی دیکەی توندوتیژی، چونکە ئەوان نەوەك هەر شەڕی پارتی کرێکارانی کوردستانیان نەکرد، بەڵکو دوای ئەوەی کە پارتی کرێکاران رایگەیاند کە ئەوانە "**دوژمنی گەلن**" و خۆیان و خانەوادەکانیان دەبنە ئامانجی لەناوبردن و کوشتن[4]، ململانێی هۆزایەتی و دوژمنداری نێوان خانەوادەکان دەورژێنن. هەروەها زۆری

(1) - ابراهيم الداقوقي، المصدر السابق، ص 306.

(2) -Ismet Imset, Op. Cit., P. 45.

(3) -Michael Gunter, The Kurds in Turkey…, P. 76.

(4) - گولستان گورباي،المصدر السابق، ص 51.

پێنەچوو ئەو پێکهاتەیە زۆر تووشی خاڵی لاواز و گرفت هات[1]، سەرباری گەندەڵی و دزی و بەرتیل کە تووشی ئەو پێکهاتەیە هاتبوو، ئاغاکان پۆستەکانیان بۆ دەرپەڕاندنی رکابەرەکانیان بەکاردێنیّ، هەتاکو لە دژی کەمینەکان لە ئاشوورییەکان و ئێزیدییەکانیش بەکاریان دەهێنا، بە ئامانجی دەستگرتن بەسەر زەوییەکانیان، زۆربەی سەرۆك عەشیرەتەکان هەتاکو ئەگەر بە تاوانی کوشتنیش تۆمەتبار بن و لە سزا هەڵاتبوون، ئەوانە بەمەرجی چوونە پاڵ پاسەوانانی لادیّ، لەم سزایە بەخشران[2].

ئەو رێکخستنە بووە ئامانجێکی ئاسانی هێرشە لەناکاوەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان، دەرەنجام دەبوو هێزەکانی ئاسایشی تورکی بەخۆی پاراستنی پاسەوانانی لادی دابین بکات، لە ساڵی 1987 وا پێدەچوو، پارتی کرێکارانی کوردستان ئەو پاسەوانانە لەناوبەریت، ژمارەی خۆبەخشەکان بۆ رێزی ئەو پێکهاتەیە، لە 20 هەزارەوە بۆ 6 هەزار دابەزی، بە هاتنی مانگی ئەیلولی 1989 پارتی کرێکاران 13 عەشیرەتی کوردی تێوەگلاّو لەو رێکخستنەی پۆلێن کردبوو، کە دەبوو هێرشیان بکرێتە سەر[3].

ترسناکترین دەرەنجام و کاریگەرییەکانی دامەزراندنی ئەو گرووپەکانی پاسەوانانی لادیّ، ببووە سەرچاوەیەکی نان پەیداکردن، هەڵوەشاندنەوەی کاریگەری کۆمەڵایەتی لێدەکەوتەوە، بۆیە ئەو باوەڕەی هێنا ئاراوە کە تاکەکانی پاسەوانانی لادیّ هەندێجار بۆ بەردەوامی بوونی کارەکەیان **"بزاوتی تیروریستیان"** ئاسان دەکرد. دائیرە جیاجیاکانی دەوڵەت هەستیان بەوە کرد کە پرسەکە بۆ زەرورەتێکی ئابووری — کۆمەڵایەتی گۆڕاوە، ئەو مووچەیەی کە

---

[1] - ژمارەی ( پاسەوانانی لادیّ) لەسەرەتای ساڵی 1999 گەیشتە نزیکەی 70 هەزار کەس، مووچەی ساڵانەیان لەسەر بودجەی دەوڵەت گەیشتە نزیکەی ملیارێك و دووسەد ملیۆن دۆلار . سەیری : گـولستان گـورباي، المصدر السابق، ص 51؛ محمد نور الدين، تركيا في الزمن...، ص 96. و سەرچاوەیەکی تر ژمارەیان مەزەندەکرد کە 100.000 Hamit Bozarslan, Op. Cit., P. 24

[2] -David McDowall, Op. Cit., P. 422.

[3] -David McDowall, Op. Cit., P. 423.



پێیان دەدرێت بەشداری لە بوژاندنەوەی ئابووری لۆکاڵی ناوچەکە دەکات، ئەمەش پاڵی بە ئەونال ئەرکانی سەرکردەی ناوچەی ئەحکامی عورفییەوە نا بڵێت **"پێویستە ئەو رژێمە [پاسەوانانی لادیّ] بە کۆتایی هاتنی تیرۆر هەڵنەوەشێنرێتەوە، پێویستە ئەمە کاتی نەبێت، بەڵکو بەردەوام بێت"**[1].

دانیشتوانی بێتان لە پلان و رێوشوێنەکانی حکوومەت لە **"پرۆسەکانی کۆچپێکردن و چۆڵکردنی ناوچەی رۆژهەڵاتی ولاّت"**، زیانمەندی گەورە بوون. شانبەشانی پرۆسەکانی چۆڵکردن و راگواستنی بە زۆرەملیّ، گوند و شارۆچکە کوردییەکانیش بۆردوومان دەکرا[2]. لەپاڵ ئەمەدا پرۆسەکانی رووخاندن و ویرانکردنی میراتی کلتووری و مرۆیی و شارستانی ناوچەکە، سیمبولّ و پەیکەر و رووخساری مێژوویی کە ئاماژەی بە ناسنامە و سەروەری و پیاوانی کورد دەکرد لابران و قەلاّ مێژووییەکانی کورد ببووە، ئامانجی بەرنامە بۆ دارێژراوی لابردن. بورجا (بەلەك)ی بەناوبانگ کە میر بەدرخان پاشای میری بۆتان (1821–1847) لەسەر رووباری دیجلە لە نیوەی یەکەمی سەدەی 19 دروستی کردبوو، بە زەوییەوە تەختکرا، هەروەها کەنیسە مێژووییەکانی ئەرمەنیش لە ناوچە کوردییەکان لادران[3]. تا کۆتایی ساڵی 1989 ژمارەی ئەو گوندانەی دانیشتوانەکەی راگوێزران، گەیشتە 400 گوند[4]. لەسەرەتای ساڵی 1989 راپۆرتە رۆژنامەوانییەکانی تورکیا ئاماژەیان بۆ دڕندەیی سوپا و دۆزینەوەی گۆڕی بە کۆمەڵ لە سیرەت کرد، کە وا باوەڕ دەکرێت کەسانی بیّ سەروشوێنی تێدا نێژرا بێت[5].

شانبەشانی ئەو رێوشوێنانە، پرۆسەکانی خاپوورکردنی سروشت بە سووتاندنی دانەوێڵەی کشتوکاڵی و دارستان و لەوەڕگا لە رووبەری 10 ملیۆن

---

[1] - محمد نور الدين، تركيا في الزمن...، ص 96؛ هاينتس گـرامر، المصدر السابق، ص 100.

[2] - گولستان گورباي، المصدر السابق، ص 51.

[3] - جيرارد جالديان، المأساة الكُردية، ترجمة عبد السلام النقشبندي، دار آراس للطباعة والنشر، اربيل، 2007، ص 81.

[4] - گولستان گورباي، المصدر السابق، ص 55.

[5] -David McDowall, Op. Cit., 426.

هەکتار لە باشووری رۆژهەڵاتی وڵات دەستی پێکرد، زیاتر لە یەك ملیۆن کورد ناچارکران گوندەکانیان چۆڵ بکەن[1]. هەروەها راپۆرتەکان ژەهراویکردنی ئاوی بیرەکان و سەرچاوە ئاوییەکانی گوند و شارۆچکەکانی هەرێمی ناوچەی ئەحکامی عورفی لەلایەن سوپاوە بڵاوکردەوە، مردن بەهۆی ژهراوییبوون لە نێوان دانیشتوانی ئەو گوندانە و مرداربوونی ژمارەیەك ئاژەڵ تۆمارکرا.

بەگوێرەی لێدوانی رۆماننووسی گەورە یەشار کەمال Yesar Kemal[2]، هەرچەندە حکوومەت لە پلانی **"وشککردنی دەریا"** بەردەوام بوو، بەڵام لە **"راوکردنی ماسی سەرکەوتوو نەبوو"**، هەروەها سەرکۆنەی **"دەسەڵاتدارانی تورکی لەمەڕ سووتاندنی گوندە ئارامەکان و جاڕدانی جەنگ لە دژی گەلی کوردی بێ چەك"**[3].

هەرچی چالاکی هەڵمەتە پاکسازییە بەردەوامەکانی هێزەکانی تورکی بوو، دژ بە ئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستان، بەگوێرەی دەربڕینی پارتی گەلی دیموکراتی کۆمەڵایەتی Sosyal Demokrat Halkci Partisi لە ساڵی 1986، خەریکبوو کوردستان بکات بە "**سەربازگەی دەستگیر کردن، چونکە هەڵسوکەوت لەگەڵ هەموو هاووڵاتییەك وەك تاوانبار دەکرا، هەروەها**

(1) -Joost Jongerden, Jacob van Etten, Hugo de Vos, "Forest burning as a counter-insurgency strategy in Eastern Turkey", Paper presented at the Kurdish Studies Conference, organized by the Kurdish Institute of Paris and Salahaddin University, Arbil, Iraqi Kurdistan, 6 to 9 September, 2006, Pp. 5-6؛
گولستان گوربای، المصدر السابق، ص 55.

(2) - یەشار کەمال، رۆماننووسێکی دیاری تورکیایە، لە بنەچەوە کوردە، لە ساڵی 1923 دایکبوون، زیاتر لە 35 شاکاری ئەدەبی هەیە، کە باس لە کۆمەڵگەی کوردی و حاڵەتی پشتگوێخستن کە بەهۆی سیاسەتی حکوومەتەکانی تورکیا تووشی هاتوون. زیاتر لە 30 کاری ئەدەبی لە زمانی بیانی وەرگێڕاوە و زۆریك خەڵاتی ئەدەبی جیهانی بەدەستهێناوە، زیاتر لە جارێك بۆ خەڵاتی نۆبل پاڵێوراوە، هەتاکو بە (پاڵێوراوی شاراوەی خەڵاتی نۆبل) وەسفکراوە. لە ساڵی 1955 رووبەڕووی راوەدونان و بەندیخانە لەلایەن دەسەڵاتدارانی تورکی بۆتەوە، بە گوێرەی برگەی سێی یاسای بەرەنگاری تیرۆر تۆمەتی جوداخوازی و هەرەشە دروستکردن بۆ سەر یەکێتی نەتەوەی خراوەتە پاڵ. سەیری : Michael M. Gunter, Historical Dictionary…, P. 96.

(3) - جوناثان راندل، المصدر السابق، ص 331.



**چەوساندنەوە و سوکایەتی پێکردن و ئازاردان ببووە یاسا"**. کەسانێکی زۆر کەم لەم هەڵمەتانەی پاکسازی رزگاریان بووە، کە زۆربەی جار هەڵمەتی دەستگیرکردنی رەمەکیشی لەگەڵدا دەبوو، ئەو هەڵمەتانە فاکتەری گرنگ و بەهێز بوون بۆ چالاکی پارتی کرێکارانی کوردستان بۆ سەربازگیری نوێ[1]. سەرچاوە نافەرمییەکان ئاماژەیان بۆ ئاگر لەخۆ بەردانی بەندییەکان کردووە، بۆئەوەی لە ئازار رزگاریان بێت. بەم شێوەیە هەموو گوند و شارۆچکەیەکی کوردی ئەوەی دەوڵەت بەیاسا و رژێم دیاریکرد، زانی. ئەندامێکی کورد لە ئەنجوومەنی نیشتمانی تورکی لەبارەی رەوشی ساڵی 1987 لێدوانێکی دا و گوتی: **"کاتێ عەسکەر لە ساڵی 1980 دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، گوردان دلخۆش بوو، بەڵام ئەوکاتەی عەسکەر لە تیرۆریستی خراپتری لێدێت، وایلێهات نزیکەی 40٪ی گوندییەکان لە ناوچە سنوورییەکان پاڵپشتی لە تیرۆریستان دەکەن"**[2].

هەرچی دەرەنجامی هەڵمەتەکانی سوپای تورکی بوو لە دژی ئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە زستانی 1988، چارەنووسەکەی دۆڕانێکی گەورە بوو، شەڕەکان بۆ ماوەی زیاتر لە شەش مانگ بەردەوام بوو بێ ئەوەی ئەنجامێکی وای هەبێت، بەڵکو 69 سەربازی لەدەستدا. نموونە بۆ سەرنەکەوتنی هەڵمەتەکە، ئەوە بوو سەرکردەی ناوچەی ئەحکامی عورفی ژەنەراڵ ئیسماعیل سەلەن Ismail Selen لە پۆستەکەی لابرا و ژەنەراڵ حیکمەت کۆکاڵ Hikmet Kokal لە شوێنی ئەو دانرا، خەیری قۆزاقچی ئۆغلو Hayri Kozaqci Oglu پارێزگاری ناوچەی ئەحکامی عورفی رایگەیاند و گوتی: **"ئێمە هێشتا زاڵ نین بەسەر ناوچەی بۆتان، کە پارتی کرێکارانی کوردستان وەك ناوچەیەکی رزگارکراوی کوردی رایگەیاندووە"**[3].

شێوازی هەڵسوکەوتی دائیرە و دامەزراوە دەسەڵاتدارەکانی تورکیا لەگەڵ پرسی کورد، دەربڕی دژایەتی ترسناك بوون، پرسی کورد بە ئاڵۆزییە

(1) -Martin Van Bruinessen, "Between Guerrilla War and Political Murder: The Worker's Party of Kurdistan", Middle East Report, No. 153, July-Aug, 1988, P.46.

(2) -David McDowall, Op. Cit., P. 426.

(3) - ابراهیم الداقوقي، المصدر السابق، ص 306.

مێژووییەکەیەوە بە **"توندوتیژی تۆقاندنی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە، تێکەڵکرا"**، هیچ جیاوازییەك لە نێوان ئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستان و دانیشتوانی مەدەنی بێ چەکی باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵات نەکرا، ئەو دامەزراوانە هیچ هەوڵێکیان بۆ **"لە ریشەوە دەرهێنانیان لە نیشتمان و گوند و شارۆچەکەکەیان"** نەدا[1].

لەلایەکی دیکەوە و لەهەمان کاتدا کە پارتی کرێکارانی کوردستان بوونی خۆی لەسەر حیسابی باقی پارت و ڕێکخستنە کوردییەکانی دیکە سەلماند، بەرەبەرە لە دژە توندوتیژیەوە گلا، بۆ هەڵەکردن بە شێوەیەکی زیاد پەلکێشکراو پێشێلکارییەکی ترسناکی دەرهەق بە مەدەنییەکانی خانەوادەی ئەوانەی لەگەڵ حکوومەت هاوکاربوون، ئەنجام دا، ئەو پێشێلکارییانە کەسانی کارگێڕیشی لە کارمەندانی مەدەنی گرتەوە. لە کۆنگرەی سێیەمی پارتەکە (25–30ی تشرینی یەکەمی 1986)، بریاردرا چالاکی سیاسی لە شارەکان چڕبکرێتەوە بۆئەوەی چالاکییە چەکدارییەکان لە ناوچە شارییەکان فراوان بکرێت. بە دامەزراندنی سوپای ڕزگاری گەلی کوردستان، خولی توندوتیژی توندتر بوو و بە ئامرازی هەمەجۆریش بەردەوام بوو، کە خۆی لە هێرشکردنە سەر دامەزراوە حکوومیەکان و مەڵبەندەکانی گەشتوگوزار و ڕفاندنی گەشتیاران و بردنی هاووڵاتی مەدەنی وەك بارمتە و تیرۆرکردنی مامۆستایان و پاسەوانانی لادێ و هەرەشەکردنی بەرژەوەندییەکانی تورکیا و هێرشکردنە سەری لە ئەورووپای ڕۆژئاوا[2]، دەبینییەوە.

لەگەڵ دەستپێکی ساڵی 1987 پارتی کرێکارانی کوردستان ستراتیژییەتێکی نوێی جێبەجێکردن، کە بە جاڕدانی جەنگ بەسەر ڕژێمی پاسەوانانی لادێ، لەماوەی دوو ساڵی دوای یەك، پارتەکە خانوو و خانەوادەکانی پاسەوانانی لادێی خاپوورکرد بە ژن و پیاویەوە، بەبێ ئەوەی

(1) - بیار مصطفی سیف الدین، ترکیا وکُردستان العراق، الجاران الحائران، مؤسسة موکریاني، اربیل، 2008، ص 153.

(2) - گولستان گورباي، المصدر السابق، ص 64.



هەست بە گوناح بکات، لە ماردین سیرەت و هەکاری، پارتی کرێکارانی کوردستان لە کوشتن گەیشتە **"پلەی زیدەڕۆیی"**، زۆربەی کات داخوازییەکانی سەرۆك عەشیرەتەکانی لەمەڕ وازهێنان لە ڕژێمی پاسەوانانی لادێ لەبەرامبەر لێبووردنیان لە کوشتن، پشتگوێ دەخست، بۆ نموونە کوشتنی هەردوو نێردەی تاهیر ئادەمینی سەرۆکی (جێرگییەکان)، کە لە ئەرکی ئەوەدابوون داوای لێبووردن لە پارتی کرێکارانی کوردستان بکەن، لەبەرامبەر دەستکێشانەوەی (جێرگییەکان) لە پاسەوانانی لادێ. ئەو جۆرە کردەوانە پاڵی بەزۆر لە پیاوانی هۆزەکانەوە نا سەرلەنوێ بەرەو ڕژێمی پاسەوانانی لادێ بچن. پارتەکە ئەوەی لەبەرچاو نەگرتبوو کە حکوومەت ئەوانی سەرۆك عەشیرەتەکان لە نێوان چوونە ناو ڕێکخستنی پاسەوانانی لادێ یان چۆلکردنی گوند و شارۆچکەیان سەرپشك کردبوو[1]. دەرەنجامی دووەمی توندوتیژی پارتی کرێکارانی کوردستان لە عێراق، ئەوەبوو پارتی دیموکراتی کوردستان ئەو ڕێککەوتنەی کە لە 10ی ئایاری 1987 لەگەڵی مۆرکردبوو، هەڵوەشاندەوە، بەگوێرەی دەربڕینی مەسعود بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان، **"بەهۆی توندیە لە ڕادەبەدەرەکەی، کە لەلایەن تەواوی گەلی کوردەوە ڕق و نارەزایەتی پەیدا دەکات"**. کۆتایی بە ڕێککەوتنەکە هێنرا[2].

چالاکییە کوشتن و توندوتیژییەکانی نێوان حکوومەت و پارتی کرێکاران دەرەنجامی ترسناکی لێکەوتەوە، لەوانەیە دیاریترینیان پرۆسەی ڕاگواستنی ناوەخۆ بێت کە دەستی گەیشتە نزیکەی 3 ملیۆن کەس، دەگوترێت کە ژمارەی ئەو کوردانەی کە لەدەرەوەی ویلایەتەکانی باشووری ڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵات دەژین لەوانەی کە لە ناوچە کوردییە ڕەسەنەکان نیشتەجێن زیاترە[3]. هەر حکوومەتی تورکی بەشی شێری لە بەرپرسیارێتی بەردەکەویت، بە گوێرەی دەربڕینی عیسمە ئەیمەست Ismet Imset: **"ئەگەر وەك گەلێکی**

(1) - یاوز ارقال، المصدر السابق، ص 83.

(2) -David McDowall, Op. Cit., Pp. 423-424.

(3) - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص 78.

**کۆچەری کە پێویستیان بە لەخۆگرتن و نوێنەرایەتیکردن هەیە، هەڵسوکەوت لەگەڵ کورد نەکرابوایە، ئەوا رەوشەکە جیاوازتر دەبوو"**[1].

بە بوونی فاکتەر و گۆڕانکاری ناوەخۆ و دەرەکی جیاواز، ئەوا **"بەشێکی گەورە لە ئەودەستکردنی پرسی کورد لە تورکیا دەرەنجامی راستەوخۆی هەڵوێستی سەرکوتکەرانەی ئەنقەرە بووە. زۆربەی ئەوانەی هەوڵدەدەن سەرنجی خەڵکی ئەورووپی بۆ پرسی کورد رابکێشن، بەڵام ناتوانن لەم هەوڵەیان سەرکەوتووبن، چونکە دەسەڵاتی تورکی ناچارکردوون لە وڵاتدا رابکەن، لە ترسی راوەدوونان و چەوساندنەوە، بەتۆمەتی بانگەشەکردن بۆ بیری جوداخوازی"**[2].

---

[1] -Ismet G. Imset, Op. Cit., P. 1.

[2] - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص 97.

## **بابەتی سێیەم: پەرەسەندنەکانی پرسی کورد لە تورکیا** 1991-1999

بە کۆتایی هاتنی ساڵانی هەشتاکان وەرچەرخانێکی گرنگ لە مێژووی پرسی کورد لە تورکیا هاتە ئاراوە، کە خۆی لە زیاد گرنگی دانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بە پرسی کورد بەگشتی دەنوێنێ. دەرەنجامی جەنگی دووەمی کەنداو بە پێچەوانەی خواست و پەرۆشییەکانی ئۆزال هات یەکێ لە فاکتەرە راستەوخۆکانی ئەو گرنگیدانە بوو، چونکە لێکدانەوەکانی پەرەسەندنە خێرا و یەکبەدوای یەکەکانی عێراقی ئاڵۆزکرد. ئەنجامەکانی راپەرینی کوردان لە ئازاری 1991 ترسناك بوو، وایکرد کۆڕەوی کورد بەرەو تورکیا و ئێرانی لێبکەوێتەوە. ژمارەی ئەوانەی بە تورکیا گەیشتن نزیکەی نیو ملیۆن کورد بوو[1]. بوونی ئەو ژمارە زۆرەی پەنابەری کورد لەسەر سنووری باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا، بەمانای تێکەڵاوکردنی دۆ و دۆشاو دێت، بەشێوەیەك کە تورکیای لەبەرامبەر کێشەی پەنابەران دانا کە لە توانای خۆی زیاترە. بۆیە داوای یارمەتی ئەمریکی کرد[2]. ئەمریکا لە هەڵسوکەوت نواندن زۆر دوودڵ

---

(1) -Sami Kohen, "Kurdish Refugees Pose Political As Well as Humanitarian Problem", (Report from Turkey), May/June, 1991, P. 10. Via at: (http://www.wrmea.com/backissues/0591/9105010.htm).

(2) – ئالان پیتزی پەیامنێری ئیستگەی (سی.بی.ئیس–CBS)ی ئەمریکی لە بەرنامەیەکی 21 رۆژی راستەخۆدا لە شوێنی رووداوەکە (لە چیا) دا دەڵێت "منداڵەکان جوانن، پیاوان دڕندە و رەتکەرەوەن، ژنانیان جوان و لەچەك پۆشن". هەروەها پیتزی لەبارەی سەرسامی رۆژئاوا لەبارەی بوونی هەندێ کورد کە چاویان شینە و قژیان زەردە. بەڕای ئەو پەیامنێرە " کورد قوربانی سیاسەتی ئەمریکین، کە داوای لێکردن شۆڕش بەسەر رژێمدا بکەن". بۆ سەلماندنی راستی قسەکەی بڵاوکراوەی ئەو کوردە هەڵاتوانەی بەدیارخست کە فرۆکە ئەمریکییەکان فڕێیان داوە و داوا لە سەربازەکان کراوە کە لە سوپای عێراق رابکەن. بڵاوکردنەوەی چڕی رووداوەکە وەك ئەوەی پیتزی لە شاشەی تەلەفزیۆنەکانی رۆژئاوا بەگشتی و ئەمریکا بەتایبەتی، لە شەرمەزارکردنی سیاسەتمەدارانی رۆژئاوایی زیاد کرد، چونکە کارەساتی کورد دووروویی رۆژئاوای لە مامەڵەکردن لەگەڵ کوردی لە تەواوی مێژووی هاوچەرخیان بۆ رای=



بوو، بەڵام فشارەکانی ئەورووپییەکان بەتایبەتی فەڕەنسییەکان بۆ رازیکردنی ئەمریکا لە بەشداریکردن لە هەولە نێودەوڵەتییەکان، ئەمەش پرۆسەی (دابینکردنی ئارامی) و دامەزراندنی "**پەناگەی ئارامی بۆ کوردان**" لە باکووری عێراق، باکووری هێلی پانی 36 بەرجەستە کرد[1]. بۆ یەکەمجار لە ماوەی نزیکەی 10 دەیەوە (واتە لە پەیمانی سیڤەرەوە 1920)، ناوی کورد بەدیاریکراوی لە دیکۆمێنتەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان هات، کە لە بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی ژمارە 688 لە 5ی نیسانی 1991 دەرچوو[2]. ئەو رەوشە نوێیەی کە لە باکووری عێراق هاتە کایەوە، هەوینی قەوارەیەکی سیاسی کوردی کە خودان ئۆتۆنۆمییەکی فراوان بێت، لێکەوتەوە. ئەو پەرەسەندنانە، لەوەتەی "**پەناگەی ئارام**"ی کوردان راگەیەنراوە، مەودایەکی نێودەوڵەتی بە پرسی کورد بەخشی، لەهەمان کاتدا راستییەکی دیکەی هێنایە پێش کە لەمەودوا کەس ناتوانێت رێگە لە جەنگاوەرانی پارتی کرێکارانی کوردستان بگرێت، کە پەنا بۆ ناوچە سنورییەکانی عێراقی–تورکی نەبەن[3].

لێرەدا ناتوانرێت، رۆڵی رووخانی یەکێتی سۆڤیەت لە 1991 و کۆتایی شەڕی سارد و ژمارەیەك لە وڵاتانی لەژێر چەپۆکی یەکێتی سۆڤیەت

---

=گشتی بەدەرخست. هەتاکو هەندێ لەو دیپلۆماسییە رۆژئاواییەکان بە "گرێی تاوانی مێژوویی" ناویان هێناوە، کە بەرامبەر بەکورد کراوە، بەهۆی رێزنەگرتنی بەریتانیا و هاوپەیمانەکانی بۆ ئەو بەلێنانەی لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی لە کۆتایی یەکەم جەنگی جیهانی دابوویان. هەتاکو پابەندی ئەو بەلێنی دابینکردنی ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی عیراقیش نەبوون کە بەریتانیا دابووی، دوای ساڵانێکی دوور و درێژ لە پشتگوێخستن و دوور لە راگەیاندن، ئەوا ئەو رووماڵە جیهانییە راگەیاندکارییە، دووبارە ناوبانگی پێدانەوە و بوونە سەردێری رۆژنامە و گۆڤار و تەلەفزیۆن و رادیۆکانی رۆژئاوا. سەیری : جوناثان راندل، المصدر السابق، ص 84.

(1) - هنري باركي وغراهام فولر، المصدر السابق، ص 111.

(2) -Michael A. Schiesl, Op. Cit., P. 3.

(3) -Kemal Kirisci, "Turkey and The Kurdish Safe-Haven in Northern Iraq", Journal of South Asian and Middle Eastern Studies, Vol. XIX, No. 3, Spring, 1996, P. 30-36; M. Huseyin Buzoglu, Korfez Savasi ve PKK, Strateji Yayinlari, Inkara, 1995, Ss 118-119;.92هاينتس كرامر، المصدر السابق، ص

سەربەخۆییان دەستکەوت، هەندێکی دیکەش بەهیوای دەستکەوتنی سەربەخۆیی تەواوە[1]. هەوەرها رووداوی نێودەوڵەتی دیکەش کاری لە پرسی کورد کرد بەگشتی، بۆنموونە پرۆسەی ئاشتی نێوان عەرەب ئیسرائیل کە دوای دووەم جەنگی کەنداو[2] دەستی پێکرد، بۆ کوردی دەرخست کە خەباتی سیاسی دەستکەوتی دەبێت و هیوای بە کورد بەخشی[3].

هەموو ئەو پەرەسەندنانە، وایکرد گرووپ و کەمینە نەتەوەیی یا زمانی یا ئایینییەکان، لە نێوانیانیش کورد، ببێتە پرسێکی گرنگی یاسای نێودەوڵەتی. رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانیش گرنگییەکی تایبەتیان پێدان، بۆنموونە دەکرێت ئاماژە بە دەرکردنی جاڕنامەیەك لە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لە ساڵی 1992 لەبارەی مافەکانی ئەو کەسانەی کە سەربەو گرووپ و کەمینانە، دەریکردووە، بکرێت. لە ئەورووپاش کۆمیسیۆنی باڵای کەمینە نەتەوەییەکان دامەزرا، هەورەها ئەنجوومەنی ئەورووپا لە ساڵی 1992 میساقی ئەورووپی تایبەت بە زمانی کەمینە و هەرێمەکان تەبەنی کرد[4].

ئەو فاکتەرانە رەنگدانەوەی لە سەر پەرەسەندنە ناوخۆییەکانی تورکیا هەبوو، بەشداری لە گەورەکردنی رووبەڕووبوونەوەی کورد کرد، کە خۆی لە پارتی کرێکارانی کوردستان دەبینییەوە. هەڵمەتەکە لە باشووری رۆژهەڵاتی وڵات لە دژی جەنگاوەرانی پارتەکە بۆ "**جەنگێکی ئاست نزم**" گۆڕا. تواناکانی حیزب لە رووی رێکخستن و جۆری چالاکییەکانی شانبەشانی پەیوەندییەکانی

(1) - بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی سەرخۆبوونی دەوڵەتەکانی ئێکەتی سوڤییتی جاران سەیری،
Hooman Peimani, Op. Cit., 1998, Pp. 3-19
سیار کوکب علي الجمیل، المصدر السابق، ص ص 24–31.

(2) - بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی پروسەی ئاشتی عەرەبی–ئیسرائیلی سەیری،
Robert O. Freedman (ed), The Middle East and the Peace Process, The Impact of the Oslo, Baltimore Hebrew University, Board of Regents of the State of Florida, Florida, 1998.

(3) - گولستان گوربای، المصدر السابق، ص 61.

(4) -Michael Gunter, "The Kurdish Question and International Law", in, Ferhad Ibrahim and Gulistan Gurbay, Op. Cit., Pp. 38-39.



بە لایەنی نێودەوڵەتی و هەرێمایەتی گەشەی کرد، وەك رووسیا و وڵاتانی یەکێتی ئەورووپی و یۆنان و ئەرمینیا و سووریا. دەستەی ئەرکانی تورکی، سەرکردایەتی چالاکییەکانی لە دژی پارتی کرێکارانی کوردستان گرتە ئەستۆ، بەرەبەرە هێزەکانی سوپای نیزامی شوێنی هێزەکانی دەرەکی گرتەوە. نزیکەی چارەکێك یان زیاتر لە هێزەکانی تورکی لە هەوڵی تێکشکاندنی پارتی کرێکارانی کوردستان و ئەوانەی هاوسۆزن لەگەڵی بەشداربوو، بۆردومانی ئاسمانی بۆ سەر ئەوەی بە پێگەی پارتەکە ناسرابوو، هەلیکۆپتەری هێرشبەر بە شێوەیەکی زیاد بەکارهێنرا، ئەمانە ببوونە شتێکی بوا و رۆتین[1].

ئەو گۆڕانکارییانە جگە لە ئاماژەیەك بۆ ئەوەی کە پارتی کرێکارانی کوردستان بۆتە دیاردەیەکی جەماوەری، کە بە چەند رووخسارێکی دیاریکراو خۆی دەردەبڕێ، زۆربەی کات ئەو خۆدەربڕینانەشی ئاشکرا نییە. دوای ئەمە کەس نەیدەتوانی ئەو گۆڕانە جۆرییەی کە لە کوردستانی تورکیا هاتبووە پێش پشتگوێبخات. لە مانگی ئازاری 1990 خانەوادەی پارتی کرێکارانی کوردستان بۆ یەکەمجار زاتی ئەوەی کرد تەرمی خزمانیان لە حکوومەت وەربگرنەوە، زۆری پێنەچوو وەرگرتنەوەی تەرمەکان بۆ نارەزایەتی جەماوەری گۆڕا. لە 12ی ئازاری 1990 لە هەرێمی ساور Savur لە پارێزگای ماردین رووبەڕووبوونەوەیەك لە نێوان ئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستان و هێزەکانی تورکی روویدا، لە میانەیدا 40 سەرباز و 13 جەنگاوەری پارتەکە کوژران. لە 14ی تەمووزی 1990، 500 کەس لە ناشتنی تەرمی ئەندامێکی پارتی کرێکارانی کوردستان لە شاری نەسیبەین بەشدارییان کرد، بەڵام یەکە تایبەتەکانی تورکی هێرشیان کردە سەر کەژاوەکە و گەنجێکیان کوشت و دەیانی دیکەشیان بریندار کرد و نزیکەی 700 کەسیان گرت[2]. لە رۆژیی دواییش پیکدادان لەگەڵ ئەندامانی ئەمنی تورکی روویدا و بە دەستگیرکردنی

(1) - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص 77.

(2) -Paul J. White and William S. Logan, Remaking the Middle East, Berg Publishers, Oxford, 1997, P. 232.

نزیکەی هەزار کەس کۆتایی هات. لەشاری جەزیرەش خۆپیشاندانێکی 15 هەزارکەسی سازکرا و لەلایەن سوپا و یەکەی تایبەتی تورکیا رێیان پێگیرا و نزیکەی 80 بریندار و کەسێکی دیکەش بەهۆی ئەوەی کەوتە ژێر زرێپۆشەوە کوژرا و سەدانی دیکەش دەستگیرکران. دواتر نارەزاییەکان بۆ مانگرتنی بەندییەکان لە خۆراک لە بەندیخانەکانی دیاربەکر و وان و غازی عەنتاب فراوان بوو، هەروەها خوێندکارانی زانکۆکانی دیجلە و ئەستەمبۆل و ئەنقەرە و ئەسکیشەهیر Eski Sehir و ئەرزەرووم لە خۆپیشاندانێك دەرچوون[1].

بۆیەکەمجار بەئاشکرا پرسی کورد بووە مایەی گرنگی پێدانی رای گشتی تورکی، هەتاکو سەرۆك ئۆزالیش ناوە ناوە لێدوانی وای دەدا، کە دەچووە هەمان بابەتەوە، لە نیسانی 1990 و لەمیانەی کۆبوونەوەیەك کە ئۆزال و رابیتەی پیاوانی پیشەسازی و پیاوانی کاری تورکی Turk Sanayi ve Is Adamleri Dernegi (TUSIAD) لە خۆگرتبوو، ئۆزال گوتوویەتی: "**حکوومەت بە راستی لە دۆزینەوەی نموونەیەکی نوێی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوردی دوور لە رێوشوێنی پۆلیسی دەکۆڵێتەوە**"[2]. لە هاوینی هەمان ساڵدا، گەورەترین پارتی ئۆپۆزسیۆنی تورکی، کە پارتی دیموکراتی کۆمەڵایەتی بوو، "**قەدەغەکردنی بەکارهێنانی زمانی دایك**" بە "**رێوشوێنیکی سەرەتایی و وەحشیگەرییە**" و "**ئامرازێکی پرۆسەی ئاویتەکردنە**" وەسفکرد. جەختی لەسەر هەڵگرتنی هەموو کوت و بەندێك لەسەر بەکارهێنانی زمانی دایك و مافی قسەکردن و فێربوون و نووسینی بە زمانی دایك، کردەوە، هەروەها پێویستە دەوڵەت پەیمانگا و سەنتەری توێژینەوەی بە هەمەجۆری زمان بکاتەوە[3]. لە 13ی تشرینی یەکەمی 1991 ئۆزال سەردانی هەکاری کرد و دانی بەوەنا کە کورد لە تورکیا هەیە، و پێویستە رێزیان لێبگریت[4]. پێ دەچێت ئەم لێدوانەی ئۆزال لەمیانەی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردنی 1991 ەوە هاتبێ.

(1) -Ibid, P. 233.
(2) -Michael Gunter, The Kurds and The Future..., P. 61
(3) -Ibid, Pp. 61-62.
(4) -Paul J. White and William S. Logan, Op. Cit., P. 235.



پارتی کرێکارانی کوردستان لەلای خۆیەوە، چەند هەنگاوێکی هاوێشت کە دەربڕی بزاوتنی حیزب بوو بەرەو گرنگیدان بە لایەنی سیاسی پرسی کورد. لەسەرەتای نیسانی 1990 بە دوو رۆژنامەنووسی تورکیا راگەیاند، کە "**ئەگەر تورکیا واز لە سیاسەتی سەرکوتکردن بێنێت، ئاگربەست رادەگەیەنین و لە دەورەی مێزی دانوستاندن دادەنیشین، ئەو کات واز لە کردەوە توندوتیژی دێنین...**"[1]. دوای ئەم لێدوانە پارتی کرێکاران رایگەیاند کە هێرش ناکاتە سەر ئامانجی مەدەنی و لێبووردنی گشتی بۆ پاسەوانانی لادێی ئەوانەی چەکیان داناوە دەرکرد[2].

زۆری پێنەچوو، هەر لایەنە ئامانج و نیازەکانی بەرامبەرەکانیان تەجرەبەکرد. لە 9ی نیسانی 1990 لەمیانەی کۆبوونەوەی نائاسایی ئەنجوومەنی وەزیران، حکوومەت مەرسومی ژمارە 413 ی بەناوی "**چاودێری و دوورخستنەوەی**" دەرکرد، کە دەسەڵاتی رەهای بە حاکمی هەرێمی لەناکاو دا بۆ ئەوەی هەر بڵاوکراوەیەك کە "**رووداوەکانی ناوچەکە بە شێوەیەکی ساختە دەگوازێتەوە**" دابخات. سەرباری پێدانی دەسەڵاتێکی فراوان تایبەت بە دووبارە نیشتەجێکردنەوەی "**ئەوانەی کە وەزارەتی ناوەخۆ بۆیان دیاری دەکات کە لە کوێ نیشتەجێ ببن**"، هەروەها دەسەڵاتی لەکارخستنی قازی و داواکاری گشتی هەبوو، لەپاڵ هەڵپەساردنی مافی سەندیکایی[3].

جێبەجێکردنی ئەو مەرسومە پێشێلکارییەکی زۆری لە ئازادی رۆژنامەگەری لێکەوتەوە، لەوەتەی ئەو مەرسومە دەرچووە، راستگۆیی راپۆرتە هەواڵەکانی رۆژنامە تورکییەکان لەبارەی پەرەسەندنەکانی ناوچە تەنگژەدارەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ولات کەمبۆتەوە، زۆر ناوچە لەبەردەم رۆژنامەنووسان، فەرمانبەرانی مەدەنی داخران. زۆر کەم رۆژنامەی چەپرەو هەبوون، وەکو رۆژنامەی ئەژێندای ئازاد Özgür Gündem، کە دواتر بە ناوی سیاسەتی ئازاد

(1) -Michael Gunter, The Kurds and The Future of Turkey..., P. 61.
(2) -David McDowall, Op. Cit., P. 427.
(3) -Michael Gunter, The Kurds and The Future..., P. 61.

Özgür Politika دەردەچوو، دەوێران رەخنە و ئیدانەی ئەو رێوشوێنە نایاساییانەی هێزەکانی ئاسایش بکەن(1).

بۆیەکەمجار پەرەسەندنەکانی دوایی ئەنقەرەی ناچارکرد بەشێوەیەکی ئاشکرا زاراوەی **"کورد و پرسی کورد"** بەکاربێنێت، لە بەهاری 1991 زنجیرەیەك هەنگاوی حکوومەت، ئاماژەی بەو گۆڕانکارییەی کە لە هەڵسوکەوتی ئەنقەرە لەمەڕ پرسی کورد هاتۆتە ئاراوە دا. لە شوباتی 1991 ئۆزال پێشنیازیکی بۆ هەڵوەشاندنەوەی ماددەی (2932) پێشکەشکرد، کە لە دەستووری 1982 قسەکردنی بەزمانی کوردی قەدەغەکرد، پێشنیازەکە رێگەی دا زمانی کوردی جگە لە پەخش و بڵاوکردنەوە و فێرکردن نەبێت، ئۆزال لە 12ی نیسان ئەنجوومەنی نیشتمانی لەسەر وەرگرتنی پێشنیازەکە رازی کرد(2). دوای داناننەکەی، ئۆزال چاوی بەسەرکردە کوردەکانی عێراق کەوت(3)، و پێ راگەیاندن کە تورکیا پاڵپشتی لە **"گەڕانەوەی مافەکانی کورد دەکات، جا ئەمە بە گوێرەی رژێمی دیموکراتی یان بەشێوەی فیدرالی یا کۆنفیدرالی یا ئۆتۆنۆمی بێت"**(4).

لە ئابی 1992ەوە سەرۆك کۆمار (ئۆزال) پێشنیازیکرد لەنێوان 60 تا 90 دەقیقە لە پەخشی تەلەفزیۆنی حکوومی بۆ باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ بە زمانی کوردی تەرخان بکرێت، زمانی کوردی وەك دووەم زمانی خوێندن بێت لەو شوێنانەی کە پێویست دەکات. بەڵام ئەو بەڵێن و پێشنیازانە وەك مەرەکەبی سەرکاغەز مایەوە، بەهۆی نارەزایەتی عەسکەر لە ئەنجوومەنی نەتەوەیی تورکی، ئەمەش وایکرد هیچ مافێکی کلتووری بە کورد نەبەخشرێت.

(1) - گولستان گوربای، المصدر السابق، ص 50.

(2) -Morton I. Abramowitz, "Dateline Ankara: Turkey after Ozal", Foreign Policy, Issue: 91, Summer 1993. P. 164 ff.

(3) -Michael M. Gunter, "The Foreign Policy of Iraqi Kurds", Journal of South Asian Studies, Vol. XX, No. 3, Spring, 1997, Pp. 7-8.

(4) - ادوارد مور تايمز، "اكراد العراق يكتشفون حليفاً مدهشاً"، الفاينيشال تايمز، 22 اذار 1991، في: ارشيف دار البعث (قسم التوثيق والمعلومات)، "المسألة الكُردية"، الرمز (97/1/9)، ص 12.



هۆکاری ئەمەش ئەوە بوو کاتی دیمیریل لە تشرینی دووەمی 1991 حکوومەتی پێکهینا، شەڕ گیانی 4500 هەڵوشی بوو، و پاڵپشتی لۆکاڵی بۆ پارتی کرێکارانی کوردستان گەیشتبووە ئاستێك کە هیچ کاتێ نەگەیشتبوو. ژەنەراڵەکان ئەمەیان بەمشێوەیە دارشت کە هەر چارەسەرێکی پرسی کورد بەر لە خۆبەدەستەوەدانی تەواوی پارتی کرێکارانی کوردستان، وادەکات ورەی سوپا دابەزێ(1).

کاردانەوەی کوردی، وای بینی کە بریارەکە ناتەواوە، نەیارانی ئۆزال لە سوپا و سیاسەتمەدارانی مەدەنی وایان بینی کە بریارەکە بوار بە دابەشبوونی تورکیا دەدات، ئەو هەنگاوانە بە یەکەم گۆڕانکاری سیاسی تورکی بەرامبەر کورد دادەنرێت، هەروەها بە هەنگاوێکی گرنگ بەرەو ئاراستەی نوێ، کە دواتر بەرامبەر کێشەی کورد بەرجەستە بوو.

ئەو هەنگاوانە جگە لە دەربڕینی ئەو شڵەژانەی کە ئەنقەرە بەهۆیەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کێشەی کورد دەکرد، هیچی دیکە نەبوو. هێندەی پێنەچوو، تا ئۆزال ئەنجوومەنی نیشتمانی تورکی بە هەڵوەشاندنەوەی یاسای (2932) رازی بکات، لە هەمان رۆژ (12ی نیسانی 1991) پرۆژە یاسایەکی نوێی پێشکەش کرد، کە لە توندی یاسای یەکەمی کەمکردەوە، ئەویش پرۆژە یاسای بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر Terörle Mücadele Yasasi بوو، یاساکە تیرۆری وا پێناسەکرد **"کە هەرکارێك بە ئامانجی گۆڕانی رووخساری کۆمار بدرێت"**، ئەم پێناسەیە هەموو پیادەکردنێکی دیموکراتی وەك خۆپیشاندان یا کۆبوونەوە و بڵاوکردنەوە یان هەموارکردنی شێوازی دەوڵەت کە بە توندی دەناسرێتەوە(2)، لە ئابی 1991 ئۆزال رایگەیاند کە تورکیا هیچ دوودڵی پیشان نادات لە هێرشکردنە سەر پێگەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە ناو

(1) -Omer Taspinar, Op. Cit., Pp. 104-105.

(2) – بو بینینی بەندەکانی ئەم یاسایە سەیری،

Human Rights Watch, "The human rights picture in Turkey grew worse during 1992" via at:

(http://www.hrw.org/reports/1992/WR92/HSW-06.htm#P744_222349.

سنووری عێراق . دوابەدوای لێدوانەکەی ئۆزال، هێرشی هێزەکانی توركی بۆ سەر پێگە ئەگەرییەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە ناو سنووری عێراق دەستی پێکرد[1]. تەواوی ساڵی 1991 ئاراستەیەکی زیاد لە توندوتیژی لە مامەڵـەکردنی ئەنقەرە لەگەڵ پرسی کورد بەخۆیەوە بینی، دوای هەڵبژاردنەکانی تشرینی یەکەمی 1991، بە دۆڕاندنی پارتی نیشتیمانی دایك (حیزبەکەی ئۆزال) دیمیریل حکوومەتێکی ئیئتیلافی پێکهێنا، حکوومەتە نوێیەکە وەڵامی بانگهێشتەکەی ئۆجەلانی بۆ شەڕ ڕاگرتن دایەوە، **"مۆڵەتی بە حکوومەتی نوێ دا تا لە هەڵوێستی خۆی تاوتوێ بکات"**، ئەگەر نا کاری چەکداری بۆ شارەکانی توركی دەگوزێتەوە، **"لەوێش خوێنێکی زۆر دەرژێت..."**[2]. دوابەدوای بانگهێشتنەکەی ئۆجەلان ئۆزال رایگەیاند کە **"بەهاری کوردان خوێناوی دەبێت، بەو شێوەیە نابێت کە سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان دەخوازێت، کاتێ بەڵێنی دابوو کە ساڵی 1992 ساڵێکی رەش دەبێت"**[3].

هەردوو لایەن، هەرەشەکانی خۆیان جێبەجێکرد، پارتی کرێکارانی کوردستان لە هەمان مانگدا هێرشێکی کردە سەر بنکەیەکی سنووری و 17 کەسی کوشت، لە هێرشەکەدا 500 جەنگاوەر بەشداری کرد. دوای ئەمەش چالاکی بەدیلگرتن و رفاندنی سەربازانی بە دواداهات، دواتریش ئەو گەشتیارە بیانییانەی کە بەرەو باشووری رۆژهەڵات دەهاتن ناچار دەکران بۆ وەرگرتنی مۆلەتی هاتنە ناو تورکیا، دەبوو سەردانی نووسینگەکانی پارتی کرێکاران لە ئەورووپا بکەن، هەروەها لە کانوونی یەکەمی 1991 پارتی کرێکاران رایگەیاند بەبیانوی سەپاندنی زمان و کلتووری تورکیا لە کوردستان 85 قوتابخانەی سوتاند و 231 مامۆستای کوشتووە[4]، پێ

---

[1] - محمد نور الدين، المسالة الكُردية في تركيا...، ص 39.

[2] - وصال نجيب عارف العزاوي، المصدر السابق، ص 188.

[3] - المصدر نفسه، ص 191.

[4] - محمد نور الدين، المسالة الكُردية في تركيا...، ص 39.



دەچوو پارتی کرێکارانی کوردستان بریاری پەرینەوە لە ستراتیژی **"لێدە و راکە"** بۆ جەنگی کراوە دابێت[1].

یەکە تایبەتییەکان، ئەوانەی بۆ ئەنجامدانی چالاکی سنووربەزێن و چالاکی زستانە مەشقپێکرابوون، چەند چالاکییەکیان لە باشووری رۆژهەڵاتی وڵات ئەنجامدا، ئەوانە لای دانیشتوان بە (یەکەکانی رامبۆ–Rambos) ناسرابوون[2]. رۆژنامە تورکییەکان لێرەو لەوێ راپۆرتیان لەبارەی چالاکی یەکەکانی نەهێشتنی گەریلا– Kontr gerilla کە هاوشێوەی تیمەکانی مردنی ئەمریکای لاتینی بوو، بڵاوکردەوە. ئەو یەکانە لە شوێنبزرکردن و کوشتنی لایەنگرانی کورد و ئەوانەی رەخنە لە سیاسەتی سەربازیی دەوڵەت دەگرن، بەرپرسن. ئەو یەکانە بەرەزامەندی دەوڵەت و بە نهێنی ئەم چالاکییانەیان ئەنجام دەدا. چەند حاڵەتێك هەبوون، ئاماژەیان بە بوونی دامەزراوەیی وا دەدا کە لەژێر کۆنترۆڵی دەوڵەت دا نەماوە[3].

ترسناکترین لایەنی **"جەنگی تابیەت–**Special War"[4]، دژ بە پارتی کرێکارانی کوردستان و ئەوانەی دژایەتی سیاسەتی سەربازی حکوومەت و رێوشوێنەکانی سوپا دەکەن، هەوڵەکانی باڵی راسترەوی دەسەڵاتدار بۆ پێکهێنانی گرووپی ئیسلامی توندڕەو وەك **"تیمەکانی گورز وەشاندن"** بوو. لە

---

[1] - هاينتس كرامر، المصدر السابق، ص 91.

[2] - گولستان گورباي، المصدر السابق، ص 50؛ هنري باركي وغراهام ڤولر، المصدر السابق، ص114.

[3] - گولستان گورباي، المصدر السابق، ص 55.

[4] - "جەنگی تابیەت"، "هێزی شاراوە"، "جەنگی نهێنی"، "دەوڵەتی قووڵایی"، زاراوەگەلێکی ناسراون لەلایەن نێوەند و دەستەبژێری تورکی کە پەیوەندییان بە رەوشی تورکیاوە هەیە. ئەم زاراوانە وەك ئاماژە بۆ دەزگا ئەمنیە جۆراوجۆرەکان و هێزە چەکدارەکان بەکاردێت، لەوەتەی ساڵانی نەوەدەکانەوە، ئەو زاراوانە بەچڕی هاتوونەتە ناو فەرهەنگی رۆژنامەنووسان و ئەوانەی گرنگی بە رووداوەکانی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا دەدەن. سەیری :
Omer Lutfi Mete ve Mahir Kaynak, Derin Devlet: Tanimlanamayan Guc, Timas Yayinleri, Istanbul, 2005, SS. 11-28; Hurriyet, 23-12-1995;
وە لات، العدد (13)، 15 كانون الثاني 1994.

وەڵامی چوونە پێش و سەرکەوتنەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان، حیزبوڵڵا Hizbulla[1] لە ساڵی 1991 بەرنامەیەکی بۆ تیرۆر و هاوێشتنی نارنجۆك و **"لەسێدارەدانی دەستبەجێ"** دارشت. ڕۆژنامەنووسانی لایەنگری پارتی کرێکارانی کوردستان و ئەندامانی سەندیکا بازرگانی و پیشەییەکان و ئەوانەی لەگەڵ چەپ هاوسۆز بوون، ببوونە ئامانجی ئەو پارتە. چالاکییەکانی پارتەکە بە کوشتنی ویداد ئایدنی ئەندامی (پارتی کاری جەماوەری–Emek Partisi)[2] لە هاوینی 1991 لە دیاربەکر دەستی پێکرد. لە ئەیلولی 1992 موسا عەنتەر (ئەو کات 74 ساڵ بوو)ی ئەدیب و چالاکی سیاسی کوردیان لە میانەی سەردانی بۆ دیاربەکر تیرۆرکرد. تا کۆتایی کانوونی دووەمی 1992 ڕاپۆرتەکان پێیان وایە زیاتر لە 245 چالاکی تیرۆریستی ئەنجام داوە، هەندێکی دیکەش

(1) - ڕێکخراوی حیزبوڵڵا، لە ساڵی 1981 لەلایەن هەریەکە لە حوسین وەلی ئۆغلو ڤیدان کۆنکۆر و ئەوانەی پێشتر ئەندامی سەندیکای نەتەوەیی بۆ قوتابییە تورکەکان، کە ڕێکخراوێکی پارتی سەلامەتی نیشتمانی بوو، دامەزراوە، ئەو پارتە پەیرەو لە شۆڕشگێڕێتی و توندوتیژی بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی دەکرد، لە ساڵی 1983 پارتەکە لە ناوەخۆی دابەش بوو، لەنێوان هەریەکە لە حوسێن وەلی ئۆغلو، کە خانەیەکی بڵاوکردنەوەی بە ناوی (ئاڵا) دانا و بریاریدا پەرە و هێز بە ڕەوتەکەی بە گوێرەی نموونەی ئێرانی بدات، گرووپەکەی دیکە، ناوی (خانە)یان لە خۆنا. دەزگای هەواڵگری تورکی ڕێزەکانی ئەو پارتەی بری و وەك بەشێك لە جەنگی بۆ سەر پارتی کرێکارانی کوردستان بەکاریهێنا، چالاکبوونی خۆی لەو بوارەدا سەلماند. زۆر لە ڕاپۆرتەکان لە بارەی پەیوەندی توندی پارتەکە بە دەزگانی دەوڵەتەوە نووسییان. ئەوەی ڕاستی ئەو ڕاپۆرتانەش دەردەخات، بریاری ڕاوەدوونان و کوشتنی ئەندامانی پارتی کرێکاران بوو، هەروەها ڕاستەوخۆ دوای دەستگیرکردنی عەبدوڵڵا ئۆجەلان دەرگای بارەگاکانی داخران. بۆ زانیاری زیاتر، سەیری:

Human Rights Watch, "What is Turkey's Hizbullah?", 16 February, 2000. Via at: (http://hrw.org/english/docs/2000/02/16/turkey3057_txt.htm); M. Kürşad Atalar, "Hizballah of Turkey: A Pseudo-Threat to the Secular Order?", Turkish Studies, Vol. 7, No. 2, 307–331, June 2006,Pp. 307-329.

(2) – پارتەکە لە 7ی حوزەیرانی 1990 لەسەر دەستی 7 نوێنەری کورد، لەوانەی لە تشرینی یەکەمی 1989 بەشدارییان لە کۆنگرەی پاریس لەبارەی پرسی کوردەوە کرد و لە پارتەکەیان ( پارتی گەلی دیموکراتی کۆمەڵایەتی) دەرکران، دامەزرا. سەیری :
Omer Taspinar, Op. Cit., P. 102



دەڵێن لە ساڵی 1992 زیاتر لە 360 کردەی تیرۆریستی کە نەزانراوە خاوەنەکەی کێن ئەنجامدراوە، کە لەو ژمارەیە 140ی تەنها لە باتمان بووە. چالاکییەکانی و کردەوەکانی ئەو پارتە لە ساڵی 1993 زیادی کردووە، هەموو تورکیای گرتەوە، هەتاکو هەموو ئەوانەی نەتەوەی تورکن و لەبواری مافەکانی مرۆڤ و ڕۆژنامەی ئازاد چالاکن گرتەوە، لەو ساڵە 150 کەسایەتی تیرۆر کرا، لە ساڵی 1994، 423 کەس و لە ساڵی 1995، 99 کەس[1]. قوربانیانی پارتی کرێکاران بەتەنیا لە نێوان ساڵانی 1991–1995 ئەوانەی بەدەستی حیزبوڵلاوە تیرۆرکران، بە نزیکەی 500 ئەندامان مەزەندە دەکرا[2]. ڕۆژنامەنووسە چەپرەوەکان ئەوانەی لەبواری مافەکانی مرۆڤ چالاکبوون و ئەوانەی هاوسۆزییان لەگەڵ پرسی کورد هەبوو، لە دڵەڕاوکێدا دەژیان، چونکە دوست و هاوڕێیانیان دەرفێنران و ئازاردەدران و دەکوژران. هەتاکو ئەوانەی ئەو هەواڵانەشیان بڵاودەکردەوە، دەبوونە ئامانجی حیزبەکە[3]. ڕۆژنامەنووسانی کورد و زۆرێك لەوانەی گرنگییان بە بابەتەکە دەدا و چاودێران، گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە حیزبوڵڵا بە هەماهەنگی تەواوی دەزگای حکوومی لەسەر ئاستی لۆکالی و مەرکەزی کاریکردووە[4]. ڕاپۆرتەکان لە سەرەتای 1992ەوە بڵاویانکردەوە کە 4000 **"جوداخواز"** دەستگیرکراوە، لەهەمان کاتدا ڕانەگەیەنرا کە هیچ یەکێك لەوانەی سیاسەتمەدار و ڕۆژنامەنووسان و لایەنگرانیانی کورد تیرۆر دەکات دەستگیر کرابێت. نەوەك هەر ئەوە، بەڵکو هیچ دەزگایەکی فەرمی نەبوو، چاودێری حاڵەتی لەو جۆرە بکات[5].

تووندوتیژی هاوبەشی نێوان سوپای تورکی و دەزگا ئەمنییەکانی لەلایەك و پارتی کرێکارانی کوردستان لەلایەکی دیکەوە، بە کەرتی فێرکردنیش گەیشت،

(1) -Michael Gunter, The Kurds and The Future..., P. 68.

(2) - محمد نور الدين، حجاب وحراب: الكمالية وأزمات الهوية في تركيا، دار الريس، بيروت، 2001، ص 253.

(3) -David McDowall, Op. Cit., P. 429.

(4) -M. Kürşad Atalar, Op. Cit., Pp. 307–331

(5) -Michael Gunter, The Kurds and The Future..., P. 68

ئەو کەرتە لە کانوونی یەکەمی 1991 بە توندی زیانی لێکەوت کاتێ داخستنی 1010 قوتابخانە راگەیەنرا، بەهۆیەوە 27 هەزار قوتابی لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات، بێ زانستکران[1].

سلێمان دیمیرێلی سەرۆك وەزیران، لەبارەی تیرۆرکردنی موسا عەنتەر لێدوانێکی دا و گوت: **"ئەوانەی کوژران، رۆژنامەنووسی راستەقینە نەبوون، بەڵکو جەنگاوەربوون، یەکتریان دەکوشت"**[2]. ئەوە راستییەکە روون دەکاتەوە، ئەو گوتارەی عیسمەت ئۆکسای ئۆغلوی سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوە بوو کاتێ لە کردنەوەی ساڵی قەزا لە ئەیلولی 1992 پێشکەشی کرد و گوتی: **"بۆ نەهێشتنی تیرۆر، بە پشتبەستن بە بنەما دیموکراتییەکانی دەوڵەت، دەوڵەتی یاسا، دەبێت دەوڵەت هەموو ئەو ئامراز و رێوشوێنانەی کە تیرۆریستان بەکاری دێنن بەکاربێنێت"**[3].

لێدوانەکانی دیمیریل و ئۆکسای، تارادەیەك هەڵوێستی حکوومەتی لە بارەی چالاکییەکانی حیزبوڵلا و راستی ململانێ باوەکانی روونکردەوە، هەرچەندە حکوومەت نکۆڵی لە تێوەگلانی لە چالاکییەکانی حیزبوڵلا و باقی یەکەکانی تایبەت بە نەهێشتنی جەنگی پارتیزانی کرد، بەڵام دواتر دانی بە بوونی چەندین تیمی تایبەت نا، کە ئەندامانی مەشقپێکراون و بۆ کارکردن لە باشووری رۆژهەڵاتی وڵات راسپێردراون. ئەو یەکانە بەتایبەت ئامادەکراون بۆئەوەی بتوانن لە دژی پارتی کرێکارانی کوردستان بجەنگن. هەرچی ناسنامە و ئەندامان و چالاکی و شێوازی کارکردنیان بوو، ئەوا بە نهێنی مایەوە، کاتێ کردەوەکانیان ئەنجام دەدەن، جلی تایبەت و دەمامك دەپۆشن، زۆربەیان بە کوردی قسە دەکەن و جلی کوردی کلاسیکی لەبەر دەکەن، ئەوانە بە پێچەوانەی سەربازانی تورکی رێگەی درێژکردنی مو و ریش بەردانەوەیان پێ دەدرێت. شایانی باسە زۆربەی قوربانیانی ئەوانە، لەلایەن پۆلیسیشەوە

(1) - محمد نور الدين، "المسالة الكُردية..."، ص 39

(2) -David McDowall, Op. Cit., P. 432.

(3) -Michael Gunter, The Kurds and The Future..., P. 74.



ئامانجن. کە باگراوندێکی سیاسی هاوبەشیان هەیە و هەموویان زۆربەی کات کوردبوون کۆیان دەکاتەوە، ئەو تیمی مەرگە رەوشێکی لە تۆقاندن لە کوردستان دروستکردووە[1].

لەمیانەی زیندووکردنەوەی ئاهەنگەکانی نەورۆزی 1992، ئەو توندوتیژییەی دەوڵەت سەرپەرشتی دەکرد، گەیشتە لوتکە، کاتێ 92 مەدەنی لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا کوشت. لە ئابی هەمان ساڵدا کاتێ لە میانەی هێرشێکی حکوومەت بۆ گەڕاندنەوەی شارۆچکەی شیرناخ لە دەستی هێزەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان، بەهۆیەوە زیاتر لە 20 هەزار دانیشتوانی ناوچەکە بە کۆمەڵ رایان کرد و زیانی گەورە بە زۆر تەلار و موڵکی گشتی کەوت، ئەمە لە ناوچەی دیکە لە دارکجیت Dargecit و جۆکوجا دووبارە بووەوە[2]. پارتی کرێکارانی کوردستان بە خێرایی توانای خۆی لە شکاندنی خەیاڵپڵاوی حکوومەت بەدەرخست، لە ئەیلولی هەمان ساڵ 40 کەسی لە پاسەوانانی لادێ لە نزیك وان کوشت، دوای ئەمەش 29 سەربازی کوشت[3].

بانگەشە و رەخنە توندەکانی راسترەوی تورکی لە حکوومەت لەبارەی هەرگیز مامەڵە نەکردن لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان، وای لە ئۆزال کرد کە دەستبەرداری ئەو ئاماژە لیبراڵییانەی بێت کە ساڵێك پێشتر دابووی، بۆیە واپێدەچوو کە دۆسییەکە بەتەواوی لە دەستی سەرۆکایەتی ئەرکانی تورکیدا بێت، کە حکوومەتی هەرێمی کوردستانی رازی کرد لە هێرشکردنە سەر نزیکەی 5 هەزار جەنگاوەری پارتی کرێکارانی کوردستان لە دۆل چیاکانی کوردستان یارمەتی بدات. هەرچەندە سەرکردایەتی ئەرکانی تورکی زیادەرۆیی لە گەورەکردنی سەرکەوتنەکانی سوپای تورکی و ژمارەی کوژراوانی پارتی کرێکارانی کوردستان دەکرد و پارتی کرێکارانیش هەوڵی دەدا قەبارەی زیانەکانی کەمبکاتەوە، تا کۆتایی ئەو ساڵە هەردوولا لەو ململانێیەدا زیانێکی

(1) – بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی تیمی مەرگ سەیری : Wayne S.Cox, Op. Cit., Pp. 241-249.

(2) -David McDowall, Op. Cit., P. 435.

(3) -Ibid, P. 435

گەورەیان پێکەوت. سەبارەت بە حکوومەتی تورکی، ئەوا بەقەد چارەکێك لەوانەی لەسەرەتای ململانێیەکە لە 1984 کوژران کە ژمارەیان 4000 دەبوو، لە ساڵی 1991 کوژران، هەروەها لە ساڵی 1992، نزیکەی 2000 کەس کوژران[1]. سەبارەت بە پارتی کرێکارانی کوردستان، ئەوا **"ستراتیژی رووبەڕووبوونەوە"** و وەرچەرخان بۆ شێوازی رووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆی چەکداری لە بەرەی کراوەدا، بەمەبەستی دەرکردنی هێزەکانی تورکی لەبەشێك لە کوردستان لە جیاتی چالاکی پارتیزانی کە پارتەکە لە ساڵی 1992 گرتبوویەبەر، بەگران لەسەری وەستا، چونکە هێزەکانی تورکیا لە رووی ژمارەوە زیاتر بوون، خاوەن نوێترین چەك و فڕۆکە و هەلیکۆپتەر و زرێپۆش بوو، کە بە سەرچاوەی هەواڵگری لەرێگەی مانگی دەستکردەوە، بەستراوبوونەوە، ئەمەش گومانی لە دەرەنجامەکانی ئەو جەنگانەی کە هەردوولا بەرپایان دەکرد نەدەهێشتەوە، سوپای تورکی لە میانەی چالاکییەکانی تشرینی یەکەم و دووەمی 1992 لە ناو کوردستانی عێراق، توانی ژمارەیەك لە جەنگاوەرانی پارتەکە بکوژێت و بارەگاکانی خاپوور بکات، بەمەش پارتەکە زۆربەی بنکەکانی لەناوچەی بادینان لە دەستدا[2].

لە تورکیا پەرەسەندنێکی گەورە روویدا و بوارەکانی پرسی کوردی ساڵی 1993ی گۆڕی، پارتی کرێکارانی کوردستان لە 17ی ئازاری 1993 ئاگربەستی یەکلایەنی (لە 21ی ئازاری 1991 تا 15ی نیسانی هەمان ساڵ) راگەیاند[3]. یەکەکانی پارتەکە لەو ماوەیەدا تەنها پابەندی بەرگریکردن لەخۆ دەبن ئەگەر هێرشیان کرایە سەر. ئۆجەلان ئەوەشی باسکرد، کە ئەگەر حکوومەت وەڵامی ئاگربەستەکە بداتەوە، ئەوا هیچ هۆکارێك بۆ درێژکردنەوەی ئاگربەستەکە نابینێ[4].

---

(1) -Human Rights Watch, "The human rights picture in Turkey grew worse during 1993" Via at: (http://www.hrw.org/reports/ 1993/WR93/Hsw-08.htm#P564_202642).

(2) – محمد نور الدین، "المسالة الكُردية..."، ص ص39–40.

(3) - المحادثات السرية بين"PKK" حزب العمال الكُردستاني والدولة التركية، دار الشموس للدراسات والنشر والتوزيع، دمشق، 2000، ص 13.

(4) -Michael Gunter, The Kurds and The Future of Turkey..., P. 75.



ئەو بەڵگەنامەیەی کە ئۆجەلان بە جەلال تاڵەبانی دا کە رێبەرایەتی هەوڵەکانی میانگیری نێوان حکوومەتی تورکی و پارتی کرێکارانی کوردستانی[1] دەدا، هەندێ سازشی تێدابوو[2]، کە بۆ هەریەکە لە ئۆزال دیمیریل مایەی حەپەسان بوو، بۆ نموونە لە نامەکەدا هاتووە کە پارتی کرێکاران واز لە بیری جوداخوازی دێنیت و داوای کۆماری تورکی دیموکراتی دەکات، زۆر جەختی لەسەر ئەوە کردبووە کە پارتی کرێکاران **"کار بۆ دابەشکردنی تورکیا ناکات، بەڵکو داوای مافە مرۆڤایەتییەکانی گەلی کورد دەکات"**، بەڵگەنامەکە بەم دەستەواژانە داواکاری پێشکەش کردبوو: **"ئەگەر تورکەکان ویستیان هەنگاوێك بهاوێژن، ئیمە دە هەنگاو دەهاوێژین، ئەگەر دەستپێشخەرییەك پێشکەش بکەن، ئێمە دە دەستپێشخەری لەبواری کاری سیاسی پێشکەش دەکەین"**[3].

لەنێوان هەموو ئەو سیاسەتمەدارانەی خاوەن دەسەڵاتن لە سیاسەتی تورکیدا، ئۆزال تاکە کەس بووە کە خاوەن دیدگا و سیاسەتێکی تەواو دروستی هەبوو[4] و ئارەزووی تاقیکردنەوەیەکی نوێی وای هەبوو کە پێشتر شێوەی نەبووە لە تورکیا. سەرباری ئەوەش توانای ئەوەی هەبوو کە شێوازێکی وا دابهێنێت کە هەموو ئەو لایەنانەی گرنگی بە کۆتایی هینان بە جەنگەکە

---

(1) -Paul J. White and William S. Logan, Op. Cit., P. 239.

(2) - ینظر التفاصيل في: محمد نور الدين، "المسالة الكُردية..."، ص ص 31–32.

(3) -Michael Gunter, The Kurds and The Future of Turkey..., Pp. 75-76.

(4) - پێ دەچێت ئەو دیدگایەی بەخێرایی لەو رۆڵە نوێیەی کوردستانی عیراقەوە پێکهێنابێ. ئۆزال دیپلۆماسییەتەکی هێمنی ئاشکرا و دیاری لەگەڵ کورد و جیاواز لەگەڵ حکوومەتەکانی تورکیا لەبارەی پرسی کورد پەیرەو کرد، لە میانەی چاوپیکەوتنەکانی بەسەرۆکە کوردەکانی عێراق ئەوەی دەورژاند کە لەگەڵ رژێمی فیدراڵی عیراقە، کە ناوچەی کوردی لە خۆبگریت، ئەمە دەنگدانەوەیەکی باشی لە نێوەندە کوردییەکان لە تورکیا پەیدا کرد، ئەو ئاوات و قورساییەی ئۆزال لە ناو کوردان ئەو کاتە بەهێز بوو کە ئۆزال خۆی وەك (پارێزەری کوردی عیراق) پێشکەشکرد، لە زۆر بۆنەدا دانی بەوە ناوە کە لەوانەیە خۆی بەشێك بیت لە کورد، چونکە داپیرەی کوردە، سەیری : هنري باركي وغراهام ڤولر، المصدر السابق، ص 20–117.

دەدەن، پێی رازی بن[1]. هەستکردنی سەرۆك ئۆزال بە رەهەندەکانی پرسی کوردی و مەترسییەکانی، لە نامە شەش لاپەرەییەکەی بەدەرکەوت، کە لە شوباتی 1993 بۆ دیمیریلی سەرۆك وەزیران ناردبوو، لە بەشێکی نامەکەدا هاتووە "**لە سەرەتای مێژووی کۆماری تورکی تا ئەمرۆ، تورکیا رووبەڕووی ترسناکترین هەڕەشە بۆتەوە، ئەو بومەلەرزە کۆمەلایەتییە لەوانەیە بەشێك لە تورکیا دابماڵێت و ئێمەش هەموو لەژێر گلەکەی دەنێژرێت**"[2]. ئۆزال راوێژەکانی لەگەڵ ژمارەیەك رۆژنامەنووس و نووسەر و سیاسەتمەدار و ئەوانەی گرنگی بە پرسی کوردی دەدەن لە تورك و کورد دەست پێکرد و لەگەڵ ئەوانە پرۆژەی چارەسەرکردنی کێشەی کوردی گفتوگۆ کرد[3]. ئۆزال بە رۆژنامەنووسی ناسراوی تورکی جەنگیز جاندار Cengiz Candar رایگەیاند کە نیازی وایە لێبوردنی گشتی بۆ جەنگاوەرانی پارتی کرێکارانی کوردستان دەربکات و رێگەیان پێدەدات بێنەوە ناو ژیانی گشتییەوە، جگە لەوانە نەبێت کە تاوانێکیان ئەنجامداوە[4].

هەرچەندە ئۆزال متمانەی بە تواناکانی خۆی بۆ رازیکردنی لایەنی سەخت (واتە دامەزراوەی سەربازی) هەبوو، تاکو بە بیروراکانی خۆی لەبارەی ئاگربەست رازییان بکات و گوتی: "**دەسەلاتی تەواوم هەیە وەك سەرۆك کۆمار بۆ ئەوەی، سەروك ئەرکان، دۆغان گورەش** Dogan Gures **لە پۆستەکەی بۆ سالێکی دیکە بهێلمەوە**". هەرچەندە ئۆزال لەسەر هەولدان بۆ کارکردن لە هەلۆیستی گەورە ژەنەرالەکان و هاندانیان بۆ رازی بوون بە چارەسەری

(1) - جوناثان راندل، المصدر السابق، ص 367

(2) -The Independent, 13 November 1993.

(3) – ئۆزال وەزیری بەرگری ئەریجان ئەریهانی راسپارد پەیوەندی بە تالەبانییەوە بکات، کە پەیوەندی تایبەتی لەگەلیدا هەبوو، ئەو وەزیرە بیروراکانی ئۆزالی پێ راگەیاند، تالەبانیش ئەرکەکەی بە باشترین شێوە جێبەجێکرد. سەیری، المحادثات السرية...، المصدر السابق، ص 37–40.

(4) - جوناثان راندل، المصدر السابق، ص 367.



ئاشتییانە، بەلام نێوەندە سیاسییە جۆراوجۆرەکان "**گومانیان لەو توانایەی ئۆزال لە کاریگەری لەسەر دامەزراوەی سەربازی هەبێت" کرد**[1].

لەو کاتەوە عەبدوللا ئۆجەلان لە میانەی کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی لە بیقاع بە ئامادەبوونی تالەبانی و نوێنەرانی پارتی گەل و رۆژنامەنووسانی تورك و بیانی ئاگربەستی درێژکردەوە[2]، دائیرە کاریگەرەکانی گۆرەپانی تورکی، بەتایبەتی دامەزراوەی سەربازی، ئەم هەنگاوەی ئۆجەلانیان بە لاوازی لێکدایەوە[3]، هەروەها بە گوێرەی دەربڕینی دۆغان گورەش ئەمەیان "**بە نەشیاو لەقەلەم دا، چونکە سنووری تورکیا ئەتاتورك کێشاویەتی، ئەگەرنا ئەوا خەلکی دەمانکوژن و ناتوانین لە گۆرەپانی قزەلای** Kizlay **[لە ئانقەرە] پیاسە بکەین**". نێوەندە سیاسییەکانی تورکیا وەك سەرۆك وەزیران سلێمان دێمیرێل لەگەڵ ئەم دیدگایە کۆك بوون، کاتێ وەلامی دەستپێشخەرییەکەی ئۆجەلانی بەمشێوەیە دایەوە و گوتی: "**ناکرێت بە دانیشتن لەسەر مێزی دانوستاندن لەگەڵ ئەوانەی کە بوونەتە هۆکاری خوێنڕێژی رازی بین**"[4]. لەڕاستیدا ئۆزال لە سەختی ئەرکەکەی دلنیا بوو، لە زۆر بۆنەدا، ئەگەری بەشداریکردنی ئەندامانی حکوومەتی لە رازیبوون بە چارەسەری پرسی کورد، بەدوور دەزانی، بۆیە لەبارەی درێژکردنەوەی ئاگربەستەکە بە رۆژنامەنووسیکی تورکی راگەیاند کە ئەو بەو ئاگربەستە دلخۆشە و ئەوەی زیاد کرد کە "**لەوە دەترسێ کە ئەو گێلانە هەموو شتێ تێکبدەن**"، کاتێ رۆژنامەنووسەکە لەبارەی مەبەستی لە "**گێلەکان**" کێیە، گوتی: "**حکوومەتە**"[5]. ئۆزال هیچ گومانێکی لە ترسناکی ئەرکەکەی نەبوو، بەلام بڕیاریدا لەم رێگایە بەردەوام بێت، چونکە هەستی بە دەرەنجامە دوورەکانی دەکرد.

(1) - المصدر نفسهّ، ص 368.

(2) - هنري باركي وغراهام ڤولر، المصدر السابق، ص 115.

(3) -Michael Gunter, The Kurds and The Future..., P. 77.

(4) -Michael Gunter, The Kurds and The Future..., Pp. 77-78

(5) - جوناثان راندل، المصدر السابق، ص 368.

بریاری ئاگربەستی ئۆجەلان و جەماوەری بوونی بریارەکە، کە هاوشان بوو لەگەڵ هەوڵەکانی حکوومەت بۆ قەدەغەکردنی پارتی گەل، ئەو پاڵنەری هێزەی پەیداکرد، کە بەهۆیەوە پارتی دیموکراتی گەل Halkin Democrasi Partisi لە ئایاری 1993 دابمەزرێ. هەروەها هێزی بە پارتی کرێکارانی کوردستان لە نێوەندە کوردییەکان بەخشی، ئەو نێوەندەی بەرەبەرە زیاتر بە سیاسی دەبوو، چونکە تواناکانی ئەو پارتەی (پ ک ک) لەسەر شەڕکردن و جێبەجێکردنی ستراتیژی سیاسی لەکاتی پێویست پیشاندا[1].

لەوکاتەی کە ئۆزال بۆماوەی هەفتەیەك دەبوو هەوڵی دەدا کە لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئەمنی نەتەوەیی سەکردە سەربازی و مەدەنییەکان بە پێکهێنانی لیژنەیەك بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی سیاسی بۆ پرسی کورد رازی بکات، لە 17ی نیسان مردنی لەناکاوی ئۆزال راگەیەنرا[2]. مردنی ئۆزال گورزێکی کوشندە بوو بەر هەوڵەکانی ئاشتی لە تورکیا کەوت[3]. دوست و

[1] - هنري باركي وغراهام ڤولر، المصدر السابق، ص 116.

[2] -Michael Gunter, The Kurds and The Future..., P. 78.

[3] - زنجیرەی رووداوەکانی مردن و کاتی مردنەکانی ئەو کەسایەتییانەی لایەنگری چارەسەری ئاشتی پرسی کورد بوون، بە توندی پاڵپشتی لەو بیرۆکەیە دەکات کە ئەمانە جگە لە پرۆسەیەکی لەناوبردن نەبێت کە هێزی شاراوە لە دەوڵەت ئەنجامی دەدەن، هیچی دیکە نییە، کە بەتوندی دژایەتی هەر پرۆژەیەك دەکەن کە مامەڵەیەکی ئاشتییانە لەگەڵ پرسی کورد بکات. لە 17ی شوبات ئەشرەف بەتلیسی سەرکردەی ژەندرمە لە رووداوێکی نارۆشنی کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەدا کوژرا، ئەو پیاوەش لە دیارترین کەسە نزیکەکانی ئۆزال و لایەنگری پرۆژەی دانوستاندنی لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان دەکرد، سەبارەت بە ئۆزالیش، لە نێو خانەوادەکەی وا بڵاوبۆوە، کە لەلایەن ئەوانەی پاڵپشتی لەسیاسەتەکەی ناکەن، ژەهرخوار کراوە. لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵ و دوای حەوا مانگ، رائید جەم ئەرسەڤەر لە رووداوێکی دڵتەزین و نا مەعقول کوژرا، ئەو پیاوە بەرپرسی هەوالگری هێزەکانی ژەندرمە بوو، وای لێی زانرابوو، دەستەڕاستی ژەنەرال بەتلیسە، یەکێ بوو لەوانەی زۆر بە پەرۆش بوو بۆ سازکردنی مامەڵە لەگەڵ کورد، بەتایبەتی کوردی عێراق کە پەیوەندییەکی توندیان لەگەڵی هەبوو. سەیری: Philip Robins, Suits and Uniforms: Turkish Foreign Policy Since the Cold War, University of Washington Press .Seattle, U.S.A, 2003, P. 329



نەیاری ئۆزال بەیەکەوە، لەسەر ئەو رایە بوون کە **"ئەگەر ئۆزال بمابوایە دەیتوانی هەموو شتی بگۆڕێت. لەوانە بوو زنجیرەیەك چاکسازی ئەنجام بدابوایە، لەوانەبوو بیتوانیبا هەموو دڕکەکانی سەر رێگای لاببردابوایە"** ئەمەش بەگوێرەی دەربڕینی یەکێك لە گەورە کەسایەتییەکانی دەزگای ئەمنی تورکی. ئۆجەلانیش چەندین جار لەسەر رووداوەکە گوتوویەتی: **"چارەسەری پرسەکە لەوانەبوو، رووناکی بدیبا، ئەگەر سەرۆك ئۆزال لە ژیاندابمابا"**. بەم قسەیەشی دەزگایەکی دیاریکراوی دەوڵەتی بە ژەهرخوارکردنی تۆمەتبار دەکرد[1].

مردنی ئۆزال بۆشاییەکی سیاسی وای پەیداکرد زەحمەت بوو پڕبکرێتەوە، سیاسەتمەدارێکیش نەبوو، زاتی ئەوە بکات کە ئەوەی ئۆزال دەستی داوەتی، تەواوی بکات. دووبارە سیاسەت لە تورکیا دوای چەند هەفتەیەك لە بەستەڵۆکی، بە هاتنە سەرکاری سلێمان دێمیرێل چووە ناو بازنەیەکی بۆشەوە. لە رۆژە یەکەمینەکانی وەرگرتنی سەرۆکایەتی کۆماردا، دۆسیەی پرسی کورد کەوتە دەست عەسکەرەوە[2]. هەڵبژاردنی تانسۆ چیلەر لە حوزەیراندا بۆ پۆستی سرۆك وەزیران، بەهۆی کەمی شارەزایی لە بابەتەکانی ئەمن و سیاسەتی دەرەوە، خۆی لە خۆیدا بە واتای بە هێزبوونی دەستی توندرەوەکان و عەسکەر دەهات[3]. چیلەر ویستی لەسەر شێوەی نموونەی (باسك)[4] گرنگی بە پرسی کورد بدات، دواتر پاشەکشەی کرد و پێی باشتر بوو بەدوای دێمیرێل بکەوێت و رووبەڕووی عەسکەر لەم پرسەدا نەبێتەوە[1].

[1] - سەیری: وەلات، العدد (2)، 28 أيار، 1993؛ جوناثان راندل، المصدر السابق، ص 370.

[2] -Omer Taspinar, Op. Cit., P. 107.

[3] -Ibid, P. 105.

[4] - نموونەی باسکی: کە بۆ هەرێمی (باسك) دەگەڕێتەوە، ئەو هەرێمە گەورەیەیە کە لە چیاکانی بیرینیە لە رۆژهەڵاتی سنووری نێوان فەڕەنسا و ئیسپانیا درێژ دەبێتەوە، رووبەرەکەی 20 هەزار کم دووجایە، هەرێمی باسك لە رووی سیاسییەوە لە نێوان فەڕەنسا و ئیسپاینا دابەشکراوە. ئەو هەرێمە تا کەناری کەنداوی بسکای درێژدەبێتەوە. ناوچەکە بەشێوەیەکی گشتی مێژووییە و گەلی باسك تێیدا نیشتەجێیە و بە زمانی خۆیان باسکی قسەدەکەن. هەیانە داوای جودابوونەوە لە ئیسپانیا و فەڕەنسا دەکەن، رێکخراوی (ئیتا)ی جوداخواز بەناوبانگترین=

هەرچەندە ئاگربەست بە کردەوە لە 24ی ئایاری 1993 کۆتایی پێهات، کاتی گرووپێك لە جەنگاوەرانی پارتی کرێکارانی کوردستان 33 سەربازی تورکی نا چەکداریان بەبێ ئاگادارکردنەوەی ئۆجەلان کوشت، ئۆجەلان رووداوەکەی بە "**مۆن**" وەسفکرد[2]. دێمیرێل هەرگیز ئەو رێگایەی کە ئۆزال دەستی پێکردبوو، تەواو نەکرد و بۆئەوەی ئاشتی و چارەسەری پرسی کورد بە ئاشتییانە بکات و ئەو رووداوە ببەزێنێ، بەڵام بێ ئەوەی ئەمە بەمانای یەکەم وەرگرتنی کاریگەری و مەترسییەکانی رووداوەکە بێت، لەبەرئەوەی ئەو رووداوە پاساوی گونجاوی بەدەست ئەوانەی لەگەڵ چارەسەری سەربازی پرسی کورددا و لەناوەوە و دەرەوە هەڵوێستی بەهێزکردن.

ئاگربەستەکەی پارتی کرێکارانی کوردستان و وەڵامەکەی ئۆزال لە هیوایەکی کورت بەولاوە هیچی دیکە نەبوو. هەروەك واقیع و رووداوەکان دواتر سەلماندیان. بە کۆتاییهاتنی ئاگربەستەکە، دووبارە ململانێیەکە بە خێرایی گەیشتە ئاستەی پیوانەییەکان، کە پێشتر نموونەی نەبوو، لە رووی چڕی و قەبارەی زیانەکانی. لە دەستپێکی نیوەی ساڵی 1993 سوپای تورکی و پارتی کرێکارانی کوردستان لە خولێکی تازەدا ناوچە کوردییەکانیان کردە گۆڕەپانی تیرۆر و توندوتیژی. بە گوێرەی ئەوانەی گرنگی بە بابەتەکە دەدەن "**تاکە چارەسەرێك کە بە مێشك دادەهات، ئەوە بوو کە زیاتر هێز و توندوتیژی لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵات بەکار بهینرێت**"[3]. بە ئاشکرا دیار بوو کە دێمیرێل ئامادە نەبوو ئەو پرۆژەیەی کە ئۆزال دەستی پێکردبوو، تەواو بکات،

=رێکخراوی باسکە کە بە تیرۆر تۆمەتبارە. هەرێمەکە خاوەن ئیدارەیەکی ئۆتۆنۆمی و نامەرکەزییە و خودان مافی سیاسی و کلتووری فراوانە، سەربارى ئەمانەش هەیانە داوای سەربەخۆیی تەواو لە ئیسپانیا دەکەن. سەیری: ویکیبیدیا، الموسوعة الحرة، متاحة على الموقع الالكتروني التالي: (http://ar.wikipedia.org/wiki/).

(1) -Carol Migdalovitz, "Turkey's Kurdish Imbroglio and U.S. Policy", in: Sophia Lahlos, Turkey: Current Issues and Background, Nova Science Publishers, New York, 2003, P. 96

(2) -Michael Gunter, The Kurds and The Future..., P. 80.

(3) -Michael Gunter, The Kurds and The Future..., P. 80.



سەبارەت بە چارەسەری ئاشتییانەی پرسی کورد. فشاری دامەزراوەی سەربازی لە سەر دێمیرێل وایکرد دووجار لە دوو کودەتای 1971 و 1980 لە کار لاببدەن، هەروەها لە رابردوو ئەو پیاوە شتێکی وای نەبوو کە وای لێبکات لە پرسی کورد وە پرسێکی ئەتنی جیاواز بکات و کینە هەڵگرتن و نا متمانەیی بە ئۆزال بەس بوو بۆئەوەی بەلای عەسکەردا بشکێنێتەوە و دیدگای ئەوان لەبارەی پرسی کوردەوە پەسند بکات[1]. سەبارەت بە سەرۆك وەزیرانەکەی (تانسۆ چیلەر)، ئەوا رێرەوی ژیانی ئەوەی بەرجەستە دەکرد، کە تا چەند سیاسییەکانی تورکیا هەژارن. بۆ دوورخستنەوەی لە بیروڕاکانی کار و ماندووبوونێکی زۆری نەدەویست، بەڵکو هەوڵە زۆرەکانی بۆ رازیکردنی عەسکەر، وایکرد زیان لە رەوایەتی حکوومەتی مەدەنی بگەیەنێ. هەرچەندە پرۆسەکانی راگواستنی گوندەکان و رفاندن و تیرۆرکردن، بەشێوەیەکی توند لەماوەی دوو ساڵی حکومڕانی چیلەردا زیادی کرد، بەڵام ئەو بە هیچ شێوەیەك هەراسانی خۆی لەو سەرکوتییانە پیشان نەدەدا[2]. ستراتیژی جەنگی تایبەت کە حکوومەت لە سەرەتای تەمووزی 1993 لەلایەن دەزگا سەربازییەکانەوە دەستی پێگیرا و بەوەی پێی دەگوترا "**تیمی تایبەت** Ozel Tim"، چالاکی گەورەی خۆی سەلماند. ئەو تیمە زۆربەیان لە سەربازە کۆنەکان لەوانەی خودان شارەزایین پێکهاتبوو، سوپای نوێ خودان لێهاتوویەکی بەرز و ئیمتیازاتێکی فراوان بوو، یەکەکانی ئەو سوپایە بە فەرمانی سەرۆك ئەرکان و هەندێکیشیان بە فەرمانی وەزیری ناوەخۆ و ئەمن، کاریان دەکرد، ژمارەیان لە نێوان 50 تا 60 هەزار کەس دەبوو، بۆ ناوچەکانی باری لەناکاو دەنێردران. چیلەر ئەوانەی بەو "**مێرولانە ناوبرد کە پارتی کرێکارانی کوردستان دەخۆن و ئەو پارتە لە رەگوڕیشەوە دەردێنن**"[3]. هەرچەندە تیرۆرکردنی نەیارانی

(1) - هنري باركي وغراهام ڤولر، المصدر السابق، ص 113.

(2) - جوناثان راندل، المصدر السابق، ص ص 375 –374.

(3) - محمد نور الدين، تركيا في الزمن...، ص 116؛

Carol Migdalovitz, "Turkey's Kurdish Imbroglio and U.S. Policy", Pp. 92-93.

دەوڵەت لە شەقامەکاندا کەم بووەوە، بەڵام ژمارەی بزربوان و رفێنراوان بەشێوەیەکی زۆر زیادی کرد، بەهۆی **"تیمی تایبەت"** و هەواڵگری هێزی ژەندرمە (دەرك)ی تورکی JITM ژمارەیەکی زۆر لە نەیاران و ئەوانەی هاوسۆز بوون لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان لە ناوبران و لاشەیان لە زبڵدان و سەر شەقامە چۆڵەکان فرێدران و ئەوانی دیکەش هەرگیز نەگەڕانەوە[1].

ئەو ئاگربەستە نوێیەی ئۆجەلان لە ئازاری 1994 رایگەیاند پشتگوێخرا[2]. ئاشکرا بوو کە چیلەر بە تەواوەتی دەستی لە دۆسیەی کورد بۆ بەرژەوەندی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکی هەڵگرتووە، کە عەسکەر لەو ئەنجوومەنە دەستی باڵایان هەبوو، بە رەزامەندی تەواوی دێمیرێلی سەرۆك کۆمار کە رایگەیاندبوو **"هەر شتێ یەکانگیری ئاساییشی نەتەوەیی بێت، هیچ حکومەتێك و پەرلەمانێکی هەڵبژێردراو ناتوانێت رای تێدا بدات لە تورکیا"**[3]. دەسەڵاتی باڵا و دوا قسە لەبارەی پرسی کورد و جەنگ لەدژی پارتی کرێکارانی کوردستان بە دەستی سەرۆکایەتی ئەرکان بوو، کە ئیسماعیل حەقی قەرەدای I.H.Karadai لە ئابی 1994ەوە ئەو پۆستەی وەرگرت و سەرکردە مەدەنییەکانی بە تەواوی پەراوێز خست، ئەو پیاوە ژمارەیەك تەکتیك و پلانی تایبەتی دارشت بەهۆیەوە تای تەرازووی بەلای حکومەتدا شکاندەوە، کە ئەوکات سەرکەوتنەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان گەیشتبووە لوتکە، کە وای دێمیرێلی لەسەرۆکی تورکیا کردبوو بڵێت **"تورکیا لە سەرەوبەندی دابەشبوونە"**[4].

پارتی کرێکارانی کوردستان بۆ هێشتنەوەی جلەوەی دەستپێشخەری بەدەستی خۆی و وەك وەڵامێکیش بۆ هەنگاوە روو لەسەرەکانی حکومەتی تورکی، پارتەکە لە سەر هەدوو ئاستی ناوەوە و دەرەوە زنجیرەیەك چالاکی ئەنجامدا، تا کۆتایی ساڵی 1993 پارتەکە 20 گەشتیاری رۆژئاوایی، کە

(1) - وەلات، 18 حزیران 1993.

(2) - وەلات، 5 کانون الاول 1994.

(3) -Michael Gunter, The Kurds and The Future..., Pp. 74-75.

(4) - وەلات، 26 کانون الاول 1994.



ئەمریکییەکیان لە نێو بوو، رفاندبوو، ئەوانەی بەبێ مەرج و ئازاردان ئازاد کرد، ئەو چالاکییە تەنها بۆ مەبەستی راگەیاندن بوو[1]. هەروەها چالاکی پارتەکە بە مامۆستایانی قوەتابخانەکانیش گەیشت و ژمارەیەکی لێکوشتن کە بە **"بەکرێگیراوی حکوومەت"** وەسفی کردن. راپۆرتەکان ئاماژەیان بۆ جێهێشتنی کۆمپانیا و دامەزراوە ئابوورییەکان کرد، بەهۆی نەبوونی ئارامی ئاسایش لە ناوچەکە و زیاتر خراپبوونی رەوشەکەوە، بەکردەوە چەند لقێکی بانکەکان رویشتن و کاری گەشتیاری راوەستا، ئەو پرۆژانەی کە تەواونەکرابوون وەستێنران، هەتاکو کارکردن لە پرۆژەی گاپیش (پرۆژەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ GAP) راوەستا[2]. کردەوەی رفاندن و کوشتن و هەڕەشە لە کارمەندانی کۆمپانیا نەوتییەکان وایکرد کارکردن لەو پرۆژانە بوەستێ، بۆ نموونە کۆمپانیای مۆبیل Mobil ی نەوتی لقێکی لە شاری باتمان داخست. لە کانوونی دووەمی 1994 پارتەکە بۆڕی نەوتی کەرکوك–یورتالیك Yumurtalik ی لە ناو تورکیا تەقاندەوە، تێچوونی چاککردنەوەی ئەو بۆرییانە بە ملیۆنیك دۆلار مەزەندە کرا، بەمەش پارتەکە توانی هەڕەشە لەسەر تەواوی پیشەسازی نەوتی تورکی دروست بکات، کە نزیکەی لە 90٪ی بەرهەمی نەوتی تورکی لە باتمان دایە[3].

لە سەر ئاستی دەرەوە پارتەکە بواری چالاکییەکانی بۆ دەرەوەی سنوور بۆ ئەورووپا فراوانکرد، هێرشی لە دژی شاندە دیپلۆماسییەکانی تورکی و شاندی پیاوانی کاری تورکی لە ئەورووپای رۆژئاوا ئەنجامدا. لە تشرینی دووەمی 1993 ەوە ئەو باوەڕە باوبوو کە پارتی کرێکارانی کوردستان بەرپرسی ئەو زنجیرە هێرشە تیرۆریستییانەیە کە کرایە سەر دامەزراوە تورکییەکان لە ئەورووپا، کە

(1) -Carol Migdalovitz, "Turkey's Kurdish Imbroglio and U.S. Policy", P. 92.

(2) -Michael Gunter, The Kurds and The Future..., P. 81.

(3)-U.S. DEPARTMENT OF STATE, TURKEY HUMAN RIGHTS PRACTICES, 1994, FEBRUARY, 1995. Via at: (http://www.hri.org/docs/USSD-Rights/94/Turkey94.html); Carol Migdalovitz, "Turkey's Kurdish Imbroglio and U.S. Policy", P. 92; وەلات، 1994/3/1.

خۆی لە فریدانی نارنجۆك بۆ سەر بانكە توركییەكان و ئاژانسەكانی سەفەركردن و نووسینگەكانی هێڵی فرۆكەوانی هەواڵ و چێشتخانەكان و بالیۆزخانەكان دەبینییەوە. پارتەكە لە 28 شار لە ئەڵمانیا و بەریتاینا و بەلجیكییا و دانیمارك و فەڕەنسا و سویسرا ئەو چالاكییانەی تێدا ئەنجامدا[1]. لە وەڵامی ئەمەدا ئەڵمانیا دەستی بە داخستنی نووسینگە و بارەگاكان و دامەزراوەكانی ئەو پارتە كرد و راوەدووی ئەندامەكانی نا، دوای ئەڵمانیا، فەڕەنسا و تەواوی وڵاتانی ئەورووپی ئەو كارەیان كرد[2].

پارتی كرێكارانی كوردستان بریاری دا **"جەنگی سەراپاگیر"** لە دژی دەوڵەتی توركی بەرپا بكات و ئۆجەلان لە كۆنگرەی پێنجەمی پارتەكەی كە لە كانوونی دووەمی 1995 بەسترا سوێندی خوارد كە **"ساڵی 1995 ساڵی هەنگاوێكی زۆر بێت بۆ بەرژەوەندیمان"**[3]. پارتەكەی بەشێوەی زیاد بە ئاراستەی پیادەكردنی سەروەری راستەقینە بەسەر ناوچەكانی باشووری رۆژهەڵاتی رۆیشت و ناوچەی بۆتانی بۆ ئیدارەی جەنگ راگەیاند، كە پیادەكردنی هەر چالاكییەكی حیزبی یان رۆژنامەگەری توركی لەوێ قەدەغەكرد، دەبوو ئەوانەی بۆ نووسینی راپۆرت لەبارەی رەوشەكە دێنە ناوچەكە، مۆڵەتی رێپێدان لە پارتی كرێكارانی كوردستان وەربگرن. جگە لەمانە رۆژنامەكانی توركی جگە لە ناو بنكەكانی پۆلیس نەبیت لە هیچ شوێنیكی دیكە نەفرۆشران. بۆ جێبەجێكردنی ستراتیژی نوێی پارتەكە كە لەسەر بنەمای گواستنەوەی جەنگ بۆ قووڵایی خاكی توركی وەستابوو، جەمیل بایك Cemil Bayik ی سەركردەی سوپای رزگاری گەلی كوردستان هۆشداری دایە ئەو بیانییانەی كە بەمەبەستی سیاسی یان روماڵكردنی رووداوەكان بەبێ مۆڵەتی پارتەكە دێنە توركیا. لەبەیاننامەیەكی پارتەكەدا

[1] -Carol Migdalovitz, "Turkey's Kurdish Imbroglio and U.S. Policy", P. 92.

[2] -Foundation for Middle East and Balkan Studies, SEPARATIST TERROR: MENACE OF THE POST COLD WAR PERIOD: A Case Study of the PKK in Turkey. Via at: (http://www.fas.org/irp/world/para/pkk.htm).

[3] - وەلات، 13 شباط 1995.



هاتبوو كە بڕیاردراوە كەرتی گەشتیاری لە وڵات بكرێتە ئامانج، ئەو كەرتەی كە ساڵانە نزیكەی 4 تا 5 ملیار دۆلاری داهات بوو، بەكردەوە هەندێ گەشتیار رفێنران و چەند گوللە هاوەنێكیش بەسەر دەزگا گەشتیارەكان هاوێژران[1].

لە ئەیلولی 1995 رۆژنامەكانی توركیا راپورتێكیان بڵاوكردۆتەوە باسی هەبوونی شانەی پارتی كرێكارانی كوردستان لە هاتای (ئەسكەندەرۆن) دەكەن. هەر وەكو روژنامەی حوریيەتی توركی باسی كردبوو لە ژمارەی بڵاوكراو لە ئەیلولی 1995)، ئاشكرا بوو كە ئۆجەلان دەیویست هاتای بكات بە بۆتانیكی دیكە و چالاكییەكانی پارتەكەی لەوێ زیاد بكات. بە گوێرەی رۆژنامەی توركی پارتەكە لە سەرەتای نەوەدەكانەوە ویستوویەتی بۆ ناوچەكانی ئەدەنە و مەرسین و هاتای دزە بكات، بەڵام لە سەربازگیری نوێ لەو ناوچانە سەركەوتوو نەبوو، بەهۆی ئەو پەردە ئەمنیە توندەی كە هێزە چەكدارەكان لە هاتای و ناوچەكانی دەوروبەری سەپاندبوویان[2].

هەرچۆنێ بێت، ئەوا ساڵی 1995 ئەو ساڵە بوو حكوومەت جلەوی دەستپێشخەری لە پارتی كرێكارانی كوردستان وەرگرتەوە، ئەمەش پێچەوانەی پێشهاتەكانی عەبدوڵڵا ئۆجەلان بوو كە پێشتر لە كانوونی دووەمی 1995 رایگەیاندبوو، كە **"قۆناغی خەبات چۆتە قۆناغی سەركەوتنەوە"**. لە بەهاری 1995 هەولە جەنگییە گەورەكەی توركیا، دەستكەوتی بوو، بەرەبەرە عەسكەر بەسەر زۆربەی ناوچە لادێیەكانی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات زاڵ بوو. ئەمەش بەهۆی ئەو هەڵمەتە چڕوپڕانەی سوپا كە بووە هۆی خاپووركردنی 300 گوند[3]، دواتر زنجیرەیەك چالاكی لۆجستی پارتی كرێكارانی كوردستانی بلۆككرد، هەروەها بەهۆی جەنگی نهێنییەوە كە هێزی شاراوە لەرێگەی تیمە تایبەتییەكانەوە بەڕێوەیان دەبرد، لەسەرووی هەموویانەوە تیمە تایبەتییەكان و هێزەكانی بزووتنەوەی تایبەت Ozel Hareket، كە هەر بە پاككردنەوەی

[1] Michael Gunter, The Kurds and The Future of Turkey..., Pp. 81-82.

[2] -Stala M. Gavrielides, Op. Cit., P. 80

[3] -Michael Gunter, The Kurds and The Future Turkey..., P. 83.

چیاکان و لابردنی پەناگە شاراوەکانی پارتەکە، بەڵکو لەگەڵ سوپا بەشداری لە گەورەترین هەڵمەتی داگیرکاری کرد کە بۆ دەرەوەی سنووری تورکیا بۆ باکووری عێراق ئەنجامدرا، کە بە "**پرۆسەی پۆڵا**" ناسراوە، ئەو پرۆسەیە لە 21 ئازاری 1995 تا 4ی مایسی 1995 بەردەوام بوو[1].

تا دەگاتە بەر لە ناوەڕاستی 1995، ئەوە روون بووەوە کە پارتی کرێکارانی کوردستان زۆریك لە هێز و کاریگەری و دەسەڵاتی لە دەستداوە، هیچی دیکە شەوانە دەسەڵاتی نابێت و ناتوانێت مەدەنییەکان بۆ سازکردنی خۆپیشاندان ناچار بکات، هەروەها دووکاندار و کۆگاکان لە دیاربەکر و سلۆپی Silopi و جەزیرە چیدی وەڵامی بانگەشەکانی مانگرتن و داخستنی دووکانەکانیان نادەنەوە، قەبارە و جۆر و ژمارەی چالاکییەکانی کە یەکەکانی جەنگاوەرانی پارتەکە دەیانکردە سەر پێگە قایمەکانی سوپا و ئامانجەکانی ناو شارە گەورەکان بۆ چالاکی بۆسە دانانەوە و چاندنی مین لە رۆخی شەقام و هێرشکردنە سەر گوندێکی لاواز گۆڕا[2].

عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە کانوونی یەکەمی 1995 [3]بۆ جاری دووەم ئاگربەستی راگەیاند بۆئەوەی هەلێك بە حکوومەتە نوێیەکەی مەسعود یەڵماز M. Yilmaz (6ی ئازاری 1996 تا 28ی حوزەیرانی 1996)، ئەو راگەیاندنەی ئاگربەستە ئاماژەی بە بڕی ئەو تەنگی و پاشەکشە و ماندووبوونەی کە بەسەر حیزبەکەیدا هاتووە، دەدا[4].

هەرچەندە ئەورووپییەکان و کەسایەتی جۆراوجۆر فشاریان نواند، هەروەك چاوەڕوان دەکرا، بانگهێشتەکەی ئۆجەلان رەتکرایەوە[5]. دەستپێشخەرییە نوێیەکەی مەسعود یەلمازی سەرۆك وەزیران و بەلێندان بە "**دۆزینەوەی چارەسەری سیاسی**" و کۆتاییهێنان بە باری لە ناکاو و پەلەکردن لە

(1) - جلال عبد الله معوض، المصدر السابق، ص 46.

(2) -Michael Gunter, The Kurds and The Future..., P. 84.

(3) - شمس الوطن، 23 كانون الاول 1995.

(4) - المحادثات السرية...، المصدر السابق، ص 52.

(5) - وەلات، 1 شباط 1996.



چەسپاندنی مافە کلتوورییەکانی هاووڵاتی کوردی بە بەکارهێنانی زمانی کوردی و کردنەوەی وێستگەیەکی تەلەفزیۆنی کوردی[1]، هەموو ئەمانە جگە لە بەڵێنی هەڵبژاردن کە لەو قسانە تێپەڕی نەدەکرد کە هەموو سەرۆکی پارتە تورکییەکان لە سەرەتای نەوەدەکانەوە لە میانەی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن دەیانگوتەوە، بە سلێمان دیمیرێل و چیلەریشەوە. لە راستیدا یەلمازیش دەسەڵاتێکی راستەقینەی نەبوو وەك ئەوەی عەسکەر هەیبوو، ئەوان (عەسکەر) پرسی کوردیان بە دەستێکی ئاسن لە دەستی خۆیان گرتبوو و بەتەواوی بۆ خۆیان مۆنۆپۆلیان کردبوو.

بە هاتنی ساڵی 1996 زیاتر لە 4 هەزار گوند چۆڵکرابوون زیاتر لە 1.5 ملیۆن خانووش سووتێنرابوون، 4 ملیۆن کورد بۆ گواستنەوە بۆ شوێنیکی دیکە ناچارکرابوون، هەروەها زیاتر لە 30 هەزار سەربازیش کوژرابوون، هەندێ سەرچاوە ژمارەی کوژراوان لەوەتەی ساڵی 1980ەوە لە نێوان 60 تا 100 هەزار کەس مەزەندە دەکرد[2].

ئاستەکانی ململانێ لە ساڵی 1996، 350 هەزار کەسی لە دامەزراوەی سەربازی و هێزەکانی بزووتنەوەی تایبەت، کە بۆ ئەنجامدانی ئەرکی تایبەت ئامادەبوو، زۆربەیان لە ئەندامانی بزووتنەوە نەتەوەییە توندرەوەکان بوون[3]، بەخۆیەوە خەریك دەکرد[4]. بەگوێرەی شاهێد حاڵەکان، شان بەشانی ئەو پرۆسانە وەحشیەتگەری و هەڵسوکەوتی شەرمهێن کە سەربازە تورکەکەکان ئەنجامیان دەدا لە لەخۆوە گرتن و کوشتن و دەستدرێژی سێکسی و هەرەشەکردن بە دەستدرێژی و دزی موڵکی گواستراوە و مەڕوماڵات و ئازوقەی لە خۆگرتبوو[5].

(1) -Michael Gunter, The Kurds and The Future of Turkey..., P. 135;
المحادثات السرية بين PKK...، ص ص 53–56.

(2) -Wayne S. Cox, Op. Cit., Pp. 234-235.

(3) - وەلات، العدد (4)، 18 حزيران 1993.

(4) -Michael Gunter, The Kurds and The Future..., P. 81.

(5) - منظمة العفو الدولية، تركيا: ضعوا حداً للعنف الممارس ضد النساء في الحجز، الوثيقة رقم (EUR44/006/200)، ص ص 16–20.

هەرچەندە نەجمەدین ئەربەكان لە كۆتایی حوزەیرانی 1996 وەك یەكەم سەرۆك وەزیرانی ئیسلامی لەوەتەی كۆمار لە 1923 دامەزرا، هاتە دەسەلآت، ئاماژەیەك بوو بۆ شێوازێكی دیكەی جیاواز لە ئایدیۆلۆژیای فەرمی دەولەت كە لەسەر پرەنسیپەكانی كەمالی نەتەوەیی عەلمانی دامەزراوە، بەلآم هیچ شتێكی وا لە ئارادا نەبوو كە پالپشتی لەوە بكات كە ئەربەكان هەنگاوی كرداری بە ئاراستەی دۆزینەوەی چارەسەری ئاشتییانەی پرسی كورد دەنێ. لێدوانەكانی لەبارەی "**رایەلەكانی برایەتی**" و "**چارەسەری ئیسلامی پرسی كورد**" و ئەو قسەیەی ئەربەكان "**هیچ شتێك لە ناكۆكییە ئەتنییەكان بێ قیمەتر نییە**" هەموو ئەمانە جگە لە دروشمگەلێك كە بەهۆیەوە حیزبەكەی زۆربەی دەنگەكانی ناوچە كوردییەكانی باشووری رۆژهەلآتی ولآتی بۆلای خۆی كێشكرد[1].

هێزەكانی توركی لە راوەدوونای ئەندامانی پارتی كرێكارانی كوردستان بەردەوام بوو، وەك بەلگەی سەركەوتنی باری لەناكاوی لە 15 پارێزگای كوردی هەلگرت. لە 1997 بەدواوە هێرشكردنە سەر باكووری عێراق خەسلەتێكی دیاری سوپای توركی بوو. هەندێ لەو هێرشانە پێویستی بە جولاندنی نزیكەی 502 هەزار سەرباز وەك ئەوەی لە پرۆسەی (پۆلآ 1997) روویدا، كە بە هەماهەنگی تەواوی پارتی دیموكراتی كوردستان لە عێراق بەرێوەچوو. ئەو پرۆسەیە نزیكەی 36 رۆژ بەردەوام بوو و وایكرد زۆربەی هەرە زۆری ژێرخانی پارتەكە خاپوور بكرێت. بە گوێرەی مەزەندەكانی دەستەی ئەركانی توركی كە زێدەرۆیی تێدایە، زیانەكانی پارتی كرێكارانی كوردستان بە 2651 كوژراو و 444 دیل و برێكی زۆر چەك و تەقەمەنی و زیاتر لە 500 تەن خۆراك مەزەندە كرد، بەگوێرەی پرۆتۆكۆلی تایبەت هەموو پێگە و بارەگاكانی پارتی كرێكاران بە پارتی دیموكراتی كوردستان بەخشرا[2].

به زیادبوونی فشاری توركی، بەهۆی دەرەنجامەكانی سیاسەتی "**زەوی سووتێنراو**" كە سوپا لە میانەی پرۆسەكاندا جێبەجێكرد لە رێگەی بەزۆرە ملێ

[1] -Michael Gunter, The Kurds and The Future..., P. 85.

[2] - جلال عبد الله معوض، صناعة القرار...، ص 176.



چۆلكردن و فراوان كردنی هەلمەتەكانی راوەدوونان كە سەركەوتوو بوو لە دوورخستنەوە و كوشتنی ژمارەیەكی گەورە لە چالاكەكانی پارتەكە، بەهۆی هەموو ئەمانەوە پارتی كرێكاران زیاتر خۆی لە پێگەی بەرگری دەبینییەوە و خۆراك و پەناگەی لەدەستدەدا، ئەو ناوچەیەی كە پارتەكە زالْ بوو بەسەریدا رۆژ بەرۆژ تەنگ دەبووەوە، بەمەش شكستی ئەو تەكتیكەی چەسپاند كە پارتەكە لە لێدە و راكە بۆ جەنگی كراوە و رووبەرووبوونەوەی راستەوخۆ وەرچەرخاند[1].

لێرەدا هاوكاری توندوتۆلی ئیسرائیل فەرامۆش ناكرێت، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە تشرینی دووەمی 1994 هەردوولا رێككەوتننامەی هاوكارییان لە بواری لەناوبردنی تیرۆر مۆركرد، هەروەها لە شوباتی 1996[2] رێككەوتننامەی هاوكاری سەربازییان مۆركرد. لە رێككەوتننامەی دواییەوە فرۆكەوانە توركییەكان فرۆكەكانیان لە ئاسمانی توركی دەسوراندەوە و راوێژیان لەبارەی سەركوتكردنی یاخیبوونەكان پێشكەش دەكرد[3]، بۆیە ئۆجەلان لە ئەیلولی 1998 بۆ جاری سێیەم ئاگربەستی خستەڕوو، بەبی ئەوەی لە توركیاوە ولآم بدرێتەوە. لە مانگی تشرینی یەكەمی 1998 لەناكاو توركیا 10 هەزار سەربازی لەسەر سنووری باكووری سووریا كۆكردەوە و داوای رادەستكردنەوە یا دەركردنی عەبدوللآ ئۆجەلانی[4] كرد، ئەگینا توركیا "**بەو زمانە لەگەلْی مامەلە دەكات كە سووریا تێی دەگات**"، ئەمەش بە گوێرەی بەیاننامەی ئەنجوومەنی

[1] - وەلات، 15 حزیران 1994 .

[2] – بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی ئەم رێكەوتنامە و پالنەرەكانی سەیری، خلیل علی مراد، "دوافع التحالف التركي–الصهيوني"، دراسات سياسية (بيت الحكمة–بغداد) العدد 2، صيف 1999، ص ص 15–22.

[3] - جلال عبد الله معوض، صناعة القرار...، ص165.

[4] – بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی گەشەكردنی تەنگژەی چریی ئێكەم 1998 لە نێوان توركیا و سوریا سەیری، خليل علي مراد، "العلاقات السورية–التركية في ضوء ازمة اوجلان، تشرين الاول/ اكتوبر 1998"، مجلة اوراق تركية معاصرة، العدد 16، مركز الدراسات التركية، جامعة الموصل، ربيع 2001، ص ص 71–88.

ئاسایــشی نەتــەوەیی تــورکی[1]، دوای هەماهەنگییــەکی تــەواو لــە نێــوان ژەنەرالەکانی تورکیا و ئەمریکا و ئیسرائیل و دوای ئەوەی ئۆجەلان بە گوێرەی رێککەوتنامەی ئەدەنەی 1998 لە سووریا دەرچوو و بەرەو رووسیا بەرێکـەوت و دواتـر بـۆ رۆمـا کـە لـەوێ لـە تـشرینی دووەمـی 1998 دەسـتگیرکرا، دوای ئــازادکردنی رایگەیانــد کــە ئامادەیــە چــالاکییە ســەربازییەکان بوەســتێنێ لەبەرامبەر دۆزینەوەی چارەسەرێکی ئاشتییانەی پرسی کورد. دواتـر ئۆجـەلان رۆمـای بــە فڕۆکەیــەکی ئــەمنی ئیتــالی بــەرەو رووســیا لەســەر داوای خـۆی بەجێهێشت[2]. لەوێ بەرەو شوێنیکی رانەگەیەنراو چوو، بۆ ئەسینا، لەوێش بە فشارێکی زۆری ئەمریکی دەرکرا[3]، لەوێش بۆ نایرۆبی، کـە بنکـەی هـەواڵگری ئەمریکایـە لـە ئـەفریقیا، لـە 15ی شـوباتی 1999 لـە رێگـای بـۆ فڕۆکەخانـەی نایرۆبی بەرەو ئەفریقیا رفێنـرا و رادەسـتی هێـزە تایبەتییـەکانی تورکیـا کـرا، ئــەویش لــە دوورگــەی ئیمیرالــی Imrali لــە دەریــای ئیجــە Ege Deniz لــە بەندیخانەی تاکەکەسی، دەستبەسەری کرد[4].

بەدەستگیرکردنی ئۆجەلان چالاکی کورد لە تورکیا، بە پـارتی کرێکـارانیش، لـە خـەباتی چـەکداری کـە پارتەکـە و رێکخـستنە کوردییـەکان گرتبوویانەبـەر کـەم نەبووەوە، بەڵکو خەباتی کورد لە تورکیـا لایـەنی سیاسـی هەمـەجۆری بەخۆیـەوە بینی، چالاکییە راگەیاندنەکان یەکێك بوو لەو لایەنانە. وێستگەی ئاسمانی Med Tv کرایـەوە، کـە گرنگـی بـە جـەنگی بـەرپابووی نێـوان حکوومـەتی تـورکی و پـارتی کرێکارانی کوردستان لـە باشـووری رۆژهـەڵاتی تورکیـا دەدا. ویـستگەکە لەوەتـەی ساڵی 1990 [5] ەوە بەرنامەکانی خۆی پەخشدەکرد، سەباری هەوڵەکانی تورکیـا

[1] - محمد نور الدين، حجاب وحراب...، ص ص 44–50.

[2] -Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds", P. 37.

[3] - السفير، العدد، 20 شباط 1999.

[4] -The New York Times, 20 February, 1999 .

[5] – ئەو وێستگەیە لە ناوەڕاستی 1988 ەوە لە باکووری ئەورووپا وە کەناڵێکی لۆکالی بەرنامەکانی پەخش دەکرد، دواتر لە ساڵی 1990 پەخشەکەی بووە ئاسمـانی و هـەموو ئەوانـەی ئـامێری سـەتەلایتیان هەیـە لـە تورکیـا و سـووریا و عێـراق و ئێـران دەتـوانن پەخـشەکە وەربگـرن،=



بۆ داخستن و بچووککردنەوەی وێستگەکە، بەڵام سەرکەوتوو بـوو لـە کۆکردنـەوەی ژمارەیەکی زۆر لە بینەرانی کورد لە ناو تورکیا و دەروەی تورکیا[1].

هـەروەها ئـەو رۆژنامانـەی کـە دەربـڕی کـورد بـوون لـە تورکیـا، تـەنگیان پێهەڵچنرا، بۆ نموونـە ئـەوەی رووبـەڕووی رۆژنامـەی (رۆژنامـە) بـووەوە، دوای ئەوەی لە کانوونی یەکەمی 1991 رێگە بەدەرچـوونی یەکـەم رۆژنامـە بـەزمانی کوردی لە تورکیا بەناوی درا، هەروەها هەمان شت رووبەڕووی رۆژنامەی کوردی دیکەوە کە دواتر دەرچوون، وەك رۆژنامەی (نیـشتمانی نـوێ Yeni Ulke) کـە 44 تۆمەتی لە مانگێکدا رووبەڕوو کرایەوە[2].

لەمیانەی هـەردوو ئاگربەسـتەکەی (ئـازاری 1993– ایـار 1993) ئۆجـەلان، پارتی کرێکارانی کوردستان هەولیـدا سەرپەرشـتی کۆنگرەیـەکی نەتـەوەیی بـۆ سەرجەم پارتە کوردییەکان بکـات، بـە پارتـە کوردییـەکانی عێراقیـشەوە. ئـەو بیرۆکەیە لە سەر بنـەمای سـوود وەرگـرتن لـە ئـەزموونی کـۆنگرەی نیـشتمانی ئەفریقی یـا پـارتی گـۆنگرەی هینـدی یـا رێکخـراوی رزگـاریخوازی فەلەسـتینی بونیادنرابوو. بەڵام بەهۆی ترسی زاڵبوونی پارتی کرێکارانی کوردسـتان بەسـەر ئاراسـتەکانی هەولەکـە سـەرکەوتنی بەدەسـت نـەهێنا، بۆیـە هەوڵـەکان بـەرەو دامەزراندنی پەرلەمانی کوردی لە تاراوگە چوو، کە نوێنەری سـەرجەم کـوردانی جیهان بکات. ئەو پەرلەمانە لە هۆلەندا لە ماوەی 12–16ی نیسانی 1995 بـە بەشداری کەسـایەتی کـوردی و ئاشـووری و کەمینـەکانی دیکـەی کوردسـتان و نوێنــەرانی رێکخــراوە نیــشتیمانییەکان و رێکخراوەکــانی لاوان و کۆمپانیــا

=لەوکاتەوە ئەو وێستگەیە بووە دوژمنی ژمارە (1)ی ئاشکرای حکوومەتی تورکی . لێهاتوویی وێستگەکە بەهۆی پاڵپشتی دارایی رەوەندی کوردی لە ئەورووپا و ئەمریکای باکوور باش بوو، رۆلێکی گرنگی لە رووناکی خستنە سەر رەوشی ئازاراوی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا لە رێگەی کاسیتە ئاودیوکراوەکانەوە، بینی. لەو ساڵەوە تورکیا هەوڵی داخستنی ئەو کەناڵە دەدات، کـە بەهۆیەوە ناچار بووە زیاتر لە 8 جار شوێنی پەخشەکەی بگۆڕیت. سەیری
Wayne S.Cox, Op. Cit., Pp. 272-273

[1] - جوناثان راندل، المصدر السابق، ص378؛ کولستان گَورباي، المصدر السابق، ص 62.

[2] -David McDowall, Op. Cit., P. 429.

بازرگانییەکان یەکەمین دانیشتنی خۆی گرێدا، هەروەها لە پەرلەمانەکەدا شەش پەرلەمانتاری کورد لە پەرلەمانی تورکی بەشدارییان کرد، ئەوانەی کە حکوومەت حەسانەی بەهۆی بەشدارییان لە کۆنگرەیەك لەبارەی کورد لەپاریس لە 1993 لەسەر هەلگرتبوو[1].

ئەو پەرلەمانە هەوڵیدا پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپی و رێکخراوەکانی ئەورووپا و ئەمریکا ببەستێ، بەڵام زۆربەی ئەو وڵاتانە بەهۆی فشاری تورکییەوە رەتیان کردەوە دانی پێدا بنێن، بۆیە لە خۆ پێشکەشکردنی وەك لایەنکی سیاسی کە نوێنەری کورد بکات و رێگەی ئاشتی بۆ داواکردنی مافەکانی کورد گرتبێتەبەر، سەرکەوتوو نەبوو.

ئازاردان و راوەدوونان هەرتەنها کوردی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیای نەدەگرتەوە، ئەوانەی کە بەبیانوی شەڕ لەدژی پارتی کرێکارانی کوردستان، بەگوێرەی ئەحکامی لەناکاوەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرا، بەڵکو هەموو ئەوانەشی گرتەوە کە بەرگری لە ناسنامەی کوردی یان دژایەتی سیاسەتی تواندنەوە و بە تورککردن و تەواوی ئەو رێوشوێنە سەربازییانەی حکوومەتی تورکیان لە مامەڵەکردن لەگەڵ دۆسیەی پرسی کورد کردووە، بەڵکو هەتاکو ئەوانەشی گرتەوە کە لەدەرەوەی ئەو ناوچەیە (باشوور و رۆژهەڵاتی وڵات) خەباتی سیاسییان کردووە. دادگای ئەمنی دەوڵەت کاری ئەوانەی بەدەستەوە گرت، هەموو ئەو رۆژنامەنووس و بڵاوکەرەوەی کتێب و رۆشنبیران ئەوانەی کە وێران رەخنە لە سیاسییەتی دەوڵەت بەرامبەر کورد بگرن، رووبەڕووی تۆمەتی **"بانگەشەکردن بۆ بیری جوداخوازی"** دەبنەوە، ئیسماعیل پێشکچی دەستگیرکرا و بە 200 ساڵ حوکمدرا، چونکە لەسەر بیروڕا و هەڵوێستە لایەنگرەکانی بۆ کورد لەبارەی بەخشینی مافەکان بەکورد بەردەوام بوو. یەشار کەمال کە تەمەنی 71 ساڵ دەبوو، لەبەردەم دادگای ئەمنی دەوڵەتدا دادگایی کرا، بەهۆی ئەوەی لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ گۆڤاری (دیرشپیگل Der Spiegel)ی ئەلمانی دژایەتی قەدەغەکردنی زمان و کلتووری کوردی

(1) -Michael M. Gunter, Historical Dictionary…, Pp. 112-113.



کردووە. دوای تۆمەتبارکردن و حوکمدان لەسەری بە بەندی 22 مانگ یەشار گوتی **"لەم وڵاتە هیچ دیموکراتی و یاسایەك نییە"**[1]، بەگوێرەی رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی مافی مرۆڤ تورکیا ژمارەیەکی پێوانەیی لە پێشێلکاری لە مافەکانی رۆژنامەنووسان و دەستگیرکردنیان لە ساڵی 1995، تۆمارکردووە[2].

ئەمەش وایکرد دامەزراندنی هەر رێکخراوێکی کۆمەڵایەتی یا سیاسی کە بەرگری لەمافەکانی کورد بکات کارێکی زۆر سەخت بێت لە تورکیا. ئەو کەناڵ و پارتە سیاسییانەی کە کورد لەسەرەتای نەوەدەکانەوە بۆ بەرگرییەکی ئاشتییانە و ئاشکرا لە پرسی کورد پێکیهێنابوون، رووبەڕووی داخستن و دادگایی دەهاتنەوە. بۆ نموونە کەناڵی پارتی کاری گەلی کە لە ئەنجوومەنی گەورەی نیشتمانی تورکیدا لە ناو لیستی پارتی گەلی دیموکراتی سۆسیالیستی Sosyal Demokrat Halkci Partisi بەسەرۆکایەتی ئەردال ئینیۆ لە هەڵبژاردنەکانی تشرینی یەکەمی 1991 کورسی ئەنجوومەنەکە بەدەستهێنا، لە ساتەوەختی سوێندخواردنی پەرلەمانی دا، مافەکانی کوردیان وروژاند و رەخنەیان لەو سیاسەتە گرت کە حکوومەت لەدژی کورد گرتوویەتەبەر و پرسی کوردی تیکەڵ بە **"کێشەی تیرۆر کردووە"**، ئەو پارتە زۆر سوربوون لەسەر چارەسەری سیاسی کێشەکە، و سەرکۆنەی چارەسەری سەربازییان کرد و رازی نەبوون بە پارتی کرێکارانی کوردستان بگوترێت **"بزووتنەوەیەکی تیرۆریستییە"** و داوایان لە حکوومەت کرد بە میانگیری ئەوان دانوساندنی لەگەڵ دا بکریت[3]. ئەو تاکە حیزبە کوردییە لە تورکیا، کەوتبووە بەردەم هەڕەشەی داخستن بەهۆی تێزە سیاسییەکانیەوە لەبارەی کورد.

بۆ خنکاندنی هەر هەلێك کە تێیدا کورد پیادەی چالاکی سیاسی و مافە مەدەنییەکانی خۆی بەرێگای ئاشتییانە بکات، بەشێوەیەکی زیاد تەنگیان بە

(1) - جوناثان راندل، المصدر السابق، ص 375.

(2) - وەلات، العدد، 20 آذار 1995؛ New York Times, 13 July 1997.

(3) - گولستان گورباي، المصدر السابق، ص ص 71–70. وذکر مصدر اخر بان معظم اعضاء ذلك الحزب كانوا من مؤيدي حزب العمال الكُردستاني. ينظر،
Paul J. White and William S. Logan, Op. Cit., P .229.

پارتی کاری گەلی هەڵەچنی و ژمارەیەك لە ئەندامانیان کوشتن[1] و بۆمبیان فرێدایە ناو بارەگاکانی، لەپێناو پاشەکشەکردن لە هەڵبژاردنەکانی شارەوانی کە بریاربوو لە 1994 ئەنجام بدرێت، 6 کەسیان دەستگیر کرا و تۆمەتی جوداخوازییان خرایە پاڵ، دیاریترینیان لەیلا زانا Leyla Zana[2] و خەتیب دیجلە بوون، کە بە 15 ساڵ[3] بەندی حوکمدران، پارتەکە لە حوزەیرانی 1994[4] بەیەکجاری قەدەغەکرا، ئەندامەکانی پەنایان بۆ دامەزراندنی پارتێکی نوێ برد ئەویش پارتی دیموکراتی گەل Halkin Demokrasi Partisi بوو، سەربای تەنگهەڵچنینی دەوڵەت لە کردەی تیرۆریستی و تۆقاندن، توانی لە هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکەی کانوونی یەکەمی 1995 زیاتر لە 1.2 ملیۆن دەنگ بەدەستبهێنێت و پلەی دووەم لە دوای پارتی رەفای ئیسلامی وەربگریت لە ناوچە کوردییەکان. لە هەڵبژاردنەکانی 1999 ئەو پارتە لە 11 هەرێمی ناوچەکە بەهێزترین پارت بوو، لە هەڵبژاردنەکانی شارەوانی لە 9ی نیسانی 1999 سێ پۆستی گرنگی شارەوانی بردەوە، کە دیاربەکری گەورە شاری کوردی یەکێك بوو لەوان[5].

---

(1) - وەلات، العدد، 16 تموز 1993.

(2) - لەیلا زانا نوێنەرێکی کوردی پەرلەمانی تورکییە، لەسەر لیستی پارتی کاری گەلی بە نوێنەرایەتی شاری دیاربەکر چووە پەرلەمانی تورکیاوە. حکوومەت حەسانەی پەرلەمانی لەسەر ئەو و پێنج ئەندامی هەمان پارت هەڵگرت، لە ئازاری 1995 لەیلا زانا بە 15 ساڵ زیندانی حوکمدرا، ئەمەش بەهۆی ئەوەی بەهەردوو زمانی کوردی و تورکی لە پەرلەمان سوێندی یاسایی خوارد و گوتی ( ئەو سوێندە لە پێناو برایەتی هەردوو گەلی تورکی و کوردی دەخۆم). زانا لەلای رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ لە ئەورووپا و ئەمریکاوە رێزێکی زۆری هەبوو، خەڵاتی ( زاخارۆڤ)ی ئەورووپی بۆ ئازادی رادەربرینی پێ بەخشرا. سەیری:
Faruk Bildirici, Yemin Gecesi: Layla Zana'nin Yasamoykusu, Dogan Kitap, Istanbul, 2008; Michael M. Gunter, Historical Dictionary…, P. 216.

(3) - وە لات، 15 آب 1994.

(4) -Michael M. Gunter, Historical Dictionary…, P. 61.

(5) -Kemal Kirisci and Gareth M. Winrow, The Kurdish Question and Turkey, An Example of Trans-state Ethnic Conflict, Frank Cass, London-Portland, 1997, Pp. 137-138; Michael M. Gunter, Historical Dictionary…, Pp.60-61



هەرچەندە دەسەڵاتدارانی تورکی گەیشتنە ئامانجی خۆیان بە دەستگیرکردنی سەری یاخیبوونەکە، بەڵام هیچ هەنگاوێکیان بە ئاراستەی دۆزینەوەی چارەسەرێکی ئاشتییانە بۆ کێشەی کورد نەهاوێشت، هەروەك ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکرد، ئەوە لەبری ئەوەی رووداوەکە وەك هەلێك بۆ سازکردنی ئاشتەوایی و چاکسازی هەڵبقۆزرێتەوە[1]، لە سەرکوتکردنی کورد دریخی نەکرد، هێزەکانی ئاسایش هێرشیان بۆ سەر بارەگا و نووسینگەکانی پارتی دیموکراتی گەلی، لایەنگری کورد هینا، ئەو پارتە لە هەڵبژاردنەکانی شارەوانی ئازاری 1999 [2]رەوایەتی بەدەستهێنا، بەگوێرەی ئامارەکانی کۆمەڵەی مافەکانی مرۆڤ، لەماوەی چەند رۆژێکدا 3 هەزار ئەندامیان دەستگیر کران، و رووبەرووی ئازاردان بوونەتەوە، تاکو دوانیان لەژێر ئازارەوە گیانی سپاردووە[3].

هەرچی سەبارەت بە حکوومەتی تورکیش بوو، ئەوا ململانێکە دەچووە قوناغێکی تازەوە، واپێ چوو حاڵەتێکی سەربەخۆ و تایبەتی پێکهینابێ، ئەم راستییەش ئەو نیازە باشانەی کە راگەینراوی یەکەمینەکانی حکوومەت لەبارەی نوێنەرایەتی راستەقینەی کوردی لە پەرلەمانی تورکی هەرسپێهێنا. دەوڵەت جڵەوی زاڵبوونی بەسەر بابەتەکان لەدەستدا، کاتێ ئەندامانی گرێدراو بە دەزگای ئەمنی دەوڵەت و ئەوانەی دیکەش کە هیچ پەیوەندییەکیان نەبوو، جەنگیان لە دژی پارتی کرێکارانی کوردستان بەتایبەتی و کورد بەگشتی بەرپاکرد[4].

---

(1) - النهار، 12 آذار 1999.

(2) – هەرچەندە هیچ پارتێکی کوردی نەیدەتوانی بە ئاشکرا خۆی لە پارتی کرێکارانی کوردستان بەدوور بگریت، ئەمەش بەهۆی ئەو لایەنگیرییە فراوانەی پارتی کرێکارانی کوردستان لە نێو ریزەکانی کوردە سیاسییەکان هەیبوو، بەڵام هیچ یەکێك لەم پارتانە هەرگیز دەستپێشخەری دامەزراندی هەر جۆرە پەیوەندییەکی ئۆرگانی نەبوونە، وەك ئەوەی لە نێوان سوپای ئیرلەندی و پارتی شین فین لە ئیرلەندای باکووردا هەیە، پارتی شین ئەوە ناشارێتەوە کە باڵی سیاسی سوپای کۆماری ئیرلەندایە. سەیری: هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص 83.

(3) -Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds", P. 36.

(4) - هنري باركي وغراهام فولر، المصدر السابق، ص 114.

هەموو سیاسەتەکانی حکوومەتی تورکی لەبەرامبەر کورد، بە داخستنی تاکە پارتی سیاسی کوردی، ئەوەی چەسپاند کە ئەستەمە ناسنامەی کوردی پێ قەبوول بکرێت، ئەمەش مانای وابوو پاڵی بە ژمارەیەکی زۆر لە کوردەوەنا بۆ ئەوەی بچنە پاڵ پارتی کرێکارانی کوردستان یان هەر رێکخراوێك کە داوای سەربەخۆیی بکات، رێوشوێنە سەربازییەکانی حکوومەت و جەنگە بەردەوامەکانی بۆسەر شار و گوندە کوردییەکان و قەدەغەکردنی پارتە سیاسییەکانیان، لەلایەك بەمانای بەهێزبوونی دەسەڵاتی عەسکەر دەهات، لەلایەکی دیکەوە بەمانای جەمسەرگیری لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات دەهات، لەسایەی رەتکردنەوەی هەڵوێستێکی مامناوەند لەلایەن حکوومەتەوە، دانیشتوانی ناوچەکە دەبوو لە نێوان دوو هەڵبژاردن سەرپشك بن، یا ئەوەتا پاڵپشتی حکوومەت وەك پاسەوانانی لادێ دەکەن، ئەوەش مانای دوژمنداریکردنی پارتی کرێکارانی کوردستان دەهات، یا ئەوەتا دەچنە پاڵ ئەو پارتە و رووبەڕووی راوەدوونان و راگواستن و بەندیخانە و هەتاکو رفاندن و کوشتنیش دەبنەوە. ئەمەش لە بەرژەوەندی پارتی کرێکارانی کوردستان بوو، هەروەها یەکێ بوو لە هۆکارەکانی بەهێزبوونیشی[1].

تورکیا توانی بانگەشەکانی گفتوگۆ و دەستپێشخەرییەکانی ئاگربەست، کە پارتی کرێکارانی کوردستان لە ماوەی جیاجیا کردی، فەرامۆش بکات، هەروەها ئەو فشار و بانگەشانەی وڵاتانی رۆژئاواش بە دۆزینەوەی چارەسەری ئاشتی بۆ کێشەی کوردی فەرامۆش کرد، هەروەها هەڵمەتە سەربازییەکانی بۆ سەر کوردستان و سیاسەتی زەوی سووتێنراو کە خۆی لە لابردنی دارستانەکان و سوتاندنی گوندەکان و راگواستن دەبینییەوە، هەموو ئەمانە روویاندا بەبێ ئەوەی میدیا دەرەکییەکان گرنگی پێ بدەن یا کاردانەوەیەك لای نەتەوە یەکگرتووەکان دروست بکات[2]، بەڵام نرخەکەی زۆر گران بوو. درێژی ماوەی شەڕەکە بەرژەوەندی نەگۆری بۆ هەندێ گرووپی چەکدار دەستەبەرکرد.

(1) -Carol Migdalovitz, "Turkey's Kurdish Imbroglio and U.S. Policy", P. 98.

(2) -Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds", P. 37.



کەرتەکانی دەزگای ئاسایشی دەوڵەت لە زنجیەرەیەك چالاکی نارەوا گلابوو، کە شانبەشانی جەنگە نهێنییەکەی بۆسەر پارتی کرێکارانی کوردستان ئەنجامدرا. هەروەها کردەوەی تیرۆریستی نادیار لە دژی لایەنگرانی پارتەکە رۆژنامەنووسانی کورد و ئەندامانی پارتە کوردییەکان رووی لە زیادی کرد، کە لە نەوەدەکانی سەدەی بیستەم بەشێوەیەکی چەندبارە روویان دەداوە. تۆمەتی بارزگانی کردن بە ماددەی بیهۆشکەر ئەگەر راست بێ ئەوا بە هاوکاری لایەن و رێکخراوەکانی دەزگا تورکییەکان ئەنجامدراوە. هەروەك لە لیکۆلینەوەکانی پەیوەست بە ئابڕوچوونی (سوسورلوك Susurluk)[1] بەدیار کەوت. دەسەڵاتدارانی دەوڵەت لەوەتەی سەرەتای نەوەدەکای سەدەی بیستەم لە یارمەتی دانی نەتەوە پەرەستە توندرۆکان و باندەکانی دەرەوەی یاسا لە ئەستەنبۆل هاتوونەتە پێش بۆئەوەی جەنگی رێکخراوە کوردییەکانی پێ بکەن، گوومان لە پەیوەندییەکانی ئەو باندانە بە بازرگانیکردن بە ماددە بێهۆشکەرەکان و بۆندی چەك لە پارتی کرێکارانی کوردستان هەبوو، ئەوەی ئەو باوەڕەی بەهێزتر کرد، هەر پەیوەندییان بە بارزگانی ماددە بیهۆشکەرەکانی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا نەبوو، بەڵکو دڵنیا بوون لەوەی

(1) – ئەو ئابروچوونە لە تشرینی دووەمی 1996 تەقییەوە، دوابەدوای رووداوی هاتووچۆ، کە لە نزیك شارۆچکەی (سوسورلوك) لە نزیك ئەستەمبۆل روویدا. رووداوەکە ئەوەی ئاشکراکرد کە جێگرێکی پێشووی سەرۆکی بەشی ئاسایشی سیاسی شاری ئەستەمبۆل کە ناوی ( حسێن کوجداغ) و سەرۆکی عەشیرەتێکی دیاری کورد لە پارتی رێگای راست کە ناوی (سادات بوجاق) و عەبوڵلا جاتلی سەرۆکی باندێك و بکوژێکی نەتەوە پەرستی توندرەو کە لەلایەن ئەنتەرپۆلەوە داواکرابوو، لەناو یەك ئۆتۆمبێل بوون، حکوومەت لە رێگای وەزیری ناوەخۆوە ویستی کێشەکە بپێچێتەوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، بۆیە ناچار بوو دەست لەکاربکێشێتەوە. ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە لەلایەن لیژنەیەکی پەرلەمانییەوە کرا و راپۆرتی رۆژنامەنووسان ئەوەیان دەرخست کە تۆڕێك هەیە و سیاسەتمەداری سەرکردە و گەورە بەرپرسانی ئاسایش و سەربازی بە پلەی باڵا و بکوژانی باندی مافیا لە نەتەپەرەستە توندرۆکانی تێدایە، ئەو مافیایانەی کە لە ناوەڕاستی نەوەدەکانەوە بۆ لەناوبردنی لایەنگرانی پارتی کرێکارانی کوردستان دروستکرابوون. سەیری :
The Washington Post, 1 January, 1997; Medeni Duran, Osmanli'dan Semdinliye JITEM Tarihi, Bercem Yayincilik, Istanbul, 2006, Ss. 216-220;
هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص ص 99؛ المحادثات السرية بين PKK...، ص ص 55–56.

که تۆڕیکی نەتەوەیی–حکوومی فرە لایەن هەیە، کە پارتی کرێکاران جگە لە لایەنێکی نەبێت هیچی دیکەی لێپێکناهێنێت، ئەگەرچی پارتی کرێکاران گرنگترینی ئەو لایەنانەش بێت[1].

رەهەندێکی دیکەی پرسی کورد لە تورکیا، دەرەنجامێکی راستەوخۆی سیاسەتی تورکی بەرامبەر کورد، ئەو پەیوەستییەیە کە لە نێوان دواکەوتوویی ئابووری و کۆمەڵایەتی لەلایەك و بەرخۆدانی سیاسی لەلایەکی دیکەوە هەیە، ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا لە سەر هەردوو ئاستی ئابووری و کۆمەڵایەتی، ئەمرۆ دواکەوتووترین شوێنی تورکیایە، بەشێ لە داهاتی نەتەوەیی کەمترین بەشە و تێکرای بێکاریش بەرزترینە و قەبارەی پرۆژە پیشەسازییەکان بچووکترینە، بەرهەمی کشتوکاڵی زۆر لاوازە. رێژەکانی لەدایکبوون و نەخوێندەواری زۆر بەرزە[2]. ژمارەی دامەزراوەکانی فێرکردن و چاودێری تەندروستی گونجاونین، باری ژێرخانی تایبەت بە گەیاندن و پەیوەندیکردن لە دەرەوەی مەڵبەندەکانی شار وەکو باری خوێندەوارییەکە. ژمارەیەکی زۆر لە گوند و شارۆچکەی کوردی بەگەیشتنی زستان سەختە دەستی پێ رابگات[3].

لەلایەکی دیکەوە بەشێکی زۆر لە داهات و خەرجییەکانی دەوڵەتی تورکی بۆ جەنگی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات خەرج دەکرێت، تێچووی جەنگی

---

(1) - ینظر: هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص ص 98–99؛

Medeni Duran, A. G. E., Ss. 216-220.

(2) – قەدەغەکردنی زمانی کوردی لە کوردستانی تورکیا و کەمی زۆر لە قەتابخانەکان و مامۆستایان لە گوندە کوردییەکان، کۆسپی لەبەردەم ئاستی فێرکردن لە نێو کورد دروستکردووە. بە بەراورد لەگەڵ دانیشتوانی ناوچە تورکییەکان رێژەی نەخوێندەواری لە نێو کورد لە ساڵی 1975 گەیشتە 72٪. مهرداد ئازادی پەیوەندییەك لە نێوان بەکارهێنانی زمانی کوردی لە پرۆگرامەکان و ئاستەکانی فێرکردن و تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی لەلایەکی دیکەوە دروست دەکات، ئەوەی دەرخستووە کە رێژەی خوێندەواری لەو وڵاتانەی رێگە بە بەکارهێنانی زمانی کوردی دەدەن زیاترە، ئەمەش ئەوە روونمدەکاتەوە بۆچی رێژەی خوێندەوار لە یەکێتی شورەوی و عێراق لە چاو شوێنەکانی دیکە بەرزترە. سەیری: لقمان محو، المصدر السابق، ص 18.

(3) - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص 88.



هەڵگیرساوی کوردستان لە 1984ەوە تا 1996 گەیشتە نزیکەی 100 ملیار دۆلار[1]. عیسمەت ئیمسەت Ismet G. Imset، کە راپۆرتێکی تێروتەسەلی لەبارەی جەنگی نێوان حکوومەت و پارتی کرێکاران ئامادەکردووە، دەڵێت: **"ئەگەر ئەو ملیارەها دۆلارەی کە لە پێناوی بەرگری لە ناوچەکان لە دژی هێرشی جوداخوازی و چالاکی سنوور بەزین خەرجکراوە، بۆ وەبەرهێنانی ناوچەکە خەرج بکرابوایە، رەوشەکە جیاوازتر دەبوو... پارتی کرێکارانی کوردستان کاری لەسەر کاردانەوەی هەرێمایەتی لە سەختییە ئابوورییەکان و پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ تا دوا سنوور دەکرد"**[2].

پرسی کورد بۆ خاڵی لاواز لە دیموکراسی تورکیا گۆڕا، هەروەها بووە رێگری سەرەکی بەردەم بە ئەندامبوونی تورکیا لە یەکێتی ئەورووپا، هەرەشەیەکە ناکرێت بەهەند وەرنەگرێت لە پەیوەندییە توندوتۆڵەکانی ئەمریکا–تورکیا. بەگوێرەی سەرچاوەیەك **"چیدیکە تورکیا ناتوانێت بەردەوام بێت لە بەرگریکردن لەو خورافەی کە کێشەی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات،**

---

(1) – هیچ زیدەرۆییەك لەم ژمارەیەدا نییە، ئەگەر زانیمان نرخی یەك هەلیکۆپتەری جۆری سیکورسکی لە نێوان 18–20 ملیۆن دلارە، و نرخی سوپەر کوبرا 20–22 ملیۆن دۆلارە. جگە لەوەش باسکردنی گالیسکەی گواستنەوەی سەرباز و تەکنەلۆژیای چەکی پێشکەوتوو، ئەو ژمارەیە دوو هیند دەکاتەوە. تێچووی یەك سەعات گەڕانی ئاسمانی جا بە هەلیکۆپتەر بێت یا بە فرۆکەی شەڕکەر نزیکەی 10 هەزار دۆلار دەکەویت. سەرباری ئەمەش ناوچەکانی چالاکی و هێرشکردنی سەربازی پیویستی بە دامەزراندنی رەبایە و راکێشانی رێگای سەربازی لە چیا و دامەزراندنی بنکە و مەلبەندی سەربازی هەیە. سەرباری ئەمەش مووچەکانی کارمەندان، ئەوانەی لە هەرێمی لەناکاو خزمەت دەکەن دوو هێندەیە. هەروەها دەوڵەت مووچەی 80 هەزارکەسی پاسەوانانی لادێ دەدات، سەرباری ئەمەش بودجەی تایبەت بۆ چاککردنەوەوی ئەو تەلار و خانوانەی کە بەهۆی کردە سەربازییەکانەوە خاپوور دەکرێن تەرخان کراوە، بەمشێوەیە ژمارەی 100 ملیار دۆلار وەك تێچووی جەنگەکە هەتاکو لەلای دائیرە فەرمییەکانی دەوڵەتیشەوە پەسندە. سەیر:

Umit Ozdag, Turk Ordosunun PKK Operasyonlari 1984-2007, Pegasus Yayinlari, Istanbul, 2007, SS, 157 .

(2) -Ismet G. Imset, the PKK: areport on Separatist Violence in Turkey (1973-1992), Turkish Daily News Publications, Ankara, 1992, P. 1.

**کێشەیە رژێم و بوژاندنەوەی ئابوورییە. تورکیا ناتوانێت هەموو ئەوانەی بەو رایـەی نـاکۆکن لەناوبـەرێت یـان بترسـێنێ، دوای ئەمـەش لـە کۆمەڵگـەی نێودەوڵەتی چاوەروان دەکرێت کە لە هەڵوێستی خۆی بگات و پاڵپشتیـشی لێبکات... تورکیا ناتوانێت لەسەر ئەوە بەردەوام بێت کە تەنها خۆی لەسەر راستە و جیهان هەموو لەسەر هەڵەیە"**[1].

بۆیە بەرنامەی دیموکراتی و هەموارکردنی یاسـاکانی تـورکی بـۆ گونجانـدنی زیاتر لەگەڵ بەها و پێوانـە دیمـوکراتی و مرۆڤایەتییـەکانی نێودەوڵـەتی یـەکی کـەوت، هــەتاکو ســامی ســەلجوق Sami Selcuk ی ســەرۆکی دادگــای تێهەڵـچوونەوەی تـورکی بەمـشێوەیە لـە ئـەیلولی 1999 لەسـەر دەسـتووری وڵاتەکەی قسەی کرد و گـوتی: **"ئەو دەستوورەی ئێـستای تورکیـا زیـاتر لـە پرووپووچییەوە نزیکە، چونکە بەزۆر بەسەر خەڵکیدا سەپاوە"** هـەروەها هـانی وڵاتەکـەی دا کـە **"وەك وڵاتێـك کـە بـە یاسـای سـەرکوتکردن کاریکـات و هاووڵاتیانی خۆی پانبکاتەوە و بێ دەنگیان بکات، نەچێتە ناو سەدەی بیست و یەکەوە"**[2]. بەشێکی گەورە لە پرۆسەی بـە دەوڵـەتکردنی پرسـی کـورد لـە تورکیا لە دەرەنجامی راستەخۆی هەڵوێستی سـەرکوتکەرانەی ئەنقەرەدایـە[3]. لەسـەر ئاسـتی یـەکێتی ئـەورووپیش، ئاسـتی زیانـەکانی تورکیـا لـەو کاروانـە دوورودرێژە و سەختەی کـە بـۆ چـوونە نـاو ئـەو یەکێتییـە داویـەتی، وایلێکـرد هـەتاکو ناویـشی لـە لیـستی پـاڵێورانی 1997 ئەوانـەی چـاوەریی چـوونە نـاو یەکێتییەکە دەکەن، نەبێت، ئەمەش بەهۆی ئەو تۆمارە خراپەی کـە لـە بـواری مافەکانی مرۆڤ هەیەتی. هەر لە ساڵی 1996 بەدواوە، دادگای مافەکانی مرۆڤی ئەورووپی لە ستراسبۆرگ، بە شێوەیەکی رۆتـینی سـەرکۆنەی تورکیـا دەکـات.

[1] - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص 98.

[2] -Tamar Gabelnick, William D. Hartung and Jennifer Washburn with research assistance by Michelle Ciarrocca, Arming Repression: U.S. Arms Sales to Turkey During the Clinton Administration, World Policy Institute and the Federation of American Scientists, October 1999. Via at: (http://www.fas.org/asmp/library/reports/turkeyrep.htm#new).

[3] - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص 97.



ئەو سەیر نەبوو کـە ئەنجوومـەنی ئـەورووپا بـە هـەموو 41 ئەندامەکانیـەوە لـە حوزەیرانی 1999ەوە، تورکیا بە ئاشکرا لەبارەی پێشێلکارییە دووبارەبووەوە و ترسناکەکانی مافی مرۆڤ، سەرکۆنە کرد[1].

لـە دەرەنجـامی کۆتاییـدا پرسـی کـورد، بـووە هۆکـاری سـەرەکی نائـارامی سیاسی لە تورکیـا. هـەروەها بـووە گـەورەترین هەرەشـە لەوەتـەی کۆمـار لـە 1923 دامەزراوە. ئەو پرسـە بـە شـێوەیەکی کـرداری و گـەورە کـار لـە هـەموو سیاسەتە دەرەکی و ناوخۆییەکانی تورکیا دەکات. پرسی کورد هەرتەنها کاری لە ئابووری گەشتیاری و وەبەرهێنانی بیانی راستەوخۆ و قەرزی بیـانی نـەکرد، یان بـە تـەنها کـاری لـە پەرەسـەندنی پرۆسـەی دیمـوکراتی و مافـەکانی مـرۆڤ نەکرد، یـان هەرتـەنها کـاری لـە زۆربـوونی دەسـەڵاتی سـوپا لـەناو دەسـەڵاتی حکوومەتی مەدەنی هەڵبژێردراو و ئاراستەکردنی سیاسـەتەکانی نـەکرد، بـەڵکو سیاسەتی دەرەوەی تورکیاشی دیاریکرد و بواری گۆڕانکاری لە سیاسەتدا بەند کـرد. هـەروەها دەرگـای فـشاری وڵاتـانی بیـانی لەسـەر تورکیـای کـردەوە، ترسناکترین لایەنی کاریگەری پرسی کورد لە پەیوەندییەکانی دەرەوەی تورکیا، ئەو گرفت و دیدگا ناکۆکانە بوو کە لـە نێـوان تورکیـا و هاوپەیمانـە نزیکەکـەی ئەمریکا دەهاتە ئـاراوە. لایەنـە جۆراوجۆرەکـانی ئـەمریکا، فـەرمی و نافـەرمی هەوڵیانـدا را لـەبارەی پێداچـوونەوە بـە سیاسـەتەکانی وڵاتەکـەیان بەرامبـەر تورکیا بدەن، بە شێوەیەك دوو قوتابخانەی جیا لەیەکتری لە خـودی واشـنتۆن دامەزرا، هەریەکەیان دیدگای جیای لەوەکەی دیکە لەبارەی مامەڵەکردن لەگەڵ تورکیا هەبوو.

[1] – بو گاریگەری دۆزی کورد لە رێگرتنی چوونی تورکیا بو ناو یەکێتی ئەوروپا دا سەیری،
Kerim Yildiz, The kurds in turkey: EU Accession and Human Rights, Forward by Naom Chomsky, Pluto Press, London, 2005, Pp,20-40.

## بابەتی یەکەم: هەڵوێستە دیاریکراوەکانی ئەمریکا بەرامبەر پارتی کرێکاران

لە نەوەدەکانی سەدەی بیستەم، لەسەربنەمای پێنج کۆڵەگەی سەرەکی، ئەمریکا پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا پەرە پێدا، یەکەم چەسپاندی پەیوەندی دوو قۆڵی کلاسیکی ئەمنی لەگەڵ تورکیا، بە فرۆشتنی چەکیشەوە[1]. هەڵسەنگاندنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ بەها و گرنگی ئەمنی تورکی لە ناو پەیمانی ناتۆ و خزمەتەکانی لەکاتە جیاجیاکاندا، وای لە دروستکەرانی بریار لە واشنتۆن کردووە، هەڵوێستێکی وا وەربگرن، بەئاقاری قسەکردن لەو دۆسیانەدا نەڕوات کە کاریگەری نێگەتیڤی لەسەر پەیوەندییەکانی تورکیا–ئەمریکا دادەنێت. لەم ڕێرەوەدا ریچارد هۆلبرۆك Richard Holbrook ی یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکی بۆ کاروباری ئەورووپی لەگەڵ هاوڕێیەکەی مارك کرۆسمانی بالیۆزی ئەمریکی لە ئەنقەرە (1994–1997)، ئەم دوانە ئەزموونی خۆیان لەبارەی تورکیا بەم شێوەیە کورت کردەوە گوتیان: **"کاتێ ئێمە دەستمان بەکار و ئێشە نوێیەکانمان کرد، کرۆسمان لە ئەنقەرە و منیش لە واشنتۆن، بەیەکەوە دانیشتین و گفتوگۆی ئەوەمان کرد کە تورکیا بۆ ئەمریکا لەماوەی دوای شەڕی سارد چی دەگەیەنێ؟ چەمکێکی نوێمان پەرەپێدا، بە شێوەیەکی گشتی ئەم چەمکە لە کۆشکی سپی و پەنتاگۆن جێبەجێکرا، گوتمان، تورکیا دەوڵەتی ڕووبەڕووبوونەوەی تازەیە بۆ ڕۆژئاوا، بەو مانایەی کە هەمان ڕۆڵی ئەلمانیای دوای جەنگی ساردی وەرگرتووە". نێوەندە جۆراجۆرەکانی ئیدارەی ئەمریکی**

[1] -چوار کۆڵەگەکەی دیکە هەروەك هینری بارکی دیاریکردووە، بریتین لە: پاڵپشتی پرۆسەی دیموکراتی و فرەیی سیاسی، فراوانکردن و هەمەجۆرکردنی ئابووری تورکی بەهۆی پرۆژەی مەزنەوە، وەك ڕاکێشانی بۆری گاز و نەوت لە دەریای قەزوینەوە بە ناو تورکیا، بەڕێوەبردنی پەیوەندییەکانی تورکیا–یۆنان، بەتایبەتی پرسی هەستیاری قوبرس، دوایین خاڵ، پالپشتیکردن لە هەوڵەکانی تورکیا بۆ چوونە پاڵ یەکێتی ئەورووپی، سەیری:
Henri J. Barkey, "The Endless Pursuit…", Pp. 213-214.



**ئەو دەستەواژەیان "تورکیا دەوڵەتی ڕووبەڕووبوونەوەی نوێیە"**[1]. بە درێژایی سالانی نەوەدەکانی سەدەی بیستەم دەگوتەوە[2]. لە ساڵی 1994 جیم هۆگلاند Jim Hoagland، لە ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست لە یەکێ لە گەورە کارمەندانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی گواستۆتەوە کە تورکیای بە **"دەوڵەتی هێڵی پێشەوەی"** لە سیستەمی نوێی جیهان نیشانەکردووە[3].

لە ناوەڕاستی 1995، کاتێ گفتوگۆکان لە کۆنگرێسی ئەمریکی لەبارەی بڕینی یارمەتییە سالانەییە ئەمریکییەکانی لەسەر تورکیا، سەرۆکی ئەرکانی ئەمریکی ژەنەراڵ جۆن شالیکاشفیلی J. M. Shalikashvili لە نامەیەکدا بە بەرواری 21ی حوزەیرانی 1995 کە بۆ کۆنگرێسی ناردووە، داوای کردووە، واز لەم بیروڕایانە بێنن، ئەوەی بەبیر کۆنگرێس هێنایەوە کە **"تورکیا هێڵی ڕووبەڕووبوونەوەی نوێ لە ماوەی دوای جەنگی سارد، داگیر دەکات"** و **"تورکیا هاوپەیمان و پاڵپشتیکەری بەرژەوەندییەکانی ڕۆئاوایە"**[4].

بەو پێیەی کە پرسی کورد یەکێك لە دیارترین هەڕەشەکانی بەردەم یەکێتی خاکی دەوڵەتی تورکی و ئەمنی نەتەوەییەکەیەتی، هەروەها گرنگترین خاڵی لاوازی بونیادی سیاسی دەوڵەتی تورکییە، هینری بارکی پرسی کورد بە یارمەتیدەری بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی تورکیا –ئەمریکا لەماوەی نزیکدا، لەقەڵەم دەدات. سەبارەت بە پارتی کرێکارانی کوردستان، ئەوا سیاسەتی ئەمریکی وەك سیاسەتی تورکی و لاساییکەرەوەی بوو، لە هەموو بۆنەیەك ئەمریکا پارتی کرێکارانی بە تیرۆریست ناوزەد کردووە، ئەمەش دەربڕینێکی

[1] -Ibid, P. 207.

[2] - U.S. Department of State (Bureau of European Affairs), Report on Allegations of Human Risghts Abuses by the Turkish Military and on the Situation in Cyprus, 95/06/01. Via at: (*http://www.as.org/asmp/profiles/turkey_cyprus_1995.txt*).

[3] - Washington Post, 10 October, 1996.

[4] -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfer and Violations of the Laws of War in Turkey, New York, November 1995. Via at: (http://www.hrw.org/reports/1995/Turkey.htm).

چەسپاوە بۆ پاڵپشتی ئەمریکا لە هەڵوێستی سەرەکی تورکیا بەرامبەر بە پرسی کورد[1]. بە شێوەیەکی گشتی ئەمریکا سیاسەتێکی دیاریکراو و ئاراستەکراوی بەرامبەر بە پرسی کورد یا **"پرسی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا"** نییە، هەروەك هەندێ لە گەورە بەرپرسانی ئەمریکی حەز دەکەن لەسەر شێوە تورکییەکەی ناوی بنێن. ئەمریکا سیاسەتی تایبەت بە تیرۆر و مافی مرۆڤ و سیاسەتی پاڵپشتیکردنی تورکیای هاوپەیمانی کۆن و گرنگی ناتۆی هەیە[2].

ئەمریکا بۆ ماوەی چەندین دەیەیە لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا، سیاسەتی فەرمی تورکیا کە دان بە ناسنامەی جیاوازی کورد لە تورکیا نانێت، گرتۆتەبەر و کورد بە **"تورکانی چیا"** لەقەڵەم دەدات[3]. ئەمریکا تا ساڵی 1988 ئاماژەی بە بوونی سەرکوت و چەوساندنەوەی کورد لە تورکیا نەکردووە، ئەوکاتەی کە راپۆرتێکی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لەبارەی مافەکانی مرۆڤ، بۆ یەکەمجار باسی لەو سەرکوتکردنەی کە کورد لە تورکیا رووبەڕووی دەبنەوە لەسەر دەستی دەزگا جۆراوجۆرەکانی دەوڵەت، کرد، هەروەها رەخنەشی لە پارتی کرێکارانی کوردستان بەهۆی بەشداریکردنی لە ئەنجامدانی تۆقاندن[4].

نووسەری پەرتووکی هەڵمەتی نوێی رۆژ ئاوا: ناتۆ، رۆژهەڵات ، کورد و تورکیا (Batinin Yeni Seferi: NATO, Dogu, Turkiye, Kurtler)، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە رێکخراوە سیاسییە کوردییەکان لە ناوچەکە رێکخروای چەپرەو بوون، ئەوکات تاڕادەیەکی زۆر دژایەتی و نەیار بوون بە ئەمریکا و ئیمپریالی، ئەو رێکخراوە سیاسییە کوردییانە تا پێش ساڵی 1984 دژی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا نەبوون، کودەتای سەربازی 1980 گورزێکی کوشندەی لە رەوتە چەپەکانی تورکیا وەشاند، هەروەها جەنگی ئێران–عێراق

(1) -Stala M. Gavrielides, Op. Cit., P. 100; 1993/2/8 خه بات،

(2) -Carol Migdalovitz, "Turkey's Kurdish Imbroglio and U.S. Policy", P. 100.

(3) - جوناثان راندل، المصدر السابق، ص 355.

(4) -Stala M. Gavrielides, Op. Cit., P. 101.



و داگیرکاری ئیسرائیل بۆ لوبنان و ناچاکردنی رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستینی بۆ جێهێشتنی بیروت لە ساڵی 1982، ئەمانە وایان کرد ئەمریکا هەست بە ئاسوودەیی بکات. بەڵام ئەو جەنگەی پارتی کرێکارانی کوردستان لە 1984 دەستی پێکرد، ئەمریکای بێ هیوا کرد، چونکە تورکیا یەکێکە لە وڵاتانی ناتۆ، رووبەڕوو لەمبەر هەڕەشەی پارتی کرێکارانی کوردستان وەستاوەتەوە، ئەو پارتە لەم ساڵانەی دوایی بۆتە گرنگترین هێزی دژ بەئەمریکا لە ناوچەکە[1].

دەکرێت سەیری هەڵوێستەکانی خودی رێکخستنە سیاسییە کوردییە جۆراوجۆرەکان بکەین، تا سنوورێکی دوور ناکۆکییە ئایۆلۆژییە قووڵەکانی لەگەڵ ئەمریکا بەدەردەخات. زۆربەی هەرە زۆری رێکخستنە چەپەکانی کوردستان ئەوکات بەو ئاراستەیەدا دەرویشتن، بەتایبەتی پارتی کرێکارانی کوردستان،کە لە هەشتاکانی سەدەی بیستەم یەکێتی سۆڤیەتی جاران پاڵپشتی و لایەنگیری سەرەکی لێدەکرد[2]. هەروەها ناتوانرێت لە کاریگەری دەروونی ئەزموونەکانی پێشووتری کورد لەگەڵ ئەمریکا لە بچووککردنەوەی رێکخستنە کوردییەکان لەکاتی بەستنی پەیوەندی نوێ بە ئەمریکاوە، کەم بکەینەوە. بەم شێوەیە بە کۆتای هاتنی دەیەی حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی بیستەم، سەرجەم بزووتنەوە کوردییەکان بە پارتە کوردییەکانی عێراقیشەوە لە سەربازگەیەکی دژ بە ئەمریکادا بوون، یان بەلای کەمەوە متمانەی بە رۆژئاوا بەگشتی و ئەمریکا بە تایبەتی نییە، ئەمەش بەهۆی ئەو ئەزموونە تاڵەی کوردی عێراق لەگەڵ ئەمریکا لە ساڵی 1975 گوزەراندیان[3].

(1) -Hayri Argav, Batinin Yeni Seferi: NATO, Dogu, Turkiye, Kurtler, Peri Yayinlari, Istanbul, 2000, S. 257.

(2) -Turkish Daily News, 27 December, 1994; Michael Gunter, The Kurds…, P.112.

(3) -Peter J. Lambert, The United States and the Kurds: Case studies in United States Engagement, M. A. Degree of Arts in National Security Affairs, Naval Postgraduate School, U.SA, 1997, Pp. 54-64.

لێکدانەوە ئابوورییەکان پێگەیەکی گرنگ لە نێو دیارخەرەکانی سیاسەتی ئەمریکی بەرامبەر بە تورکیا و پرسی کورد داگیردەکات. باوەڕێکی فراوان هەیە کە ناوچەی دەریای قەزوین 100 ملیار بەرمیل نەوتی تێدایە و ئەمریکا پلان بۆ ئەوە دادەڕێژرێت کە هێڵێکی نەوتی لەوێوە بەناو تورکیا بۆ دەریای ناوەڕاست درێژ بکاتەوە. مادام هەر ئەو بۆڕییانە بەناو کوردستانەوە رادەکێشرێن، تورکیا هەڕەشەی هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتەکانی ئەو چالاکییانەی کرد، ئەگەر ئەمریکا لە پاڵپشتیکردنی تورکیا بۆ راکێشانی بۆری نەوتی قەزوین سەرنەکەوێت. شەڕکەرە کوردەکان رایانگەیاند کە تەگەرە دەخنە بەردەم پرۆژەکە و هەڕەشەی لێدانی هەندێ بۆری نەوتی عێراقی و کێڵگە نەوتی تورکییان کرد[1].

بە شێوەیەکی گشتی، هیچ ئاماژەیەکی گرنگ بۆ ئەوە نەدەکرا کە ئەمریکا لە درێژکردنەوەی هاوپەیمانییەکەی لەگەڵ تورکیا دەدات، تا سەرەتای دەیەی حەفتاکانیش ئەوەندە گرنگی بە چالاکییە سەربازی و ئەمنییەکانی تورکیای لە کوردستان دابێت. هەروەها ئیدارە ئەمریکییە یەکبەدوای یەکەکانیش پالپشتییان لەو تیروانیەی تورکیا کرد کە دەڵێت "**یەکێتی سۆڤیەت لەدواوەی پالپشتییەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان وەستاوە**"[2].

مارك كرۆسمانی بالیۆزی ئەمریکی لە ئەنقەرە، لە ساڵی 1995 کاتێ گەڕانێکی بە هەرێمی باری لەناکاو کرد و چاوی بە خەیری قوزاقچی ئۆغلوی پارێزگاری هەرێم کەوت و گوتی: "**حکوومەتی ئەمریکا هەرگیز لایەنگری لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ناکات، چونکە ئەمە بە مەترسییەکی گەورە بۆ سەر ئەمنیەتی هاوپەیمانە تورکییەکەمان پەیدا دەکات. لێرەوە، ئەو کردەوە خویناوییانەی کە پارتی کرێکاران لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ ئەنجامی دەدات، هەڵدەسەنگێنین، کە گەیشتۆتە رەهەندی ئەنجامدانی قەسابخانە، ئەمەش بەکردەوەیەکی تیرۆریستی دادەنێین**"[3].

(1) -Kurdish Question in "Turkey: The U.S.-Turkish Military Relationship".: Via at: (www.mtholyoke.edu).

(2) -Peter J. Lambert, Op. Cit., P. 76.

(3) -Hurriyet, 29-6-1990.



نامەکەی تۆماس نایلزی Tomas Niles یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکای سەردەمی جۆرج بۆشی باوك لە 29ی ئەیلولی 1992 کە بۆ لی هاملتۆنی Lee Hamilton سەرۆکی لیژنەی ئەورووپا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمریکی بەرزیکردبووەوە، بە شێوەیەکی روون تێروانینی ئیدارەی ئەمریکای لەبارەی ئەو رووداو و پەرەسەندنانەی کە لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا لە ئارادان دەربڕی، هەروەها نامەکە ئاماژەی بۆ بەکارهێنانی تیرۆر لەلایەن پارتی کرێکارانی کوردستان بۆ پاڵپشتیکردن لە سیاسەتە جوداخوازییەکانی کرد و حکوومەتی ئەمریکیش بە توندی پاڵپشتی لە یەکێتی خاکی تورکیا و عێراق دەکاتەوە. هاملتۆن لە پێشکەشکردنی نامەکەیدا تێروانینی خۆی لەبارەی بابەتەکە خستە روو، ئاماژەی بەو "**بزووتنەوەی چەکدارییەی کە رێکخراوێکی تیرۆریستی [پارتی کرێکارانی کوردستان] کە ئامانجیەتی دەوڵەتی کوردی دابمەزرێنێ**"، کرد. هەروەها حکوومەتی تورکیش لە هەوڵەکانی بۆ لەناوبردنی ئەو هەڕەشەیە، رێوشوێنی توندوتیژی زیاد کردووە، بەهۆیەوە زۆرکەسی بێتاوان بوونەتە قوربانی لەهەردوولا"[1].

نامەکەی نایلز گرنگییەکی لە رادەبەری بۆ هەڵوێستی ئەمریکا لەبارەی پرسی کورد لە تورکیا بەدەستدێنێ، ئەمەش نەوەك لەبەر هەڵوێستە روونەکەی ئەمریکا لەبارەی ململانێ نێوان دەوڵەتی تورك و پارتی کرێکارانی کوردستان، بەڵکو لەبەرئەوەی لەلایەنێکی، لەوانەیە بۆ یەکەمجار بێت ئاماژەی بە بوونی "**کێشەیەکی ترسناك لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا دابێت**"، ئەو کێشەیەش تاڕادەیەکی دوور بۆ هۆکاری ئابووری دەگەڕێتەوە[2].

بەرپرسانی ئەمریکی لە زۆر بۆنەدا هەوڵیان داوە رێگاکانی پاڵپشتیکردن لە تورکیا لە دژی پارتی کرێکارانی کوردستان باس بکەن، لەمیانەی سەردانەکەی چیللەر بۆ واشنتۆن، دواتریش لە 15ی تشرینی یەکەمی 1993 چاوپێکەوتنی بە

(1) -Turan Yavuz, ABD'nin Kurt Karti: ABD-Kurt iliskilerinin perde arkasi, Otopsi Yayinleri, Ikinci Basim, Istanbul, 2003, Ss. 352-353.

(2) -Carol Migdalovitz, "Turkey's Kurdish…", P. 100.

سەرۆك كلينتۆن و گۆری A. Gour جێگری سەرۆك، لە رووی پرسەکەدا گوتی:

**"ئێمە سازش و دانوستاندن لەگەڵ تیرۆریستان ناکەین، ئێمە سوورین بۆ کارکردن لەگەڵ تورکیا. ئەوە دادوەری نییە، ئێمە وەکو پێشتر تەنها داوای دەوڵەتێکی دیموکراتی لە تورکیا بکەین و داوای لێبکەین رێزیش لەمافی مرۆڤ بگرێت و ئێمەش لەمامەڵەکردنی لەگەڵ تیرۆری ناو سنوورەکەی یارمەتی دەدەین. بۆیە هەندێ لەو رێگایانەمان گفتوگۆکرد، کە بەهۆیەوە بتوانین هاوکارییەکی گەورەتر بکەین. من لەو باوەرەدام کە تۆ هاوکاری زیاتر لە نێوان هەردوو گەلەکەمان دەبینی"**[1].

ئەو یارمەتی و پاڵپشتییە ئەمریکییەی بۆ تورکیا لە پارتی کرێکارانی کوردستان شاراوە نەبوو، لە هاوینی 1994 کانی یلماز Kani Yilmaz ی سەرکردەی پارتی کرێکارانی کوردستان، ئەمریکای بە **"خراپترین و دواکەوتووترین دەوڵەت بۆ پرسی کورد، لەپاڵ ئەلمانیا وەسفکرد"**[2].

گرووپە بەهێزەکانی فشار کە لەلایەن خودان کۆمپانیا گەورە ئەمریکییەکانی دروستکەری چەك بەرێوەدەبران یەکێك لەو هۆکارە دیارانەی بوون بەشدارییان کرد لە دیاریکردنی هەڵوێستی ئەمریکا لەبەرامبەر پرسی کورد، یەکێك لە دەرهاوێشتە دیارەکانی بەردەوامبوونی جەنگی نێوان تورکیا و پارتی کرێکاران و تەواوی رێکخستنە کوردییەکانی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا، بەستنی ئەو بۆندە گەورانەی چەك بوو لەلایەن کۆمپانیای ئەمریکی لەگەڵ تورکیا. کۆمپانیای ماك دۆنیل دۆگلاس McDaniel Douglas و ژەنەراڵ دینامیکس General Dynamics و بۆینگ Boeing و رایسۆن Raytheon و بیل تێکسترۆن Bell Textron، لە کۆمپانیا یەکەمینەکان بوون. هەلیکۆپتەری شەرکەر یەکێك لە دیاریترین هاوردەکانی چەکی ئەمریکی بوو بۆ تورکیا. کۆمپانیای بیل تکسترۆن لە تەکساس کە هەلیکۆپتەری (کنك کۆبرا) دروستدەکات، ئەو فرۆکەیە بە برِبرِەی پشتی هێزە شەرکەرەکانی تورکی لە

(1) -Carol Migdalovitz, "Turkey's Kurdish…", Pp. 100-101.

(2) -Michael Gunter, The Kurds and the Future…, P. 106.



باشووری رۆژهەڵاتی وڵات و باکووری عێراق دادەنرا، بۆ نموونە دیارترین بۆندی چەکی تورکی لە ساڵی 1998 بەهاکەی گەیشتە 4 مليار دۆلار. لەساڵی 1997 هەردوو کۆمپانیای بونیگ و بێڵ کە هەلیکۆپتەری هێرشبەر دروست دەکەن، مۆڵەتیان لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا وەرگرت بۆئەوەی بەرهەمەکانیان بۆ تورکیا هەناردە بکەن. لەپاڵ بۆندەکانی هەلیکۆپتەر، گالیسکەی گواستنەوەی سەرباز و زریپۆش دووەم پلەیان لە فرۆشتەنییەکانی چەکی ئەمریکی داگیردەکەن، لەناوەراستی نەوەدەکان، کۆمپانیای AV بۆ تەکنەلۆژیا کە بارەگاکەی لە میشیگانە، بە بەهای 45 ملیۆن دۆلار کەلوپەلی سەربازی بە تورکیا دا، کە گالیسکەی زریپۆشی گواستنەوەی سەرباز (*APCS*)، کە لە کالیفۆرنیا لەلایەن Food Machinery Cooperation دوروست دەکرا، لەخۆدەگرت. ئەو گالیسکانە بەچری لەلایەن یەکەکانی پۆلیسی تایبەتی تورکی لە باشووری رۆژهەڵاتی وڵات، بەکارهات. بە گوێرەی راپۆرتێکی رێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی Amnesty International کە بۆ مادلین ئۆلبرایتی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بەرزکرابووەوە، کە ئەو یەکانە بەرپرسن لە ئازاردانی منداڵان و پێشێلکاری و دەستدرێژی سیکسی دژی بەندییە سیاسی و چالاکەکانی کورد[1].

بۆندەکانی چەکی ئەمریکی هەرتەنها بۆ کەلوپەلی سەربازی و هەلیکۆپتەری شەرکەر تەرخان نەکرابوو، بەڵکو سیستەمی پێشکەوتووی رۆکێتیشی گرتەوە. لە کانوونی یەکەمی 1996 تورکیا 120 رۆکێتی زەمین بە زەمینی لە ئەمریکا وەرگرت (ATACMC)، ئەمەش یەکەم فرۆشتەنی لە چەکی پێشکەوتووی ئەمریکی بۆ تورکیا دەنێرێت. بەر لەدوو هەفتە لە هەڵبژاردنەکانی تورکیا، ئەو بۆندە پەسند کرا، ئەم وادەیە وەك نامەیەکی پاڵپشتی لە حکوومەتی ئەمریکییەوە بۆ حکوومەتەکەی تانسۆ چیللەر هات[2]. فرۆشتەنییەکانی چەکی ئەمریکی بۆ تورکیا، وای لە کۆمپانیای پیشەسازییەکانی چەك کرد کە بۆندی

(1) -Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds", Pp. 34-35; Kurdish Question in Turkey: The U.S.-Turkish Military Relationship, via at: (www.mtholyoke.edu).

(2) -Jennifer Washburn, "Don't Sell Weapons to Turkey", Journal of Commerce, 2 February, 1997.

گەورەیان لەگەڵ تورکیا مۆر کردووە، دەسەڵاتی خۆیان بۆ کەمکردنەوەی کاریگەری ئەو گفتوگۆیانەی کە بە شێوەیەکی بەردەوام رێکخراو و کۆمەڵەکانی مافی مرۆڤ و لۆبیەکانی کۆنگرێس بۆ رازیکردنی ئیدارەی ئەمریکی دەیورژێنن، کە سنورێك بۆ هەناردەی چەك بۆ تورکیا دابنێت، مادام تورکیا بەشێوەیەکی خراپ مافەکانی مرۆڤ بەو چەك و جبەخانانەی ئەمریکی پێشێل دەکات. لە 28ی ئازاری 1997 لەم رێرەوەدا 10 لەو کۆمپانیایانە یادداشتێکیان بە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا دا و داوایان کرد ئەو کۆت و بەندانەی کە خراوەتە سەر هەناردەکردنی سیستەم و کەلوپەلی سەربازی بۆ تورکیا، لابرێن. کۆمپانیاکانی بیل تکسترۆن و ماك دۆنیل دۆگلاس و بۆینگ سیکۆرسکی داوای گەرەنتییان لە حکوومەتی ئەمریکی کرد تاکو رێگەیان بدات بەر لەوەی بۆند پێشکەش بکەن، هەلیکۆپتەری شەرکەر بە تورکیا بدەن(1).

سەباری ئەو فاکتەرانەی سەرەوە، ئەمریکا و ناتۆ ژمارەیەك بنکەی سەربازییان لە کوردستان هەیە، کە ئامێری هەواڵگری و سیخوریکردن و پێگەی کۆگاکردنی چەك و جبەخانەی سەربازی و فڕۆکەخانەی جەنگی تێدایە، ئەمانە پالیان بە ئەمریکاوە نا نەیدەویست کارێکی وا بکات، کە تورکیا تەگەرە بخاتە بەردەم بەکارهێنانی ئەو بنکە سەربازییە ستراتیژییانە. دیاربەکر کە گەورەترین شاری کوردییە، مەزنترین پێکهاتەی لەو ئامێرانەی تێدایە، ئەویش وێستگەی بەرگری ئاسمانی و سەنتەری هەواڵگری و بنکەی سەربازی ئاسمانی ئەمریکی تێدایە(2). شاری ماردین سیستەمی رادارى زۆر پێشکەوتووی تێدایە، کە لەلایەن کۆمپانیای GM Hugh لە کالیفۆرنیا دروستکراوە، مولکداری ئەو کۆمپانیایە بۆ کۆمپانیای Delco پێشکەوتوو، دەگەڕێتەوە. وێستگەی رادارى ماردین توانای ئاشکراکردنی قووڵایی خاکی عێراق و ئێران و باکووری ئاسیای

(1) -Carol Migdalovitz, Turkey: U.S. Sale of Helicopters, in: Sophia Lahlos, Turkey: Current Issues and Background, Nova Science Publishers, Inc., New York, 2003, P. 70.

(2) - مهمت ماردنلي، "كردستان وتركيا وحلف الشمال الأطلسي"، في الفاشية التركية كديمقراطية أطلسية، سلسلة الدراسات السياسية، مركز البحوث والمعلومات (التداول محدود)، بغداد، 1982، ص 19.



ناوەندی هەیە. هەروەها بنکەی ئەنجەرلیك کە فڕۆکەکانی ئاواکس و فڕۆکەکانی F-16 و F-15 ی تێدایە، کە لەوەتەی دەیەی هەشتاکان بۆ چاودێریکردنی بزووتنەوەی ئاسمانی لە عێراق و ئێران دروستکراوە(1).

بۆیە ئەمریکا هەڵوێستێکی توندی لە دژی هەر هەرەشەیەك وەرگرت کە ئارامی تورکیا تیکبدات، جا ئەو هەرەشەیە هەرچۆنێ بێت، بەڵام بۆ پرسی کورد، نەوەك هەر تەنها هەڵوێستێکی نیگەتیڤی بەرامبەری نواند، بەڵکو بەرەو وەرگرتنی تێروانینی توندی عەسکەر رۆیشت، بۆیە هەڵوێستێکی توندی بەرامبەر بە پارتی کرێکارانی کوردستان وەرگرت، کە لە راپۆرتی ساڵانەی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکی لەبارەی جورەکانی تیرۆری جیهانی PATTERNS OF GLOBAL TERRORISM، لە هەشتاکانەوە وەك گرووپێکی مارکسی لینینی دژ بە بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوا پۆلێنکراوە(2). لەم بوارەدا پاڵپشتی ئەمریکی بۆ تورکیا دوو ئاراستەی وەرگرت، یەکەمیان سەربازی و دووەمیان سیاسی.

(1) -Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds", P. 34.

(2) -Terrorism Review: for I Jun 1989, Directorate of Intelligence (secret), 6, 1, 1989, P. 19.

## بابەتی دووەم: پاڵپشتی سەربازی: پڕ چەککردن و مەشق و ڕاوێژی سەربازی

ئەمریکا بەبێ سڵمینەوە، لە ڕووی سەربازی و لۆجستی، پاڵپشتی لە هەوڵ و سیاسەتەکانی تورکیا دەکرد، لەو شێوازەی کە بەهۆیەوە مامەڵەی لەگەڵ پرسی کورد لە تورکیا دەکرد. هەر لە پێناوی ئەمەش بوو نکۆڵی لە بانگەشەی پابەندییەکانی لەبارەی کێشەکانی دیموکراتی و مافەکانی مرۆڤ کرد، ئەو پرەنسیپانەی کە ماوەیەکی دوورودرێژ بوو بانگەوازی بۆ دەکرد و جەنگی لە پێناویدا کردووە.

ڕێککەوتننامەی هاوکاری بەرگری و ئابووری نێوان ئەمریکا–تورکیای 1980، دەرگای لەسەر هاتنی چەکی ئەمریکی بۆ تورکیا کردەوە، بێ ئەوەی ئەمریکا زۆر گرنگی بە ڕەفتاری سیاسی ئەنقەرە لەبارەی کێشە گرنگەکانی وەك دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ و پاراستن و ئارامی هەرێمایەتی بدات[1]. لەوەتەی جەنگ لە نێوان پارتی کرێکارانی کوردستان و تورکیا لە ساڵی 1984 تا 1995 دەستی پێکردووە، ئەمریکا بەشداری لە پڕچەککردنی تورکیا بە بەهای زیاتر لە 6.3 ملیار دۆلار کردووە[2]. بەهای ڕێککەوتنەکانی کڕینی چەك کە لە ماوەی 1993 تا 2000 مۆرکراوە، بە بەهای 5.17 ملیار دۆلار بووە. ئەمەش وایکردووە، تورکیا یا پلەی یەکەم یا پلەی دووەمی لەوماوەیە لە کڕینی چەگ لە ئەورووپا وەرگرتبێ[3]. لە نێوان ساڵانی 1987 تا 1991 تورکیا لە 76٪ی چەکەکانی لە ئەمریکا کڕیووە، کاتێ جەنگەکە توندبوو لە نێوان

(1) -Tamar Gabelinck, "Turkey: Arms and Human Rights", Foreign policy in Focus, Vol.4, No. 16 May, 1999, P. 1.

(2) -Jennifer Washburn, "Turkey Uses U.S. Arms to Attack Kurds", St. Louis post-Dispatch, 7 September, 1995.

(3) -Carol Migdalovitz, "Turkey: Issues for U.S. Policy", in: Sophia Lahlos, Turkey: Current Issues and Background, Nova Science Publishers, Inc., New York, 2003, P. 63.



حکوومەت و پارتی کرێکارانی کوردستان ڕێژەکە بۆ 80٪ بەرزبووەوە[1].

هەرچەندە سەرۆك کلینتۆن دوای ئەوەی وەك سەرۆکی ئەمریکا لە هەڵبژاردنەکانی تشرینی دووەمی 1992 هەڵبژێردرا، بەڵێنی دا کە چاو بە سیاسەتی چەکی ئەمریکی بخشێنێتەوە و لەگەڵ وڵاتانی دیکەی هەناردەی چەك گفتوگۆ بکات، وەك بەشێك لە پلانی درێژ ماوەی کەمکردنەوەی ڕەهەندی بڵاوبوونەوەی چەکی ویرانکەر و دانانی سنوورێك بۆئەوەی ئەو چەکانە نەکەونە دەستی ئەوانەی بۆ مەبەستی **"وێرانکاری"** بەکاری دەهێنن، تێبینی دەکرێت کە فرۆشتەنی چەکی ئەمریکی لەماوەی شەش ساڵی حکومڕانی ئەودا، چوار هێندە بە بەراورد بە 34 ساڵی مێژووی پەیوەندییەکانیان، واتا لە ساڵی 1950 تا ساڵی 1983 بوو. بەهای ئەو چەکانەی کە تورکیا لەماوەی ساڵانی 1992–1998 بەدەستی کەوتوون، گەیشتە 4.9 ملیار دۆلار، بە ڕێژەیەکی جێگر کە ساڵانە دەگەیشتە نزیکەی 800 ملیۆن دۆلار[2]. هەندێ مەزەندە بۆ ئەوە دەچن کە ئەمریکا لەوەتەی شەڕی نێوان حکوومەتی تورکیا و پارتی کرێکاران هەڵگیرساوە (1984 تا 1998) بە بری 10.5 ملیار دۆلار چەکی بە تورکیا داوە، بەڵام ڕێژەی لە 47٪ی ئەو چەکانە لە ماوەی ساڵە یەکەمەکانی (1992–1996) حوکمڕانی کلینتۆندا، بە تورکیا دراوە[3]. کڕینی چەکی ئەمریکی لەلایەن تورکیا لەماوەی هەردوو دەسەڵاتەکەی کلینتۆندا (1992–2000) بەشێوەیەکی راستەوانە بەرزبووەوە و گەیشتە نزیکەی 80٪ی[4] کۆی ئەو چەکانەی تورکیا لەم ماوەیەدا کڕیوونی. ئامارەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە

(1) -Jennifer Washburn, "Turkey Uses U.S…".

(2) -Tamar Gabelnick and Others, "Arming Repression: U.S. Arms Sales to Turkey during the Clinton Administration", A Joint Report of the World Policy Institute and the Federation of American Scientists, U.S., October, 1999. Via at: (http://www.fas.org/asmp/library/reports/turkeyrep.htm#execsum).

(3) -Ibid.

(4) -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations…; Naom Chomsky, Hegemony or Survival: America's Quest for Global Dominance, (New York-Macmillan- 2000), p.52.

لەماوەی ساڵی 1994 بە گەورەترین هاوردەی چەکی ئەمریکی دادەنرێت[1]. هەروەها بەخشینیکی دارایی لە ساڵی دارایی 1991 بەبری (500) ملیۆن و لە ساڵی 1992 بە بری (475) ملیۆن دۆلار وەرگرت، لە ساڵی 1993 بە بری 450 ملیۆن دۆلار قەرزی سەربازی وەرگرت، سەرباری یارمەتی سەربازی و پرۆگرامی مەشقی بیانی[2]. تورکیا یەکێك لەو سێ وڵاتانە بوو کە لە ساڵی دارایی 1993 گەورەترین یارمەتی دارایی دوای میسر و ئیسرائیل وەرگرتووە[3].

هاتنی چەکی ئەمریکی بۆ تورکیا بە پەرەسەندنەکانی شەڕ لە باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵات بەند بوو، هەروەها دژایەتی لەگەڵ بەڵێنەکانی ئیدارەی کلینتۆن لەماوەی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن هەبوو، کە بەڵێنی دابوو چاو بە سیاسەتی چەکی ئەمریکی بخشێنێتەوە و بە گوێرەی پێوەرەکانی مافی مرۆڤ و دیموکراسی بێت. لە لوتکەی شەڕ و پێشێلکارییە گەورەکانی سوپای تورکی لە دژی مەدەنییەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵات، کە لەلایەن ڕاپۆرتەکانی ڕێکخراوەی دەولییەوە تۆمارکراون، ژەنەراڵ جۆن شالیکاشیفیلی سەرۆکی دەستەی ئەرکانی هاوبەشی ئەمریکی لە هاوینی 1995 ڕایگەیاند کە سوپای تورکی **"پێ بەپێی ڕێوشوێنە نوێیەکان، کە بە ئامانجی بەهێزکردنی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا گیراونەتە بەر، دەڕوات"**[4]. لەوکاتەی کە ئەو پارە و یارمەتییانە لەژێر ناوەی بەرنامەی فرۆشتەنییە بیانییە سەربازییەکان و بەرنامەی یارمەتیدانی ئەمنی بە تورکیا دەدران، باجدەری ئەمریکی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە پارەدارکردنی ئەو جەنگەدا بە بری هەشت ملیار دۆلار بەشداری کردووە[5].

---

(1) -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations. …

(2) -Human Rights Watch, " The human rights picture in Turkey during 1992"; William D. Hartung, Op. Cit.

(3) -William D. Hartung, ARMS TRADE RESOURCE CENTER, REPORTS - Weapons at War: May 1995, World Policy Institute Issue Brief, U.S., 1995. Via at: (http://www.worldpolicy.org/projects/arms/news.html).

(4) -Michael Gunter, The Kurds an the Future…, P. 106.

(5) -Tamar Gabelnick and Others, "Arming Repression: U.S. Arms Sales…".



سەرباری ئەو پاڵپشتییە ئەمریکییەی پێشتر باسکرا، ئەوا تورکیا جبەخانەیەکی تەواو کە هەمەجۆر چەکی تێدایە، لە بەرنامەی (بابەتە بەرگرییە زیادەکانی هێزە کلاسیکییەکان لە ئەورووپا– Convention Forces in Europe Excess Defense Articles) بەدەست کەوت، کە بەم شێوەیەی خوارەوە بوو: 922 تانکی گەورە، 250 زرێپۆشی گواستنەوەی سەربازان، 72 پارچە تۆپهاویژ، 145 فڕۆکەی شەڕکەر، 42 هەلیکۆپتەر، 9 کەشتی جەنگی[1].

زۆربەی سوپای تورکی پێکهاتووە لە 5000 تانك، 500 فڕۆکەی شەڕکەر، 500 هەلیکۆپتەر، هەزاران پارچەی تۆپهاویژ و هاوەن و تفەنگی هێرشکردن بۆ سوپاکەی کەلە 590000 پیاو دەبێت و 300 هەزار لەوانە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵات خزمەت دەکەن[2]، لە ئەمریکا دروستکراون. بە گوێرەی بیل هارتنگ Bill Hurting لە پەیمانگای سیاسەتی جیهانی، جەنگ لە تورکیا گەورەترین چەکی ئەمریکی بەکاردێنێت، زیاتر لە هەر شوێنیکی دیکەی جیهان، جگە لە داگیرکاری ئیسرائیلی بۆ سەر لوبنان لە ساڵی 1982 نەبێت[3]. عەبدوللا ئۆجەلان لەسەرەتای ساڵی 1996 ڕایگەیاند کە **"ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگر ئەوەیە کە تورکیا بەبێ تەکنەلۆژیای ئەمریکی ناتوانێت درێژە بە جەنگ لە دژی کورد بدات"**، لە وەڵامی پرسیارێك لەبارەی بەکارهێنانی چەکی ئەمریکی لە دژی مەدەنییەکانی کورد، ئۆجەلان گوتی: **"ئەمە زۆر ڕوونە، هەموو گوندێك بەهۆی چەکی ئەمریکییەوە سووتێنراوە..."**[4].

---

(1) -Tamar Gabelnick and Others, "Arming Repression: U.S. Arms Sales…"; Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations. …

(2) -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations… ; Department of State, U.S Military Equipment and Human Rights Violations, report submitted to the Chairman of the Senate Foreign Relations Committee on 1 July 1997, pursuant to Senate Committee Report 104-295, accompanying H.R. 3540. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_dos_USweapons.htm).

(3) -William D. Hartung, ARMS TRADE RESOURCE CENTER, REPORTS - Weapons at War: May 1995, World Policy Institute Issue Brief, U.S., 1995. Via at: (http://www.worldpolicy.org/projects/arms/news.html); Desmond Fernandes, "Turkeys U.S.-backed War on Terror: A cause for concern?", Variant, No27, Winter 2008, P.33; Kevin Mckiernan, "Turkey's War on Kurds", P.26.

(4) (60 Minutes), "an American Dilemma", VOL. XXVIII, NO. 16, January 14, 1999 .

بە پشتبەستن بە راپۆرتە سالانەییەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، هەرچەندە ئەمریکا ئاگای لەوە هەبوو کە چەکی ئەمریکی بە شێوەیەکی بەرفراوان لەلایەن تورکیاوە لە جەنگی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات بەکاردێت و تۆمارە خراپەکەی تورکیا لە بواری مافی مرۆڤ بەسەرکردبووەوە، بەڵام سیاسەتمەدارانی ئەمریکی رازی نەبوون، فشار لەسەر تورکیا دابنێن، یا داوای لێبکەن راڤە و پاساو بۆ رەفتاری هێزە سەربازییەکانی بهێنێتەوە[1].

راپۆرتەکەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لەبارەی (حاڵەتی مافی مرۆڤ لە تورکیا و رەوشی قوبرس)ی ساڵی 1995، یەکەم داننانی فەرمی ئەمریکییە، کە تورکیا بە شێوەیەکی رێکخراو چەکی ئەمریکی لەو پرۆسانەی کە مافی مرۆڤ پێشێل دەکەن بەکارهیناوە. راپۆرتەکە بەکارهێنانی چەکەکەی بە شێوەیەکی تایبەت لە باشووری رۆژهەڵاتی وڵاتی نیشان کردووە. بە فڕۆکەی شەڕکەری F-16 و هەلیکۆپتەری هێرشکەری لە جۆری کوبرا و سوپەر کوبرا و فڕۆکەی جۆری سیکورسکی بلاك هۆك کە سەرباز دەگوازێتەوە و چەندەها جۆر تانك و گالیسکەی تایبەت و زرێپۆش. بەمانە هێرش بۆ سەر گوندی کوردان براوە و چۆلکراوە و راگوێزراون، زیاتر لە یەك ملیۆن کورد ناچارکراون ماڵەکانیان چۆڵ بکەن، هەروەها گوندەکانی دیکە بەهۆی ئەوەی رازی نەبوونە بچنە پاڵ پاسەوانانی لادێوە، بوونە ئامانجی سوپای تورکی[2].

بە گوێرەی پاشکۆی راپۆرتەکە کە ساڵی 1997 دەرچووە و بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی بۆ سەرۆکی لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی کۆنگرێس ناردراوە، باس لەوە کراوە کە بەکارهێنانی چەکی ئەمریکی لە جەنگی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا و ئەو پێشێلکارییانەی ئەنجامدەدرێن، لەوەتەی ساڵی 1995ەوە ئاراستەیەکی روو لەسەریان وەرگرتووە، راپۆرتەکە ئاماژەی

---

(1) -Jennifer Washburn, , "Turkey Uses U.S; US. Department of state, country Reports on Human Rights Practices for 1994, Washington, D.C, February, 1995.

(2) - U.S. Department of State (Bureau of European Affairs), Report on Allegations of Human Rights Abuses by the Turkish Military and on the Situation in Cyprus, 95/06/01. Via at: *(http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_cyprus_1995.txt);* Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds", P. 29.



بۆ ئەوە کردووە، کە پێ دەچێت چەك و ئامێری ئەمریکی لە حاڵەتەکانی کوشتن و ئازاردان و هەڵمەتەکانی دەستگیرکردن بەبێ روخسەتی دادگا، بە فراوانی بەکارهاتبێ[1].

زۆربەی هەرە زۆری پۆلەکانی سوپای تورکی و زۆربەی هێزەکانی ئاسایشی تورکی لە هەوالگری و ئاسایش و ژەندرمە پێکهاتوون، لەلایەن ئەمریکاوە پڕ چەك و مەشقپێکراون. سەرباری بوونی فەیلەقێك لە چوار فەیلەقەکەی تورکیا[2]، لە باشووری رۆژهەڵات بۆ شەڕی پارتی کرێکارانی کوردستان، یەکەی ئەمنی تورکی لە ناوچەکە کۆکراونەتەوە و ئەرکی سەرەکییان جەنگانە لەدژی پارتی کرێکارانی کوردستان[3]. ئەمریکا قورساییەکی گەورە و بەرپرسیارێتییەکی سەرەکی ئەو ململانێیە و دەرەنجامەکانی دەکەوێتە ئەستۆ، بە بەراورد بە قەبارەی ململانێکان و دەرەنجامەکانی و ئازاری دانیشتوانی ناوچە کوردییەکان، روماڵی راگەیاندن لە میدیا ئەمریکییەکان زۆر کەم بوو[4].

---

(1) -Department of State, U.S Military Equipment and Human Rights Violations, report submitted to the Chairman of the Senate Foreign Relations Committee on 1 July 1997, pursuant to Senate Committee Report 104-295, accompanying H.R. 3540. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_dos_USweapons.htm).

(2) - ژمارەی تاکەکانی هێزی ئاسایشی تورکی لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا بۆ ساڵی 1995 نزیکەی 300 هەزار بوون و بەمشێوەیە پۆلین کرابوون: 140000 هێزی سوپای نیزامی، 150000 هێزی ئاسمانی، 10000 ژەندرمە، 40000 تا 50000 پۆلیس، 40000 پاسەوانانی لادێ. سەیری:
Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations… .; U.S. Department of State (Bureau of European Affairs), Allegations of Human Rights Abuses by the Turkish Military and on the Situation in Cyprus, the report submitted in compliance with the congressional requirement as set forth in public law 103-306- August 23, 1994, (It consists of two parts. The first covers allegations of human rights abuses by the Turkish security forces. The second covers Cyprus), (95/06/01). Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_cyprus_1995.txt).

(3) -Department of State, U.S Military Equipment and Human Rights Violations, report submitted to the Chairman of the Senate Foreign Relations Committee on 1 July 1997, pursuant to Senate Committee Report 104-295, accompanying H.R. 3540. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_dos_USweapons.htm).

(4) -Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds", P. 27.

جێبەجێکردنی گەڕانی ڕۆتینی و دانانەوەی بۆسە لە ناوچە چیاییەکانی کوردستان لە ئەرکەکانی سوپای نیزامی تورکیدان، هەروەها بەهاوکاری هێزەکانی ژەندرمە، سوپا گوندەکان گەمارۆ دەدات و خەڵکان دەستگیر دەکات و مالان دەپشکنن. 40.000 مینی زەوی دژ بە تاك و تانك لە سەرەتای هەشتاکانەوە لە ئەمریکاوە بۆ تورکیا هاتووە، کەوا مەزەندە دەکرێت بە زۆری لە جەنگی باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵات بەکارهاتبیٚ[1].

سەرباری سوپای نیزامی، یەکە تایبەتییەکان، کە دوای ساڵی 1992ەوە لە چوارچێوەی ستراتیژی سەرکردایەتی ئەرکان، پێکهێنران، بۆئەوە بوو هەوڵەکانی جەنگ دژ بە پارتی کرێکارانی کوردستان دوو هێند ببنەوە[2]. ئەو یەکانەش بە پۆلە جیاوازەکانییەوە لەلایەن ئەمریکاوە پڕچەك و مەشقپێکراون، ئەمانەش لە گرنگترین ئەو یەکە تایبەتییانەن کە سەربە سوپای نیزامی بوون و لە کوردستانی تورکیا جێگیرکرابوون:

1– **هێزی کۆمادۆزی چیایی** Mountain Commandos: کە لە دوو لیوا (بۆلۆ Bolu و قەیسەری Kayseri) پێکهاتبوو. هەر لە بنەرەتەوە بۆ جەنگی پارتی کرێکارانی کوردستان دامەزرێنرابوون. بە پێچەوانەی سوپای نیزامی تورکی ئەو یەکانە لە رووی چەك و مەشقەوە نایاب بوون، ناوبانگی ئەو هێزانە لە هەڵمەتەکانی بەهاری 1994 و ئایاری 1995 و چالاکییەکانی دێرسیم بە درێژایی ساڵی 1994 دەرکەوت، چاودێرانی مافەکانی مرۆڤ ئەم یەکانەیان بە خراپ لەبارەی مامەلکردن لەگەڵ مەدەنییەکان وەسفکرد. ناوبانگی پێش خۆیان دەکەوت کاتیٚ بۆ شوێنی دەچوون، لەبەرئەوەی بە توندوتیژی و دلڕەقی بەناوبانگ بوون و بەرپرسن لە خاپوورکردن و سووتاندنی زۆربەی گوندە کوردییەکان و لە سێدارەدانی رەمەکی و چالاکی رفاندن و کوشتنی نادیار و ناچارکردنی دانیشتوان بۆ ئەنجامدانی کردەوەی گالتە ئامیز. ئەوانە تفەنگی M-16 و M-203ی ئەمریکییان پێیە. ئاژانسی

(1) -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations. …

(2) -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations. …



ڕۆیتەرز ژمارەی هەردوو لیوای (بۆلۆ و قەیسەری) بە 5000 کەس مەزندە کرد[1]. تاکەکانی هەردوو لیواکە لەسەر دەستی تیمێکی تایبەتی ئەمریکی مەشقیان پێکراوە، ئەو تیمە بە رەزامەندی کۆنگرێس لە میانەی بەرنامەی **"ئاڵوگۆڕی مەشقی هاوبەش"** بۆ تورکیا ئامادەکراون[2].

2– **هێزە تایبەتییەکانی سوپا** Army Special Forces: زۆرشت لەبارەی ئەو هێزانە نازانرێت، بەڵام ئەوەی دەزانرێت ئەوەیە کە ئەو هێزانە بەشێکی گرنگن لە **"جەنگی نهێنی یا جەنگی تایبەت"**ی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا، راستەوخۆ سەربە دەستەی ئەرکانی تورکی و لە ئەفسەرانی پێشوو، کە دووبارە بەتایبەت بۆ جەنگی پارتی کرێکارانی کوردستان گەڕینرابوونەوە[3]. ئەوانە تفەنگی M-16ی ئەمریکییان لایە[4]. سەربازە ئەمریکییەکان بە رێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ Human Rights Watchراگەیاندووە کە گروپێکی هێزی تایبەتی لە هێزی دەریایی ئەمریکی ناوە ناوە سەردانی تورکیایان کردووە، مەشقی هاوبەشیان لەگەڵ هاوتا تورکییەکەیان ئەنجامداوە، **"لەوانەیە ئەمە ئاماژەیەکی شاراوە بێت بۆئەوەی کە هێزە تایبەتییەکانی تورکی لەسەر دەستی ئەو مەشقکارە ئەمریکییانە مەشقیان بینیووە"**[5].

سوپای تورکی و یەکە پاشکۆکانی، بە پشتبەستن بە مێگەلێك هەلیکۆپتەری پێشکەوتوو، ئەو جەنگەی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتی بەڕێوەدەبرد، گرنگترین بنکەکانی ئەو مێگەلە هەلیکۆپتەرە کە فەوجی

(1) -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations… .; Desmonda Fernandes, "TURKEY’S US-BACKED "WAR ON TERROR" PART 1 ,Monday, October 23, 2006. Via at: (http://rastibini.blogspot.com/2006/10/turkeys-us-backed-war-on-terror-part-1.html).

(2) -Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds, P. 35; Desmond Fernades, "Turkey's U.S. Backed…", P. 33.

(3) -Carol Migdalovitz, "Turkey's Kurds Imbroglio", Pp. 92-93

(4) -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations. …

(5) -Iibd.

فرۆکەوانی دووەم بوو، لە باشووری رۆژهەڵاتی وڵات لە ویلایەتی مەلاتیە Malatya بوو. هەلیکۆپتەریش بە باڵی بەهێزی سوپای تورکی دادەنرێت و لەلایەن سوپای تورکی و ژەندرمەوە بەکاردێت، کە لە پێشێلکارییە ترسناك و فراوانەکانی مافی مرۆڤ لە ناوچەکە بەرپرسە، لەبەرئەوەی بۆردوومانی رەمەکی لە چالاکییەکانی دژ بە دانیشتوان و دامەزراوە مەدەنییەکان ئەنجامداوە[1].

زۆربەی هەرە زۆری هەلیکۆپتەرە تورکییە بەشداربووەکانی پرۆسە سەربازییەکانی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات لە دروستکراوی ئەمریکی بوو: لە 8 هەلیکۆپتەری S-70A Sikorsky Black Hawk و 38 هەلیکۆپتەری کوبرای هێرشبەر AH-IW Cobra، و 96ی گواستنەوە لە جۆری VH-IH و 14ی لە جۆری AB-204 و 64ی لە جۆری AB-205 پێکهاتبوو[2].

هێزی ژەندرمە Jandarma یەکێك بوو لە یەکەکانی ئاسایشی تورکی و ژمارەیان نزیکەی 40.000 تا 50.000 کەس دەبوو، بریتی بوون لە هێزی پۆلیسی لادێی، کە بە فەرمی سەربە وەزارەتی ناوەخۆیە، تاکەکانی وەك سەرباز مەشقیان پێ دەکرێت، لە ناوچە کوردییەکان لە بنکەکانی پۆلیس کاردەکەن، هەروەها زانیاری هەوالگریش کۆدەکەنەوە، گالیسکەی گواستنەوەی سەرباز و هەلیکۆپتەری شەڕکەر و هاوەنیان هەیە و ئەرکەکەی وەك پۆلیسی (دەرك)ی وڵاتانی دیکەی ئەورووپی نییە. ئەو هێزە دڕندانە شەڕی پارتی کرێکارانی کوردستانی کردووە، هەروەها پێشێلکارییەکی فراوانی مافەکانی مرۆڤی لە گوند و شارۆچکە کوردییەکان ئەنجامداوە، ئەمەش ناوبانگێکی خراپی پێ بەخشیووە[3]. ئەو هێزەی ژەندرمە هەر لە بنەرەتەوە لەلایەن ئەمریکا و پەیمانی ناتۆوە مەشقپێکراون، خەڵکی ناوچە کوردییەکان پێیان دەڵێن **"کڵاو شین"** یان **"کۆماندۆز"**، لەبەرئەوەی لەلایەن یەکەیەکی ئەمریکی **"کڵاو کەسك"**ەوە مەشقپێکراون[4]. ئەو هێزە بە شێوەیەکی بنەڕەتی

(1) -Tamar Gabelnick and Others, "Arming Repression: U.S. Arms Sales."...

(2) -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations. ...

(3) -Ibid.

(4) - مهمت ماردنلي، المصدر السابق، ص ص 21–220.



پشت بە کۆمەڵێ هەلیکۆپتەری شەڕکەری دروستکراوی ئەمریکی دەبەستێ و لە 20 هەلیکۆپتەری گواستنەوە لە جۆری بلاك هوك Black Hawk و 20ی دیکە لە جۆری بیل AB-203 Bill و 56ی دیکە لە جۆری بیل AB-205–AL(Bell) و 15ی هەناسەدەر و 12 لە جۆری Bell Helicopter (anada) B-206 و 12ی دیکە لە جۆری AB-212 Bell Helicopter (anada) و 2 ش لە جۆری Do-28 و یەکێکیش لە جۆری Rock Well Aero Commode-690 ، 6 لە جۆری Sikorsky s-70[1].

دوو پێکهاتەی دیکەش لە هێزەکانی ژەندرمە جیادەبوونە، کە لەبنەرەتەوە بۆ لەناوبردنی پارتی کرێکارانی کوردستان و ئەوانەی گومانی لایەنگیری ئەو پارتەیان دەکرد، داهێنرابوون. یەکەمیان، هێزی تایبەتی ژەندرمە بوو Ozel Tim-Special Jandarma forces، کە لە ساڵی 1992 دامەزرابوو، تانسۆ چیللەری سەرۆك وەزیران زۆر بۆی بەپەرۆش بوو، لە تشرینی دووەمی 1993 بەم شێوەیە پێناسەی کرد و گوتی: **"یەکەی میلیتانتی–مغاویر– تایبەتی راگوزەرن، مەشقپێکراون بۆ شەڕی پیاوانی باندەکان بە شێوازی تایبەتی خۆیان"**[2]. مەشقێکی باش دەکرێن و لە رووی فیکری باش ئامادە دەکرێن تاکو شەڕی هەرچی ئەوانەی بەلای نەتەوەی کوردا دەچن بکەن، یەکەکانی ئەو هێزە زۆربەی جار تاکەکانی گرووپە توندرەوە نەتەوەییە راسترەوەکان، ئەوانەی رق و کینەیەکی توندیان بەرامبەر نەتەوەی کورد هەیە، لەخۆ کۆدەکاتەوە[3]. ئەوانە بەشێوەیەکی زۆر پشت بە تفەنگی M-16 دەبەستن، هەندێجاریش بە تفەنگی ئێم 203ی ئەمریکی، ئەو چەکەش لە دژی تانکەکان بەکاردێت و گوللە نەبڕیش دەبڕێ[4].

(1) -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations... ; Tamar Gabelnick and Others, "Arming Repression: U.S. Arms Sales

(2) -Carol Migdalovitz, "Turkey's Kurdish Imbroglio", P.9.

(3) -Carol Migdalovitz. "Turkey's Kurdish Imbroglio", P. 92.

(4) -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations. ...

پێکهاتـەی دووەم، هێـزی جولانـەوە تایبەتەکانـەOzel Hareket Tim، لـە ڕێگـەی بەڕێوەبـەرانی ئاسـایش و حاکمـانی ناوچـەکان سـەربە وەزارەتـی ناوەخۆیە، ئەرکی جێبەجێکردنی "**چالاکی تایبـەت**" و لـەناوبردنی یـاخیبوانی لادێ و شارەکانە، ئەو هێزە لە بنەرەتەوە لە کارمەندانی پێشووی هـەواڵگری و نیشانە شکێنەکان و میلیتانتەکان، کە هەموویان بە باشی مەشـقیان پێکـراوە، پێکهـاتووە، هـەروەها زۆر ئیمتیازیـان هەیـە و پالنـەری بنـەرەتییان لـە ژیـان "**کوشـتنی**" ئەنـدامانی پـارتی کرێکـارانی کوردسـتانە، یـەکێك لـە ئەفـسەرانی پێشووی تـورك لـە چـاوپێکەوتنێکی لەگـەڵ (Human Rights Watch) گـوتی: "**ئەو یەکانە ترسناکن، ئێمەی ئەفسەرانی سوپا لێیان دەترسین، هەرگیز نەمان ویستووە لە ڕێگایان بوەستین، بەردەوام خۆمان لێیان لاداوە و هەرشـوێنی ئەوانی لێبێت، ئێمە بەجێی دێلین**"[1]. ئەو گرووپە بـەهۆی پێـشێلکارییەکانی لەبواری مافەکانی مرۆڤ ناوبانگی پەیداکرد، هەتاکو یەکێ لە گەورە کارمەنـدانی بالیۆزخانەی ئەمریکی لە ئەنقەرە لـە سـاڵی 1995 لـە وەسـفی تاکـەکانی ئـەو گرووپە گوتی: "**ئەوان کۆمەڵە تاوانبارێکی دڕندەن**"[2]. ئەو تیمە بەشێوەیەکی گـشتی لـە دابینکردنـی چـەکدا پـشت بـە ئـەمریکا دەبەسـتێ، تفـەنگی M-16 هێرشکەر و تۆپهاویژی M-203 کە لەسەر شان هەڵدەگیرێت، بەکاردێنن[3].

هێـزی ئاسمـانی تـورکی، کلیلـی زاڵبـوونی تورکیایـە بەسـەر یـاخیبوان لـە باشـووری ڕۆژهـەڵاتی وڵات و بـەڕێوەبردنی جەنگەکـە. سـەرکردایەتی هێـزی دووەمـی ئاسمـانی لـە باشـووری ڕۆژهـەڵاتی وڵات کۆبۆتـەوە، کـە گۆرەپـانی

(1) -Ibid.

(2) -U.S. Department of State, Turkey Country Report on Human Rights Practices for 1996, (Released by the Bureau of Democracy, Human Rights, and Labor), January 30, 1997. Via at: (http://www.hri.org/docs/USSD-Rights/96/Turkey96.html).

(3) -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations… ; Department of State, U.S Military Equipment and Human Rights Violations, report submitted to the Chairman of the Senate Foreign Relations Committee on 1 July 1997, pursuant to Senate Committee Report 104-295, accompanying H.R. 3540. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_dos_USweapons.htm).



چالاکییەکانە. بنکەی سەربازی دیاربەکر لـە چـالاکترین بنکـەکانی لـەناوبردنی یـاخیبوانی باشـووری ڕۆژهـەڵاتی وڵاتـە. دوو مێگەلـەی (181 و 182) کـە ئامادەکرابوون بە فرۆکەی جـۆری C-104 Starfishes وC/D F-16 کـە توانـای هێرشکردنی زەمینی هەیە، لەوێ (دیاربەکر) کۆبوونەتەوە[1].

کۆمەڵـە کـانی بـەرگری لـە مافـەکانی مـرۆڤ، بـەکارهێنانی تورکیـا بـۆ فرۆکـەی جەنگی، کە زۆربەیان دروستکراوی ئەمریکان، بەشێوەیەکی چڕوپڕ بـۆ بۆردوومـانی گردبوونـەوەی دانیـشتوان و گونـدە کوردییـەکان و خـاپوورکردنی و سـووتاندنیان تۆمـارکردووە، هـەروەها ئـەو هێـزە ڕۆکـێتی 500 تـا 1000 ڕەتڵـی (پاوەنـد) بـە شـێوەیەکی ڕەمـەکی بەسـەر نـشینگە مەدەنییـەکان و پێگەیـەك کـەوا مەزەنـدە دەکرێت پارتی کرێکـارانی کوردسـتان بێـت، لـە نـاو تورکیـا و کوردسـتانی عێـراق، بەرداوەتەوە. بۆنموونە لە میانەی گوزرێکی کوشـندە کـە دوو فرۆکـەی جـەنگی لـە ئـازاری 1994 کردیانـە سـەر گونـدی (کۆکنـار Kuôkonar) لـە پارێزگـای شـیرناخ Sirnak 24 هاووڵاتی مەدەنییان کوشت و دوو هیندەشیان بریندار کرد[2].

هەرچەندە فرۆکەکانی F-16، کە بڕبڕەی پشتی هێزی ئاسمانی تورکی دادەنرێت، لە بەرهەمە هاوبەشەکانی تورکیا– ئەمریکایە، بەڵام زۆربەی فرۆکە بـەکارهاتووەکان لـە باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵات و کوردستانی عێراق راستەوخۆ لـە ئـەمریکا وەرگیـراون. کـە 178 فرۆکەی شەرکەری جۆری ڤانتۆم F-4E Phantom و 160 F-16 و 20 لە جـۆری F-104 Star fighter و فرۆکەی جۆری RF-4E دیارخەر[3].

پرۆگرامـی مەشـق و ڕۆشـنبیری سـەربازی ئـەمریکی یـەکێك لـە دیـاریترین لایەنەکانی یارمەتی ئەمریکی بوو بۆ تورکیا. بە گوێرەی ئامارەکانی پەنتاگۆن (3527) ئەفسەری تورکی لە ماوەی نێوان 1970 تا 1979 مەشقیان لە ئەمریکا بینیووە، ئەو پرۆگرامە بەشێوەیەکی تایبەتی هێزەکانی ژەندرمەی گرتـەوە[4]،

(1) -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations. …

(2) -Ibid.

(3) -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations. …

(4) - مهمت ماردنلي، المصدر السابق، ص 21.

که بەشێکی زۆری پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ولات دەکەوێتە ئەستۆیان، چوار لەسەرکردەکانی ژەندرمە لەوانەی لەماوەی دەیەی حەفتاکان لە کوردستان خزمەتیان کردووە، لەوانەبوون کە لە ئەمریکا مەشقیان پێکراوە[1]. لە نێوان دیاریترین ئەوانەی لە ئەمریکا مەشقیان بینیووە، سەرکردەی هێزی تایبەت و حسێن کوجاداغ Huseyn Kocadag ی جێگری سەرۆکی پۆلیس لە دیاربەکر بوون، ئەوەی دواییان لەلای دانیشتوانی دیاربەکر بە دیارترین بکوژ، لەوانەی سەرپەرشتی **"تیمەکانی مردن"**، دەکەن، ناسراوە[2].

بە توندبوونەوە و فراوان بوونی بازنەی شەڕ لە تورکیا لەماوەی ساڵانی حەفتاکان، کۆنگرێس لە ساڵی 1991 یاسایەکی لەژێر ناوی (ئالۆگۆڕی مەشقی هاوبەش JCET-Joint Combined Exchange Training) پەسند کرد. بە گوێرەی یاساکە رێگە بە وەزارەتی بەرگری ئەمریکی درا تاکو هێزی **"چالاکی تایبەت لە میانەی ئەرکی مەشقپێکردنی یەکە سەربازییەکانی ولاتانی پشتەوەی دەریاکان"** بنێرێت. هەرچەندە یاساکە لەڕووی زمانەوانییەوە بە وردی داڕێژرابوو، بەڵام زۆرێکیش لە دەستەواژەی نەرمی تێدابوو، ناوەڕۆکی یاساکە ئەوە بوو کە مەشق بە یەکە سەربازییە بیانییەکان بکرێت، بۆ ئەوەی بتوانن کۆمەڵێ لێهاتوویی شەڕکردن، جێبەجێ بکەن[3]. لە ساڵی 1997 تید کالان کاربنتر Ted Galen Carpenter، ئەوەی بەدەرخست کە یەکەی تایبەتی چالاکییە ئەمریکییەکان لە ئەورووپا U.S.- European Common's Special Operations کە بەشێکە لەو بەرنامەی پێشتر باسکرا، **"بە مەشقپێکردنی هێزە میلیتانتە[مغاوير] چیاییەکانی تورکیاوە خەریکە"**. ئەو یەکەیەی کە لە تۆقاندن و کوشتنی چالاکەکانی کورد بەرپرسە، هەروەها بەرپرسە لە ژمارەیەك کردەوەی وەحشیگەری دژ بە هاوولاتیانی کورد و هەرەشەکردن لە

(1) - المصدر نفسهُ، ص ص 21–22.

(2) -Devrimci Sol, "Who Are Guilty?", Devrimci Sol, January 1997, P. 31.

(3) -Desmond Fernandes, "Turkey's U.S Backed "War on Terror: A Cause For Concern? ", Variant, Winter, 2006, P.2.



گوندییەکان[1]. بە گوێرەی یاسای ئالۆگۆڕی مەشقی هاوبەش، ئەمریکا تیمێکی سەربازی ئەمریکی بۆ مەشقپێکردنی هێزەکانی میلیتانتە چیاییەکان. پرۆگرامی مەشق و فێرکردنی نێودەوڵەتی سەربازی International Military Education and Training، کە وەزارەتی بەرگری ئەمریکی لە رێگەی پرۆگرامی بەخشینە دەرەکییەکان پارەی پێدەدا، لە ساڵی 1984 تا 1997 نزیکەی 2500 ئەفسەری تورکی مەشقپێکردووە[2]. هەروەها بە گوێرەی یاسای مەشقی هاوبەش لە ساڵی 1998 تیمێکی ئەرکی تایبەتی ئەمریکی Special Operations Team بۆ مەشقپێکردنی کۆماندۆزی چیایی تورکی بۆ تورکیا ناردرا[3].

ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست بەدواداچوونێکی بۆ بەرنامەی هاوبەشی ئەمریکی تورکی بۆ مەشقپێکردن، کرد. ئەو بەدواداچوونە لە وتارێکی سێ بەشی لەلایەن دانا بریست Dana Priest ی پەیامنێرەوە نووسراوە و لەژێر ناوی (Free of Oversight: U.S. Military Trains Foreign Troops) بڵاوکرایەوە، لە بەشێکی وتارەکەدا هاتووە کە ئەو یاسایەی کە لە ساڵی 1991 بە گوێرەی بەشی (2011) لە ماددەی (10)ی وەزارەتی بەرگری ئەمریکی داڕێژرا، وایکرد ئەمریکا پەیوەندی لەگەڵ زیاتر لە 110 ولاتی جیهان ببەستێ، دانا بریست باسی لەو شاندە ئەمریکییە کردووە، کە کۆتایی بە پرۆگرامێکی مەشقپێکردنی تیمێکی میلیتانتی چیایی تورکی هێنا، هەروەها ئەوەشی دەرخست کە شاندە ئەمریکییەکە لە راپۆرتەکەیان لەبارەی ئەرکەکەیان ئاماژەیان بۆئەوە کردووە کە **"ئەوان لە پێکهێنانی پەیوەندی باشی کار سەرکەوتوو بوون و ئەرکەکەیان پێداویستییە داهاتوویەکانی تورکیای بەدیهێناوە..."**، لە درێژەی راپۆرتەکە هاتووە کە یەکە تورکییەکە لەسەر چەکی تایبەتی وەك ئامێری بینینی شەو و رووبەڕووبوونەوە بە لێزەر و کردەی

(1) -Ted Galen Carpenter, Op. Cit.

(2) -Kevin McKiernan, "Turkey's War…", P.35.

(3) -Kurdish Question in Turkey: The U.S.-Turkish Military Relationship, : www.mtholyoke.edu.

نیشانە شكێنی ڕاهێنراون. هەروەها ئەو توركانەی كە **"بە شان و شكۆی تیمە ئەمریكییەكەیان دا هەڵدا، لەلایەن ئەمریكییەكانەوە بە سەرنج ڕاكێش و بەتوانا و بە ئارام"** وەسفكران. دواتر ڕۆژنامەكە ئاماژەی بۆئەوە كردووە كـە **"ئـەركی تیمە ئەمریكییە مەشقپێكردنی میلیتانتی چیایی بوو لەسەر سەربڕینی كوردان"** و تاوان ئەنجامدان لە دژی مرۆڤایەتی[1].

ڕێكخراوی لێبـووردنی نێودەوڵـەتی Amnesty International Organization[2] لە ساڵی 1997 ڕاپۆرتێكی ئاراستەی مادلین ئۆلبرایتی وەزیـری دەرەوەی ئـەمریكا كرد، ئەو ڕاپۆرتە بەرهەمی سێ ساڵ چاودێریكردن بوو لەبارەی گرووپ و یەكەكانی پۆلیسی تایبەت بە لەناوبردنی تـیرۆر، ئەمـەش بۆئـەوەی وا لـە ئیـدارەی ئـەمریكی بكرێت كە چاو بە سیاسەتی چەكی ئەمریكی لەبەرامبەر توركیادا بخشێنێتەوە. لـە ڕاپۆرتەكەدا بەڵگەی وا هەبوون، دەریدەخست كە یەكـەكانی **"لـەناوبردنی تـیرۆر"** منداڵانیان ئازارداوە و دەستدرێژی سێكسییان كردۆتە سـەر بەندییـەكان و تـەوژمی

[1] -Turkey and the Charge of Genocide - A Submission to the Independent Commission for International War Crimes Tribunal', Fashion Institute of Technology, New York, July 31, 1999. Via at: (http://www.kurdistanica.com/english/humright/articles/hum-article-01.html).

[2] - ڕێكخـراوی لێبـوردنی نێودەوڵـەتی، ڕێكخراوێكـی نێودەوڵـەتی ناحكومییـە، لـە حـوزێران 1961 لـە لەندەن لەلایەن پارێزەری ئینگلیزی پیتەر بینسون، لەسەر بودجەی تایبەتی خوی دامەزراوە. كـاری ئـەم ڕێكخـراوە ڕێگـرتن و نەهێـشتنی هەڵـسوكەوت و پێـشیلكاریەكانی مـافی مرۆڤـی ترسـناك و پێشكێشكردنی پەرپرسەكانی ئەم سەرپێچیانە بۆ دادگا بوو. هەروەها پێكێشكردنی چـەند ڕاپـۆرتی نێودەولەتی سالانە و بە شێوەیەكی ڕێكخراو لەسەر بارودوخی مافی مرۆڤ لە جیهاندا. لە سـاڵی 1977 ئـەم ڕێكخـراوە لەبـەر هەوڵـەكانی بـۆ بەرەنگاربوونـەوی ئەشـكەنجەدان، خـەڵاتی نـۆبڵی ئاشـتی پێبەخشرا. لە چالاكیەكانی ئەم ڕێكخراوە پابەندبوونی خوی بۆ هاوكاری خێزانە بەنـدكراوەكان دیـار دەكات و، گواستنەوەی چاودێرەكان بۆ دانیـشتنەكانی دادگاكـان، و هاوكـاریكردنی پەنابـەرەكان، و پێشكێشكردنی پاڵپشتی بۆ ڕێكخراوەكانی جڤاكی مەدەنی و ڕێكخراوە ناحكومیەكان، ئەم ڕێكخراوە سیمای ڕاوێژكاری لە نەتەوە یەكگرتووەكان و ئەنجومەنی ئەورووپا و ڕێكخراوی یونـسكو بـە خۆیـەوە دەبینیـت. هـەروەها لەلایـەن ناوەنـدەكانی نێودەوڵـەتی ڕێـزی لێ دەگیرێـت. سـەیری، ویكیبیـدیا، الموسوعة الحرة، متاحة على الموقع الالكتروني التالي:
http://en.wikipedia.org/wiki/Amnesty_International



كارەبا و لێدان و سووتانیان لەبەرامبەر بەندییەكان بەكارهێناوە. هەروەها ڕاپۆرتەكە ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە لە نێوان هەر قوربانییەكی (یەكەی لـەناوبردنی تـیرۆر) دا منـداڵ و كەسـانی پـیر هـەن[1]. ڕۆژنامـە ئەورووپییـەكان ڕاپـۆرتی تێروتەسـەلیان لەبارەی سەربڕینەكانی ئەو یەكەیە كە دەرهەق بە جەنگاوەرە كوردەكان ئەنجامیان داوە و دواتر كردەوەكەیان وێنەگرتووە[2].

ئەفسەران و شارەزایانی ئەمریكی بە چـڕی لـە كوردسـتانی توركیـا بـە ئـەركی مەشقپێكردن بڵاوببوونەوە، هەروەها ڕێنمایی تونـدیان لـە سـەرووی خۆیانـەوە لـە واشنتۆن پێدرابوو، كە نەچنە ناو گفتوگۆی سیاسـی لەگـەڵ هاوڕێیـە توركـەكانیان، كـە ئـەوەیان لێزانـراوە، كـە بەرامبـەر هـەر بابـەتێك كـە ڕەخنـە لـە سیاسـەتی ولاتەكـەیان بگرێـت، زۆر هەسـتیارن. جۆناسـان ڕانـدڵ ئـەزموونی تایبـەتی خـۆی دەگێڕێتەوە، كاتێ باس لەوە دەكات كە ئەو لە هشتاكانەوە لەسەر ئەوە ڕاهـاتووە كە لە ئەفسەرە توركەكانی دامەزراوە ئەمنییەكانی ناو كوردستانی توركیا لـەبارەی ڕەوشی ناوچەكە بپرسێ، ئەو سـەری لـەوە سـووڕدەما كـاتێ دەیبـینی كـە ئـەوان هێندە گوێ بەوەی لە دەروبەریان دەگوزەرا نەدەدا[3].

هەروەها دیپلۆماسە ئەمریكییەكان بۆ چەندین جار هەوڵیان داوە، پاساو بۆ ئـەو ڕیۆشـوێنەی حكوومـەتی تـوركی بهێننـەوە، ئـەویش ئـەوە بـوو هـەر دیپلۆماتكارێك كە بەمەبەسـتی بەسـەركردنەوە سـەردانی باشـووری ڕۆژهـەڵاتی توركیـای بكردابوایـە، دەیخـستە نـاو لیـستی ڕەشـەوە. یـەكێ لـە دیپلۆماتكارەكانی بالیۆزخانەی ئەمریكی لـە ئەنقـەرە لەسـەر ئـەم بابەتـە بـەم شێوەیە لێدوانی دا و گوتی: **"بـا بـۆ هـەموومان ڕوون و ئاشـكرا بێـت، ئێمـە یەكـەی بەسـەركردنەوە نـین، بـە هـەموو لایـەكی توركیـادا ڕاناكـەین و بـە كامێراكانمانەوە وێنە ناگرین"**[4].

[1] -Kevin McKiernan, "Turkey's War…", P.35; "Kurdish Question in Turkey: The U.S.-Turkish Military Relationship", : www.mtholyoke.edu.

[2] -Turkey and the Charge of Genocide. "…

[3] - جوناثان راندل، المصدر السابق، ص 354.

[4] -Human Rights Watch Arms Project, "Weapons Transfers and Violations… .

هەروەها پاڵپشتی ئەمریکی بۆ تورکیا لە چوارچێوەی **"چارەسەری پرسی کورد"**، ڕاوەرگرتن و خزمەتگوزاری ڕاوێژکاری لەخۆگرت بوو، ئەمەش لە ڕێگەی سەنتەرەکانی توێژینەوە و دامەزراوە ئەمریکییەکان. ئیسماعیل پیشکچی باس لەوە دەکات کە پرۆفیسۆری ئەمریکی (فرای–fry)، کە لە توێژینەوەیەکدا بۆ تورکیا تەرخانکردبوو، ئەو توێژینەوەش لە چوارچێوەی هاوکاری نێوان بەڕێوەبەرانی توێژینەوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری تورکی و دامەزراوەی AID ئەمریکی هات، ئەو توێژینەوەیە لە ساڵی 1962 لە ئەمریکا بڵاوکرایەوە، لەو توێژینەوەیەدا ئەوە بەڕوونی بەدەرخرابوو کە بەرپرسانی حکوومی ئەمریکی، خزمەتگوزاری ڕاوێژکاری بە حکوومەتی تورکی دەدا، لەوانەش **"باشترین ئامرازی چارەسەری گرفتە کۆمەڵایەتییەکان، بەتایبەتی پرسی کوردی، بە دامەزراندنی پارتێك دەبێت کە سیاسەتی ئایینی بگرێتە بەر"**[1]. لەسەرەتای نەوەدەکان ئۆگۆر مەموجۆ Ugur Mumcu ڕۆژنامەنووسی تورکی، نووسیویەتی کە دۆزینەوەی بزووتنەوەیەکی ئیسلامی کوردی لە تورکیا، لە کارە لەپێشەکانی ئەمریکایە[2]. هەرچەندە هیچ هێمایەك بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە ئارادا نییە کە بۆ ئەوەی کە ئەمریکا بەهەرشێوەیەك بێت ئەزموونی حیزبوڵای تورکی دەست پێ بکاتەوە، بەڵام کردەوەکانی ئەو حیزبە و پێشێلکارییە ترسناکەکانی بۆ مافەکانی مرۆڤ لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا، هیچ کاتێ لەلایەن بەرپرسانی ئەمریکی لە میانەی قسەکانیاندا بە بابەتە پەیوەندارەکان بە تورکیا، ڕەخنەی لێنەگیراوە.

کارۆل میکادۆلۆفیتەرز، ئەوەی بەدرەخست کە شارەزایانی ئەمریکی لە ساڵی 1993 بۆ تورکیایان پێشنیاز کردووە، کە هێزەکانی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵات دوو هێند بکاتەوە، بۆئەوەی بتوانێ زاڵبوونێکی ڕاستەقینە

(1) - اسماعيل بيشكجي، كردستان مستعمرة دولية، ترجمة، زهير عبد الملك، دار ابيك للطباعة والنشر، اسبانيا–السويد، 1998، ص 168.

(2) -Cengiz Ozaknci, Iblisin Kiblesi: Soguk Savas Donnemi'nden Yeni Dunya Duzeni'ne 1945'ten 28 Subat'a ve gunumuze Turkiye'de Islamcilik ve Emperyalizm, Otopsi Yayinlari, Istanbul, 2005, P. 191.



بەسەر ناوچەکە بەدەست بێنێ. بەکردەوە دوای کەمێك دوودڵی، لە ناوەڕاستی ئازاری 1994، بەرپرسانی تورکی ڕایانگەیاند کە هەزاران هێزی زیادەیان بۆ باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵات ناردووە[1].

ئەمریکا زۆر نەیویستووە، کاریگەری لەسەر سیاسەتەکانی تورکیا لەبارەی پرسی کوردەوە دابنێ، بەتایبەتی لەسەرەتای نەوەدەکان، چونکە جێبەجێکردنی سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر پێویستی بە هاوکاری تورکی هەیە، هەردوولا دانیان بە پشتبەستن بەیەکتری نا[2]. بەو سیفەتەی ئەمریکا گاریگەرییەکی کەمی لە سیاسەتەکانی سوپای تورکی دا هەیە[3]، باشیش دەیزانی کە بەکردەوە ئەو سوپایە خاوەن دەسەڵاتی ڕاستەقینەی باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتە و هەر ئەویشە خاوەن قسەی کۆتاییە لە بارەی دۆسیەی کوردی[4].

ڕاپۆرتی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لەبارەی مافەکانی مرۆڤ بۆ ساڵی 1995، کە لە گەورە بەرپرسانی ئەمریکی گواستراوەتەوە، کە سوپای تورکی هاوکاری و وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی نووسینگەکانی مافەکانی مرۆڤی سەربە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی ڕەتدەکاتەوە، کە لەبارەی بەکارهێنانی چەکی ئەمریکی لە پێشێلکارییە فراوانەکانی مافەکانی مرۆڤ و بەکارهێنانی فڕۆکەی F-16 و گالیسکەی گواستنەوەی سەرباز لە پرۆسەکانی کوشتنی ڕەمەکی مەدەنییە کوردەکان[5]. ئەوە لەبری ئەوەی فشار بۆ سەر تورکیا بێنێت و بە هاوکاریکردن ڕازیی بکات، ئەوا ئیدارەی ئەمریکی پێیباشتربوو گەورە بەرپرسانی سەربازی تورکی توڕە نەکات، ئەوانەی کە ناوە ناوە چاویان بە

(1) -Carol Migdalovitz, "Turkey's Kurdish …", P. 88.

(2) -Henri J. Barkey, "The Endless Pursuit…", P. 220; Carol Migdalovitz, "Turkey's Kurdish…", P. 88.

(3) -Carol Migdalovitz, "Turkey's Kurdish…", P. 88.

(4) -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations… .

(5) - U.S. Department of State (Bureau of European Affairs), Report on Allegations of Human Rights Abuses by the Turkish Military and on the Situation in Cyprus, 95/06/01. Via at:
*(http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_cyprus_1995.txt)*.

هاوتا ئەمریكییەكانیان دەكەوت، ملكەچی داخوازییەكەی سوپا بوو، كە داوای لێكردبوو بۆ وڵامی پرسیارەكانیان با سەردانی وەزارەتی دەرەوەی توركیا بكەن، بەمەش بە بەندكردن و تێكەڵاوكردنی زانیارییەكان رازی بوون، هیچ نارەزاییەكی لەمبارەیەوە دەرنەبری. لەجیاتی ئەمە، ژەنەراڵ جۆن شالیكاشفیلی سەرۆكی دەستەی ئەركانی هاوبەش دوای چەند رۆژێك لە دەرچوونی راپۆرتەكەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكا، هانی كۆنگرێسیدا ئەو بانگەشانەی كە داوای پچڕاندنی یارمەتییە سەربازییەكان بۆ توركیا بەهۆی تۆماری لەبارەی مافی مرۆڤەوە دەكەن، فەرامۆش بكات. لەگەڵ تەواوی بەرپرسانی پەنتاگۆن ئەوەیان رەتكردەوە كە پرسی مافەكانی مرۆڤ بە فرۆشتنی چەكەوە گرێبدرێت[1]. لە چاوپێكەوتنێكی جۆن شاتۆك John Shattuck ی یاریدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریكا بۆ مافەكانی مرۆڤ، لە ساڵی 1998، لەبارەی سیاسەتی وڵاتەكەی لەمەڕ پێدانی چەكی ئەمریكی بە توركیا بەرگریكرد و گوتی: **"هەرچەندە پێشێلكارییەكان دژ بە كورد بۆ ئەمریكا خەمهێنە، بەڵام تۆماری مافەكانی مرۆڤی توركی باش بووە...، بەهەر حاڵ لەو باوەڕەدانیم كە ئەمریكا لە سیاسەتە ناوەخۆییەكانی توركیا بەرپرس بێت"**[2].

پشتبەستنی توركیا بەو ئاستە لەسەر یارمەتییە سەربازییەكانی توركیا، واتا ئەمریكا لە پیگەیەكدا بوو دەیتوانی فشار بخاتە سەر توركیا و وایلێبكات چارەسەرێكی ئاشتییانە بۆ پرسی كورد بدۆزێتەوە، بەڵام چاوپۆشی ئیدارەی ئەمریكی لە پێشێلكارییە فراوانەكانی مافی مرۆڤ لە توركیا، و بەدەوامبوونی لە پێدانی چەك بە حكومەتێك مافە بنەرەتییەكانی هاووڵاتیانی پێشێل بكات و بەهای دیموكراتی ببەزێنێ، ئاماژەیەكی روون و ترسناك بوو بۆ توركیا كە ئەمە ماناكەی بوو **"بەردەوامیدان بە جەنگی ناوەخۆی دژ بە كورد و پاڵپشتیكردن بە زەبری هێز لە حكومەتێكی لایەنگری رۆژئاوا و فەرامۆشكردنی ئاماژەكانی داتەپینی ئابووری"**[3].

---

(1) -Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations. ...

(2) -Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds, P. 29.

(3) -Jennifer Washburn, "Don't Sell Weapons ...).

## بابەتی سێیەم: پاڵپشتی سیاسی: دابینکردنی پاڵپشتی سیاسی بۆ چالاکییە سەربازییەکانی تورکیا دژ بە کورد

گرنگترین و دیاریترین پاڵپشتی ئەمریکی بۆ تورکیا لە جەنگەکەی لە باشووری رۆژهەڵاتی وڵات، کەمکردنەوەی ئەو کاریگەرییانە بوون کە بەهۆی ئەو سیاسەت و پێشێلکارییانەی مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا و یاسای نێودەوڵەتی سەبارەت بە پرسی کورد دەهاتنە ئاراوە. ژمارەیەك لە رێکخراوە ناحکوومی و کۆمەڵە کانی ماڤ مرۆڤ ئەوەی لە کوردستانی تورکیا دەگوزەرێ بە هەڵمەتی **"لەناوبردنی بە کۆمەڵی–Genocide کە هیچ گومان هەڵناگرێت"**، پۆلێنکردووە. لیژنەیەکی پەرلەمانی مافەکانی مرۆڤ دوای سەردانێکی مەیدانی بۆ ناوچە کوردییەکان لە ساڵی 1993 گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە **"چۆڵکردنی ناوچە کوردییەکان، بە گوێرەی باوەڕی ئێمە بەشێکە لە ستراتیژێك کە ئامانجەکەی لە ناوبرنی چەند هەزار چەکدارێکی [پارتی کرێکارانی کوردستان] نییە- بەڵکو بۆ سڕینەوەی ناسنامەی جیاوازی گەلی کوردە..."**، راپۆرتی لیژنەکە هەروەها ئاماژەی بۆ ئەوە کردبوو کە حکوومەتەکانی بەریتانیا و ئەمریکا بە رۆژنامە باوەکانیش وا کێشەکە دەنێرنە دەرێ کە **"کێشەی حکوومەتێکی دیموکراتییە، کە تاڕادەیەکی زۆر بەرگە دەگرێت، کێشەیەکی کەللە رەقە، ئەویش تیرۆرە"**، هەروەها لیژنەکە لە راپۆرتەکەی لەو باوەرەدا بووە **"کە یەکەم ئامانجی سەربازی سڕینەوەی ناسنامەی گەلێکە، ئێمە لە دووبارەبوونەوەی کوشتارگەی ئەرمەن (Armenian Holocaust 1915-1916) زۆر نیگەرانین...، ئەندامانی پارتی کرێکاران وەکو ئەرمەنییەکانی یەکەم جەنگی جیهانی چەکیان هەڵگرت، چونکە ئەوان بە رێگەی ئاشتی بواریان پێنەدرابوو، ئامانجە سیاسییە رەواکانیان بەدیبێنن، تورکەکان لە ساڵی 1915 بە لەناوبردن وەڵامیان دانەوە. هەروەك ئەوەی لەگەڵ ئەرمەن ساڵی 1915 روویدا، دواتر تورکیا زمانی ئاشتەوایی بۆ**



**سواندنی جیهانی دەرەوە بەکارهێنا، حکوومەتی تورکی لە بەرامبەر دانیشتوانە مەدەنییە بێ چەکەکان بەزەیی خۆی پیشاندا. شۆڕشی گەل لە دژی ئەوانە ئەو گەلە دەچەوسێننەوە، وەك تیرۆر لەناودەبرێت. هەڵەتێگەیشتن لە ئاوا رەوشێك، تەنها لەلای ئەوانەی راستی و مێژوو نازانن، روودەدات"**[1].

رێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ لە راپۆرتێکی کە بۆ ساڵی 1997 دەگەڕێتەوە، نووسیویەتی، **"بەڵگەی تەواو لەبەردەستدان، بۆئەوەی تورکیا بە پێشێلکاری ترسناکی مافەکانی مرۆڤ و رێککەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکانی دژ بە جینۆساید، تومەتبار بکرێت، ئەو رێکەوتننامەیەی کە پێشتر تورکیا خۆی مۆری کردووە"**[2].

هەرچی فایلی تورکیایە لەبارەی بوون بە ئەندام لە یەکێتی ئەورووپا، ئەوا لایەنێکی گەورەی ئەو مەرجانەی کە پێویستە تورکیا بەر لە چوونی بۆ ناو یەکێتییەکە جێبەجێیان بکات، بە فایلی کوردی و باشترکردنی مافەکانی مرۆڤەوە گریدراوە[3].

ئەو فشارانەی ئەمریکا کە بۆسەر هاوپەیمانە ئەورووپییەکانی ئەنجامی دا، بەس بوو بۆئەوەی وا لە تورکیا بکات، خۆی بە ناچار نەزانێ بۆئەوەی زۆر لەو یاسایانەی کە لەگەڵ میساق و داخوازییەکانی یەکێتی ئەورووپی ناکۆکە بگۆڕێت[4]. یەکێتی ئەورووپا ماوەیەکی درێژە هانی تورکان دەدات کە تۆماری

[1] -Desmond Fernades, "Turkey's U.S. Backed…", P.3-4.

[2] -Ibid, P. 3.

[3] - هۆگو بیمان نوێنەری یەکێتی ئەورووپی لە ئەمریکا، بەمشێوەیە باسی پرسی کوردی لە تورکیا کردووە، کە "تاکە راستییەکە کە ئێمە ناتوانین حکوومەتێکی وەك تورکیامان هەبێت و لە ناو یەکێتی ئەورووپی بۆی دڵخۆش بین". بە گازاندەوە درێژەی پیدا و گوتی: "سەختە بۆ یەکێتی ئەورووپی بە نیازێکی باش لەگەڵ حکوومەتی مەدەنی لە ئەنقەرە قسە بکات و لە هەمان کاتیش ژەنەرالەکانی سوپا لە پشت پەردەوە دەسەڵاتیان بەدەستەوە بێت". بەم شێوەیە ولامی پرسیاری رۆژنامە نووسێکی ئەمریکی دایەوە، ئایا دیموکراتی تورکیا هەرتەنها رووپۆشە و بەس؟ ئایا مرۆڤ دەتوانێ بەمە بڵێ دیموکراسی. سەیری:
Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds, Pp. 31-32

[4] -Henri J. Barkey, "The Endless Pursuit…", P. 230.

خۆیان لەبواری مافەکانی مرۆڤ بگۆڕن و مافی رۆشنبیریی و مەدەنی بە کورد ببەخشن و واز لە ئازاردانی بەندییە سیاسییەکان بێنن، بەر لەوەی باسی بوون بە ئەندام لە یەکێتی ئەورووپی بکەن[1]. بریاری ئەورووپییەکان لە کانوونی یەکەمی 1999 هات و مافی خۆپالاوتنی بە تورکیا بەخشی بۆئەوەی ببێتە ئەندامی تەواوی یەکێتییەکە، ئەمەش بە پاڵپشتی و فشاری راستەوخۆی ئەمریکی و هەروەها لەسەر حیسابی پێوانەکانی ئەو یەکێتییە بۆ مافەکانی مرۆڤ[2]. کە راستەوخۆ پەیوەندی بە رەوشی کورد لە تورکیاوە هەیە.

هاتنی مادلین ئۆلبرایت Madeline Albright بۆ پۆستی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (1997–2001) رێوشوێنەکانی ئیدارەی ئەمریکی دژ بە پارتی کرێکارانی کوردستان زیادی کردووە، لەو ساتەوە پارتەکە چووە ناو لیستی رێکخراوە تیرۆریستییەکانی جیهان، ئەو لیستەی کە ناوە ناوە ساڵانە بە شێوەیەکی رۆتین دەری دەکات[3]، بەڵام ئەمریکا هەر بەوەندە نەوەستا و هەلمەتێکی دیپلۆماسی و فشارێکی بەهێزی لە وڵاتانی ئەورووپی دەست پێکرد و ئەوانی رازیکرد کە پارتی کرێکارانی کوردستان بخەنە ناو لیستی ریکخراوە تیرۆریستییە نا رەواکانی ئەورووپا، دوای ئەمە ئەو وڵاتانە ئەو پارتەیان بە رێکخراوێکی تیرۆریستی لەقەلەمدا[4]. ئەم هەنگاوەی ئەورووپا لەژێر فشاری زۆری ئەمریکا بوو، نەوەك بەهۆی کردەوە و چالاکییەکانی ئەو پارتە کە دژ بە بەرژەوەندییەکانی تورکیایە لە ئەورووپا. بەرپرسە ئەورووپییەکانیش لە زۆر بۆنەدا بێزاری خۆیان لە فشارە زۆرەکانی ئەمریکا تایبەت بە پرسی ئەندامبوونی تورکیا لە یەکێتی ئەورووپی نەشاردۆتەوە.

کێشەی یەکلاکردنەوەی شوێنی گرێدانی لوتکەی (رێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپی–Organization for Security and Cooperation in Europe)

(1) -Kerim Yildiz, Op. Cit.

(2) -Kemal Krişci, "U. S.-Turkish Relation…", P.133; Soner Kagaptay, Op. Cit., P.3.

(3) -Yalcin Yelence, A.G.E, S. 498.

(4) -Henri J. Barkey, "The Endless Pursuit…", P.233.



لە ئەستەمبۆل لە ئازاری 1999، دوای دەمەتەقێیەکی زۆر لەنێوان ئەوانەی سەرپەرشتی لوتکەکە و بەرپرسانی ئەمریکی، یەکلاکرایەوە، لەبارەی شوێنیکی جێگرەوەی دیکەکە تورکیا نەبێت، چونکە تورکیا تۆماری باشی لەبواری مافەکانی مرۆڤ نییە و ناسنامەی کوردی فەرامۆش کردووە. ئەو کات مارك یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ کاروباری ئەورووپی، توانی بەرهەلستکارانی گرێدانی لوتکەکە لە ئەستەمبۆل رازی بکات و سووربوونی وڵاتەکەی بۆ گرێدانی لوتکەکە لە ئەستەمبۆل بەم شێوەیە پاساودا **"لە راستیدا لوتکەکە یارمەتی تورکیا دەدات بۆئەوەی لە بڵاوکردنەوەی پرۆسەی وەرچەرخانی دیموکراسی و چاکسازی بەشدار بێت"**[1].

ئەمریکا بە شێوەیەکی بەرچاو پاڵپشتی لە هەلمەتە سنوور بەزێنەکانی تۆرکیا بۆ سنووری باکووری عێراق بۆ راوەدوونانی ئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستان دەکرد، ئەمریکا بۆ دۆزینەوەی پاساو بۆ هەر هەلمەتێك کە هێزە تورکییەکان لە ناو عێراق ئەنجامیان دەدا، کاری دەکرد، هەورەها بۆ کەمکردنەوەی کارکردەکانی ئەو هەلمەتانەی کە بەردەوام دەبوونە مایەی نارەزایەتی نێودەوڵەتی. لە ئابی 1991ەوە تورکیا زنجیرەیەك پرۆسەی داگیرکاری وشکانی و پرۆسەی بۆردوومانی ئاسمانی ئەودیوی سنووری لەگەڵ عێراق ئەنجامداوە[2]. کۆی ئەو چالاکییانە تا

(1) -Kemal Krişci, "U,S. Turkish Relation…", P.142

(2) - پرۆسەکە بریتی بوو لە چەند هێرشێکی ئاسمانی بۆ سەر ناوچەی قەندیل، کە بۆ چوار گوندی دیکەش درێژکرایەوە و لەهەندێ ناوچە زیانی گیانی و ماددی لێکەوتووە، کە 3 هاووڵاتی مەدەنی و 3 پێشمەرگەی کوشت و ژمارەیەکیشی بریندار کرد. پاشماوەکانی بۆمبی ناپالمی ئەمریکی لە شوێنی بۆردوومانەکە دەبینرا، ئەو بۆردوومانە مەسعود بارزانی تورە کرد و لای ئەفسەری هاوپەیمانان لە زاخۆ گازاندەی کرد و هێرشەکەی پرتستۆکرد و بە (قەسابخانە) وەسفیکرد. هەروەها رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ قسەی ئەوانەی لە هێرشەکە زیانیان لێکەوتووە و هەڵاتووەکانی تۆمارکردەوە، کە بەهۆی چالاکی سوپای تورکی گوندە ئارامەکانی خۆیان جێهێشتووە. سەیری:

Hugh Pope, "Turkey and Kurds: American in Charge", Middle East International, No. 399, 3 May, 1991, P, 5; Human Rights Watch Arms Project, Weapons Transfers and Violations. …

1997/5/25 گەیشتە 73 چالاکی، کە 13 چالاکی داگیرکاری وشکانی و 58 بۆردوومان بە تۆپهاوێژ بوون[1].

هەموویان پاڵپشتی و پەردەپۆشی چەسپاوی ئەمریکییان هەبوو. داگیرکارییە چەند بارەکانی تورکی بۆ باکووری عێراق و ئەو زیانە مرۆییانەی لە نێوان مەدەنییەکانی لێکەوتەوە لە هەڵاتنی بە کۆمەڵی لادێیە کوردەکان، ئەگەر ئۆکێی پێشوەختەی ئەمریکا نەبوایە، ئەنجام نەدەدران[2]. ئەمریکا بەشێوەیەکی راستەقینە رەخنەی لە تورکیا نەگرتووە یان هانی نەداوە هەڵمەتەکانی لەناو خاکی عێراق کۆتایی پێبێنێ، ئەمەش لەو راستییەوە هاتووە، کە تورکیا یەکێك لە کۆڵگە دیارەکانی سیاسەتی دەورەدانی دوولایەنەی ئەمریکییە دژ بە عێراق و ئێران. هەروەها مۆڵەتدانی ساڵانە بە هێزەکانی ئەمریکا بۆ جێبەجێکردنی پرۆسەی (داڵدەی ئارامی کوردان) لە بنکەی ئەنجەرلینك پێویستی بە وەرگرتنی رەزامەندی شەش مانگەی ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکی هەیە[3].

کاردانەوەکانی پرۆسەی داگیرکاری سەربازی تورکی لەسەر ئاستی مرۆیی، (داڵدەی ئارامی کوردان)، کە ئەمریکا لە باکووری عێراق دابینی کردووە، لەو مانایەی بۆی دانراوە بەتاڵ دەکاتەوە. لەلایەکی دیکەوە پرۆسەکانی پەرینەوە لە سنووری عێراق، گومانی وڵاتانی عەرەبی وروژاند، کە تورکیا هەوڵدەدات ویلایەتی موسڵ بخاتەوە سەر خۆی. شانبەشانی پرۆسە سەربازییەکانی بڕینی سنوور بەرپرسانی فەرمی تورك لەبارەی دووبارە کێشانەوەی نەخشەی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا، لێدوانیان دەدا. بۆ نموونە چیللەر لە 1995/3/28 رایگەیاند کە "**چوونە ناو باکووری عێراق بەمانای پێشێلکاری سەروەری عێراق**

(1) - جلال عبد الله معوض، صناعة القرار...، ص 175.

(2) -Jennifer Washburn, "Has to Met Responsibility to Kurds", News day, 2 October 1996.

(3) -Z. Abidin Kizilyaprak, Turki Korkunun Anatomisi: Irak Kurdistani ve Ttkileri, Doz yayinleri, Istanbul, 2005, S. 142.



**نایەت، چونکە ناوچەکە موڵکی هیچ کەس نییە**"[1]. دێمیرێل لە 1995/5/3 داوای "**دووبارە کێشانەوەی نەخشەی سنووری نێوان عێراق و تورکیای کرد، بۆئەوەی ویلایەتی موسڵ کە تورکیا ناچار بوو بۆ بەرژەوەندی عێراق دەستبەرداری بگەڕێنیتەوە، بەشێوەیەك سنووری تورکیا دەبێت تا کۆتایی هێڵی نەوتی کەرکوك–موسڵ بێت، ئەمەش بۆ رێگەگرتن لە دزەکردنی یاخیبوانی پارتی کرێکارانی کوردستان بەناو سنووری ئێستای پێویستە**"[2]. لەوەتەی تورکیا لە جەنگی کۆری 1950 و داگیرکاری بۆ قوبرس و چالاکییەکانی ناتۆ و نەتەوە یەکگرتووەکان بەشداری کرد، پرۆسەی (پۆڵا 1995)گەورەترین داگیرکاری سەربازی بوو، کە تورکیا بۆ وڵاتێکی بیانی ئەنجامی دا. لە 20ی ئازاری 1995 دەستی بە داگیرکاری سنووری عێراق بۆناو ناوچەی ئارام لەباکووری عێراق کرد. لە پرۆسەی داگیرکارییەکەدا 35.000 سەرباز بەشداری کرد و ماوەی 6 هەفتەی خایاند و 65 ملیۆن دۆلاری ئەمریکی تێچوو[3].

بەهۆی ئەم داگیرکارییەوە 15 هەزار هاووڵاتی مەدەنی کورد ماڵ و حاڵی خۆیان جێهێشت، سەرباری زیانە گیانی و ماددییە گەورەکانیان، ئەم کردەوەیە بووە مایەی نارەزایەتی نێوەندە نێودەوڵەتییەکان لەسەرووی هەموویانەوە نەتەوە یەکگرتووەکان، کاتێ بوترس غالی ئەمیندارە گشتییەکەی لە 1995/3/23داوای "**کۆتایی پێهێنانی پرۆسە سەربازییەکانی باکووری عێراقی کرد، بەهۆی ئەوەی کە کاریگەری نێگەتیڤی لەسەر چالاکییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەبێت**"[4]. بەڵام پرۆسەی داگیرکارییەکە پاڵپشتی ئەمریکای هەبوو، کە بە "**مافێکی رەوای تورکیای بۆ بەرگریکردن لەخۆی**" دانا[5]. مایکل

(1) - جلال عبد الله معوض، صناعة القرار...، ص 50.

(2) - المصدر نفسهٌ، ص 47.

(3) -Kemal Krisçi, "Turkey and the Kurdish safe-Haven in Northern Iraq", Journal of South Asian and Middle Eastern Studies, No. 19 spring, 1996, PP.21-39.

(4) - جلال عبد الله معوض، صناعة القرار...، ص 46.

(5) -New York Times, 6 September 1996.

ماكۆری Michael McCurry وتەبێژ بەناوی كۆشكی سپییەوە، رایگەیاند كە بیل كلینتۆنی سەرۆكی ئەمریكا بەر لە پرۆسەكە قسەی لەگەڵ چیللەردا كردووە، ئەوەی بۆ دەربڕیوە كە ئەمریكا **"لە پێویستی توركیا لە مامەڵەكردن بە شێوەیەكی توند لەگەڵ جەنگاوەرانی پارتی كرێكارانی كوردستان گەیشتووە"**[1]. وارن كریستۆڤەر لەبارەی پرۆسەی داگیركارییەكە باسی لەوە كردووە كە ئیدارەی ئەمریكی **"پرۆسە سەربازییەكانی توركیا بە رەوا دادەنێت، چونكە بەرگریكردنە لە خۆ، لەدژی گرووپێكی جوداخوازی تیرۆریستی وەك پارتی كرێكارانی كوردستان"**[2].

سالّی 1997 توركیا گەورەترین پرۆسەی داگیركاری بۆ باكووری عێراق بەناوی پرۆسەی (پۆلاینی 97) دەستپێكرد و لە پرۆسەكەدا 50 هەزار سەرباز بە پاڵپشتی تانك و فرۆكەی شەڕكەر بەشدارییان تێداكرد، كە ناوچەیەكی كەوانەی درێژبووەوە لە چیای زاخۆ (دوورترین شوێنی رۆژئاوا لە سنووری سووریا) تا چیای لۆلان (دوورترین شوێنی رۆژهەڵات لە سنووری ئێران)ی گرتەوە، لە نێوان هەردوو شوێنەكە دەگەیشتە 100 تا 200 كم لە قووڵایی خاكی عێراق نزیك شارەكانی موسڵ و هەولێر درێژ دەبووەوە[3]. بە چاوپۆشین لە زیانەكانی هەردوولای شەڕكەر، پرۆسەكە زیانی مرۆیی لە نێوان مەدەنییەكان لێكەوتەوە، كە بووە هۆی ئەوەی نزیكەی 10.000 كەس پەراگەندە بن[4]. پرۆسەكە كاردانەوەی توندی لەلایەن نەتەوە یەكگرتووەكان و یەكێتی ئەورووپی و حكومەتە عەرەبییەكان لێكەوتەوە، بەڵام ئەو كاردانەوانە رووبەڕووی هەڵوێستی پاڵپشتیكەری ئەمریكی لە توركیا بووەوە و ئەمریكا ئەوەی چەسپاند كە ماف توركیایە پرۆسەی پۆڵا و پرۆسەی دیكەی هاوشێوەی ئەمە لە داهاتوو ئەنجام بدات، ئەمە لەچوارچێوەی

(1) -Jennifer Washburn, "Uses U.S Arms. "...

(2) -Washington Post, 28 March, 1995.

(3) - جلال عبد الله معوض، صناعة القرار...، ص167-177؛ الحیاة، 1997/5/25.

(4) -David McDowall, Op. Cit., P. 586.



بەرەنگاربوونەوەی پارتی كرێكارانی كوردستان، كە ئەمریكا بە **"رێكخستنێكی تیرۆریستی"** لەقەلەمی دەدات، هەروەك ئەوەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكا لە دوو بەیاننامە لە (1997/5/18 و 1997/6/12) رایگەیاندووە[1].

ئەمریكا كە لە ئەنجوومەنی ئاسایش بالا دەستە، سووربوو لەسەر پاڵپشتیكردنی توركیا و زامنی ئەوەی كردبوو كە هیچ رێوشوێنێكی دەولی ناتوانێت توركیا بۆ راگرتنی ئەو داگیركارییە چەند بارانەی بۆ باكووری عێراق ناچار بكات، ئەمە سەرباری نارەزایەتییە عێراقی و عەرەبی و نێودەوڵەتییە چەندبارەكان[2]. ئەمریكا ئەورووپییە رەخنەگرە بەردەوامەكانی داگیركاری توركی بۆ باكووری عێراق بەوە رازیكرد، كە لە چالاكییەكانی توركی تێبگەن، بەم شێوەیە وەڵامی ئەوانەی دایەوە كە رەخنە لە لایەنگری ئەمریكا بۆ توركیا دەگرن **"ئەمریكا پێی باشترە كە چالاكانەتر لەژێر پەردە كار بكات"** لەبابەت هەڵسوكەوتی لەگەڵ توركیا لەبارەی ئەو پرسانە[3].

پەردەپۆشی سیاسی كردە داگیركارییە سەربازییەكانی توركی لە نێو رێكخراوەكانی كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و وڵاتان، تاكە شتێك بێت كە ئەمریكا بۆ توركیای كردبێت، بەڵكو زۆربەی هێزی سەربازی توركی كە سنووری عێراقی دەبەزاند و هەڕەشەی لە شار و گوندە كوردییە پڕ لە دانیشتوانەكانی دەكرد، بەشێوەیەكی بنەڕەتی پشتی بە جبەخانەی سەربازی ئەمریكی بەستووە. بەبێ چەك و فرۆكەی ئەمریكی سەخت بوو توركیا بتوانێت كردەوەی لەم جۆرە ئەنجام بدات. زۆربەی هێرش و بۆردوومانە چڕەكانی هێزەكانی توركی بەو فرۆكانە ئەنجامدراون، كە ئەمریكا دروستی كردوون[4]. لەبەر زۆری

(1) -Nicole Pope, "Turkey goes back into Northern Iraq", Middle East International, No. 551, 30 May, 1997, P, 4; الحیاة، 14/ 6/ 1997.

(2) - جلال عبد الله معوض، صناعة القرار...، ص 184.

(3) - جوناثان راندل، المصدر السابق، ص 357.

(4) -HUMAN RIGHTS WATCH, December 1994 Vol. 6, No. 19, U.S. CLUSTER BOMBS FOR TURKEY?, New York, 1995. Via at: (http://www.hrw.org/reports/1994/turkey2/); Tamar Gabelnick and Others, "Arming Repression: U.S. Arms Sales…"., P. 17.

بەکارهێنانی فرۆکەکانی (کوبرا و سیکورسکی) لە ناوچە کوردییەکانی کوردستانی عێراق، ناوی ئەو فرۆکانە لای گوندییەکان ناسراوە[1].

پاڵپشتی ئەمریکا بۆ پرۆسە داگیرکارییەکانی تورکی لەلایەك دەربڕی قووڵی و توندی پەیوەندییەکانی ئەمریکا–تورکیا، لەلایەکی دیکەشەوە دوو ڕوویی لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا بەدەردەخات کاتێ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی و تورە نەکردنی هاوپەیمانانی پێ لە پێوەرەکانی مافەکانی مرۆڤ و یاسا و دابونەریتی دەولی و پرەنسیپی سەروەری وڵاتان بەسەر خاکی خۆیان باشترە. ئەمریکا لە میانەی جەنگی ئەتنی هەڕەشەی لە سربیا دەکرد نەوەکو تا ناو سنووری ئەلبان راوەدووی جەنگاوەرانی ئەلبانی بنێ، لەهەمان کاتیش پرۆسەکانی داگیرکاری تورکی **"هاوپەیمانی گەرموگوڕ"** بۆ ناو خاکی وڵاتێکی خودان سەروەری (عێراق) پەردەپۆش دەکرد. کاتێ تورکیا خۆی بۆ پرۆسەی پۆڵاینی 97 ئامادە دەکرد، ئەمریکا چەند ئامانجێکی سەربازی عێراقی لەمیانەی پرۆسەی (**ریوی بیابان**) بۆردوومان دەکرد، بەهۆی ئەوەی هێزەکانی عێراق لە 31ی ئابی 1996 چوونەتە ناو شاری هەولێرەوە.

ئەمەریکا هەر بە پاڵپشتی سیاسی و سەربازی راستەخۆ بۆ پرۆسە سەربازییەکانی تورکیا لەباکووری عێراق نەوەستا، بەڵکو، بەرگەی نارەزایەتی و رەخنە توند و تیژەکانی سیاسەتوانان و میدیاکارانی تورکی گرت. بڕیاری رازی بوونی ئەمریکا بە پێدانی رۆکێتی (پاتریۆت Patriot missiles) لە ساڵی 1999 هەوڵێکی ئیدارەی ئەمریکی بوو بۆ کەمکردنەوەی نارەزایەتییەکانی تورکیا و ئارامکردنەوەی عەسکەر بوو[2]، بەڵکو بەهۆی بوونی مەترسی هەڕەشەی راستەقینەی لایەنی عێراقییەوە نەبوو، کە ئەوکات پەیوەندییەکانی بە عێراقەوە بەرەو چاکبوون و بوژاندنەوە دەچوو، بەتایبەتی دوای دەرچوونی بڕیاری 986 ئەنجوومەنی ئاسایش لە 1996، کە بەهۆیەوە رێگە بە عێراق درا

(1) -Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds", P. 34.

(2) -George S. Harris, U.S.-Turkish Relations, in: Alan Makovsky and Sabri Sayari, Op. Cit., P. 199.



برێك لە نەوتەکەی بۆ مەبەستی مرۆیی بفرۆشێت، بە پاڵپشتی ئەمریکا پاشکۆی بڕیاری 1284 ی بۆ زیاد کرا، بۆئەوەی بەهۆیەوە تورکیا گەمارۆکەی سەر عێراق هەڵاوێردرا، دەیتوانی بارزگانی لەگەڵ هەرێمی کوردستان بکات و دواتر لە ساڵی 1998بڕیاری ئەنقەرە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی پەیوەندییەکانی لەگەڵ بەغدا بۆ ئاستی بالیۆز[1].

سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر پرسی کورد لە تورکیا و پارتی کرێکارانی کوردستان، لاساییکەرەوەی سیاسەتی فەرمی تورکی بوو، ئەمریکا هیچ دەستپێشخەرییەکی بۆ ئەو بانگەشانەی کە ناوە ناوە پارتی کرێکارانی کوردستان بۆ ئاگر بەست رایدەگەیاند، نەبوو. لەبری ئەمە لە هەموو بۆنەیەکدا پارتەکەی بە **"رێکخراوێکی تیرۆریستی"** وەسف دەکرد. ئەمەش پاڵپشتی هەڵوێستی نەگۆڕی ئەمریکا بر هەڵوێستی تورکی بەرامبەر پرسی کورد پیشان دەدا[2].

سەربارى ئەو هەڵوێستە ئاشکرا و پالپشتیکارانەی ئەمریکا بۆ تورکیا لە رووی سیاسی و سەربازی و هەوالگەرییەوە، چەند ناوەندێکی کوردی جۆرارجۆر داوایان لە ئەمریکا کردووە کە بۆ دانانی سنوورێك بۆ سیاسەتەکانی تورکیا لەمەڕ نکۆلیکردن لە ناسنامەی نەتەوەیی دابنێ. نامەکانی عەبدوڵا ئۆجەلانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان لە ماوەی ساڵانی 1994–1996 بۆ ئیدارەی ئەمریکی، لە دیارترین ئەو هەوڵە کوردییانەن کە بۆ رازیکردنی ئەمریکا بۆ فشاردانان لەسەر تورکیا تاکو پرسی کورد بە ئاشتییانە چارەسەر بکات. ئۆجەلان وای دەبینی کە سەربارى پاڵپشتییە بێ سنوورەکانی ئەمریکا بۆ تورکیا و پەیوەندییە ستراتیژییەکانی نێوان هەردوولا، بەلام ئەمریکا **"لەگەڵ سیاسەتی کوشتنی بە کۆمەڵ و قەسابخانە نییە...و دەیەوێت چارەسەری ئەو پرسە [پرسی کورد] بکات، بەلام چارەسەرێك لەگەڵ ستراتیژ و ئامانج و تێگەیشتنی خۆی بگونجێ..."[3]**. هەر لەهەمان رێرەودا عەبدوڵا

(1) -Henri J. Barkey, "The Endless Pursuit", p. 218.

(2) -Stala M. Gavrielides, Op. Cit., P.100.

(3) - سبعة ايام مع آپو، حوار لنبيل ملحم مع عبد الله اوجلان، دار الفارابي، بيروت، 1999، ص249.

ئۆجەلان لە میانەی گرێدانی کۆنگرەی نێودەوڵەتی کوردستانی باکوور و رۆژهەڵات لە برۆکسل لە ئازاری 1994، کۆمەڵێ نامەی بۆ سەرانی ئەلمانیا و بەریتانیا و فەرەنسا و ئەمریکا نارد، کە ئەوکات لە لوتکەی وڵاتانی ئەندام لە رێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپی بۆ میانگری نێوان تورکیا و پارتی کرێکارانی کوردستان کۆبیبوونەوە[1].

لە هەولێکی دیکەدا ئۆجەلان نامەیەکی کەسی بە شێوەیەکی راستەوخۆ بۆ سەرۆکی ئەمریکی بیل کلینتۆن لە تشرینی یەکەمی 1995 نارد، لە بەشێکی نامەکەدا داوا لە ئیدارەی ئەمریکی کراوە، کە پرۆسەکانی **"لەناوبردنی کورد"** رابگرێت و فشار بۆسەر تورکیا بێنێت کە بە شەڕراگرتن لەژێر چاودێری نێودەوڵەتی رازی بێت، وابکات چارەسەری ئاشتییانەی لێبکەوێتەوە و کۆتایی بەو ململانێیە بێنی کە زیان بە تورکیاش دەگەیەنێ[2]. لەهەمان کاتیشدا نامەیەکی هاوشێوەی بۆ کۆنگرێسی ئەمریکی نارد[3]. لە دوایین هەوڵی ئۆجەلاندا، لە کانوونی دووەمی 1996 داوای لە کلینتۆنی سەرۆکی ئەمریکا و سەرۆکەکانی ئیتالیا و بەریتانیا و فەرەنسا و هۆڵەندا و ئیسپانیا کرد کە دۆزینەوەی چارەسەری ئاشتییانە بۆ پرسی کورد زۆر پێویستە، سیاسەتی تورکیا کە لەسەر زوڵم و لەناوبردنی بەکۆمەڵ و فەرامۆشکردنی بانگەوازە چەندبارەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان وەستاوە، داوای لە سەرۆکەکان کرد فشار بو سەر تورکیا بێنن و رازی بکەن کە وەڵامی ئاگربەستەکەی کە پارتی کرێکاران رایگەیاندبوو بداتەوە[4]. لە کانوونی یەکەمی 1996 ئۆجەلان دیسانەوە نامەیەکی بۆ کلینتۆن نارد و ئاگربەستی یەکلایەنەی خستە روو، ئەگەر تورکیا هێرشەکانی بوەستێنی، هەروەها ئەوەشی روونکردبووەوە کە پارتی کرێکارانی کوردستان هیچی دیکە لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتی

---

[1] - وەلات، 5 کانون الاول 1994؛ گولستان گورباي، المصدر السابق، ص 65

[2] - وەلات، 23 تشرین الاول 1995.

[3] - المصدر نفسهٌ.

[4] - وەلات، 8 کانون الثاني، 1996.



سەربەخۆی کوردی سوور نییە، بەڵکو **"بەرەو چارەسەری فیدراڵی وەك ئەوەی لە ئەمریکا باوە، کراوەیە"**[1].

ئەمریکا بە پاساوی ئەوەی کە گفتوگۆ لەگەڵ تیرۆریستان ناکات، بەردەوام بانگەوازەکانی ئۆجەلانی رەت دەکردەوە، هەروەها گفتوگۆی لایەنە کوردییەکانی دیکەش بە هەمەجۆر ئاراستەیانەوە رەت کردەوە. نەجمەدین کەریمی سەرۆکی ئەنجوومەنی نیشتیمانی کوردی بۆ باکووری ئەمریکا نامەیەکی بۆ وەکیلی وەزیری دەرەوەی ئەمریکی لۆرنس ئیگلبرگەر L. Eagleburger لە 5ی تشرینی دووەمی 1992 نارد و داوای لە حکوومەتی ئەمریکا کردبوو کە هانی تورکیا بدات واز لە بەکارهێنانی چەکی ئەمریکی لە دژی کورد بێنێت، دەستبەجێ ئەو هێزانەی لە تشرینی یەکەمی 1992 چوونەتە ناو هەرێمی کوردستان کە ژمارەیان 20.000 دەبوو، بکشێنێتەوە. هەروەها داوای کردبوو هەموو شێوەکانی یارمەتییە سەربازییەکانی بۆ تورکیا رابگرێت کە لە کوشتنی کورد و ئازاردانیان و پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ بە بیانوی جەنگان لەدژی پارتی کرێکارانی کوردستان، بەکاریان دێنێ. بەڵام وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا پێی باش بوو وەڵامی ئەو نامەیە نەداتەوە و خۆی لەبەرامبەر ئەوەی تێیدا هاتبوو بێ دەنگ کرد[2].

لەهەمان رێرەودا، لەمیانەی ئەو سەردانەی کە هەریەکە لە ئەحمەد تورك و لەیلا زانا، کە دوو کەسایەتی سیاسەتمەداری کوردن و نوێنەرن لە ئەنجوومەنی نیشتمانی تورکی و پارتی کاری گەل، بۆ ئەمریکا ئەنجامیان دا و لەگەڵ بەرپرسانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە ئایاری 1993 کۆبوونەوە. هەرچەندە لەلایەن وەزارەتی دەرەوە پێشوازییان لێکرا، بەڵام بەرپرسانی وەزارەتەکە بۆئەوەی تورکیا توڕەنەکەن، سووربوون لەسەرئەوەی وەك پەرلەمانتارانی تورك پێشوازییان لێبکەن. هەروەها راپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە (جورەکانی تیرۆری جیهانی – PATTERNS OF GLOBAL TERRORISM)،

---

[1] -Jennifer Washburn, "Don't Sell Weapons. …"

[2] -Turan Yavuz, A.G.E., S. 359.

پارتی کرێکارانی بە "**ڕێکخراوێکی تیرۆریستی مارکسی لینینی وەسفکردووە، کە ئامانجی ئەوەیە تورکیا لەناوبەرێت و پارچەپارچەی بکات**"، ئەمە دوو هەفتە لە پیشوازێکردن بوو لە زانا و تورك هات[1].

لەیلا زانا لە لایەنێکی چاوپێکەوتنەکەی بە دیڤید ڕانسۆم D. Ransom ی سەرۆکی بەشی کاروباری ئەورووپی لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و دیڤید وین D. Winn ی یاریدەدەرەکەی ئاماژەی بە بەکارهێنانی تورکیا بۆ یارمەتییە سەربازییەکانی ئەمریکا لە دژی کورد کرد و داوای کرد سەرجەم یارمەتییە سەربازییەکانی ئەمریکا بۆ تورکیا بوەستێ، هەروەك ئەوەی کە لە ساڵی 1974 لە بابەتی قوبرس لە دژی ئەنجامدرا. ڕانسۆم ڕوونیکردەوە کە وڵاتەکەی ئەو بیروڕایە ڕەت دەکاتەوە و بیریشی لێناکاتەوە "**چونکە تورکیا هاوپەیمانێکی زیندووی ئەمریکایە**". ڕانسۆم هەدرووکیانی ئامۆژگاری کرد کە ئەگەر پارتەکەیان دەیەوێت بەرگری لە پرسی کورد لە تورکیا بکات پێویستە لەپارتی کرێکارانی کوردستان دووربکەوێتەوە، هەروەها داوای لێکردن کە گوێ لەو پەرلەمانە بۆی هەڵبژێردراون بگرن. هەروەها باسی ئەوەی بۆکردن کە ئەمریکا بۆ تورکیای دووپاتکردۆتەوە کە پێویستە ڕێوشوێنی سیاسی لەپاڵ ڕێوشوێنی سەربازی بۆ چارەسەری پرسەکە بگرێتەبەر، ئەوکاتیش لەیلا زانا وەڵامی دایەوە و گوتی: "**ڕاستە، بەڵام ئێستا داوایەکی یاسایی لەبارەی دەرکردنمان لەپەرلەمان لە دادگایە...**"، ڕانسۆم نەیزانی بەچی وەڵامی قسەکەی لەیلا زانا بداتەوە، هەرچەندە ئەو و زۆربەی هاوڕێیانی لە ئیدارەی کلینتۆن دەیانزای کە زانا لەسەر هەقە[2].

ئەمە تاکە هەوڵی لەیلا زانا نەبوو، لە 25ی تشرینی یەکەم نامەیەکی ئاراستەی سەرۆکی ئەمریکی کلینتۆن کرد، کە پانۆرامای 25 ساڵ شەری

(1) -U.S. Department of State, Office of the Secretary (Office of the Coordinator for Counterterrorism), Department of State Publication (10136), 1994 APRIL: PATTERNS OF GLOBAL TERRORISM, 1993. (http://www.hri.org/docs/USSD-Terror/93/euro.html#Turkey)

(2) -Turan Yavuz, A.G.E, SS. 387-391; Ahmet Turk and Leyla Zana, "Testify Before the Helsinki Commission in the United States Congress, 17 May, 1993. Via at: (http://kurdistan.org/washington/turk-zana.html).



باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا، لە خۆگرتبوو. لە لایەنێکی نامەکە باسی ئەوەی کردبوو کە "**جەنگەکەی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا ناڕەوایە، 30 هەزار کوژراوو هەزاران پەککەوتە و ویرانکردنی نزیکەی 3185 گوند و ڕاگواستنی 300 هەزار کەسی لیکەوتۆتەوە...، سەرباری لەناوچوونی 4 هەزار ڕۆشنبیر و سیاسەتمەدار و سەرکردەی پارتەکان و پارێزەران لەوانەی بەرگری لە مافەکانی مرۆڤ، گیانیان سپاردووە. بەرپرسی هەموو ئەمانە سیاسەتی دەوڵەتی تورکیایە**"، زانا ئەوەشی زیاد کرد کە "**نیلسۆن ماندێلا[1] وەکو تیرۆریست مامەڵەی لەگەڵ کرا بەڵام ئێستا سەرۆکی وڵاتێکە، هەروەها ێکخراوی (ئیتای ئیسپانی) و (ئیرای ئیرلەندی) وەکو دوو ڕێکخراوی تیرۆریست ناسرابوون، ئێستا دانوستاندنیان لەگەڵ دەکرێت، بەڵام پارتی کرێکارانی کوردستان و ئۆجەلان هێشتا وەکو تیرۆریست مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، هەرچەندە داوای گفتوگۆ و ئاشتی دەکەن... مامەڵەکردن لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان وەکو ڕێکخستنێکی تیرۆریستی کێشەکە لەجیاتی چارەسەر، ئالۆز دەکات، چارەسەری ڕاستەقینە خۆی لە دامەزراندنی ئاشتییەکی ڕاستەقینە شاردۆتەوە**"[2].

ئەمریکا بەدەم داوا و بانگەشە کوردییەکان نەهات، چونکە هەر لە بنەڕەتەوە نەیدەویست دامەزراوەی سەربازی تورکی تورە بکات و زیان

[1] – نیلسون ماندێلا، لە 18 حوزەیران 1918 لە دایك بووە، سەرۆکی پێشووی کۆماری ئەفریقیایی باشور و یەکێکە لە دیارترین خەباتگێر و بەرهەڵستکارەکانی سیاسەتی ڕەگەزپەرستی، کە لە وڵاتەکەی پەیرەدەکرا. لە ژیانی دا بیست حەوت ساڵ بەندکرا. لە 11 شوباتی 1990 لە بەندیخانە دەرچووە. بوو بە سەرۆکی کۆمار و لە ساڵی 1993 خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی پێبەخشرا. بۆتە ڕەمزێك بۆ بەرەنگاربونەوەی سیاسەتی ڕەگەز پەرستی. ماندێلا چەندین جار و لە چەندین شوێن ڕەخنەی توندی لە سیاسەتی تورکیا گرتووە، لە بارەی ڕەتکردنەوە و پشتگوێخستنی مافەکانی کورد. سەیری، ویکیبیدیا، الموسوعة الحرة، متاحة على الموقع الالكتروني التالي: (http://ar.wikipedia.org/wiki/.)

(2) -Faruk Bildirici, A. G. E., Ss, 402-405

به پەیوەندییە ستراتیژییەکانی لەگەڵ تورکیا بگەیەنی، ئەمەش وایکرد **هیچ** وەڵامێکی بۆ دەستپێشخەرییەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان نەبیت. لەبری ئەمە پاڵپشتییە سیاسییەکانی بۆ تورکیا زیاد کرد، سەربازی بەردەوامبوون لە هاتنی بۆندەکانی چەك و یارمەتییە ئەمریکییەکان بۆ تورکیا. ئەمریکا لەسەرەتای 1995ەوە پارتی کرێکارانی کوردستانی بە **"ترسناکترین رێکخراوی تیرۆریستی جیهانی"**[1] لەقەلەمدا، لە ساڵی 1996 سەرلەنۆی راپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوە لەبارەی (جورەکانی تیرۆری جیهانی) لە لیستی رێکخراوە تیرۆریستییەکان لە ئەمریکا دانرا[2]. بە فەرامۆشکردنی بانگەوازەکانی کورد و بەردەوامی لە پاڵپشتی سیاسی و سەربازی بۆ تورکیا، بەمە ئەمریکا تورکیای بۆ بەرەوپێشچوون لە چارەسەری سەربازی و بەردەوامبوون لە جەنگەکەی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات هاندا.

بەهۆی ئەو هەلوێستانەی ئەمریکاوە، سەرکردەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە هەموو بۆنەیەکدا رەخنەیان لەو هەڵوێستانە دەگرت، بۆ نموونە ئۆجەلان لە ساڵی 1995 بە توندی رەخنەی گرت بەهۆی هەڵبەستنی **"رای نەگونجاو و شێواو لەبارەی پارتیمان [پارتی کرێکارانی کوردستان] لەبەرامبەر هەموو دونیا"**، ئەمە بە گوێرەی قسەی ئۆجەلان. هەروەها رایگەیاند کە ئەمریکا **"هەلسەنگاندنێکی تەواو نایەکسان دەکات"** لە میانەی بانگەشەکانی، کە پارتی کرێکاران **"نوێنەری بنەرەتی تیرۆری نێودەوڵەتییە، ئەمەشی تەنها بە رایەکی ئیمپریالی"** دایە قەلەم[3].

(1) - وەلات، 9 كانون الثاني، 1995.

(2) -The Truth About The PKK" Turkish Embassy Contact: Namik TAN, at (202) 659-8200, WASHINGTON, D.C. November 17, 1998.

(3) -Michael M. Gunter, The Kurds and the Future…", P.106.



هەروەها ئۆجەلان لەبارەی دەستگیرکردنی (کانی غولام Kani Xulam)[1]ی نوێنەری پارتەکەی لە 1997 لە ئەمریکا لێدوانی دا و گوتی: "ئەمریکا لەمیانەی ئەو پالپشتییەی لە تورکیای دەکات خۆی کردە دوژمنی کورد"[2]. هەروەها لە میانەی چاوپێکەوتنی بە پەیامنێری گۆڤاری Middle East Quarterly، لە حوزەیرانی ساڵی 1998، سەرلەنوێ بەتوندی رەخنەی لە ئەمریکا گرت و گوتی: **"بەو تۆماتانەی لەبارەی تیرۆر دەیخاتە پالم دەیەوێت بەبێ دادگا لە سێدارەم بدات"**، ئەمەشی بە **"نەزانی کوێری سیاسی، کە بۆ عەقل ناگەڕێتەوە"** وەسفکرد و گوتی: **"کاتێ دانوستاندن دەخەمە روو، بە لاواز وەسفم دەکەن، کاتێ هێز بەدەردەخەم، بە تیرۆریست، ئەمە کارێکی لۆژیك هەلگر نییە"**[3].

لایەنێکی گرنگی توندبوونی پەیوەندییەکانی ئەمریکا–تورکیا لەدوای ناوەڕاستی نەوەدەکان، کە کاریگەری راستەوخۆی لەسەر پرسی کورد لە تورکیا و پارتی کرێکارانی کوردستان هەبوو، بۆ هاتنی ئیسرائیل وەك هاوپەیمانی ستراتیژی فرە سوود و گرنگ بۆ هەریەکە لە ئەمریکا و تورکیا دەگەڕێتەوە. ئەو پەیوەندییەی ئیسرائیل بۆ پەیوەندییەکانی هەردوو لا، رەهەندێکی دیکەی لە قووڵترکردنەوەی ژێی پەیوەندییەکانی تورکیا– ئەمریکا دروستکرد و تاڕادەیەکی زۆریش ناکۆکییەکانی کەمکردنەوە[4]. بەڵام

(1) - بەڕێوەبەری توری زانیاری کوردی بوو لە واشنتۆن، هەروەها نوێنەری پارتی کرێکارانی کوردستانیش بوو لە واشنتۆن. کانی غولام هەولێکی زۆری دا تاکو لۆبیەکی کوردی لە کۆنگرێس دروست بکات، ژمارەیەکی زۆر چالاکی بۆ رەوەندی کوردی لە ئەمریکا رێکخست و ئەندامانی کۆنگرێسی بۆ بانگ دەکرد. فەزلی ئازادکردنی لەیلا زانا بۆ بەرپاکردنی هەلمەتەکانی ئەو لە نێو ئەندامانی کۆنگرێس دەگەڕێتەوە، بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی چالاکییەکانی سەیری ماڵپەری ئەلیکترۆنی تۆری زانیاری کورد *Kurdish American Information Network* لە واشنتۆن بکە: (*www.kurdistan.org*).

(2) -Michael M. Gunter, The Kurds and the Future…, P. 106.

(3) -Abdullah Öcalan: We Are Fighting Turks Everywhere", Journal of Middle East Quarterly, June 1998,. Via at: (http://www.meforum.org/article_print.php?id=399&v=1469122221).

(4) -George Harris, U.S-Turkish Relations, P.198.

کارکردەکانی ئەو هاوپەیمانییە نویە بۆ سەر پرسی کورد لە تورکیا زۆر نیگەتیڤ بوو، کە هەر لە بنەماوە بە مافەکانی مرۆڤ و کێشەکانی دیموکراسییەوە بەندبوو، دەرەنجامەکانی ئەو هاوکارییە توندە سێ قۆڵییە زۆر خێرا بۆ سەر پرسی کورد هات، ئەمە بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەسەر داهاتووی ئۆجەلانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان و گەورە سەرکردەکانی پارتەکە بەدەرکەوت.

ئاکامەکانی پەرەسەندنی نزیکبوونەوەی تورکی–ئیسرائیلی بۆ هاوپەیمان بۆ سەرکردەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان شاراوە نەبوو، جەمیل بایکی سەکردەی باڵی سەربازی پارتی کرێکارانی کوردستان ARGK دوای چەند مانگێگ لە رێککەوتی شوباتی 1991ی تورکی – ئیسرائیلی لە چاوپێکەوتنیکی لەگەڵ رۆژنامەیەکی ئەمریکی گوتی: **"پارتی کرێکارانی کوردستان یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی هاوپەیمانی تورکی– ئیسرائیلییە"**[1].

رێککەوتنی سەربازی شوباتی 1996ی نێوان تورکیا و ئیسرائیل، دەستخۆشی و پێشوازییەکی گەرمی بێ وێنەی لە ئیدارەی ئەمریکییەوە لێکرا، رێککەوتنەکە کە لەلایەن چاودێرانی سیاسییەوە بە (پەیمانی ئەنقەرە) ناوبراوە، لە راستیدا هاوپەیمانێتییەك بوو لە نێوان ئەمریکا–تورکیا–ئیسرائیل. لەوانەیە ئەم هاوپەیمانییە دەرەنجامی هەولێکی گەورەی ستراتیژی ئەمریکی سەردەمی جەنگی سارد بووبێ[2]. رێککەوتننامەکە دەرگایەکی فراوانی لەبەردەم سەردانی گەورە بەرپرسانی سەربازی هەردوو لا کردەوە، هەروەها وایکرد چەکی ئاسمانی و پۆلەمانی ئامێرەکانی هێزی وشکانی تورکی نوێ بکرێنەوە، ئەمەش وایکرد ئەمریکا لە بەشێکی گەورە لەو بارەی لەسەر شانی بوو رزگاری ببێت و ئەو شەرمەزارییەی کە بەهۆی رەخنەی رێکخراوە ناحکوومییەکان ئەوانەی گرنگی بە مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا دەدەن، بەهۆی

[1] -Robert Olson, Turkey's Relations with Iran, …, P.126.

[2] "-U.S.-Israeli-Turkish Alliance Grows", Meddle East Review, Washington, 16 February 1999. Via at: (www.middleeast.org/archives/1999_02_16.htm).



بەکارهێنانی چەکی ئەمریکی لەو چالاکییانەی کە مافەکانی مرۆڤ پێشێل دەکەن، کەم بکاتەوە[1]. هەروەها زۆربوونی فشارەکانی کۆنگرێس کە هاوکات بوو لەگەڵ داننانی ئیدارەی ئەمریکی بۆ یەکەمجار بە شێوەیەکی فەرمی لە 6/1/ 1995 لە رێگەی راپۆرتی وەزارەتی دەرەوەی بە (پێشێلکارییەکانی سوپای تورکی بۆ مافەکانی مرۆڤ و حاڵەتی قوبرس Allegations of Human Rights Abuses by the Turkish Military and on the Situation in Cyprus)، لە راپۆرتەکە هاتبوو کە تورکیا چەکی ئەمریکی لە چالاکییەکانی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا بەزۆری بەکاردێنێت[2]. داخوازییە بەپەلەکانی کۆنگرێس بۆ چاکسازی دیموکراسی و سەپاندنی مەرج بەسەر فرۆشتنییەکانی چەك بۆ تورکیا و سەپاندنی کوت و بەندی زیاتر بەسەر یارمەتییە سەربازییەکان و فرۆشتنی چەك بە تورکیا، لەوانە بوو ئامانجە ستراتیژییە دوور ماوەکانی ئەمریکای تێکبدابوایە، ئەمەش بە دیدگای تورکی، سەرکێشییەکی ئەمریکی بوو کە ئارامی ناوەخۆی تورکیای دەخستە مەترسییەوە[3].

وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، سووربوو لەسەر ئەوەی کە ناوی پارتی کرێکارانی کوردستان بخاتە ناو راپۆرتە ساڵانەییەکەی بارەی جۆرەکانی تیرۆر لە جیهان، بەبێ ئەوەی ئەو پارتە هێرشی کردبێتە سەر بەرژەوەندییەکانی تورکیا هەتاکو هەڕەشەی راستەوخۆشی بۆ بەرژەوەندییەکانی ناوەوە و دەرەوەی تورکیا کردبێ. راپۆرتی وەزارەتی دەرەوە لەبارەی جۆرەکانی تیرۆری جیهانی ساڵی 1999 لەبارەی پارتی کرێکارانی کوردستان بەمشێوەیە بوو: **"هەرەشەی تیرۆریستی گەورەی تورکیا پێکدێنی... چالاکی رفاندنی گەشتیارانی رۆژئاوایی لەباشووری رۆژهەڵاتی ولات ئەنجامدەدات، لەساڵی**

[1] -Henri J. Barkey, "The Endless Pursuit", P.213.

[2] - سەیری راپۆرتی ساڵانەی مافەکانی مرۆڤی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بکە، هی ساڵی 1995:
U.S. Department of State (Bureau of European Affairs), Report on Allegations of Human Rights Abuses by the Turkish Military and on the Situation in Cyprus, 95/06/01. Via at: *(http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_cyprus_1995.txt)*.

[3] -Henri J. Barkey, "The Endless Pursuit", P. 213.

**رابردوو زنجیرەیەك هێرشی بۆ سەر دەیان شاندی دیپلۆماسی و بازرگانی تورکی لە ژمارەیەك وڵاتانی ئەورووپی کردووە"**(1). لە راپۆرتی ساڵی 1994 ئاماژەی بۆ ئەوە کردبوو کە **"پارتی کرێکاران هەڵمەتێکی بۆ هێنانە کایەوەی حاڵەتی جوداخوازی لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا دەستپێکردووە... ئەو پارتە دەستی بە هەڕەشەی کرداری بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا کردووە"**(2). راپۆرتەکەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لەبارەی تیرۆر لە ساڵی 1995 هەمان تۆمەتی لەسەر پارتی کرێکاران دووبارە کردەوە، بەوەی کە هێرش دەکاتە سەر بەرژەوەندییەکانی تورکیا و چالاکییەکانی لە ئەورووپا فراوان دەکات و **"گۆرەپانی تەقسیم** TAKSIM**[گۆرەپانێکی بەناوبانگی ناوەڕاستی ئەستەمبۆڵە]ی بۆردوومان کردووە"**، کە دوو ئەمریکی بریندار بوونە(3). هەروەها وەزارەتی دەرەوە بەردەوام بوو لەسەر پۆلێنکردنی پارتی کرێکارانی وەك رێکخراوێکی تیرۆریستی، لەساڵی 1996 راپۆرتەکە لەبارەی جۆرەکانی تیرۆری جیهانی، پارتەکە بە رێکخراوێکی تیرۆریستی داناوە بەبێ ئەوەی باس لە جۆری ئەو هەڕەشە راستەوخۆیانە بکات کە وا لەو پارتەدەکات بیکات بە تیرۆریست و هەڕەشە بێت بۆ بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا، راپۆرتەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کردبوو کە **"پارتی کرێکاران بەرپرسی ئەو چالاکییە خۆکوژییە کە لە 30ی حوزەیرانی 1996 دژبەو سەربازە تورکانەی ماتۆرێکی سەربازییان لە دەرسیم سازدەکرد، ئەنجام درا، کە 9 لە هێزەکانی ئاسایشی**

(1) -U.S. Department of State, Office of the Secretary (Office of the Coordinator for Counterterrorism), " Patterns of Global Terrorism, 1993", Department of State Publication (10136), April, 1994. Via **at:**
**(**http://www.hri.org/docs/USSD-Terror/94/euro.html#Turkey).

(2) -U.S. Department of State, Office of the Secretary, (Office of the Coordinator for Counterterrorism, Philip C. Wilcox, Jr.), Patterns of Global Terrorism ", Department of State Publication 10239, April, 1995. **Via at:**
**(**http://www.hri.org/docs/USSD-Terror/94/euro.html#Turkey).

(3) -U.S. Department of State, Office of the Secretary, (Office of the Coordinator for Counterterrorism, Philip C. Wilcox, Jr.) " Patterns of Global Terrorism, 1995", April,1996.
(http://www.hri.org/docs/USSD-Terror/95/europe.html#Turkey).



**تورکی کوژران و 35ی دیکە بریندار بوون. ئەمەش یەکەمجار بوو کە ئەو پارتە شێوازی خۆکوشتن لە چالاکییەکانی بەکار بێنیت"**(1).

راپۆرتی وەزارەتی دەرەوە لەبارەی جۆرەکانی تیرۆری جیهانی بۆ ساڵی 1997 گرنگییەکی تایبەتی هەیە، راپۆرتەکە بەشێکی زۆری بۆ قسەکردن لەبارەی پارتی کرێکارانی کوردستان تەرخان کرابوو، پێکهاتە ئایدیۆلۆژییەکەی و رێکخستنەکەی و سەرچاوە داراییەکانی. ژمارەی جەنگاوەرانی بە (10 تا 15) هەزار مەزەندە کرابوون، سەربازی هەزاران هاوسۆز چ لەناو تورکیا چ لە ئەورووپا، پارتەکە بەشێوەیەکی بنەرەتی لە تورکیا و ئەورووپا و چەند ناوچەیەکی دیکەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئاسیا چالاکە. راپۆرتەکە وەك راپۆرتەکانی بەر لەخۆی جۆری ئەو هەڕەشە تیرۆریستییەی دیاری نەکردبوو کە وا لە ئیدارەی ئەمریکی بکات بەردەوام بە هەڕەشە بۆسەر بەرژەوەندییەکانی وەسفی بکات(2).

تورکیا هاوپەیمانێتییەکەی لەگەڵ ئیسرائیل بۆ سوود وەرگرتن لە لۆبی بەهێزی جولەکە لە کۆنگرێس بەکارهێنا، چونکە کۆنگرێس تاڕادەیەکی زۆر لە دارشتنی سیاسەتی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەشداری دەکات، تورکیا لە رێگەی (کۆمەڵەی جولەکە ئەمریکییەکان)ەوە توانی کاریگەری زۆر لەسەر سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر کورد، دابنێت، بەتایبەتی ئیسرائیل کە زۆر گوێ ناداتە نارەزایی لایەنی ئەمریکی و دوەلی بۆ سیاسەتی ئەنقەرە لە بواری مافی مرۆڤ و سەرکوت کردنی وەحشییانەی کورد، چونکە ئیسرائیلیش هەمان پێشێلکاری بەرامبەر فەلەستینییەکان ئەنجام دەدات(3).

(1) - U.S. Department of State, Office of the Secretary, (Office of the Coordinator for Counterterrorism, Philip C. Wilcox, Jr.), "Patterns of Global Terrorism, 1996", April, 1997. Via at:
(http://www.hri.org/docs/USSD-Terror/96/europe.html#Turkey).

(2) -Patterns of Global Terrorism: 1997, Department of State Publication 10535, Office of the Secretary

(3) -Robert Olson, Turkey's Relation With Iran…, P.150.

دیـاریترین لایەنــەکانی کاریگــەری دەســت هــەبوونی ئیــسرائیلییەکان لــە پەیوەنـدی تورکیـا و ویلایـەتی یـەکگرتووەکان کاریگـەری پۆزەتیفانـەی بـە دوو ئاراستە بۆ تورکیا هـەبوو، یەکـەم تورکیـا چـەك و تەکنـەلۆژیای پێـشکەوتووی ئەمریکی لەرێگەی کۆمپانیـا ئیـسرائیلییەکانەوە بەدەسـت کـەوت[1]، ئاراسـتەی دووەم ئەمریکا بە ئاسانی لەو شەرمەزاری و فشارانەی کە کۆمەڵە کانی مافی مرۆڤ دروستی دەکەن و ئەو کۆتانەی کە کۆنگرێس بۆ رێگەگرتن بۆ هاوردەکردنی چەك بۆ تورکیا، رزگار دەکات، هـەروەها لۆبیـە بـەهێزە خـودان کۆمپانیاکـانی چـەکی ئەمریکی کە بە دوای بازاڕی گەورەی وەك تورکیـادا دەگـەڕێن و بۆنـدی گـەورەی لەگەڵ مۆر دەکەن[2].

---

[1] -Ibid.

[2] -Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds", Pp. 34-35.

## بابەتی چوارەم: هاوکاری ئەمنی (هەواڵگری) و دەستگیرکردنی ئۆجەلان

لایەنێکی گرنگی پاڵپشتی ئەمریکی بۆ تورکیا پێدانی زانیاری هەواڵگری بوو لەبارەی پارتی کرێکارانی کوردستان. موراد یەتکین MURAT YETKIN دیارترین ڕۆژنامەنووسی تورکی لە گەورە ئەفسەرێکی هەواڵگری تورکی گواستۆتەوە کە ئەمریکا لەسەر داوای تورکیا لە ساڵی 1997ەوە زانیاری هەواڵگری لە ڕێگەی مانگی دەستکردەوە لەبارەی خیوەتگا و سەربازگەکانی پەنابەرانی کورد بە تورکیا داوە، ئەوانەی لە تورکیا هەڵاتوون لە باکووری عێراق و یۆناندان. دەزگاکانی هەواڵگری تورکی هەر 35 دەقیقە جارێك وێنەی نوێی ئاسمانی ئەو خیوەتگا و سەربازگانەی بە شێوەیەکی وا بەدەست دەگەیشت کە دەتوانی رووخساری ئەوەی دەچیتە ئەشکەوتێك و لێی دەردەچیت بناسرێتەوە[1].

دیارترین و روونترین نموونە لەسەر پاڵپشتی ئەمریکی لە بواری هەواڵگری و ئەمنی بۆ تورکیا، پرۆسەی دەستگیرکردنی عەبدوڵا ئۆجەلان بوو. ئەمریکا رۆڵێکی زۆر گرنگی لە ئاراستەکردنی گورزێکی کوشندە بۆ پارتی کرێکارانی کوردستان گێڕا، ئەویش بە بەشدارییە گەورەکەی لە دەستگیرکردنی ئۆجەلان لە ساڵی 1999. فشارە دیپلۆماسییە چڕەکانی ئەمریکا، شانبەشانی توانا هەواڵگرییەکانی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکی (سی ئای ئەی–CIA) وایکرد عەبدوڵا ئۆجەلانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان لە 1999/6/15 لە نایرۆبی پایتەختی کینیا دەستگیر بکرێت، ئەو رووداوە کۆتایی بە مێژوویەك لە پرسی کورد لە تورکیا هێنا و گەرموگوڕی بە پەیوەندییەکانی ئەمریکا – تورکیا بەخشی.

ڕۆژنامەی نیۆیۆرك تایمز لە بەرپرسانی ئیدارەی ئەمریکی گواستۆتەوە کە دیپلۆماتکار و ئەفسەرانی هەواڵگری ئەمریکی راستەوخۆ لە تشرینی یەکەمی

(1) -Murat Yetkin, Kurt Kapani: Sam'dan Imraliya Ocalan, Remzi Kitabevi, Istanbul, 2004, S. 55.



1998ەوە چاودێری جولانەوەکانی ئۆجەلانیان راستەخۆ دوای دەرچوونی لە سووریا و پەنابردنی بۆ رووسیا کردووە، لەوێشەوە بەرێگەی وڵاتانی ئەورووپای رۆژئاوا بۆ ئەفریقیا چووە. بە گوێرەی رۆژنامەکە بەرپرسانی ئەمریکی، سەبارەت بە پارێزگاریکردن لە ئۆجەلان بەشێوەیەکی راستەخۆ، هۆشداری توندیان بە هاوتا ئەورووپی و رووسییەکان داوە[1]. نامەکەی تشرینی یەکەمی 1998ی کلینتۆن بۆ سلێمان دێمیرێل پاڵپشتی راستەخۆ و زۆری ئەمریکی بۆ تورکیا تێدابوو، لەبارەی وەردەرنانی ئۆجەلان لە سووریا، لەبەشێکی نامەکەیدا باسی ئەوەی کردبوو کە **"ئەمریکا لەبارەی وەدەرنانی ئۆجەلان لە سووریا لەگەڵ تورکیا هاوڕایە، هەروەها گوتبووی هیچ وڵاتێك وەك ئەمریکا نییە پاڵپشتی لە تورکیا لە دژی پارتی کرێکارانی کوردستان بکات**...". هەروەها کلینتۆن بەڵێنی بە دێمیرێل دا کە نامەیەك ئاراستەی حافز ئەسەدی سەرۆکی سووری دەکات، بۆئەوەی دەستبەرداری پاڵپشتیکردن بێت لە پارتی کرێکاران و سەرۆکەکەی[2]. بەکردەوەش کلینتۆن نامەیەکی ئاراستەی سەرۆکی سووری کرد و داوای لێکرد چیدی سووریا پاڵپشتی لە ئۆجەلان و حیزبەکەی نەکات، هەروەها باسی ئەوەشی کردبوو کە ئەو چاوەروان دەکات کە جەنگ لە نێوان هەردوولا (سووریا–تورکیا) بەم هۆیەوە بەرپا بێت، ئەمەش لەبەرژەوەندی کەس نییە[3].

جیمس فۆلی یاریدەدەری وتەبێژ بەناوی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، لە واشنتۆنەوە بە رۆژنامەنووسانی راگەیاند کە وڵاتەکەی بە رێکوپێکی لەگەڵ

(1) -New York Times, 20 February, 1999.

بۆ نموونە کلینتۆن بە ئاشکرا تورەبوونی ئیدارەکەی لە بانگکردنی ئۆجەلان بۆ پەرلەمانی یۆنانی لەلایەن ژمارەیەك پەرلەمانتارەوە دەربری، بەرپرسێکی ئەمریکی رایگەیاند کە ئەو بانگکردنە فەرمی نییە و ژمارەیەك پەرلەمانتار کردوویانە و کارێکی هەڵەیە، وڵاتێکی هاوپەیمان (واتە یۆنان) ئەگەر دەستی یارمەتی بۆ رێکخراوێکی تیرۆریستی درێژ بکات، ئەوا متمانەی هاوپەیمانیمان دەهەژێنی.

Yalcin Yelence, Baslangictan gunumuze ayrilikci isyanlar, sam'dan imrali'ya Ocalan Belgeseli INFAZSIZ YARGI, Utopsi Yayinlari, Istanbul, 2005, S. 498.

(2) -Murat Yetkin, A. G. E., Ss. 66.

(3) -A. E., S. 67.

ئیتاڵییـەکان و ئەلمانـەکان و تورکـەکان لـە پێنـاوی پەلبەسـتکردنی ئۆجـەلان و هێنـانی بـۆ بـەردەمی دادگـا کاردەکـات، ئـەمریکا **"لەگەڵیانـدا گفتوگـۆی چوارچێوەی گشتی جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە دەکات. هەرچییەك رووبدات، دادگایی کردنی ئۆجەلان پرسێکی کۆتـایی پیهـاتووە"**[1]. ئۆلبرایت بـە هاوتـا ئیتالییەکـەی لامبرۆتـۆ دیـنی Lamberto Dini راگەیانـدووە کـە **"لـە پێنـاو چارەسەری پرسەکە [واتا تەنگژە دیپلۆماتییەکەی کە بەهۆی دەستگیرکردنی ئۆجەلانەوە لە ئیتالیا روویدا] تەنها یەك ئامراز هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئێوە ناچارن ئۆجەلان رادەستی تورکیا بکەنەوە. ئێمەش لەوەدا تا کۆتایی یارمەتی تورکیا دەدەین"**[2]. جیمس رۆبنی وتەبێژ بەناوی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا رایگەیاند کە **"مادلین ئۆلبرایتی وەزیری دەرەوە رایگەیاندووە کە پارتی کرێکارانی کوردستان رێکخراوێکی تیرۆریستییە. داوامان لە رووسیاش کردووە کە لێکۆڵینەوە لە بوونی ئۆجەلان لە سەر خاکەکەی بکات. پێویستە هیچ وڵاتێك مافی ئامادەبوون بە ئۆجەلان لەسەر خاکەکەی نەدات، دووبارەی دەکەمەوە هیچ وڵاتێك"**[3].

راپۆرتەکان ئەوەیان بەدەرخست کـە بەشـێکی گرنگـی گەشـتەکەی ئۆجـەلان و کۆتاییهێنانی لە نایرۆبی، بە پلانی پێشوەختەی دەزگای هەواڵگری ئـەمریکی بـووە، ناچـارکردنی یۆنـان بـە دەرکردنـی ئۆجـەلان بـۆ نـایرۆبی لـە 4ی شـوباتی 1999 و هێشتنەوەی لە مێوانداری بالیۆزی یۆنانی بۆ ماوەی نزیکـەی دوو هەفتـە رێکخرابـوو، دواتریش داوای لێکرا بەرەو ئەمستردام بچێت و رفاندنی لە رێگای نێوان بالیۆزخانـە و فرۆکەخانـە، کـە چـوار یـاوەری کـورد و بەرپرسـێکی لەگەڵدا بـوو، ئەمـەش گومـانی بۆندێکی هاوبەشی (یۆنانی – ئەمریکی – تورکی) ورژاند، کۆتایی هاتنی گەشتەکەی ئۆجەلان بەو شێوەی باسکرا، سەرکەوتنێکی باشی پیلانێکی رێکخراو بوو[4].

---

[1] -Yalcin Yelence, A. G. E., S. 683.

[2] -Hurriyet, 22 kasim, 1998; Yalcin Yelence, A. G. E., S. 562.

[3] -Hurriyet, 14, Kasim, 19998; Yalcin Yelence, A. G. E., S. 499.

[4] -Joshua Black, Greek Diplomacy and the Hunt for Abdullah Ocalan, WWS 547 – International Diplomacy, Pp. 9-11;
جوناثان ماركوس، "الدور الاسرائيلي في اعتقال عبد الله اوجلان"، المشاهد السياسي، العدد (155)، 28 شباط–6آذار 1999، ص ص 11–16.



نوێنەرێکی ئاژانسی هـەواڵگری ئـەمریکی لـە 4ی شـوباتی 1999 لـە ئەنقـەرە چاوی بە شنگال ئاتشگون Senkal Atasagun ی راوێژکاری دەزگـای هـەواڵگری تـورکی (میـت–MIT) کـەوت[1]. بابـەتی چـاوپێکەوتنی ئـەم دووانـە گفتوگـۆی چالاکییەی هاوبەش بـۆ دەسـتگیرکردنی ئۆجـەلان و هێنـانی بـۆ تورکیـا بـوو[2]. دوای سازکردنی چەندین راوێژ لە نێوان گەورە بەرپرسـانی تـورك لەسـەر ئاسـتی سەرۆك وەزیران و سەرۆك کۆمار و سەرۆکایەتی ئەرکان، پرۆتۆکۆلێکی نهـێنی لـە نێوان هەردوو دەزگای هەواڵگری MIT و CIA مـۆرکرا. لەبەشـێکی پرۆتۆکۆلەکـە هـاتبوو کـە **"پرۆسـەیەکی هاوبـەش لـە نێـوان میـت و سـی ئـای ئـەی بـۆ دەستگیرکردنی ئۆجـەلان و هێنـانی بـۆ تورکیـا ئـەنجام دەدرێـت. پێویـستە بەزیندوویی دەستگیر بکرێت و، دادگاییەکی عادیلانە بکرێت"**[3]. بە گـوێرەی لێدوانەکانی بەرپرسانی ئـەمریکی بـۆ رۆژنامـەی نیۆیـۆرك تـایمز، **"کـە** CIA **بـە یارمەتی ئەفسەرانی کینی تورکیایان بە وردی لە هەموو جولانەوەکانی ئۆجەلان لە نایرۆبی ئاگادارکردۆتەوە و ئەمریکا بە بەردەوامی بۆماوەی چوار مانگ کاری بۆ یارمەتیدانی تورکیا بـۆ دەسـتگیرکردنی ئۆجـەلان کـردووە"**[4]. هـەروەها ناتوانرێت رۆڵی دەزگای هەواڵگری یۆنانی لـەم پرۆسـەی دەسـتگیرکردنە بـەدوور بگیرێت، بەتایبەتی کە ئۆجەلان لە بەندیخانە بۆ رۆژنامەنووسـی تـورکی تونجـای ئۆزکان TUNCAY OZKANی نووسـیوە، کـە **"پرۆسـەی رادەسـتکردنەوەم بـۆ تورکیا بە بریارێکی ناتۆ بووە و ئەمریکا پیلانی بۆ دارشتبوو. رۆژی رێگەگرتنم بۆ ئەورووپاتان بەبیر دێتەوە، هەتاکو بریماکۆفیش ملکەچـی بریارەکـە بـوو، باهـەموو بـزانن کـە نـاتۆ برِیـاری چارەنووسـی مـنی دا، بـەڵام گـرنگتر رۆڵـی**

---

[1] -Milli Istihbarat Teskilati.

[2] -Tuncay Ozkan, Operasyon, Dogan Kitap, 7 Baski, Istanbul, 2000, S. 11; Faruk Bildirici, A. G. E., S. 253.

[3] -Tuncay Ozkan, Operasyon, Ss. 12-13; Faruk Bildirici, A. G. E., S. 253

[4] -New York Times, 20 February, 1999.

**یۆنانییەکانە کە پرۆسەی دەستگیرکردنی منیان هەر لەسەرەتاوە، بەڕێوەبرد. ئەوان درۆزنن، یۆنان ویستی من لە گۆرەپانەکە بەدەربنێت، بۆئەوەی جەنگ لەنێوان کورد و تورك لە تورکیا بەرپا ببێت"**[1].

سەرکردەکانی پارتی کرێکارنی کوردستان لە چالاکی و هەوڵەکانی ئەمریکا کە پاڵپشتی لە پیلانی دەستگیرکردنی ئۆجەلان بۆ تورکیا دەکات، بێ ئاگا نەبوون، بۆ نموونە خودی ئۆجەلان رایگەیاند کە بەر لە ماوەیەکی کورت، بە رۆژنامەی ئۆزگور پۆلیتیکای Ozgur Politika نزیك لە پارتی کرێکارانی کوردستانی راگەیاند و گوتی: "**لە راستیدا ئامانجی ئەو پیلانەی کە ئەمریکا بەڕێوەی دەبرد و ئاراستەی دەکرد، بەتەواوی لەناوبردنی پرۆگرامی رزگاریخوازی نیشتمانی بوو. راگەیاندەکەی واشنتۆن [ئەیلولی 1998] کە سەرکردە کوردەکانی عێراق بەشدارییان تێدا کرد، لەسەر حیسابی لە ناوبردنی ئێمە بوو. سەردانەکانی مەسعود بارزانی و جەلال تالەبانی بۆ ئەنقەرە هەر لەهەمان چوارچێوە دێت. نابێت کەس بەمە هەڵبخەڵەتێ**".

کاتێ بولەند ئەجەویدی سەرۆك وەزیرانی تورکی لە ناکاو لە 19ی شوباتی 1999 بە میدیای تورکی راگەیاند کە عەبدوڵا ئۆجەلان لە سەعات هەشتی بەیانییەوە لە دەستی تورکیا دایە[2]. ئەمریکا لەسەر زاری جو لوکهارت JOE LOCKHART وتەبێژی کۆشکی سپی خۆشحاڵی خۆی دەربڕی و گوتی: "**دیارە ئێمە بەدەستگیرکردنی سەرکردەیەکی تیرۆریستی ئاوا خۆشحاڵ دەبین**"[3]. لە رۆژی دوای دەستگیرکردنەکە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، هاووڵاتیانی خۆی ئەوانەی نیشتەجێ دەرەوەن و یا سەفەر دەکەن، ئاگادارکردەوە کە رێوشوێنی ئەمنی بەدەگ وەربگرن، بۆ ئەوەی هەر کاردانەوەیەکی تورە کە لەوانەیە لە لایەنگرانی ئۆجەلانەوە دەربچێت[4].

(1) -Tuncay Ozkan, Operasyon, S. 177.

(2) -Greece and PKK Terrorism II, Ministry of Foreign Affairs, Ankara, April, 1999, P. 66.

(3) "-The Seizure of Abdulla Ocalan: Whatever Happened to the Right of asylum?", via at: (www.wsws.org/articales/ 1999/feb1999/ocal-f18.html).

(4) -New York Times, 18 February, 1999.



کاردانەوە تورە و گەورەکانی کورد کە پایتەختە ئەورووپییەکانی گرتەوە، وای لە ئیدارەی ئەمریکی کرد کە نکۆلی لە رۆڵی راستەخۆی لە رفاندنەکە بکات. بەڵام لێدوانەکانی گەورە بەرسانی ئەمریکا بەبێ شەرم لایەنەکانی پاڵپشتی ئەمریکی بۆ تورکیا لە سەرکەوتنی پرۆسەکە بەدەرخست. یەکێ لەوانە دوای راستەوخۆ دەستگیرکردنی ئۆجەلان گوتی: "**کات و ماندووبوونێکی زۆرمان لە کارکردن لەگەڵ ئیتالیا و ئەلمانیا و تورکیا بۆ دۆزینەوەی رێگایەك کە بەهۆیەوە ئۆجەلانی پێ پێشکەشی دادگا بکەین، خەرجکرد**"[1].

بەرپرسانی تورکیش لەلای خۆیانەوە پاڵپشتی ئەمریکییان بۆ تورکیا نە شاردەوە ونە کەمکردەوە، هەرچەندە زانیارییە سەرەتاییەکان کە ئەجەوید بلاویکردەوە ئاماژەی بە رۆڵی راستەخۆی ئەمریکی نەکرد، بەڵام ئاماژەی شاراوەی بۆ ئەو رۆڵەی تێدابوو. کاتێ دوای رۆژێك لە دەستگیرکردنەکە لەبارەی رۆڵی دیاریکراوی ئەمریکا پرسیار لە ئەجەوید کرا، وەڵامی دایەوە کە: "**من پشت بە دەرپێنیکی لۆکاڵی دەبەستم، لێگەرێن با ترێ بخۆین و نەپرسین ئەو ترێیە لە کوێ هاتووە**"[2]. کاتێ دواتر کە سەر لەنوێ لەبارەی رۆڵێکی ئەمریکا پرسیاری لێکرایەوە گوتی: "**من ناتوانم ئەمە ئاشکرا بکەم، بەڵام تۆ دەتوانی پشت بە مەزەندەی خۆت ببەستی**"[3]. ئەو یادداشتە سوپاسگوزارییەی کە ئەجەوید بۆ سەرۆکی ئەمریکی ئاراستەی کرد، هیچ بواری بۆ گوومان و لێکدانەوە نەهێشتەوە کە ئەمریکا بە یارمەتی ئیسرائیل رۆڵی هەرە گەورەی لە پرۆسەی دەستگیرکردنی ئۆجەلان بینیووە[4]. بۆیە سەیر نییە کە سوپاسگوزاری و رێز لە یەکێك لە دیارترین سەرکردە تورکەکانی بەرهەڵستکاری کلاسیکی سیاسەتی ئەمریکی لەبەرامبەر تورکیا بێت[5].

(1) -Ibid.

(2) -Ibid.

(3) The Washington Post, 21 February, 1999-.

(4) -Milliyet, 20 Subat, 1999; Kemal Krişci, "U.S.-Turkish Relation…", P.136.

(5) -Kemal Krişci, "U.S.-Turkish Relation…", P.136.

پرۆسەی دەستگیرکردنی ئۆجەلان قوولّی و بەهێزی و پێگەیشتوویی پەیوەندییەکانی تورکیا– ئەمریکا بەدەردەخات و گەیشتنی ئەو پەیوەندییە بۆ قۆناغی ستراتیژی ئاشکرا دەکات، لەلایەکی دیکەوە دیسانەوە بێ ئومیدی کوردی لەسەر دەستی هێزێکی گەورە تۆمارکردەوە، ئەو هێزەی کە پێشتر کورد ئەزموونی تالّی لەگەلّیدا هەبووە، کە هێشتا لە دەرەنجامەکانی رزگاریان نەبوو، دیسانەوە تووشی یەکێکی نوێ بوونەوە، یاریدەدەری وەزیری دەرەوە روبێرت بللیترو ROBERT BELLITRO لە وەلامی پرسیارێکی گۆڤاری لەندەنی **(المشاهد السياسي)** کە لە دەستەی رادیۆی بەریتانی–BBC دەردەچێت، سەیر نییە کە رابگەیەنێ کە ئەو چارەسەرەی کە رۆژئاوا لەبارەی **"چارەسەری مرۆیی"** بۆ پرسی کورد قسەی لەبارەیەوە دەکات، دوای سەرکەوتنی تورکیا بە یارمەتی ئیدارەی ئەمریکی لە دەستگیرکردنی ئۆجەلان هات، ژمارەیەکی زۆر لە کەمینە لە جیهاندا هەن ماف چارەنووسیان پێنەبەخشراوە، بەلام ماف خۆیانە کە پارێزگاری لە کلتوور و زمانی تایبەتی خۆیان و جۆرێك لە ئۆتۆنۆمییان هەبێت. بەلام رۆژئاوا نایانەوێت ئەو شتە لە دژی خواستی ولاتانی ناوچەکە پێشنیاز بکەن[1]. ئیدارەی ئەمریکا دروشمی **"یارمەتیدانی تورکیا، بۆئەوەی یارمەتی خۆی بدات"** داهێنا، ئەو دەستەواژەیە زۆری پێنەچوو لەلای بەرپرسانی ئیدارەی ئەمریکی سەردەمی کلینتۆن لە هەموو بۆنەیەکدا باسیان دەکرد[2].

گراهام فولەر Graham Fuller، سیاسەتی ئەمریکای لەبەرامبەر تورکیا لە چوارچێوەی **"پاراستنی یەکێك لە هاوپەیمانە سەرەکییەکان"**دانا، کە لە ئەنجامی هەر گۆڕانێك لە رەوشی ئێستا و هەلّگەرانەوەی هاوکێشەی هێزەکان لە مامەلّەکردن لەگەلّ کێشەکانی پەیوەندیدار بە مافەکانی کوردەوە دێنە ئاراوە، فاولەر وای دەبینی هەرتەنها هەولدان بۆ هێشتنەوەی رەوشی ئێستا و بەردەوامی پێدانی، کارێکی مەترسیدارە بۆ ئەو نائارامییەی کە ئەمریکا خوازیارە کۆتایی پێ بێنێت گوتی: **"هیچ کار نەکردن، تەنها کار بۆ هێشتنەوەی**

[1] - جوناثان ماركوس، المصدر السابق، ص 15.

[2] -Henri J. Barkey, "The Endless Pursuit…", P. 220



**رەوشی ئێستا بکرێت، واتا رۆژهەلاتی ناوەڕاست لەوانەیە توندترین پلەی توندوتیژی و سەرکوتکردن هەلبژێرێ و کەمینە بێزارەکانی هەر ولاتیك لەناوبەرێت"**[1].

ئاستی پەرەسەندووی پەیوەندییەکانی ئەمریکا–تورکیا لە ماوەی نەوەدەکان و هەماهەنگی لە دیدگایان لەبارەی زۆربەی پرسە هەرێماییەتی و جیهانییەکان، رێگەی لە جیاوازی بۆچوونیان و بڕینی بەرژەوەندییەکانیان لە کێشە گرنگەکانی ناوچە جیاجیاکانی جیهان نەگرت[2]، لەوانەیە دیارترین ناکۆکی لە بۆچوون لە نێوان هەردوولا، بەهۆی سیاسەتی ئەمریکاوە بێت لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست و بە دیاریکراوی بەرامبەر عێراق و ئێران، سەرباری مافەکانی مرۆڤ و تیرۆر لە ناوخۆی تورکیا.

لە راستیدا سەروکاری ئەمریکا بە کێشەی کورد لە تورکیا و عێراق، کاریگەرییەکی پێچەوانەی لە پەرەسەندنی پەیوەندییەکانی هەردوولا کردووە. پێکدادان و هێرشەکانی نێوان پارتی کرێکاران و هێز و دەزگا سەربازی و ئەمنییەکانی تورکیا لە نێوان سالانی 1992 تا 1996، پێشێلکاری گەورەی لە بواری مافەکانی مرۆڤ تۆمارکردووە، کە رێکخراوە جۆراوجۆرەکان و رێکخستنە نێودەولّەتییەکان و حکوومی، فەرمی و نافەرمی، بە ئەمریکاشەوە، چاودێرییان کردووە. راپۆرتە سالانەییەکانی ماف مرۆڤ کە لەلایەن وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەردەچیت، بۆ چەندین جار بەرنامەی یارمەتییە سەربازییەکانی ئەمریکای بۆ تورکیا، تێکداوە، هەروەك دواتر باسی دەکەین، لەبەرامبەردا سیاسەتمەدارانی تورکی بە هەموو بۆچوونە جیاکانیان و پۆستە حکومی و حیزبییەکانیانەوە، بەردەوام گومانیان لە نیاز و پلانەکانی واشنتۆن لە باکووری عێراق دەکرد، بەلّکو کەسایەتییەکی وەك بولەند ئەجەویدی سەرۆك وەزیران کە پێشتر نامەی سوپاسگوزاری بۆ ئیدارەی ئەمریکی لەبارەی رۆلّی ئەمریکا لە

[1] -Graham Fuller, "The Fate of The Kurds", Foreign Affairs, Spring, 1993, P. 119

[2] -Graham E. Fuller, "The Institutional Framework …", Pp. 1-9.

دەستگیرکردنی ئۆجەلان ناردبوو، ئەو کەسایەتییە سەرکردایەتی ئەو گرووپە رەخنەگر و گومانکارییەی لە سیاسەتی ئەمریکی لە کوردستانی عێراق دەکرد[1].

گوومان هەر باڵی بەسەر میزاجی سیاسی تورکی کێشابوو، لەبارەی **"بوونی نیازی شەڕئەنگیز"**ی هێزە بیانییەکان کە یەکێتی خاکی تورکی دەکاتە ئامانج[2]. هەروەها پرسی مافەکانی مرۆڤ کە ناوە ناوە ئەمریکا دەیورژێنێ و ئەو بانگەشانەی لەبارەی پاراستنی کوردان لە کوردستانی عێراق، جگە لە ئامانجگەلێکی جاڕنەدراو بۆ **"زیندووکردنەوەی پەیمانی سیڤەر"** هیچی دیکە نییە، هەروەها بەردەوام بوونی ئەمریکا لەم سیاسەتەی وای لێدەکات لەبری **هاوپەیمانێکی ستراتیژی** شوێنی **"دوژمن"** بگرێتەوە[3].

---

[1] -Kemal Krişci, "U.S.-Turkish elRations…", P. 136.

[2] - هاینتس کرامر، المصدر السابق، ص 407.

[3] -Kemal Krişci, "Turkey and United States…", Pp. 23-24.

بە درێژایی ماوەی ساڵانی هاوپەیمانیان لە قۆناغی جەنگی سارددا، بەردەوام پێگەی ستراتیژی بەسەر سیاسەتەکانی ئەمریکا لەبەرامبەر تورکیا، زاڵبووە. پلەی هاوکاری ئەمریکی لە بنەماوە بە سروشتی پشتی بەو پەرەسەندن و رووداوانەی کە دەوروبەری تورکیا بەخۆیانەوە بینیووە، بەستووە. لەو ماوەیەدا بەشێوەیەکی گشتی پەرەسەندنە سیاسییەکانی تورکیا، بەشێك لە ئەژێندای هاوپەیمانی تورکی– ئەمریکی نەبووە، تەنها بە برێکی کەم نەبێت کە توانای تورکیا بۆ بەرزەفتکردنی ئارامی ناوەخۆی بەهێزدەکات تاکو درێژە بەو هاوپەیمانییە بدات[1]. بەڵام تێبینی دەکرێت ئەو گۆڕانکارییانە لە جیهانی دوای جەنگی سارد لە دەریای رووداوەکانی ماوەی نەوەدەکانی سەدەی بیستەم دا بوون. گۆڕانکارییەکانی کە لە گۆرەپانی جیهانی روویاندا، ئەوانەی لە دەروبەری تورکیا روویاندا، بەهۆی داڕمانی کۆمۆنیزم لە ئەورووپای رۆژهەڵات و یەکێتی سۆڤیەت و دەرکەوتنی زنجیرەیەك کێشمەکێشی ئەتنی زۆریك لە پرەنسیپەکانی دونیای دوای دووەم جەنگی جیهانی لەناوبرد و وایکرد چاو بە پرەنسیپ و چەمکی "**پێشێل نەکردنی سنووری دەوڵەت**"دا بخشێنرێتەوە[2]. پرسەکانی دیموکراسی و کێشەکانی ماف مرۆڤ، یەکێك بوون لە ئامرازەکانی سیاسەتی ئەمریکا لە جیهاندا. لەم پێوەندەدا حەسەن جەمالی رۆژنامەنووسی دیاری تورك بابەتێکی لە رۆژنامەی مللیەتی خودان مەیلی کەمالی نووسیوە: "**لەوەتەی لە ساڵی 1989 دیواری بەرلین رووخاوە و یەکێتی سۆڤیەت نەماوە، گۆڕان لە ئەمریکا**

(1) -Sabry Sayari, "Turkey and United States: A changing dynamics of an Ending Alliance", in: Tariq Y. Ismael and Mustafa Aydin, Turkey's Foreign Policy in the 21st Century: A changing Role in world Politics, Ash gate Publishing Company, Great Britain, 2003, P.34.

(2) -Henri J. Barkey, "The Endless Pursuit…", P. 211.



**دەستی پێکردووە. لە ئەمریکا زۆر گوێمان لە قسەکردن دەبوو لەبارەی دیموکراسی مافەکانی مرۆڤ و ئەو بابەتانەی کە پێشتر لە تورکیا گوێمان لێ نەدەبوو، هەروەها پرسی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا یان پرسی کوردی کە پێشتر لە بابەتە قەدەغەکراوەکان بوو لە پەیوەندییەکانی ئەمریکا–تورکیا، ئێستا لە واشنتۆنەوە گوێمان لێی دەبێت**"[1].

(1) -Milliyet, 17 kasim, 1999.

## بابەتی یەکەم: کارگێڕی و دەسەڵات

گرنگیدانە نوێیەکانی سیاسەتی ئەمریکی بەرامبەر تورکیا دوای جەنگی سارد، لەوەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەنگیدایەوە، تەنیا وەزارەتی دەرەوە بەرە بەرە لەراپۆرتە ساڵانەییەکانی لەبارەی پیادەکردنی مافی مرۆڤ گرنگی تایبەتی بە تورکیا دەدا، رووماڵێکی چڕی لەبارەی پەرەسەندنە نێوخۆییەکانی تورکیا دەرکرد و لەبارەی کێشەکانی پەیوەست بە پرسی کوردیشەوە، بەتایبەت جەختی دەکردەوە[1].

هەرچەندە حکوومەتی ئەمریکی لە ناوەڕاستی حەفتاکانەوە بەشێوەی خول راپۆرتی ساڵانەی لەبارەی پیادەکردنی مافەکانی مرۆڤ لە جیهان دەرکردووە، بەڵام تێبینی دەکرێت زۆر گوێی بەوەی لە تورکیا روودەدات لە پێشێلکاری ترسناکی مافەکانی مرۆڤ تا کۆتایی دەیەی هەشتاکان نەدابێت، ئەو پێشێلکارییانەش ئەوەندە گەورە بوون نەدەکرا، پشتگوێ بخرێت. رێکخراوە نێودەوڵەتییە بەرگری کارەکانی مافی مرۆڤ بەتایبەت لەوماوەیەدا بابەتی مەترسی بەردەوامبوونی وڵاتانی رۆژئاوا بۆ پێدانی چەك بە قەبارەیەکی گەورە بە تورکیایان ورژاند، ئەو چەکانەش لە جەنگی بەرپابووی کوردستانی تورکیادا بەکاردێت. لەناوەڕاستی هەشتاکان، هەر لەهەمان رێرەودا جوناسان راندلی رۆژنامەنووسی ئەمریکی لە رۆبیرت شتراوس هۆپی بالیۆزی ئەمریکا (سەردەمی رۆناڵد ریگن 1980–1988) لە تورکیای پرسی کە بۆچی ئەمریکا لەبارەی پێشێلکارییە ترسناکەکانی مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا، قسە لەگەڵ تورکیادا ناکەن، شتراوس بە لێدوانی پچڕپچڕ وەڵامی دایەوە و گوتی: **"پێویستە ئەرکی بەرگریکردن لە مافەکانی مروڤ لە تورکیا بو وڵاتانی ئەورووپی بە جێ بێڵین"**، بەبێ ئەوەی ئاماژە بە ئەرکی تورکیا بدات، کە ئەمریکا لە بەرامبەر "ئیمپراتۆرییەتی شەڕ" ئامادەی کردووە، ئەو دەربرینەش ریگن بۆ ئاماژەکردن بۆ یەکێتی سۆڤیەت بەکاریدەهێنا[2].

---

[1] -Sabry Sayari, Op. Cit., P. 34

[2] - جوناثان راندل، المصدر السابق، ص 361.



بەر لە نەوەدەکان پرسی کورد لە تورکیا بەشێوەیەکی گشتی لەلایەن ئەمریکاوە ئەوەندە گرنگی پێنەدەدرا، سەرجەم حکوومەتەکانی ئەمریکا بە درێژایی ماوەی جەنگی سارد هەڵوێستێکی پۆزەتیڤیان بەرامبەر پرسی کورد لە تورکیا نەنواند. جگە لەو زانیارییانەی کە نووسەری کتێبی (یۆتۆپیای کوردستان Kurdistan Utopyasi) سەبارەت بەو سێ داواکارییانەی کە حکوومەتی ئەمریکی لە ساڵی 1962 سەبارەت بە کورد بە حکوومەتی تورکی داوە[1]. هیچ ئاماژەیەك بۆ ئەوەی کە ئەمریکا تێبینییەکی لەبارەی توندوتیژی تورکی لەگەڵ هاووڵاتییە کوردەکانی دابیت نییە، هەرچەندە ئیدارەکەی جیمی کارتەر (1977– 1980) بانگەشەی ئەوەی کرد کە پرسەکانی مافی مرۆڤ گرنگی یەکەم لەلایەن ئەمریکاوە وەردەگرن، بەڵام راپۆرتە ساڵانەییەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکای سەردەمی کارتەر لەبارەی پیادەکردنی مافەکانی مرۆڤ، سەبارەت بە پێشێلکارییەکانی تورکیا بۆ ئەو مافانە تاڕادەیەکی زۆر بێ لایەن نەبوو[2].

---

[1] - سێ داخوازییەکەی ئەمریکا ئەمانە بوون:

1– کردنەوەی رادیۆیەك بە زمانی کوردی لە کوردستانی تورکیا، بە گوێرەی ئایدیۆلۆژیای تورکی ئەمریکی بەرنامەکانی پەخش بکات، بە مەرجی ئەمریکا سەرجەم خەرجییەکانی کە بە گوێرەی رۆژنامەی رۆژئاوا 33 ملیۆن دۆلار بوو، بگرێتە ئەستۆ، حکوومەتی تورکی داواکەی رەتکردەوە، لەهەمان کاتدا شای ئێران لەسەری رازی بوو و ویستگەیەکی کوردی لە کرمانشان دانا.

2– ئەو ئەفسەرە ئەمریکییانەی کە لە شاندەکانی مەشق لە تورکیا خزمەتیان دەکرد، راپۆرتێکیان بۆ پەنتاگۆن بەرزکردەوە، تێیدا هاتبوو کە ئەو کوردانەی کە بۆ خزمەتی سەربازی بۆ سوپای تورکی دەهینرێن، لێهاتوون، بەڵام بەهۆی سوك سەیرکردنیان (لەلایەن تورکەکانەوە) و نەزانینی زمانی تورکییەوە، ناتوانرێت بەتەواوی سوود لەو سەربازانە وەربگرێت. لەسەر ئەمە داوا لە حکوومەتی تورکی کرا کە ئەوانە بە زمانی کوردی فێربکرین و مەشقیان پێبکرێت، بەشێوەیەك کە لەگەڵ بەرنامەی سەربازی تورکی بگونجێ و حکوومەتی ئەمریکی خەرجی ئەمە دەکێشێت، بەڵام حکوومەتی تورکی دیسانەوە رەتی کردەوە.

3– دوای ئەمانە ئەمریکییەکان ئامادەیی خۆیان بۆ چاپکردنی فەرهەنگی (کوردی – تورکی) و (تورکی – کوردی) پیشاندا، بەڵام تورکیا هەمدیسان رەتی کردەوە. سەیری
Ersal Yavi, A. G. E., S.19

[2] -George S. Harris, "U. S. Turkish...", P. 193.

یەکەم ئاماژە بۆ پرسی کورد لە تورکیا کە لە راپۆرتی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لەبارەی پیادەکردنی مافەکانی مرۆڤ هاتووە، بۆ ساڵی 1988 دەگەڕێتەوە. لەوکاتەوە راپۆرتەکان بەشێوەیەکی رۆتینی و بە وردەکارییەکی زیاترەوە پێشێلکارییەکانی دەوڵەتی تورکی لە دژی کورد لە تورکیا تۆمارکردووە، هەروەها رەخنەشی لە پارتی کرێکاران بەهۆی بەشداریکردنی لە ئەنجامدانی کردەوەی ئابروبەردا گرتووە[1].

تورکیا ئەو ئاماژانەی کە لە راپۆرتی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکادا هاتوون فەرامۆش نەکرد، تۆزێك هەستیار بوو بەرامبەریان. لەساڵی 1988 کۆمپانیای توێژینەوە و لێکۆڵینەوە بەناوی (دەستەی ریبەرانی نێودەوڵەتی) لە واشنتۆن دامەزرا، لە پێناو نزیککردنەوەی بۆچوونەکانی هەردوو حکوومەتی ئەمریکی و تورکی لەبارەی کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کێشەکانی تورکیا، بۆئەوەی فشارێك بۆ سەر کۆنگرێس دروست بکات، تاکو رووبەڕووی ئەو فشارە سیاسییانەی کە ئاراستەی تورکیاکراوە ببێتەوە[2].

بە نزیکبوونەوە لە دەیەی حەفتاکان پیادەکردنەکانی تورکیا لەبواری مافەکانی مرۆڤ رۆژ بەڕۆژ زیاتر ئەمریکای شەرمەزار دەکرد. هاوسەنگی راگرتن لە نێوان پاڵپشتیکردنی تورکیا لە شەڕی پارتی کرێکاران و فەرامۆش نەکردنی ئەو بارە خراپەی کەبەسەر مافەکانی مرۆڤ لە تورکیادا هاتووە، کارێکی سەخت بوو. دەرەنجامی هەنووکەیی ئەمە، ئەوەبوو ئیدارەی ئەمریکی لەبارەی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ تورکیا بوون بە دوو بەشەوە[3].

بالیۆزی ئەمریکا لە تورکیا مۆرتون ئەبراموڤیچ– M. Abramowitz (1989–1991)، راستەوخۆ دوای وەرگرتنی پۆستەکەی رایگەیاند کە **"پرسەکانی مافی مرۆڤ بەشێکی گرنکی ئەرکەکانییەتی"**. لە راپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ ساڵی 1989 لەبارەی پیادەکردنی مافەکانی

(1) -Stala M. Garielides, Op. Cit., P. 101; Makiko Ali, Op. Cit., P.59.

(2) - ابراهيم الداقوقي، المصدر السابق، ص ص 402–403.

(3) -Henri J. Barkey, "The Endless Pursuit…", P. 220.



مرۆڤ لە جیهان، باسی ئەوەی کردبوو کە **"بانگەشەی باوەڕپێکراو لەبارەی ئازاردان و خراپ مامەڵەکردن و حکومی بەندی درێژماوە بۆ چالاکە سیاسییەکان"** و بوونی یاساگەلێك کە بەکاردێت لەدژی بەرتەسکردنەوەی کاری رۆژنامە و ئازادی کۆبوونەوە و فیکردن و قەدەغەکردنی پارتەکان بە پاساوی کۆمۆنیزم یان ئایینی و **"قەدەغەکردنی بڵاوکردنەوەی کتێب یا رۆژنامە یا هەرشتێکی دیکە بە زمانی کوردی"**. بەردەوامی لە **"فەرامۆشکردنی هەرچی شتی کە پەیوەندی بە مێژوو و کلتوور و ناسنامەی نەتەوەیی کوردییەوە بێت..."**[1].

پێ دەچێت ئەو رایانەی ئەبراموفیتەز کەسیی بن، بەشێك لە ئەژێندای ئیدارەی جۆرج بۆشی باوك نەبیت لە مامەڵەکردنی بە شێوەیەکی راستەقینە لەگەڵ دۆسیەی مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا. وتارەکانی ئەبراموفیتەز لە ساڵی دووەمی وەرگرتنی پۆستەکە ئاماژە بۆ پاشەکشی و بێ هێوایی توند لەچاو هەڵوێستەکانی ساڵی یەکەم دەکات. سەرباری لێدوانەکانی پێشوو و راپۆرتی وەزرارەتی دەرەوەی ئەمریکی ساڵی 1989 لەبارەی **"ئازاردان بە شێوەیەکی فراوان"** و بوونی **"دەنگۆ سەبارەت بە مردنی بەندییەکان لەژێر ئازار"**، بەڵام خۆدوورخستنەوە لە هیما کردن بۆ زۆربوونی بەندییە سیاسییەکان لە تورکیا یان باسکردن لە توندکردنی کۆت و بەندی سەپێنراو بەسەر پیادەکردنی ئازادی رادەربرین و مافەکانی کورد و توندبوونەوەی پرۆسەی راگواستنی دانیشتوانی گوندە کوردییەکان. هەروەها لە مەڕسومی ژمارە (413)ش کە حکوومەتی تورکی دەریکرد، کە بەهۆیەوە زۆریك لە مافە سیاسییەکانی کوردی پێ هەڵپەسارد. لەبر هەموو ئەمانە ئەو بالیۆزە ئەمریکییە رایگەیاند کە **"باری مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا بە چەسپاوی بەرەو باشی چووە"**[2]. هەروەها ریتشارد شیفتر Richard Schifter وەزیری مافەکانی مرۆڤی ئەمریکی، لەبری

(1) -Human Rights Watch, " The human rights picture in Turkey grew worse during 1989". Via at: (http://www.hrw.org/reports/1989/WR89/Turkey.htm#TopOfPage).

(2) -Human Rights Watch, " The human rights picture in Turkey grew worse during 1990" via at: (http://www.hrw.org/reports/1990/WR90/HELSINKI.BOU-04.htm#P585_134572).

ئەوەی ئاماژە بۆ نەبوونی ویستی سیاسی تورکی لە چارەسەری حاڵەتەکانی ئازاردان بکات. هەڵوێستی کلاسیکی ئیدارەکەی وەرگرتەوە، "**پرۆسەی ئازاردانی بەندییەکانی تورکیا**"ی بۆ کەم مەشقی پۆلیسی تورکی گەڕاندەوە[1].

رێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ لە راپۆرتی ساڵانەی لەبارەی پێشێلکارییەکانی ماف مرۆڤ لە ساڵی 1989 گەیشتە ئەوەی کە سەرباری ئیدارەی بۆشی باوك زانیاری لەبارەی "**پێشێلکاری ترسناکی مافەکانی مرۆڤ، وەك ئەوەی لە نێو دەوڵەتان ناسراوە**" هەبوو، ئەمەش لەگەڵ بەشی B-502 ی یاسای یارمەتییە سەربازییە بیانییەکان ناکۆك بوو، بەڵام سەرۆك بۆشی باوك داوای لە کۆنگرێس نەکرد کە لەکاتی رازی بوونیان لەسەر پێدانی بەخشینی ساڵانە لە یارمەتییە دەرەکییە بیانییەکان بە تورکیا ئەو بابەتە بەهەند وەرگرن. ئەمریکا "**هیچ خۆی بە رازی کردنی حکوومەتی تورکییەوە ماندوو نەکرد، تاکو تۆماری خۆی لەبواری مافەکانی مرۆڤ چاك بکات**"، لەبری ئەمە بەرپرسە گەورەکانی ئەمریکا لەمیانەی سەردانێکی ئۆزالی سەرۆك وەزیرانی تورکی بۆ واشنتۆن لە حوزەیرانی 1989 و چاوپێکەوتنی بە بۆشی باوك لە کانوونی یەکەمی هەمان ساڵ، پرسی قەدەغەکردنی زمانی تورکییان لە بۆلگاریا و ئەو رێگرییانەی لەبەردەم بڵاوکردنەوە بە زمانەکانی هەنگاری و ئەلمانی لە رۆمانیا دانراون گفتوگۆ کرد، بەبێ ئەوەی ئاماژە بە قەدەغەکردنە فەرمییەکەی زمانی کوردی لە تورکیا بدەن[2]. وەزارەتی دەرەوە لەلای خۆیەوە، وەك هەنگاوێ بۆ وەڵامدانەوەی رەخنە نێودەوڵەتییە زۆرەکان، فایلێکی تایبەتی لەبارەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵەوە ئامادەکرد و دانەیەکی بە وڵاتانی ئەورووپی دا، کە کێشەکانی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لە ناوچە کوردییەکانیان دەورژاند و داوایان دەکرد، بەهۆی ئەو پێشێلکارییانەوە ئەمریکا فشار بۆسەر تورکیا بێنێت[3].

(1) -Human Rights Watch, " The human rights picture in Turkey grew worse during 1990" via at: (http://www.hrw.org/reports/1990/WR90/HELSINKI.BOU-04.htm#P585_134572).

(2) -Human Rights Watch, "The human rights picture in Turkey grew worse during 1989". Via at: (http://www.hrw.org/reports/1989/WR89/Turkey.htm#TopOfPage).

(3) - ابراهيم الداقوقي، المصدر السابق، ص 402.



هەڵوێستەکانی ئیدارەی سەرۆك بۆشی باوك لە کاریگەر نەنواندێکی راستەقینە بۆ سەر تورکیا تاکو فایلی خۆی لە بواری مافەکانی مرۆڤ باش بکات، وەکو خۆی مایەوە. سەرباری زۆربوونی حاڵەتەکانی پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤ لە ساڵی 1991 و زۆربوونی ژمارەی حاڵەتەکانی مردن لە بەندیخانە و پرۆسەکانی کوشتنی بکەر نادیار و زۆربوونی ئازاردان و بەردەوامی لە بەندکردنی رۆژنامەنووسان و داخستنی رۆژنامە و زەوتکردنی ئازادییەکان و قەدەغەکردنی کۆبوونەوەی ئاشتیخوازانە، سەرباری هەموو ئەمانە سەرۆك بۆش کە لە تەمووزی 1991 سەردانی تورکیای کردبوو، زۆر مەدح و سەنای تورکیا و سەرۆك ئۆزالی کرد و بەمشێوەیە قسەی بۆ ئەو ئامادەبوانەی کە لە خوانێکدا کە بۆ شەرەفی سەرۆکی ئەمریکی رێکخرابوو کرد و گوتی: "**هیچ وڵاتێك وەك تورکیا جیدی نییە و هیچ هاوپەیمانێکیش وەك سەرۆك ئۆزال نابێت**" تورکیای بە ماڵی دووەمی خۆی وەسفکرد[1].

دوای ئەوەی کلینتۆن لە هەڵبژاردنی تشرینی دووەمی 1992 هەڵبژێردرا، بەڵێنی دا چاو بە "**سیاسەتی چەکی ئەمریکی بخشێنێتەوە و دەرگای گفتوگۆش لەگەڵ وڵاتانی دیکەی هەناردەی چەك بکاتەوە، ئەمەش وەك بەشێك لە پلانێکی دوور مەودا بۆ کەمکردنەوەی بڵاوکردنەوەی چەکی ویرانکەر و دانانی سنوورێك بۆ ئەوەی ئەو چەکانە نەکەونە دەستی ئەوانەی بۆ مەبەستی ماڵوێرانی بەکاری دێنن**"[2]. لەهەمان کاتدا سەرۆکی نوێ ئەوەی پێی دەگوترێت "**ستراتیژی پەلەکردن لە بڵاوکردنەوەی دیموکراسی لە جیهان**"ی گرتەبەر، ئەمەشی لە هاوپەیمانە نزیکەکان وەك تورکیا دەست پێ دەکات. بۆیە بەرپرسانی ئەمریکی، هەتاکو ئەوانەشی کە بۆ پەیوەندی کردن لەگەڵ

(1) -Human Rights Watch, " The human rights picture in Turkey grew worse during 19 ". Via at: (http://www.hrw.org/reports/19 /WR /Turkey.htm#TopOfPage).

(2) -Tamar Gabelnick and Others, "Arming Repression: U.S. Arms Sales to Turkey during the Clinton Administration", A Joint Report of the World Policy Institute and the Federation of American Scientists, U.S., October, 1999. Via at: (http://www.fas.org/asmp/library/reports/turkeyrep.htm#execsum).

توركيا بە پەرۆش بوون، لە ورژاندنی هەلسوکەوتە ترسناکەکانی دەوڵەتی توركی کەوتنە نیگەرانییەوە و پاڵپشتی ئەمریکییان لە یارمەتیدانی تورکیا بۆ **"قوولترکردنەوەی دیموکراسییەکەی"** بینی، هەروەها بینییان بەگوێرەی پرەنسیپی **"ئەمریکا یارمەتی توركیا دەدات بۆئەوەی یارمەتی خۆی بدات"** نابێت تورکیا بۆ رووبەڕووبوونەوە نێوخۆییەکانی بەتەنیا جێنەهێڵدرێت[1].

دەتوانرێت بگوترێت کە سەرەتای گۆڕان لە هەڵوێستی ئەمریکا لە مامەڵەکردنی تورکیا لەگەڵ پرسی کوردی لە چوارچێوەی مافەکانی مرۆڤ بە هاتنی ئیدارەی کلینتۆن بۆ دەسەڵات هات. لەپاڵ مانەوەی گرنگییە ستراتیژییەکان کە لە پەیوەندییەکانی هەردوو لادا، ئیدارەی نوێی ئەمریکی هیمای تێکەڵاوی لەبارەی کێشەکانی پەیوەندیدار بە مامەڵەی توركیا بە فایلی کوردەوە، دەنارد.

راپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لەبارەی پیادەکردنەکانی مافی مرۆڤ بۆ ساڵی 1991 بە بەراورد بە ساڵانی پێشووتر وردتر بووە، لە روونکردنەوەی پێشێلکارییەکان **"سەرنەکەوتنی تورکیا بۆ کەمکردنەوەی حاڵەتەکانی ئازاردانی ئەوانەی لای پۆلیسن"**، هەورەها پۆلیس هێزی زۆر لە دژی ئەوانەی **"ناچەکدارن"** لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵات بەکاردینێت و کوتوبەند دەخاتە بەردەم ئازادی رادەربرین، بەندییەکان مافیان نییە پارێزەریان لە میانەی لێکۆلینەوەکان هەبێت. هەروەها راپۆرتەکە لەبارەی ئازادی کۆبوونەوە نموونەی داخستنی لقەکانی رابیتەی ئازاد– Ozgur Dernegi دەهێنێتەوە. هەروەها گفتوگۆی پرسی ئازاردانی بەربڵاوی بەشێوەی زۆرلە تورکیا کردووە[2].

راپۆرتەکە زۆرێك لە خاڵی پۆزەتیڤی باسکردووە، بەڵام چەندین خاڵی لاوازیشی تێدایە. ئاماژەی بەو حاڵەتانەی کە پۆلیس تەقەی لە خۆپێشاندەرانی ناوچە کوردییەکان کردبێت، نەکردووە،. هەروەها ئاماژەی بۆ داخستنی

(1) -Henri J. Barkey, "The Endless Pursuit…", P. 213

(2) -U. S. Depart of States, Turkey Country Reports on Human Rights Practices for 1991, Washington, D.C, February, 1992. Via at: (http://www.hri.org/docs/USSD-Rights/92/Turkey92.html).



ژمارەیەکی زۆر لە کۆمەڵە کانی مافەکانی مرۆڤ و رۆژنامەی کوردی چەپەکان نەکردووە، یا بۆ حاڵەتی ئازاردانی منداڵان کە دەستەی نێودەوڵەتی سەربەخۆ تۆماریان کردووە، نەکردووە. هەوەها راپۆرتەکە بە ئەنقەست ئاماژەی بۆ دادگایی کردنی نووسەران و رۆژنامەنووسان بەهۆی ئەوەی بەوەی پێی دەگوترێت: **"تاوانی فیکر"** تۆمەتبارکراون، بە پاساوی یاسای نەهێشتنی تیرۆر کە لە ساڵی 1991 دەرچووە و راڤەکردنی نارۆشنە.

لێدوانێکی ریتشارد باوتشر R.Boucher ی وتەبێژ بەناوی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە 8ی تشرینی یەکەمی 1991، بە روونی ئەو هەولانەی کە ئیدارەی ئەمریکی بۆ کەمکردنەوەی کاریگەرییەکانی راپۆرتەکە لەسەر پەیوەندییەکانی هەردوولا دروستی دەکات دەربڕی و پاساوی بۆ هێنانەوە، کاتێ گوتی: **"ئەمریکا پاڵپشتی لە هەوڵەکانی حکوومەتی تورکی دەکات، بۆئەوەی زامنی مافە سیاسی و رۆشنبیرییەکانی سەرجەم هاووڵاتیانی خۆی بەکوردیشەوە بکات"**. باوتشەر بە ئەنقەست خۆی لە بەردەوامبوونی حکوومەتی تورکی لەسەر قەدەغەکردنی قسەکردن بە زمانی کوردی بوارد لە دادگاکان و شوێنە فەرمییەکان و کردنەوەی قوتابخانە بە زمانی دایك. هەروەها ئەو تەنگپێهەڵچنینە بەردەوامانەی لە دژی ئەو کوردانەی دەیانەوێت ناسنامەی نەتەوەییان دەربڕن، هەروەك ئەوەی لە راپۆرتەکەی سەرەوە باسکرابوون[1].

وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ستراتیژێکی نوێی لەبارەی مافەکانی مرۆڤ لە توركیا دارشت، کەلەسەر بنەمای **"کۆتایی هێنان بە پێشێلکارییە فراوانە بڵاوەکانی بۆ مافەکانی مرۆڤ وەستاوە"**. ئەمەش لە رێگەی پاداشتکردنی تورکیا لەسەر هەر رەفتارێکی باش کە دەینوێنێ، بە دەستگرتن و یارمەتی ئابووری پاداشت دەکرێت، لەبری ئەوەی لەسەر رێوشوێنەکانی سزا بدرێت یا رەخنەی توندی لێبگرێت. ئەمریکا سێ بابەتی وەك سەرەتا دیاریکرد تاکو

(1) -Human Rights Watch, "The human rights picture in Turkey grew worse during 1992" via at: (http://www.hrw.org/reports/1992/WR92/HSW-06.htm#P744_222349).

جەختی لەسەر بکاتەوە، ئەوانیش : **"ئازاردان و ئازادی رادەربرین و کوشتنی نارەوا"** بوون[1].

ئەمریکا داخوازی و راسپاردەی زۆری سەبارەت بەو سێ بابەتە بە تورکیا بەخشی. سەبارەت بە ئازاردان، داوای لە تورکیا کرد ئازاردان و بەندی تاکەکەسی و رەشبگیری کە بەگوێرەی یاسای نەهێشتنی تیرۆر پیادە دەکرێت، نەهێڵێ و لەبری ئەوەی پەنا بۆ دادگای ئەمنی دەوڵەت بەریت، پەنا بۆ دەسەڵاتی دادوەری تورکی بەریت. رێوشوێنیك بۆ چاودێری حکوومەت بەسەر هەڵسوکەوتەکانی پۆلیس و ژەندرمە دابنێت و پرەنسیپەکانی مافەکانی مرۆڤ دەرخواردی پۆلیس بدات بەڵام بابەتی دووەم، کە ئازادی رادەربرینە، ئەمریکا، تورکیای ئامۆژگاریکرد کە دەرگای گفتوگۆ لەگەڵ سەرجەم نوێنەرانی گرووپە ئۆپۆزسیۆنەکان بکاتەوە، مافی رادەربرین بە بەکارهێنانی زمانی کوردیشەوە بدات و پارێزگاری لە ئازادی رۆژنامەگەری بکات. سەبارەت بە بابەتی سێیەم، کە حاڵەتەکانی کوشتنی نارەوایە و زیادەڕۆیی لەبەکارهێنانی هێزە لەلایەن حکوومەتەوە، وەزارەتی دەروە هیچ راسپاردەیەکی راستەوخۆ و ئاشکرای ئاراستەی حکوومەتی تورکی نەکرد[2].

راپۆرتی وەزارەتی دەرەوە لەبارەی پیادەکردنەکانی مافی مرۆڤ لە ساڵی 1992، بەشێوەیەکی نیمچە گشتی ئاماژەی بە زۆر لە حاڵەتەکانی پێشێلکاری ترسناك و فراوانی مافەکانی مرۆڤی کوردی نەکرد، بەڵام دەستپێشخەرییەکانی کە خۆی لە راسپاردەکانی سەرەوە دەبینییەوە، خاڵێکی پۆزەتیڤی تۆمارکرد، بە شێوەیەك هیچ ئیدارەیەکی پێشوو بە درێژایی قۆناغەکانی پەیوەندییەکانی

(1) -Human Rights Watch, "The human rights picture in Turkey grew worse during 1993" via at: (http://www.hrw.org/reports/1993/WR93/Hsw-08.htm#P564_202642).

(2) -Human Rights Watch, "The human rights picture in Turkey grew worse during 1993" via at: (http://www.hrw.org/reports/1993/WR93/Hsw-08.htm#P564_202642). ;(U. S. Depart of states,1992,



بە تورکیاوە، بەم شێوە ئاشکرایە کێشەکانی نەوروژاندووە. بەمەش شایەنی پیاهەڵگوتنی لیژنەی هلسنکی بۆ چاودێری مافەکانی مرۆڤ بوو[1].

ئاماژەیەکی دیکە بۆئەوەی کە ئیدارەی ئەمریکی ستراتیژێکی نوێی وەرگرتووە، لە پێشوازییە گەرمەکەی کلینتۆن بۆ تانسۆچیللەری سەرۆك وەزرانی تورکی لەمیانەی سەردانێکی بۆ ئەمریکا لە تشرینی یەکەمی 1993 بەدەردەکەوێت، کلینتۆن بەمشێوەیە دوا **"بە شێوەی نەتەوە بێ هاوتاکەمان، تورکیا وەك نموونەی هەمەچەشنی کلتووریی دەردەکەوێت"** بەبێ ئەوەی بچیتە سەر باسی پێشێلکارییە گەورەکانی تورکیا دەرهەق بە کورد[2].

ساڵی 1994 ئیدارەی ئەمریکی ئاراستەیەکی زۆری بەرەو ئاگادارکردنەوەی تورکیا لەبارەی قەبارە و مەترسی ئەو چەوساندنەوەیەی کە کورد لە تورکیا رووبەرووی بۆتەوە گرتەبەر. راپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەروەی ئەمریکا لەبارەی پیادەکردنەکانی مافی مرۆڤ لە هەمان ساڵ ئاماژەی بە ئازادییە کەسییەکان و ئازادی رادەربرین و پێکهێنانی پارتی سیاسی کردووە، کە تووشی گورزێکی کوشندە بووە، راپۆرتەکە بەشێکی بۆ بابەتی هەڵگرتنی حەسانە و دادگایی کردنی شەش ئەندامی پەرلەمانی سەربە پارتی دیموکراتی گەلی کوردی تەرخان کرد بوو[3]. رێکخراوی (چاودێری مافەکانی مرۆڤ – Human Rights Watch) ئەو رێوشوێنەی تورکی بە فشاری دوغان کورش سەرۆکی دەستەی ئەرکانی تورکی زانی، کە پێشتر هۆشداری لەبارەی ئەوەی کە **"تیرۆریستان لە پەرلەمان دابنیشن دابوو"**[4].

(1) -Human Rights Watch, " The human rights picture in Turkey grew worse during 1993" via at: (http://www.hrw.org/reports/1993/WR93/Hsw-08.htm#P564_202642)

(2) -Ibid.

(3) - ئەوانیش خەتیب دیجلە Hatip Dicle و ئەحمەد تورك Ahmet Turk و ئۆرهان دۆگان Orhan Dogan و ساری ساقیق Sirri Sakik و لەیلا زانا Layla Zana بوون.

(4) Human Rights Watch, " The human rights picture in Turkey grew worse during 1994" via at: (http://www.hrw.org/reports/1994/WR94/Helsinki-21.htm#P680_209831).

رۆژنامەی ئەمریکی الیزا مارکوس لـە پـاییزی 1994 لـەبارەی هەڵمەتـەکانی سوپای تورکی نووسیویەتی و دەڵێت: "**ئەمـە هێرشـێکی سـەربازی درنـدە و سـەرپاگیرە بـۆ ئـەوەی کۆتـایی بـە بـەرخۆدانی کـوردی بـە شـێوەیەکی وەحشیگەرانە بێنێت (250 هەزار سەرباز بەرامبەر 15 هەزار پیاوی باندەکان و هاوولاتیـانی مـەدەنی کـورد)... ئامانجیـان تـیرۆر و کوشـتنی نـارەوا و بـێ دەنگکردنی بەرهەلستکارانی کوردە... نووسەر و رۆژنامەنووس و نوینەرانی پەرلەمانە دیارەکان تاکو پیاوانی کاری کوردیش رووبەرووی تەقـەلێکردن و ئازاردان و بەندیخانە دەبوونەوە، هەروەها رۆژنامەی ئۆپۆزسیۆن ناچار بە داخستن کران. رووی راستەقینەی ئەو هەلمەتانە، ئامانجێکی سەربازی هەبوو، ئـەویش ویرانکردنـی هـەموو گونـدێکی یـاخیبووە، راگواسـتن و کوشـتنی گوندییەکان و کوشتنی رەمەکی و شوێنبزرکردنی هاوولاتیانی مەدەنی کوردی ئەوانەی رازی نابن ببنـە میلیـشیای بـەکرێگیراوی حکوومـەت دژ بـە پـارتی کرێکارانی کوردستان. پرۆسەکانی کوشتن لەلایەن سوپا و تیمەکانی مەرگەوە جێبەجێ دەکرێن و حکوومەتی مەدەنی لەم تاوانە بەشدارە**"[1].

لـەم وەسـفەی الیـزا هـیچ زیدەرۆییـەکی تێـدا نییـە، لێدوانـەکانی گـەورە بەرپرسانی ئەمریکی، دەیـانزانی رەوشـەکە لـەوێ چـەندە مەترسـیدارە. وارین کریستۆفەری وەزیـری دەرەوەی ئـەمریکا لـە 30ی ئـەیلولی 1994 ئامۆژگـاری تورکیـای کـرد کـە "**لەسـەر حیـسابی پابەنـدبوونی وڵات بـە پێـوەرە نێودەوڵەتییەکانی مافی مرۆڤ، درێژە بە جەنگ لە دژی جوداخوازان نەدات**"[2].

دوپـاتکردن بـو دەرکـەوتنی سـەرەتاکانی گـۆڕانی بەرەبـەرەیی لـە پەیوەندییەکانی ئەمریکا و تورکیا و گرنگیدانی ئیدارەی کلینتۆن بە پرسەکانی مافی مرۆڤ، جون شاتوك یاریـدەدەری وەزیـری دەرەوەی ئـەمریکا بـۆ مافـەکانی مرۆڤ لە ماوەی ساڵی 1994 دووجار سەردانی تورکیای کـرد، هـەروەها سـتیفن

(1) - لقمان محو، المصدر السابق، ص 25.

(2) -Oprad Kesic, "American- Turkish Relations at a Crossroads", Mediterranean Quarterly, Winter, 1995, VOL. I, P. 17.



اوکـسمان Stephen Oxman یاریـدەدەری وەزیـری دەرەوە بـۆ کاروبـاری ئەورووپی لەهەمان ساڵدا سەردانی تورکیای کرد. لەکاتی دەرچوونی لە تورکیـا لە 11ی شوباتی 1994 رایگەیاند کە وڵاتەکـەی "**چارەسـەرێکی ئاشـتییانەی کۆمەڵایەتی**" پێ باشترە بۆ پرسـی باشـووری رۆژهـەڵات [1]. هـەروەها گـوتی "**پێویستە تورکیا ئەو چارەسەرییە بگرێتەبەر**"، چونکە "**ئەمریکا باوەڕی بە چارەسەری سەربازی بەردەوام نییە لە باشووری رۆژهەڵات**"[2].

لە 25ی تشرینی یەکەمی 1994 شاتۆك لە کۆنگرەیـەکی رۆژنامەنووسـی لـە ئەنقەرە رایگەیاند کە: "**مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسـی تـا رادەیـەکی زۆر دوو خاڵی میحوەریان لە پەیوەندییەکانی ئەمریکا – تورکیا پێکهێناوە**". هۆشداری ئەوەی دا کە ئاشکرایە کە "**یاساکانی ئەمریکا لێناگەڕێت یارمەتی سەربازی ئەمریکی بۆ مەبەستی پێشێلکاری مافـەکانی مـرۆڤ لـە دژی تـاکی مـەدەنی بەتایبەتی بەکاربێت... ئەمە شتێکی زۆر ئاشکرایە بۆ بەرپرسە تورکەکان**". هەروەها شاتۆك هۆشداری دایە تورکان کە ئەوان "**ملیۆنەها دۆلار**" لەیارمـەتی سەربازی لەدەست دەدەن ئەگەر نەتوانن باری مافەکانی مرۆڤ چـاك بکـەن، لـە وڵامدانەوەیـەکی خێـرای تـورکی بـۆ لێدوانـەکانی شـاتۆك، مومتـاز سوسـیالی وەزیری دەرەوەی تـورکی رایگەیانـد کـە وڵاتەکـەی چارەسـەرییەکەی بەرپرسـە ئەمریکیەکە رەت دەکاتەوە و رایگەیاند کە تورکیـا ئەلتـەرناتیڤی هـەجۆری بـۆ دەستکەوتنی چەك لەبەردەستدایە[3].

بەشـێوەیەکی گـشتی تـا سـاڵی 1995، کاردانـەوەی ئـەمریکی لـەبارەی پێشێلکارییەکانی تورکیا بۆ مافی مرۆڤ، رەخنـەگرتن و پیـشاندانی خـاڵی لاوازی

(1) Human Rights Watch, "The human rights picture in Turkey grew worse during 1994" via at: (http://www.hrw.org/reports/1994/WR94/Helsinki-21.htm#P680_209831).

(2) - سالار اوسي ويوسف ابراهيم الجهماني (اعداد وترجمة)، تركيا وأمريكا: من الاقطـاب المتعـددة الى نظام القطب الواحد)، دار حوران للطباعة والنشر والتوثيق، دمشق، 2000، ص 84.

(3) Human Rights Watch, "The human rights picture in Turkey grew worse during 1994" via at: (http://www.hrw.org/reports/1994/WR94/Helsinki-21.htm#P680_209831).

ديموكراسـی تـوركی نـەبووە، بـەڵكو جارێـك ئامۆژگـاری پێـشكەشكردووە، جارێكیش لـە بەرپرسـە توركـەكان پاڕاوەتـەوە. هـەركاتێكیش ئەنقـەرە چـەند چاكسازییەكی هەرچـەند بـچووكیش بێـت ئـەنجام دابێـت، ئـەوا واشـنتۆن لـە پیرۆزبایی كردن و پیاهەلدانی بەرپرسە توركەكان دەستپێشخەری دەكات[1].

لـەماوەی سـاڵی 1995 گـۆڕانێكی گـرنگ بەسـەر شـێوازی هەڵـسوكەوتی ئیـدارەی ئـەمریكی لەگـەڵ مافـەكانی مـرۆڤ لـە توركیـا هـات. مەترسـییەكانی ئەمریكا ئاراستەیەكی روو لەسـەری وەرگـرت، ئەمـەش لەمیانـەی ئـەو فەرمانـە سـەرۆكایەتییەی كـە كلینتـۆن لـە شـوباتی 1995 بـە ژمـارەی 34 دەریكـرد و فەرمانی بە وەزارەتی دەرەوە كرد كە **"لە بۆندەكانی ناردنی چەك وردبێتەوە، لە گۆشەنیگای ئەوەی ئاخۆ ئەمە كاریگـەری لەسـەر ئـەمنی هەرێمایـەتی و مافەكانی مرۆڤ دەبێت"**[2]. لەپاڵ جەختكردنەوە لە هێشتنەوەی توركیـا وەك هاوپەیمانێكی گرنگ و بازاڕی گـەورەی چـەك. هەریەكـە شـاتۆك و كرۆسمـان و سـترۆپ تـالبوتی جێگـری وەزیـری دەرەوەی ئـەمریكا نیگـەرانی ئـەمریكایان لـەبارەی تۆمـاری مافـەكانی مـرۆڤ لـە توركیـا ئاشـكرا كـرد. تـالبوت Strobe Talbott لەمیانەی بەشداریكردنی كۆنگرەیەك كە لە زانكـۆی بیلكنـت–Bilkent لە ئەنقەرە لە نیسانی 1994 سازكرا رایگەیاند، كـە **"هەرچـەندە كـە ئـەمریكا هیواخواز نییە كە حكومێكی ئۆتۆنۆمی كوردی لە ناو توركیا دابمەزرێ، تاكە شتێك كە لە توركیا داوا دەكرێت ئەوەیە كـە چارەسـەرێكی دیموكراسـی – سیاسی بۆ پرسـە تایبەتـە كوردییەكـەی بدۆزێتـەوە"**[3]. راپـۆرتی سـاڵانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكا لەبارەی پیادەكردنەكانی مافەكانی مرۆڤ بۆ ساڵی 1994 باسی لەوە كردووە كە **"هەرچەندە حكوومەتەكەی چیللەر لـە سـاڵی 1993 بەڵێنی دا كۆتایی بە ئازاردان بێنێت و دەوڵەتێكی لەسەر رێزگرتنی ماف مرۆڤ دابمەزرێنێ، بەڵام پیادەكردنی ئازاردان و زۆر بەكارهێنانی هێز لەلایەن**

[1] -Henry J. Barkey, "The Endless Pursuit…", P. 220.

[2] -Tamar Gabelnick, OP. Cit., P. 2.

[3] - السفیر، 1 ایار 1995.



**پیاوانی ئاسایش بە درێژایی ساڵی 1994 باو بووە"**[1]. لەناوەڕاستی ئابی 1994 وارین كریستۆڤەری وەزیری دەرەوە نامەیـەكی ئاراسـتەی لـی هـاملتۆنی سـەرۆكی لیژنەی ئەورووپا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئـەمریكی كـرد و باسی لەوە كردبوو كە **"تۆماری مافەكانی مرۆڤ نیگەرانی گەورە بۆ ئیمە دروست دەكات، بەڵام باوەڕ ناكەین كە ئەمە هەڵەیـەكی چەسپاو لـە پێـشێلكارییەكان پێكبهێنێت"**. هەروەها ئەوەشی خستەسەر كە ئەمریكا پەنا بۆ بەشـی (B-502)ی یاسای یارمەتییە دەرەكییەكان نابات، كە داوا دەكات یارمەتییە ئەمریكییەكان لەو وڵاتانە ببردرێت كە پێشێلكاری لەمافەكانی مرۆڤ دەكەن[2].

وەكـو هـەموو جارێـك كاردانـەوەی تـوركی لەسـەر لێـدوان و رێوشـوێنە ئەمریكییەكان خێـرا هـات، بـۆ نموونـە بولەنـد ئەجەویـد لـە یـەكی ئـابی 1994 رایگەیاند كە **"ئامانجی بنەرەتی ئەمریكا، دروستكردنی هەرێمێكی سەربەخۆیە لە باشووری رۆژهەڵاتی توركیا"**[3].

وەزارەتی دەروەی ئەمریكا 36 لاپـەرەی بۆ توركیا لەو راپۆرتەكـەی كـە لـە شـوباتی 1995 لـەبارەی پیادەكردنـەكانی مـافی مـرۆڤ لـەجیهان بـوو، تـەرخانكردبوو، واتـا زیـاتر لـە هـەموو وڵاتـان جگـە لـە چـین كـە 39 لاپـەرەی بەركەوتبوو، بۆ توركیا تەرخانكرابوو[4].

لەسـەر داوای كـۆنگرێس، وەزارەتـی دەرەوە بـە راوێـژ لەگـەڵ وەزارەتـی بەرگری لە ساڵی 1995 راپۆرتێكیان لـەبارەی بـەكارهێنانی توركیـا بـۆ چـەكی

[1] U.S. DEPARTMENT OF STATE, "TURKEY HUMAN RIGHTS PRACTICES for 1994", FEBRUARY 1995. Via at: (http://www.hri.org/docs/USSD-Rights/94/Turkey94.html).

[2] -Human Rights Watch, " The human rights picture in Turkey grew worse during 1995" via at: (http://www.hrw.org/reports/1995/WR95/HELSINKI-16.htm#P655_198257).

[3] -Robert Olson, "The Kurdish Question and Turkey's Foreign Policy Towards Syria, Iran, Russia, and Iraq Since The Gulf War", in: Robert Olson (Ed), The Kurdish Nationalist Movement…, P. 102.

[4] -U.S. DEPARTMENT OF STATE, "TURKEY HUMAN RIGHTS PRACTICES for 1994", FEBRUARY 1995. Via at: (http://www.hri.org/docs/USSD-Rights/94/Turkey94.html).

ئەمریکی بۆ لەناوبردنی یاخیبوونی پارتی کرێکارانی کوردستان و پێشێلکاری دەرهەق بە مەدەنییەکان و چۆڵکردنی گوندەکانی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا ئامادەکرد[1]. راپۆرتەکە لە حوزەیرانی 1995 تەواو بوو بە کۆنگرێس درا،جگە لەوەی باسکران، راپۆرتەکە زانیاری بەبەهای تێدا هاتبوو، گرنگییە بێ هاوتاکەی لەوەوە هاتبوو کە بۆ یەکەمجارە لە مێژووی پەیوەندییەکانی هەردوو لا ئاماژەی بە **"خراپ بەکارهێنانی چەکی ئەمریکی دژ بە مەدنییەکانی لەلایەن تورکیای"** تێدا باسکراوە. ئەم لێدوانەش بە ترسناکترین و گرنگترین دادەنرێت لەوەتەی شەڕەکە لە ساڵی 1984ەوە روویداوە، کە بۆ حکوومەتی ئەمریکی تۆمارکرابێت[2].

سەرباری ئەوەی لە راپۆرتەکەدا لە روونکردنەوەی بەڵگەدار هاتووە، کە پەرەسەندنێکی کرنگی هەڵوێستی ئەمریکا لەبارەی مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا دەخاتە روو، بەڵام ئەمریکا لە پیا هەڵگوتن بە تورکیا و جەختکردنەوە لەسەر پێگەی ستراتیژی و ئەوەی کە تورکیا پێشکەشی کردووە و ئەوەی ئەمریکا دەتوانێ بە تورکیای بدات. هەروەها دانی نەنا بەوەی کە تورکیا چەکی ئەمریکی لە پرۆسەکانی چۆلکردنی گوندەکان و راگواستنی دانیشتوانەکەی بەکارهێنابی، ئەو پرۆسانەی کە بەشێوەیەکی گەورە پشتی بەو چەك و فڕۆکانە دەبەست کە زۆربەی لە ئەمریکا دروستکرابوون[3]. هەردوو وەزارەتی بەرگری و دەرەوە وەك لە لێدوانی بەرپرسانی را دیار بوو، ویستیان لە گرنگی کاریگەری راپۆرتەکە کەم بکەنەوە، سەرۆکی ئەرکانی ئەمریکی ژەنەراڵ جۆن شلیکاشفیلی، دوای چەند رۆژێکی کەم لە دەرچوونی راپۆرتەکە نامەیەکی

(1) - U.S. Department of State (Bureau of European Affairs), Report on Allegations of Human Rights Abuses by the Turkish Military and on the Situation in Cyprus, 95/06/01. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_cyprus_1995.txt).

(2)- Human Rights Watch, " The human rights picture in Turkey grew worse during 1995" via at: (http://www.hrw.org/reports/1995/WR95/HELSINKI-16.htm#P655_198257).

(3) - U.S. Department of State (Bureau of European Affairs), Report on Allegations of Human Rights Abuses by the Turkish Military and on the Situation in Cyprus, 95/06/01. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_cyprus_1995.txt).



ئاراستەی سۆنی کالاهان Sonny Callahan ی سەرۆکی لیژنەی سەرپەرشتیاری چالاکییە دەرەکییەکانی سەربە ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمریکی نارد و جەختی لەسەر **"بەها ستراتیژییەکەی تورکیا بۆ ئەمریکا کردەوە"**، ئەمەش وەك هەوڵێك بۆ بەرگرتن بە هەوڵەکانی کۆنگرێس بۆئەوەی یارمەتی سەربازی بۆ تورکیا بە تۆماری ئەو وڵاتە لە بواری مافی مرۆڤ نەبەستنەوە[1].

بەهەر حال ئەو شتە گرنگەی بەهۆی راپۆرتی حوزەیرانی 1995ەوە بەدیهات، سەرباری باری ناخۆشی ئەمنی فەرمانبەرانی بالیۆزخانەی ئەمریکی لە ئەنقەرە و قونسولخانەی ئەمریکی لە ئەدەنە سەردانێکی رۆتینیان بۆ ناوچەی باشووری رۆژهەڵات کرد، ئەو سەردانەی کە حکوومەتی تورکی لە ئایاری 1994ەوە قەدەغەی کردبوو. بەمەش وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی زانیاری وردتری لەبارەی ئەو دەنگو و دەمەتەقێیانەی کە لەبارەی چالاکییەکانی سووتاندنی گوندەکان و راگواستن و چۆلکردنی دانیشتوانە مەدەنییەکانی ناوچەکە هەبوون، چنگ کەوت.[2]

شتی گرنگی دووەم کە راپۆرتەکە کردی بە بەڵگە، ئەوە بوو کە دانی نا کە 160 ئەفسەری سوپای تورکی چەند بابەتێکیان لەبارەی مافەکانی مرۆڤەوە پێگوتراوە[3]. بەرنامەکە پرۆگرامێکی لەبارەی (**چەمکی مافەکانی مرۆڤ و**

(1) -Human Rights Watch, "The human rights picture in Turkey grew worse during 1995" via at: (http://www.hrw.org/reports/1995/WR95/HELSINKI-16.htm#P655_198257).

(2) - U.S. Department of State (Bureau of European Affairs), Report on Allegations of Human Rights Abuses by the Turkish Military and on the Situation in Cyprus, 95/06/01. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_cyprus_1995.txt).

(3) - بەرنامەکە لە کانوونی دووەمی 1995 دەستی پێکرد و بەم شێوەیە دابەشکرابوو:

1– بۆ پلەی ژەنەرال و عەمید دوو کاتژمێر.

2– تیمەکانی بەشداربوو لە چالاکییەکانی ئاسایشی ناوەخۆ چوار سەعات.

3– پۆلەکانی پیادە و زریپۆش و تۆپهاوێژ و ئەندازیارانی سەربازی و ئەفسەرانی ژەندرمە سێ سەعات.

4– قوتابخانەکانی سوپا و قوتابیانی ئەکادیمیای عەسکەری دوو سەعات.

5– ئەفسەر و رەقیب و سەربازانی ئەمنی ناوەخۆ چوار سەعات. سەیری:

U.S. Department of State (Bureau of European Affairs), Report on Allegations of Human Rights Abuses by the Turkish Military and on the Situation in Cyprus, 95/06/01. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_cyprus_1995.txt).

**گرنگییەکەی لە جیهانی ئەمرۆدا)** لە خۆگرتبوو، هەروەها دیاریترین بەرپرسیارێتییەکانی تورکیا کە لە رێککەوتننامە و تابلۆکانی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ پێشتر مۆری کردوون. سەرباری ئەو رێوشوێنانەی کە پێویستە بۆ جیاکردنەوەی مەدەنییەکان لە چەکدارەکان بگیرێنەبەر و رێوشوێنە قەزاییەکان دژ بەو سەربازانەی کە مافەکانی مرۆڤ پێشێل دەکەن[1]. بابەتێکی دیکە کە ئیدارەی ئەمریکی بۆ هاندانی تورکیا بۆ بەدیهێنانی چاکسازی دیموکراتی و باشکردنی باری مافەکانی مرۆڤ، بریتی بوو لەوەی کە تانسۆ چیللەری سەرۆك وەزیران ئەو یاسایانەی کە وا دەکەن چاکسازی دیموکراتی و مافەکانی مرۆڤ باشتر دەکەن بە ئەنجوومەنی نیشتمانی تورکی بدات، کە خۆی لە فراوانکردنی بەشداری سیاسی و هەموارکردنی یاسای لەناوبردنی تیرۆر دەبینییەوە، بەشێوەیەك کە ئازادی رادەربڕینی زیاتر و لێبووردن لە دەستگیرکراوەکان لە نووسەران و رۆژنامەنووسان و سنووردانان بۆ ئازاردان و خوێندنی بابەتی مافی مرۆڤ لە بواری پەروەردەدا دەگرتەخۆی. هەرچەندە ئەو چاکسازییانە لەسەرەتادا هەرێمی باری لەناکاوی نەدەگرتەوە، بەڵام ئامانجگەلێکی لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا هێنایە دی. سەرباری هەموو ئەمانە، ئەوەی سەرنجراکێشە لەمەدا، وەڵامدانەوەی دەستەی ئەرکانی تورکی بوو بۆ داواکارییەکانی حکوومەتی ئەمریکی سەبارەت بەو پرسیارانەی کە پەیوەندییان بەو دەنگۆیانەوە هەبوو، کە لەبارەی حاڵەتی پێشێلکارییە فراوانەکانی مافەکانی مرۆڤ لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا و باکووری عێراق لە میانەی جێبەجێکردنی چالاکییە سەربازییەکان[2]. هەرچەندە ئەو وەڵامانە رەنگدانەوەی بیروبۆچوونی عەسکەر بوو، بەڵام بە خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگ لە شێوازی مامەڵەی عەسکەر لەگەڵ فایلی پرسی کورد، دادەنرێت، بەر لە شوباتی 1995 بەتەواوی هەر دەستێوەردانێکی دەرەکییان لەو ململانێیە باوەی باشووری رۆژهەڵات رەت دەکردەوە.

---

(1) -Ibid.

(2) - U.S. Department of State (Bureau of European Affairs), Report on Allegations of Human Rights Abuses by the Turkish Military and on the Situation in Cyprus, 95/06/01. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_cyprus_1995.txt).



لەسەر بنەمای رێوشوێنە تورکییەکان و بەلێنەکانی چیللەر، کە زۆری لێ جێبەجێنەکران، حکوومەتی ئەمریکی لە راپۆرتی وەزارەتی دەرەوەی بۆ ساڵی 1995 لەبارەی پیادەکردنی مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا، ئاماژەی بۆ ئەوە کردبوو کە حاڵەتی مافی مرۆڤ لە تورکیا بە بەراورد بە ساڵی 1994 بەرەو باشی چووە، لەگەڵ مانەوەی گرفتی ترسناك لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات. راپۆرتەکە بۆ کۆنگرێس پێشنیاری کردبوو کە بە بەهای 450 ملیۆن دۆلار یارمەتی سەربازی لە ساڵی دارایی 1995 بە تورکیا بدات[1]. بە بەراورد بە ساڵانی 1994 و 1995 هەوڵەکانی ئیدارەی ئەمریکی بۆ باشترکردنی باری مافی مرۆڤ لە تورکیا پاشەکشێیەکی بەچاوی بەخۆیەوە بینی و فشارەکانیشی کەمکردەوە. **"لوتکەی ستراتیژی"** پەیوەندییەکانی ئەمریکا– تورکیا لەسەر حیسابی فایلی مافی مرۆڤ لە تورکیا بە دیارخرا و پێشکەشکرا، ئەمەش لە لێدوانەکانی بەرپرسانی ئەمریکی بە روونی دەرکەوت. لەو کاتەی کە راپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی ئەمریکی لەبارەی مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا بۆ ساڵی 1996 دانی بەوە نابوو کە حکوومەتی تورکی لە بەدیهێنانی بەلێنەکانی سەبارەت بە باشترکردنی مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسی سەرنەکەوتووە و حاڵەتی مافی مرۆڤ لە چاو ساڵی 1995 خراپتر بووە[2]، تێبینی ئەوە دەکرێت کە مارك کرۆسمانی بالیۆزی ئەمریکی لە تورکیا لە ئازاری 1996 ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەرچەندە ساڵی 1996 بە بەرەنگارییەکی گەورە لەبەردەم تورکیا دادەنرێت، بەڵام ئەمە پاڵپشتی ئەمریکی بۆ هاوبەشی ئەمنی کە پشت بە بەرژەوەندی هاوبەش دەبەستێ، بەهێزتر دەکات. لەهەمان رێرەودا سەرۆك کلینتۆن لەمیانەی کۆبوونەوەکەی بە سەرۆك دێمیرێل لە ئازاری 1996، گفتوگۆی بابەتی

---

(1) -U.S. Department of State, "Turkey Human Rights Practices for 1995", March 1996. Via at: (http://www.hri.org/docs/USSD-Rights/95/Turkey95.html

(2) -Tamar Gabelncik and others, "Arming Repression: U.S. Arms to Turkey During the Clinton…", Human Rights Watch, " The human rights picture in Turkey grew worse during 1995" via at: (http://www.hrw.org/reports/1995/WR95/HELSINKI-16.htm#P655_198257).

مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسییان نەکرد و هیچ زانیارییەك کە لە بەیاننامە فەرمییەکانەوە لەبارەی کۆبوونەوە دەرچوون، هیچیان لەم باتەوە نەدرکاند[1].

ئەم هەڵوێستەی ئیدارەی ئەمریکی بۆ چەند فاکتەرێك دەگەڕێتەوە، یەکەمیان، ئەو نیگەرانییە زۆرەی ئەمریکا لەبارەی ئارامی لە تورکیا، دوای ئەوەی هەوڵەکانی پێکهێنانی حکوومەتی دوای هەڵبژاردنەکانی 1995 سەرنەکەوتن[2]. فاکتەری دووەم، پەیوەندی بە هاتنی پارتی رەفاهی ئیسلامییەوە هەبوو، بۆ دەسەڵات، ئەمەش نیگەرانییەکی رانەگەیەنراوی لای ئەمریکا دروستکرد. هۆکاری سێیەم، پەیوەندی بەو شڵەژانەی کە لە پەیوەندییەکانی تورکیا– یۆنانەوە هاتەدی هەبوو، کە ئەگەری هەڵگیرسانی کێشمەکێشی چەکداری لێدەکەوتەوە. هەرچی هۆکاری چوارەم بوو، ئەوا بە شەڕەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان و پەرەسەندنەکانی شەڕی ناوەخۆی نێوان هەردوو پارتەکەی باکووری عێراق پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە هەبوو، هەروەها ئەوەی لەبارەی چارەنووسی پرۆسەی دالّدەی ئارام هێنایە کایەوە، دوای ئەوەی هێزەکانی عێراقی لە 31ی ئابی 1996 هاتنە ناو هەولێرەوە. راندل هۆکارێکی دیکەش بۆ پاشەکشێکانی

---

(1) -Human Rights Watch, " The human rights picture in Turkey grew worse during 1996" via at: (http://www.hrw.org/reports/1996/WR96/Helsinki-19.htm#P960_193943).

(2) – دەرەنجامی هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمی 1995 تورکی، بردنەوەی پارتی رەفاهی ئیسلامی بە رێژەی 21٪ی دەنگەکان و 158 کورسی پەرلەمانی لێکەوتەوە، ئەمەش مانای وابوو ماڤ خۆی بوو بەتەنیا حکوومەت پێکبهێنێ، بەڵام سلێمان دێمیرێل بە پاڵپشتی دامەزراوەی سەربازی رازی نەبوو پێکهێنانی حکوومەت بە نەجمەدین ئەربەکانی سەرۆکی پارتی رەفاە بسپێرێ، بۆیە داوای لە مەسعود یەلمازی سەرۆکی پارتی نیشتمانی دایك کرد حکوومەت پێکبهێنێ. بەڵام ئەو هاوپەیمانێتییەی کە یەلماز لەگەڵ تانسۆ چیللەری سەرۆکی پارتی رێگای راست پێکی هێنا، بۆ چەند مانگێك نەبێت درێژەی نەکێشا، بۆیە دێمیرێل بەناچاری داوای پێکهێنانی حکوومەتی لە دێمیرێل کرد، ئەو حکوومەتە لە 28ی حوزەیرانی 1996 تا 30ی حوزەیران درێژەی کێشا، بەهۆی فشاری عەسکەر و پێشوازی نەکردنی لەلایەن ئەمریکاوەوە دەستی لەکارکێشایەوە. جلال عبد الله معوض، صناعة القرار ....، ص 310.



ئەمریکا زیاد دەکات، کە هۆکارەکەی ناوەخۆییە و پەیوەندی بە ئیدارەی کلینتۆنەوە هەیە، کە لە ساڵی 1995ەوە زۆر پشتی بە تورکان دەبەست، لەسەروبەندی مۆرکردنی رێککەوتننامەی دایتۆن بۆ ئاشتی لە مانگی تشرینی دووەمی 1995، کە بەهۆیەوە بە روونی سنوورێك بۆ جەنگی ئەتنی لە بۆسنە دانرا، واشنتۆن داوای یارمەتی تورکی کرد بۆ چارەسەرکردنی پرسێکی گەورە، کە خەریك بوو هەلی بردنەوەی کلینتۆن بۆ دووەم جار لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی 1996 لەدەست بدات. ئیدارەی کلینتۆن دەبوو هێزەکانی ساڵێکی دیکە زیاتر لە بۆسنە بهێڵێتەوە یان سەرپەرشتی پرۆسەی مەشقپێکردنی سوپای لاوازی موسولمانی بۆسنی بکات "ئەمەش پێویستی بەکاتی زیاترە تاکو ئەو سوپایە بتوانێ رووبەڕووی سرب و کروات ببێتەوە"، ئەم کارە پێویستی بە نەبەردییەکی سیاسی گەورە هەبوو، هەرچەندە ئەم بابەتە، لە پێشەوەی بابەتە سیاسییەکانی ئیدارەی ئەمریکی بوو. ئیدارەی کلینتۆن تورکیای بەو هەڵبژاردنە بینی کە هەردوو رێگاچارەکەی سەرەوەی لەکۆڵ دەکاتەوە، ئەوەیش دۆزینەوەی وڵاتێکی موسولمانی میانڕەو و لایەنگری رۆژئاوا و ئەندامی ناتۆ بێت و ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگریت. هەموو ئەو خەسلەتانە لە تورکیا دا هەبوون، تورکیا پەسندکردنی ئەو ئەرکەی بە هەلێك زانی بۆئەوەی لە داهاتوو داوا لە هاوپەیمانە ئەمریکی و ئەورووپییەکانی بکات، چاکەی بدەنەوە، لەبارەی پرسی کورد لە تورکیا فشاری بۆ نەهێنن. ئەمەش یەکەمجار بوو کە تورکیا بووە بەشێك لە ململانێ توندەکانی ناو ئیدارەی ئەمریکی[1].

سەرباری ئەمانە ئیدارەی کلینتۆن نەیدەتوانی ئەو پێشێلکارییە ترسناکانەی مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا فەرامۆش بکات. والتر سکولومب S. Walter وەزیری بەرگری ئەمریکی دانی بەو راستییە نا کاتێ لە شوباتی 1996 گوتی: **"گوومانی تێدا نییە کە تۆماری تورکیا لەبارەی ماف مرۆڤ زۆر خراپە. بۆ ئێمە دارشتنی سیاسەتەکانمان لەسەر بنەمای تۆماری تورکیا لەبارەی مافەکانی مرۆڤ تەنها کارێك دەبێت کە زۆر کورت بینی تێدایە"**[2].

---

(1) - جوناثان راندل، المصدر السابق، ص ص 359 ـ 360

(2) -San Francisco Chronicle, 11 February, 1996.

ئەو پەرەسەندنە ترسناكانە بەرژەوەندییە ئەمنییەكانی ئەمریكای لە زۆر لایەنەوە خستە ژێر هەرەشەوە، هەتاكو راپۆرتی سی ئای ئەی–CIA بۆ ساڵی 1997 كە لەژێر ناوی (State Failure Task Force) بوو، ئاماژەی بۆ ئەوە كردبوو كە **"ئومەتی توركی لەبەرامبەر هەڕەشەی دارووخانە"** و ئەو رۆڵە بەهێزەی سوپا لەو وڵاتە هەیەتی كار لە ئارامی سیاسی ناوەخۆی توركیا دەكات، تا جەنگ لەگەڵ پارتی كرێكاران بەردەوام بێت، بوونی ئەو هێزە پاساو هێنە، ئەو جەنگە گەندەڵی حكومی هێناوەتە ئاراوە، كە هەموو سیاسییەكانی توركیای تێوەگلاوە[1].

دووبارە لە ساڵەكانی 1997–1998 فایلی ماف مرۆڤ لە توركیا هاتە پێشەوەی كارەكانی حكومەتی ئەمریكی، بەوەرگرتنی مارك كرۆسمان بۆ پۆستی یاریدەدەری وەزیری دەرەوە بۆ كاروباری كەنەدی و ئەورووپی، رایگەیاند كە **"سیاسەتی ئەمریكا لەبارەی توركیا سێ رەهەندی وەرگرتووە: رازاندنەوەی دیموكراسی، بەهێزكردنی پەیوەندی ئاسایش لەسەر بنەمایەكی دروست و فراوانكردنی بازرگانی"**. لەسەروبەندی ئەوەدا، گەورە بەرپرسانی ئیدارەی كلینتۆن رەخنەیان لە توركیا بەهۆی بەدی نەهێنانی بەڵێنەكانی لەبارەی رێزگرتنی مافەكانی مرۆڤ دەگرت، لە شوباتی 1997 مادلین ئۆلبرایتی وەزیری دەرەوەی ئەمریكا رەخنەی لە توركیا گرت و رایگەیاند كە **"پێشێلكاری بەردەوام لەوێ بۆ مافەكانی مرۆڤ هەیە، ئێمە بەدڵنیاییەوە باوەڕی پێناكەین"**[2].

بە هاتنی سەرەتای تەمووزی 1997، وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكا راپۆرتێكی تەواوكاری راپۆرتی حوزەیرانی 1995ی لەبارەی بەكارهێنانی چەكی ئەمریكی بۆ ئەنجامدانی پێشێلكاری لەمافەكانی مرۆڤ پێشكەش كرد. راپۆرتە نوێیەكە ئاماژەی بەخالی پۆزەتیڤ كردبوو، ئەو خاڵانە لەوەتەی چیللەر

(1) -Tamer Gabelncick, Op. Cit., P.2.

(2) -Human Rights Watch, " The human rights picture in Turkey grew worse during 1997" via at: (http://www.hrw.org/reports/1997/WR97/HELSINKI-17.htm#P674_209013



بەڵێنی دابوو یاسا تابلۆكانی ژمارەیەك ماددەی دەستوور هەموار بكات، بەدیهاتبوون، هەروەها راپۆرتەكە ئاماژەی بۆ كەمبوونەوەی رێژەكانی چۆڵكردنی بەزۆری دانیشتوانی گوندەكان كردبوو، لەپاڵ گەڕانەوەی نزیكەی 19879 كەس لەوەتەی سەرەتای ساڵی 1996 بۆ گوندەكانیان، ئەو ژمارەیەش تەنها رێژەی 7٪ی كۆی راگوێزراوانی گوندەكانە كە سەرجەمیان ژمارەیان 560 هەزار كەس دەبن[1].

هەروەها راپۆرتەكە ئاماژەی بۆ ئەوەش كردبوو كە حكومەت دەستی كردووە بە قەرەبووكردنەوەی گوندییە زیان لێكەوتووەكان و بودجەیەكی بە 100 ملیۆن دۆلار بۆ دووبارە نیشتەجێكردنەوەیان تەرخانكردووە. لە دیارترین ئەو شتانەی كە راپۆرتەكە چاودێری كردووە، ئەو باش بوونەیە كە بەسەر حاڵەتی مافەكانی مرۆڤ داهاتووە، لەلایەنی ئەوەی كە سوپا هەندێ سیاسەتی نوێی گرتۆتەبەر و هەندێ بەرنامەی مەشق كە یارمەتییان دەدات بۆ باشتر جێبەجێكردنی مافەكانی مرۆڤ، دارشت. بۆ نموونە دەستەی ئەركانی توركی (رێبەری پرەنسیپەكانی رەفتار)ی بەسەر سەرجەم تاكەكانی سوپا و ئەفسەران و سەرجەم پلەدارانی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات دابەشكرد. رێبەرەكە چۆنیەتی رێزگرتن لە خەلك و رەچاوكردنی دابونەریتە ناوەخۆكانیان لەخۆگرتبوو، لەپاڵ ئەمە دووبارە پرۆگرامی ئەكادیمیای خزمەتی سەربازی و قوتابخانە سەربازییەكان و قوتابخانەی ژەندرمە رێكخرانەوە و بابەتی مافەكانی مرۆڤی بۆ زیادكرا[2].

سەرباری ئەو هەنگاوانەی كە حكومەتی توركی و سوپا لە بواری باشكردنی مافەكانی مرۆڤ هاویشتیان و هەوڵەكانی ئیدارەی ئەمریكی، دیاریترینیان گرنگیدانی زیاد لە پێویست بە مافەكانی مرۆڤ، راپۆرتی ناوبراو ئاماژەی بە بوونی حاڵەتی بەڵگەداری پێشێلكردنی مافەكانی مرۆڤ كردووە، كە

(1) -Department of State, U.S Military Equipment and Human Rights Violations, report submitted to the Chairman of the Senate Foreign Relations Committee on 1 July 1997, pursuant to Senate Committee Report 104-295, accompanying H.R. 3540. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_dos_USweapons.htm).

(2) -Ibid.

لەمیانەی پرۆسەکانی سوپای تورکی لە دژی پارتی کرێکاران ئەنجامدراون، فرۆکە دروستکراوەکانی ئەمریکا بەشدارییان لە پرۆسەکانی چۆلکردنی گوندەکانکردووە. هەروەها ئاماژەی بە بەکارهێنانی چەکی هەمەجۆری ئەمریکی لە گەمارۆدانی گوندەکان کردووە، هەر وەك ئەوەی کە لە گوندی تەپە Tepeی سەربە دیاربەکر لە نیسانی 1997 روویدا، کاتێ لەلایەن هێزە ئەمنییەکانی تورك بۆ ماوەی دوو مانگ گەمارۆدرا، وەك تۆڵەیەك بۆ کوشتنی یەکێك لە پاسەوانانی سنوور لەم گوندە[1]. بەکارهێنانی فرۆکە و هەلیکۆپتەری دروستکراوی ئەمریکی بە شێوەیەکی بەرفراوان لە پرۆسەی سنوور بەزینی عێراق لە میانەی پرۆسەکانی پۆلا 1995 و پرۆسەکانی ئایاری 1997، تورکیا یاسای یارمەتییە دەرەکییەکانی ژمارە 5128 و یاسای 34 کە کلینتۆن لە شوباتی 1995 دەریکرد، پێشێلکرد[2]. سەرباری پێشێلکردنی سنووری نێودەوڵەتی و هەرەشەکردنی ئەمنی هەریمایەتی کە بەهۆی سنووربەزاندنی تورکییەوە پەیدابووە، پرۆسەی یەکەم (پۆلا 1995) زیانی مرۆیی و ماددی گەورەی بە دانیشتوانە مەدەنییەکانی نێوان ناوچەی)پەناگەی ئارام(ی کوردان گەیاند[3]. هەروەها لە نێوان ئەو شتە گرنگانەی کە راپۆرتەکە ئاماژەی پێدابوو، ئەوەبوو کە وەزارەتی ناوەخۆی ئەمریکی تورکیای راستەخۆ بە **"بەکارهێنانی چەکی ئەمریکی لە شەڕی پارتی کرێکارنی کوردستان تۆمەتبارکردبوو، شانبەشانی ئەو شەڕەی کە بە سیاسەتێکی بەرنامە بۆ دارێژراوی حکوومەتی تورکی لە چۆلکردنی بەزۆرە ملێی گوندە کوردییەکان"**،

(1) -Department of State, U.S Military Equipment and Human Rights Violations, report submitted to the Chairman of the Senate Foreign Relations Committee on 1 July 1997, pursuant to Senate Committee Report 104-295, accompanying H.R. 3540. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_dos_USweapons.htm).

(2) -Tamar Gabelncik, OP.Cit., P. 2.

(3) -Department of State, U.S Military Equipment and Human Rights Violations, report submitted to the Chairman of the Senate Foreign Relations Committee on 1 July 1997, pursuant to Senate Committee Report 104-295, accompanying H.R. 3540. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_dos_USweapons.htm).



بەڵام راپۆرتەکە جەختیشی لە گرنگی ستراتیژی تورکیا بۆ ئەمریکا کردەوە[1]. راپۆرتەکە ئەوەشی لە بیر نەچوو، باسی شکستەکانی حکوومەتی تورکی لەبارەی رێوشوێنەکانی دەستەی ئەرکانی تورکی کە **"هیچ یەکێك لەو پیادەکردنانە و پێوەرانەی کە لەمیانەی پرۆگرام و مەشقەکانی سوپای تورکی بریاری لێدرا، جێبەجێنەکرد و هەرگیز کردە و چالاکی و نیاز و پرەنسیپەکان بە کار و جێبەجێکردنەوە گرێنەدراون"**. هەروەها راپۆرتەکە لەبارەی بەردەوامبوونی تورکیا لە سەیرکردنی بۆ پارتی کرێکاران بە **"چاوێلکەی سەرباز و پشتگوێخستنی لایەنە ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی گرفتی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات، رەخنەی لە تورکیا گرت، کە ئەو لایەنانە بۆ کۆتایی پێهێنانی ململانێکە پێویستن"**. راپۆرتەکە کۆتایی هات بە ئاماژەکردن بۆئەوەی کە **"رێزگرتن لە دیموکراتی و مافەکانی مرۆڤ وەکو رەگەزێکی تەواوکەر لە پێکهێنانی پەیوەندییەکانی تورکیا– ئەمریکا بەردەوام دەبن و پرسی کۆتاییهێنان بە پێشێلکارییەکانی مافەکانی مرۆڤ، جا بە هەنگاوی تاکلایەنانە بێت یا هاوبەش، ئەو بابەتە مۆڵگەی گرنگی گفتوگۆ بەردەوامەکانی حکوومەتی ئەمریکی دەبێت لەگەڵ تورکیا"**[2].

راپۆرتیساڵانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لەبارەی پیادەکردنەکانی مافی مرۆڤ بۆ ساڵی 1997، فشاری ئەمریکی لەسەر تورکیا دوو هیند کردەوە، سەرباری ئەوەی کە راپۆرتەکە ئاماژەی بە باشتربوونێکی سوکی مافەکانی مرۆڤ دابوو، ئەویشی دوای ئەوەی پەرلەمانی تورکی لە تشرینی یەکەمی 1997 دەنگی بۆ هەڵگرتنی باری لەناکاوی بۆ سێ پارێزگا لە کۆی نۆ پارێزگا دا، ئەو

(1) -Human Rights Watch, " The human rights picture in Turkey grew worse during 1997" via at: (http://www.hrw.org/reports/1997/WR97/HELSINKI-17.htm#P674_209013). ;U.S. Department of State (Bureau of European Affairs), Report on Allegations of Human Rights Abuses by the Turkish Military and on the Situation in Cyprus, 95/06/01. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_cyprus_1995.txt).

(2) -Department of State, U.S Military Equipment and Human Rights Violations, report submitted to the Chairman of the Senate Foreign Relations Committee on 1 July 1997, pursuant to Senate Committee Report 104-295, accompanying H.R. 3540. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_dos_USweapons.htm).

سێ پارێزگایانەش بریتی بوون لە بەنگۆل Bingol و باتمان و بەتلیس، بەڵام ئەوەشی تێدا هاتبوو کە تورکیا لە مەحرومکردنی هاووڵاتیانی کورد لە پیادەکردنی مافە سەرەکییەکانیان لە قسەکردن بە زمانی دایك و پەرەپێدان بە کلتوور و بەشداری سیاسییان بەردەوامە. هەروەها راپۆرتەکە باسی لە بەردەوامی حاڵەتی ئازاردانی ناو بەندیخانەکان و مردنی هەندێ بەندکراو لەژێر ئازار دابوو، کە 10 بەندکراوی بەندێخانەی دیاربەکر گیانیان لە دەستدا. هەرچی سەبارەت بە ئازادی رادەربرین بوو، ئەوا راپۆرتەکە زیاتر روون و وردەیەکی زیاتری لە پیادەکردنەکانی دەسەڵاتدارانی تورکی لە بەرتەسککردنەوەی ئازادییە گشتییەکان و مافە کەسییەکانی وەك دادگاییکردنی رۆژنامەنووسان و داخستنی بنکە رۆشنبیرییە کوردییەکان و سەرکوتکردنی خۆپیشاندانەکان، تێدا بوو. راپۆرتەکە پرسی دادگاییکردنی 32 ئەندامی پارتی دیموکراتی گەلی کوردستانی باسکردبوو، هەرچەندە چالاکییە سیاسییەکانیان یاساییش بوو، موراد بۆزلاق Murat Buzlakی سەرۆکی پارتەکە و 31 هاورێی حوکمدران و بریاری توندیان دەرهەق دەرچوو. هەروەها راپۆرتەکە ئەوەشی خستەسەر کە ئەندامانی پارتە نابراوەکە، زیاتر تووشی رووداوی کوشتنی بەکەر نادیار بوون. راپۆرتەکە باسی ئەوەشی کردبوو کە پلانی دووبارە نیشتەجێکردنەوەی گوندییەکان ئامانجی نەپێکاوە و پراکتیکیش نەبووە، بەگوێرەی پەرلەمانی تورکی لە کۆی 560 هەزار راگوێزراو تەنها 7608 کەس نیشتەجێکراون(1).

هەروەها راپۆرتەکە سەرەتای گۆڕانی لە سیاسەتی ئیدارەی ئەمریکی بەرامبەر تورکیا تۆمارکرد، لەبارەی ئەوەی کە ئەمریکا لە قۆناغی پێشکەشکردنی ئامۆژگاری و ئاراستەکردنی لێدوان بۆ قۆناغی کردەوە گۆڕاوە. یەکەم هەنگاوەکانی ئەو گۆڕانەش لە تۆمارکردنی راپۆرتەکە وردی و

(1) U.S. Department of State, "Turkey Country Report on Human Rights Practices for 1997", Released by the Bureau of Democracy, Human Rights, and Labor, January 30, 1998. Via at: (http://www.state.gov/www/global/human_rights/1997_hrp_report/turkey.html).



پرۆفیشناڵی لە چاو راپۆرتی 1997 و ئەوانی پێشووتر بەدی دەکرێت، بە شێوەیەك رێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ لەسەر راستگۆیی و پیشەیی، ستایشی راپۆرتەکەی کردووە بە **"راستگۆ و گشتگیر"** وەسفیکردووە(1). ئەمەش دەستکەوتی چاودێرییەکی بەردەوامی فەرمانبەرانی ئەمریکی بوو، ئەوانەی لە بالیۆزخانەی ئەمریکی لە ئەنقەرە کاریان دەکرد.

کاردانەوەی تورکی لەسەر سیاسەتی نوێی ئەمریکی، لەو سەردانەی کە ئیسماعیل حەقی قەرەدای سەرۆك ئەرکانی تورکی لە 24 تا 28ی شوباتی 1997 بۆ ئیسرائیل ئەنجامی دا، دەنگی دایەوە، قەرەدای بەر لە جێهێشتنی ئەنقەرە کە ژمارەیەك لە رۆژنامەنووسی تورکی یاوەری بوون، رایگەیاند کە لە نێو ئەو کێشانەی کە گفتوگۆ دەکرێت، بەهێزکردنی رێککەوتنە سەربازییە لەکارکەوتووەکان و بەدەستخستنی سیستەمی ئەلیکترۆنی سەربازی پێشکەوتوو و رادارە. دوای گەیشتنی بە ئیسرائیل و چاوپێکەوتنی بە گەورە بەرپرسانی عەسکەری ئەو وڵاتە، رایگەیاند کە رێککەوتن لەسەر زیاتر ئالوگۆڕکردنی زانیاری بەدەستخستنی یارمەتی ئیسرائیل بۆ تەواوکردنی بۆندی کڕینی فڕۆکەی سی هۆك Sea Hawk لە ئەمریکا و کڕینی رۆکێتی پۆپ ئای– Pop eye دروستکراوی ئەمریکی لە ئیسرائیل، دوای ئەوەی ئەمریکا رەزامەندی پیشاندا بۆ ئەوەی ئیسرائیل بە وڵاتی سێیەمی بفرۆشیت. ئەوەی گرنگە لە سەردانەکە، ئەو لێدوانە بوو کە بالیۆزی تورکیا لە ئیسرائیل کە یاوەری قەرەدای بوو، کاتی گوتی: **"تورکیا دەیەوێت چەك و سیستەمی سەربازی زیاتر لە ئیسرائیل بکڕێت، چونکە ئەمریکا هاوبەشێکە ناتوانرێت پشتی پێ ببەسترێت"**(2).

ساڵی 1997 چەندین سەردانی بۆ بەرپرسانی ئەمریکی بۆ ناوچە کوردییەکان تورکیا تۆمارکرد، ئەو شوێنەی دەنگۆی پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤی هەیە. چاوپێکەوتنی دوور و درێژیان لەگەڵ خەڵکی ئاسایی ئەوێ

(1) Human Rights Watch, "The human rights picture in Turkey grew worse during 1997" via at: (http://www.hrw.org/reports/1997/WR97/HELSINKI-17.htm#P674_209013).

(2) -Robert Olson, Turkey's Relations with Iran, Syria, Israel, …, P. 131.

کرد. چاویشیان بە سەرکردە لۆکالییەکانی ژەندرمە و سەرۆکی شارەوانییەکان و چالاکەکانی بواری مافی مرۆڤ سەرکردە سیاسییەکان و کەسایەتی کۆمەڵایەتی کەوت[1].

شاتۆك ئەو گۆڕانەی کە بەسەر سیاسەتی ئەمریکی بەرامبەر تورکیا دا هات، لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانی لە 30ی تەموزی 1997، دەربڕی. کاتێ پرسیاری لێکرا، ئاخۆ حکومەتی ئەمریکی نیازمەندە رێوشوێنی تەمبێکردن دژ بە تورکیا بەهۆی ئەو راپۆرتانەوە، وەربگریت، گوتی: **"سیاسەتێکمان هەیە، هاوردەکردنی چەك کۆنترۆل دەکات، ئەو سیاسەتەش بە حاڵەتی مافی مرۆڤ، کاریگەر دەبێت، بەڵام لەهەمان کاتدا، مامەڵەکردنمان لەگەڵ تورکیا وەك هاوپەیمانێك لە ناتۆ بەردەوام دەبێت".** لە میانەی هەمان چاوپێکەوتن بەرگریشی لە راستگۆیی و پرۆفیشناڵی راپۆرتە ساڵانەییەکەی وڵاتەکەی لەبارەی مافی مرۆڤ لە جیهان و تورکیا بە تایبەتی کرد[2].

لێدوانەکەی شاتۆك دەربڕی گۆڕانێکی روون لەبارەی گوتاری وڵاتەکەی بەرامبەر تورکیا بوو، ئەگەرچی بە ئاشکراش ئەمەی رانەگەیاند. پەرەسەندنەکانی دوایی رەنگدانەوەی لەسەر ئاستی بەخشینی قەرز و یارمەتییە ئابوورییە ئەمریکییەکان بۆ تورکیا هەبوو. لە ساڵی دارایی 1997 ئەمریکا بری 22 ملیۆن دۆلاری وەك یارمەتی ئابووری و 175 ملیۆنیش وەك

(1) - بۆ نموونە لە 26 و 27ی ئازار بەرپرسەکانی بالیۆزخانەی ئەمریکی لە دیاربەکر بە جیا لەگەڵ سەرکردەکانی ژەندرمە و حاکمی هەرێمی لەناکاو کۆبوونەوە و سەردانی ناوچەی شەڕەکانیان بە قەرەتەپەوە کرد. لە نیسان لەگەڵ سەکردەی ژەندرمە لە وان کۆبوونەوە و پیاسەیەکیان بە ناوچەی چالاکییەکانیان کرد. لە 5 تا 9ی ئایار بۆ ئەنتاکیا و غازی عەنتاب و ئورفە و ئەسکەندەرۆنە چوون و لەوێ چاویان بە بەرپەرسان و سیاسەتمەداران و سەربازان و خەلکی ئاسایی کەوت. سەیری:

Department of State, U.S Military Equipment and Human Rights Violations, report submitted to the Chairman of the Senate Foreign Relations Committee on 1 July 1997, pursuant to Senate Committee Report 104-295, accompanying H.R. 3540. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_dos_USweapons.htm).

(2) -State of Human Rights, 30 January, 1997, via at: (www.pbs.org/newshour/bb/international/january97/human-rights-1-30.html).



قەرزی سەربازی بۆ تورکیا تەرخان کرد، بەڵام تورکیا یارمەتییە داراییەکانی ئەمریکای بەهۆی رەخنە توندەکانی رەتکردەوە، کە نێوەندە ئەمریکییە جۆراوجۆرەکان لەبەر مامەڵەی توندی لەگەڵ کورد ئاراستەی تورکیایان کردبوو. هەروەها بەهۆی ئەو هەموارکردنە بەردەوامەی کە کۆنگرێس بەسەر یاسای یارمەتییە دەرەکییەکان دا دەیهێنا و سووربوونی لەسەر ئەوەی کە ئەو یارمەتییانە بە باشکردنی فایلی مافی مرۆڤ لە تورکیاوە گرێدا[1]. دیپلۆماسییەتی نوێی ئیدارەی کلینتۆن لە کۆبوونەوەکەی کلینتۆن یەڵماز لە کانوونی یەکەمی 1997 رەنگیدایەوە، کاتێ سەرۆك وەزیرانی تورکی مەسعود یەڵماز لە واشنتۆنەوە رایگەیاند کە پرسی مافەکانی مرۆڤ لە پێشەوەی کارەکانی حکومەتەکەی دەبێت، سووربوونی خۆی بۆ باشکردنی تۆماری تورکیا لەم بوارە دەربڕی[2].

کۆشکی سپی لیستێکی حەوت خاڵی لەگەڵ سەرۆك وەزیرانی تورکی گفتوگۆکرد، کە ئەمریکا بەهۆیەوە پێشکەوتنی تورکیا لە بواری مافەکانی مرۆڤی لە خۆ گرتبوو، ئەمانەش ئەو خاڵانەن:

1– ئازادی رادەربرین نەکرێتە تاوان.

2– ئازادکردنی ئەو رۆژنامەنووس و پەرلەمانتارانەی بەهۆی سیاسییەوە دەستگیرکراون.

3– کۆتاییهێنان بە ئازاردان و هەڵگرتنی حەسانە لەسەر ئەو پۆلیسانەی ئازاردەرن.

4– کۆتاییهێنان بە راوەدوونانی بەرگریکارانی مافی مرۆڤ و رێگەدان بە کردنەوەی رێکخراوە نا حکوومییە داخراوەکان.

5– رێوشوێنەکانی راوەدوونان و قەدەغەکردنی پارتە سیاسییەکان بوەستینرێت.

(1) -Human Rights Watch, "The human rights picture in Turkey grew worse during 1997" via at: (http://www.hrw.org/reports/1997/WR97/HELSINKI-17.htm#P674_209013).

(2) -U.S. Official Speaks on Turkey and the Kurdish Question, United States In Formation Service, 6 July, 1998. Via at: (www.mtholyoke.edu/ocad/intrel/kurdtur.htm).

6– هەڵگرتنی باری لەناكاوی باشووری رۆژهەڵاتی توركیا.

7– دووبارە نیشتەجێكردنەوەی ئەوانەی بە زۆرەملی بەهۆی شەڕی باشووری وڵاتەوە، گوندەكانیان چۆلكردووە[1].

ئەوەی ئەمریكا پێی دەڵێت **"دیپلۆماسییەتی گشتی یا دیپلۆماسییەتی هێمن"**، كە لەسەر بنەمای هاندانی توركەكان بۆ باشكردنی لێهاتووییان لە بواری مافەكانی مرۆڤ، نەوەك سزادانیان، وەستاوە[2]. كردنەوەی وەزارەتی ماف مرۆڤ لە توركیا لە ساڵی 1997، وەك ریوشوێنیكی ئامانجدار بۆ باشكردنی وێنەی توركیا هات. هەرچەندە، بەگوێرەی قسەی توێژەران، وەزارەتەكە **"هیچ هێز و دەسەلاتێكی نەبوو"**، هەندێ تورك بە فێلێك لەقەلەمیان دا و هەندێكی دیكەش دروستكردنی وەزارەتەكەیان بە دەستێوەردانی ئەمریكی لە كاروباری ناوەخۆی توركیا دانا[3].

بەهەر حاڵ ساڵی 1998 بە ساڵی هەنگاوی گەورەی كرداری دادەنرێت، ئەگەرچیش بۆ سیاسەتی ئەمریكا بەرامبەر توركیا شەرمنە. راپۆرتەكانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكا لەبارەی پیادەكردنی مافەكانی مرۆڤ لە جیهان بۆ ساڵی 1998 بەردەوام بوو لە رەخنە گرتن لە توركیا و پێشێلكارییەكی فراوانی مافەكانی مرۆڤی بە شێوەیەكی گشتی، بەتایبەتیش پێشێلكاری هاوولاتییە كوردەكانی چاودێری كردبوو. لەسەرەتای راپۆرتەكە هاتبوو كە سەرباری ئەوەی كە یەلماز لەبەردەم كلینتۆن لە كانوونی یەكەمی 1997 بەڵێنی دا كە **"پرسی مافەكانی مرۆڤ لە پێشەوەی كارەكانی حكومەتەكەی دەبێت لە ساڵی 1998"**، بەڵام پێشێلكارییەكانی فراوانی مافەكانی مرۆڤ بەردەوام بووە[4]. چونكە باری لەناكاو لەشەش ویلایەت درێژكرایەوە و كوشتنی بكەر نادیار بەردەوام بوو،

(1) -Henri J .Barkey, "The Endless Pursuit…", P. 222.

(2) -Henri J. Barkey, "The Endless Pursuit…", P. 222; Carol Migdalovitz, "Turkey: U.S. Sale of Helicopters", P. 70.

(3) - جوناثان راندل، المصدر السابق، ص 356.

(4) -U.S. Department of State, "Turkey Country Report on Human Rights Practices for 1998", Released by the Bureau of Democracy, Human Rights, and Labor, February 26, 1998. Via at: (http://www.hri.org/docs/USSD-Rights/1998/Turkey.html); Tamar Gablnick, Op. Cit., P.2.



هەروەها ئازاردانیش بەشێوەیەكی بەرفراوان بڵاوببووەوە، ژمارەیەكی زۆر لە حاڵەتی ئازاردانی دەستگیركراوان، لەمیانەی لێپرسینەوەیاندا لەسەر دەستی ژەندرمە و پۆلیسی لۆكاڵی تۆماركراون. بەهۆی بەردەوام كاركردن بە یاسای نەهێشتنی تیرۆری ساڵی 1991ەوە، كە راشەی نادیار هەلدەگرێت، زیاتر لە 25 رۆژنامەنووس كە زۆربەیان رومالی جەنگی باشووریان دەكرد، دادگایی كراون. سەرباری هێرشكردن و راوەدوونانی خانەی بڵاوكراوە و رۆژنامەی ناوچەكە و داخستنی زۆربەیان. هەروەها راپۆرتەكە ئاماژەی بە بەردەوامی قەدەغەكردنی دەربڕینی ناسنامەی كوردی و ئەوانەی ئەم كارەدەكەن رووبەرووی رێوشوێنی یاسایی دەبنەوە. هەروەها راپۆرتەكە چاودێری هەڵمەتەكانی رەشبگیری كردووە، كە دەزگا ئەمنییەكان لەسەروبەندی دەستگیركردنی ئۆجەلان لە تشرینی دووەمی 1998 لە ئیتالیا و بانگەوازەكەی بۆ گفتوگۆ، دژ بە نزیكەی 1500 تا 3000 ئەندامی پارتی دیموكراتی گەل ئەنجامیانداوە. راپۆرتەكە باسی لەوە كردووە كە ئەوانە بەبێ دادگاییكردن دەستبەسەركراون و ئازاردراون، هەتاكو یەكێك لەوانە كەتەمەنی 18 ساڵ بووە، لەمیانەی لێپرسینەوە لەژێر ئازاردا گیانی سپاردووە. هەروەها راپۆرتەكە زانیاری لەبارەی رووداوی سوسورلەك باسكردووە و ئاماژەی بە تێوەگلانی دەزگا ئەمنی و حكومییەكان لە گەندەڵی و خراپ بەكارهێنانی دەسەڵات و بازرگانی كردن بە ماددە هۆشبەرەكان، كردووە[1].

ئیدارەی كلینتۆن، بەهۆی بەردەوامی حاڵەتی فراوانی پێشێلكاری مافەكان لە توركیا، بەڵێنی دا بۆندێكی فرۆكەی هێرشبەری ئەمریكی بۆ توركیا رابگرێت، كە بە 3.5 ملیار دۆلار مەزەندە دەكرا، تا ئەو كاتەی توركیا بە گوێرەی حەوت بەڵێنەكە، كە پێشتر لەمیانەی سەردانەكەی بۆ ئەمریكا لە 1997 بە ئیدارەی ئەمریكی دابوو، كار نەكات[2].

(1) -U.S. Department of State, "Turkey Country Report on Human Rights Practices for 1998", Released by the Bureau of Democracy, Human Rights, and Labor, February 26, 1998. Via at: (http://www.hri.org/docs/USSD-Rights/1998/Turkey.html).

(2) -Human Rights Watch, "The human rights picture in Turkey grew worse during 1998" via at: (http://www.hrw.org/worldreport/Helsinki-23.htm#P1117_264948).

یاسای دەسەڵاتی چالاکییە دەرەکییەکان (P.L. 105 – 118)، بڕگەی 570 بە شێوەیەك هەموارکرا، کە یارمەتییە داراییەکان لە هەر یەکەیەك لە یەکەکانی هێزی ئەمنی بیانی دەبڕدرێت، **"ئەگەر وەزارەتی دەرەوە بەڵگەی باوەڕپێکراوی لابوو، کە ئەو یەکەیە پێشێلکاری فراوانی لە مافەکانی مرۆڤ کردووە"**[1].

لە ئەیلولی 1998 وەزارەتی دەرەوە بریارێکی گرنگی دەرکرد، رێکخراوی چاودێری ماف مرۆڤ بە **"بریارێکی بێ وێنەی"** وەسفکرد، لەبارەی بۆندی فرشتنی چەك، کاتێ مەرجی لەسەر تورکیا دانا، بەوەی کە بەنکی هاوردە و هەناردەنی ئەمریکی، پارەی کڕینی (101) زرێپۆش بۆ پۆلیسی نەهێشتنی ئاژاوە دابین دەکات، ئەگەر لەو 11 پارێزگایەی کە هێزە ئەمنییەکانی تورکی پێشێلکارییان لە مافەکانی مرۆڤ ئەنجامداوە، بەکارنەهێنێ[2].

لە رێرەوێکی تازەی دیپلۆماسییەتی ئەمریکی بەرامبەر تورکیا، جۆن شاتوکی یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، لە شوباتی 1998 سەردانێکی لەیلا زانای کرد لە بەندیخانە، کە سزای 15 ساڵ بەندی بە تۆمەتێك کە تاڕادەیەك پەیوەندی بە ئازادی رادەربرینەوە، هەبوو، بۆ برابووەوە[3]. لە تەمووزی هەمان ساڵدا دانا باویری Dana Bauer جێگری بەڕێوەبەری بەشی ئەورووپای رۆژهەڵات لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی، لەمیانەی وتارێکی کە لە کۆنگرەی گرێدراو لە ڤییەننا لە ژێرناوی لەسەر رێگا بۆ ئەورووپا: داهاتووی پرسی کورد بۆ تورکیا و هاوسێکانی)، داوای لە حکوومەتی تورکی کرد کە بەدوای چارەسەری کۆمەڵایەتی و ئابووری سیاسی پرسی کورددا بگەرێت، نەوەك هەرتەنها چارەسەری سەربازی، هەروەها باسی ئەوەی کرد کە **"لەگەڵ بەردەوامی سەرکەوتنەکانی سوپای تورکی دژ بە پارتی کرێکارانی کوردستان،**

---

(1) -Carol Migdalovitz, "Turkey: U.S. Sale of Helicopters", P. 69.

(2) -Human Rights Watch, " The human rights picture in Turkey grew worse during 1998" via at: (http://www.hrw.org/worldreport/Helsinki-23.htm#P1117_264948); Carol Migdalovitz, "Turkey: U.S. Sale of Helicopters", Pp. 69-70.

(3) -Human Rights Watch, "The human rights picture in Turkey grew worse during 1998" via at: (http://www.hrw.org/worldreport/Helsinki-23.htm#P1117_264948).



**لەسەر تورکیا پێویستە ئەو هەڵە بۆ تێکەڵاوکردنی کورد بە فرەچەشتنی کلتوورەکەی بقۆزێتەوە. ئەگەر لە لایەنە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەوە گرنگی بە پرسی کورد بدرێت، تورکیا دەتوانێت هەڵی چەسپاندنی خۆی وەك نموونەیەکی ئاشتی و هێزێکی تەواوکاری لە سیستەمی جیهانی بۆ سەدەی بیست و یەك بقۆزێتەوە"**[1]. باویر ئەوەی رەتکردەوە کە **"پرسی کورد پرسێکی نوێ بێت، ئەو پرسە لەوەتەی ئیمپراتۆری عوسمانی هەڵوەشاوەتەوە و کۆماری تورکی دامەزراوە، بوونی هەیە"**. لەو کاتەوە کێشەکان بەشێوەی جیا جیا هەن. خانمە بەرپرسە ئەمریکییە پارتی کرێکارانی کوردستانی بەوە تۆمەتبار کرد کە **"بەدرۆ بانگەشەی نوێنەرایەتی هەموو کوردی تورکیا دەکات"**، لە کۆمەڵێ چالاکی ناڕەوا گلاوە بە ئاودیوکردنی ماددەی هۆشبەر و تۆڕی تاوانی رێکخراو لە ئەورووپای رۆژهەڵات[2]. ئەمەش هەمان ئەو تۆمەتانەیە کە پێشتر بەرپرسانی تورك لەدژی پارتی کرێکارانی کوردستان بڵاویان دەکردەوە.

بیرورای نوێی ئیدارەی ئەمریکی لە لێدوانەکانی ستروب تالبوتی جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بە گەورەیی بە دەرکەوت، کە لە دیارترین لایەنگرانی رێوشوێنە سەربازییەکانی تورکی بوو لە دژی پارتی کرێکارانی کوردستان، لە تشرینی یەکەمی 1998 کاتێ گفتوگۆی ئەوەی کرد کە **"دیاریکردنی ئامرازەکانی چالاکییە سیاسییە رەواکان ـ ئەگەر گەل لە دادگا یا لە بەندیخانە لەبەر ئەو شتانەی دەینووسن و دەیڵێن، ئەمەش لە رێگەی قەدەغەکردنی پارتە سیاسییەکان یا داخستنی نووسینگەی رێکخراوە ناحکوومییەکان–Non-government Organizations، کارێکی مەترسیدارە و دەرەنجامی نەخواستراوی بەدواوەیە، چونکە ئەمە میانڕەوەکان بۆ توندڕەو**

---

(1) " -U.S. Official Speaks on Turkey and the Kurdish Question", United States Information Service, 6 July, 1998. Via at: 
(http//:www.mtholyoke.edu/acad/intrel/kurdtur.htm)

(2) -Human Rights Watch, "The human rights picture in Turkey grew worse during 1998" via at: (http://www.hrw.org/worldreport/Helsinki-23.htm#P1117_264948).

**دەگۆڕێت، ئەمەش پرسی کوتوبەندکردنی ئازادی بۆ لەناوبردنی خودی دیموکراسی دەبات**"[1].

کاریگەرییە ناڕاستەوخۆیەکانی لێدوانەکانی بەرپرسانی ئیدارەی ئەمریکی لەسەر بەرنامەی یارمەتییە ئەمریکییەکان بۆ تورکیا ڕەنگی داوەتەوە، بەتایبەتی لەلایەنی سەربازی. یارمەتییە سەربازییە ساڵانەییەکانی ئەمریکا بۆ تورکیا لە ساڵی 1992 لە 553 ملیۆن دۆلار بۆ 175 ملیۆن لەساڵی 1997 کەمکرایەوە، تا لە ساڵی 1998 بە یەکجاری کۆتایی پێهات[2].

سەرباری ئەو ڕێوشوێنە کردارییانەی سەرەوە، ڕاپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لەبارەی پیادەکردنەکانی مافی مرۆڤ لە تورکیا بۆ ساڵی 1998، ئەوەی سەلماندن کە ڕۆڵی حکومەتەکەی مەسعود یەڵماز بۆ بەرژەوەندی عەسکەر پاشەکشەی کردووە، هەروەها ئاماژەی بە بەردەوامی باری لەناکاوی لە پێنج پارێزگای کوردی داوە، بشتی هەڵگرتنی لە پارێزگای سێرت Siirt، هەروەها ڕاپۆرتەکە ئاماژەی بۆئەوە کردووە، کە سەرباری کەمبوونەوەی چالاکییە تیرۆریستییەکان، پێشێلکردنی ڕاستەقینەی مافەکانی مرۆڤ و ئازاردان کە لەلایەن ژەندرمەوە ئەنجامدراوە بەردەوامبووە و 700 حاڵەت بەفەرمی لەبارەیانەوە ڕاگەیەنراوە. هەروەها ڕاپۆرتەکە پەنجەی بۆ حاڵەتی شوێن بزرکردن و کوشتنی بکەر نادیاری چالاکە سیاسییەکانی کورد، 36 حاڵەت، کە 6 حاڵەتی لە ساڵی 1997 زیاترە، تۆمارکردووە. هەروەها سەبارەت بە حاڵەتی مردن لە بەندیخانە یا لەکاتی لێپرسینەوە، ڕاپۆرتەکە 12 حاڵەتی تۆمارکردووە. سەبارەت بە ئازادی ڕادەربڕین و ڕۆژنامەگەری، ڕاپۆرتەکە هۆشداری لەبارەی بوونی **"کێشەیەکی مەترسیدار"** کردووە، بەهۆی ئەوەی دەسەڵاتدارانی تورکی لە هێرشکردنە سەر نووسینگەی ڕۆژنامە

(1) -Strobe Talbott, "U.S – Turkish Relations in an Age of Interdependence", 2d Turgutozal Memorial Lecture, Washington Institute for Near East, 14, 1998; Policy, Washington, D.C, October, via at:(www.washingtoinstitute.org/media/talbott).

(2) -Carol Migdalovitz, "Turkey: Issues for U.S. Policy", P.65; Sabri Sayari, "Turkey and the United States…", P.35.



سەربەخۆکان و بەردەوامی لە سانسۆرکردنی هەموو ئەو شتانەی لەبارەی باشووری ڕۆژهەڵات دەنووسرێت. هەروەها ڕاپۆرتەکە زۆر حاڵەتی تۆمارکردووە، کە پاڵێوراوانی پارتی دیموکراتی گەل تووشی سەختی گەورە بوونەتەوە لە هەڵمەتەکانی هەڵبژاردنەکانیان، سەرباری قەدەغەکردنیان لە وتنی گۆرانی تێکەڵاوی (کوردی–تورکی) لە میانەی بانگەی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن و داخستنی ڕۆژنامە (ئازادی نیشتیمان–Azadia Welat) و سەرجەم ڕۆژنامە کوردییەکان، 47 ئەندامی ئەو پارتە دەستگیرکران، یەکێك لەوانە لە میانەی لێپرسینەوەی گیانی سپارد، ئەویش ناوی حامد چاکار بوو، تەمەنی 18 ساڵ بوو، لەلایەن پۆلیسی دیاربەکرەوە، لێی دراوە[1].

سەرباری ئەو پەرەسەندنە گەورانەی کە تورکیا لە سەرەتای ساڵی 1999ەوە بەخۆیەوە بینی، لەبارەی ململانێی ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵات کە خۆی لە دەستگیرکردنی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان لە شوباتی هەمان ساڵ، کە وایکرد ڕێژەکانی توندوتیژی بە ڕێژەی 90٪ی لە سەرەتای ناوەڕاستی 1999 کەم ببێتەوە[2]. ڕاپۆرتەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لەبارەی پیادەکردنەکانی مافی مرۆڤ بۆ ساڵی 1999 ئاماژەی بە بەردەوامی کاریگەری سوپا لەسەر دەسەڵاتی سیاسی دا، هەروەها بۆ بەردەوامی باری لە ناکاو لە چوار پارێزگا دوای ئەوەی لە هەمان ساڵ لەسەر پارێزگای وان هەڵگیرا. هەروەها ڕاپۆرتەکە ئەوەشی تۆمارکردبوو کە سەرباری کەمبوونەوەی هێز و هێرشەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان بەڵام پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ و ئازاردان بە فراوانی ماونەتەوە. هەورەها جەختی لەسەر پرسەکانی ئازادی ڕادەربڕین و قەدەغەکردنی بەکارهێنانی زمانی کوردی لە پڕوپاگەندەکانی هەڵبژاردن لە نێوان کورد و بەردەوامی لە فەرامۆشکردنی مافە

(1) -U.S. Department of State, "Turkey Country Report on Human Rights Practices for 1999", Released by the Bureau of Democracy, Human Rights, and Labor, February 25, 2000. Via at: (http://www.state.gov/www/global/human_rights/1999_hrp_report/turkey.html).

(2) -U.S. Department of State, "Turkey Country Report on Human Rights Practices for 2000", Released by the Bureau of Democracy, Human Rights, and Labor, February 23, 2001. Via at: (http://www.state.gov/g/drl/rls/hrrpt/2000/eur/844.htm).

کلتوورییەکانی کورد، ئەمانە کێشەی مەترسیداربوون وەکو خۆی مانەوە. هەروەها راپۆرتەکە باسی لە بەردەوامی کوشتنی بکەر نادیار دەرهەق بە سیاسەتمەدارانی کورد کرد. هەرچەندە راپۆرتەکە ئاماژەی بە بوونی حاڵەتی مردن لەژێر ئازاردا لە بەندیخانەکان نەکردبوو، بەڵام ئاماژەی بۆ بڵاوی ئەو حاڵەتە لە کوردستان کردبوو. هەروەها راپۆرتەکە قسەی لەبارەی تەقە کردنی راستەوخۆی ژەندرمە بە مەبەستی کوشتنی هاووڵاتیانی مەدەنی پارێزگا کوردییەکان کردبوو. هەروەها راپۆرتەکە ژمارەی ئەوانەی لە گوندەوکانیان راگوێزراون بە 1.380.000 کەس مەزەندە کرد، لەبەرامبەریشدا تەنها 10.000 کەس بۆ شوێنی رەسەنی خۆیان گەڕاونەتەوە[1].

سەرباری ئەمانەش **"ئیدارەی ئەمریکی هەر بە گەشبین لە بەرامبەر داهاتووی مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا مایەوە"**، ئەمەش بە گوێرەی لێدوانی بەرپرسێکی ئەمریکی لە تورکیا، کە دوای دەستگیرکردنی ئۆجەلان دابوو، هەروەها گوتی: **"80٪ی پاساوەکانی تورکیا بۆ پێشێلکاری لە مافەکانی مرۆڤ بە دەستگیرکردنی ئۆجەلان نەمان"**[2]. بەرپرسانی ئەمریکی لە تورکیا هەولەکانیان بۆ هاندانی تورکیا چڕکردەوە، تاکو تورکیا لە لایەنێکی نا سەربازییەوە سەیری کێشەی کورد بکات و سنوورێك بۆ پێشێلکارییە بەردەوامەکانی مافی مرۆڤ دابنێت. هەر لەهەمان رێرەودا هەریەکە لە مارك کرۆسمانی یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکی بۆ کاروباری ئەورووپی (1997–2000) و هارولد کوهی یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکی بۆ مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسی، کۆبوونەوەیەکیان لەگەڵ رێکخراوە ناحکوومییەکانی تورکیا ئەنجامدا، هەردوو بەرپرسە ئەمریکییەکە لە میانەی کۆبوونەوەکەیان گەشبینی خۆیان بە تواناکانی تورکیا بۆ باشترکردنی بواری مافەکانی مرۆڤ پیشاندا[3]. لەمیانەی سەردانێکی دیکەی کۆهی بۆ تورکیا لە

(1) -Ibid.

(2) -Turkish Daily News, 27, February, 1999.

(3) -Tamar Gabelncik, Op. Cit., P.3.



ئابی 1999، لە لێدوانێکیدا گوتی: **"چارەسەری تەواو سەربازی بۆ پرسی کورد نییە. چارەسەرێکی بەردەوامی کێشەکە، خۆی لە فراوان کردنی دیموکراسی و چاکسازی ئابووری کۆمەڵایەتی سیاسی بوێرانە و زیرەکانە شاردۆتەوە، کە بەشداری سیاسی تەواو بۆ سەرجەم هاووڵاتیانی تورکیا زامن بکات. لەمیانەی رازاندنەوەی ئازادی رادەربڕین لە باشووری رۆژهەڵات"**[1] و لە میانەی گەڕانێکی بە ناوچەکەدا، سەردانێکی ئەخلاقی و ماناداری بۆ بەندیخانەی ناوەندی ئەنقەرە کرد، تاکو چاوی بە لەیلا زانا بکەوێت[2].

لەلایەکی دیکەوە، لە ئەیلولی 1999 تورکەکان رێگایان بۆ ئەجەوید خۆشکرد کە سەردانێك بۆ ئەمریکا بکات[3]، لەوێ زنجیرەیەك رێوشوێن بگرێتەبەر کە بە پرسی کوردەوە لە چوارچێوەی مافەکانی مرۆڤ، پەیوەستە. ئەو رێوشوێنە تورکییانە دەرکردنی ژمارەیەك یاسای لەخۆگرتبوو، یەکەمیان یاسای لێبووردنی گشتی بوو، بۆئەوانەی بەشدارییان لە کردەی تیرۆردا کردووە، کە لە شوباتی 1999ەوە دەرچووە، واتە راستەوخۆ دوای دەستگیرکردنی ئۆجەلان. لە نیسانی 1999 یاسای ئازادی رادەربڕینی هەموارکرد، کە بەشێوەیەك دادگای تورکی لە ئایاری 1999، بۆ یەکەمجار رێگەی دا منداڵ بەناوی کوردەوە ناو بنرێت. دوای ئەمەش زنجیرەیەك رێوشوێنی دەرچوو، کە باری لە ناکاوی لەسەر پارێزگای وان هەڵگرت، هەروەها گەمارۆ لەسەر هاتنە ناوەوەی ماددە خۆراکییەکان بۆ پارێزگای دەرسیمی کوردی هەلگیرا. بۆ یەکەمجار بە شێوەیەکی فەرمی رێگە بە سازکردنی ئاهەنگی نەورۆز درا، لە دەوروبەری دیاربەکر 80 هەزار کەس بەشدارییان تێدا کرد.

شانبەشانی ئەمە، سەرلەنوێ دەنگی دەستەبژێری سیاسی تورکی بەرزبووەوە و داوای رێگەدان بە کردنەوەی پەخشی رادیۆیی بە زمانی کوردی

(1) -Human Rights Watch, " The Human Rights Picture in Turkey during 1999". Via at: (http://www.hrw.org/worldreport/Helsinki-23.htm#P1117_264948).

(2) -Tamar Gabelncik, Op. Cit., P.3.

(3) -T.C, Basbakanlik, Dis Basinda (Basbakan Bulent Ecevit'in ABD Geztesi (15 Eylul – 4 Ekim 1999), Basin-Yayin ve Enformasyoun Genel Mudurlugu.

دەکـرد. یاسـای (دەسـەڵاتەکانی هەرێمـە لـە ناکاوەکـان) ی سـاڵی 1996، پوچەڵکرایەوە، ئەو یاسایەی کە ڕێگەی دەدا هەموو کەسێ بەبێ تاوان و دادگا دەستگیر بکرێت. هەروەها ڕاپۆرتەکە ئاماژەی بە دەستگیرکردن بەهۆی ئازادی ڕادەربڕین و چـالاکی سیاسـییەوە کـرد، کـە لـە چـاو سـاڵانی ڕابـردوو کەمبوونەوەیـەکی بەرچـاوی بەخۆیـەوە بینیـووە. هـەورەها سـەبارەت بـە ڕێوشـوێنە تورکییـەکان سـەبارەت بـە هەڵپەسـاردنی حـوکمی لەسـێدارەدانی ئۆجـەلان، ڕاپۆرتەکـە ئـەم ڕێوشـوێنانەی بـە دلخۆشـکەر بـۆ ئـەمریکی و ئەورووپییەکان بینی[1].

لە 26ی ئەیلولی 1999 ئەجەوید سەردانێکی فەرمی بۆ ئـەمریکا کـرد و مـاوەی پێـنج ڕۆژی خایەنـد. ڕادیـۆی دەنگـی ئـەمریکا وای دەبـینی کـە پرسـی ئـەو ڕێوشوێنانەی لە دژی ئەوانەی بە **"جوداخوازانی کورد"** وەسفکراون، گیراوانەتەبـەر لە کۆبوونەوەی ئەجەوید – کلینتۆن گفتوگۆی لەسەر دەکرێت[2].

لە 28ی ئەیلولی 1999 ڕادیۆی ئەڵمانیا بڵاویکردەوە کە یەکێك لەو شتانەی لە میانەی سەردانەکەی ئەجەوید لە تورکیا داوادەکرێت ئەوەیـە کـە ڕێوشـوێن سەبارەت بە پێشێلکارییەکانی مافەکانی مرۆڤ وەربگرێـت و ڕێگـا چـارەیەك بـۆ پرسی کورد بدۆزێتەوە[3]. لە ڕۆژی دواتر ڕادیۆکە بڵاویکردەوە کە کلینتـۆن لـە کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسی ڕایگەیاندووە کە پرسی مافەکانی مرۆڤ، لە پێـشەوەی بابەتـەکانی خـشتەی کـاری کۆبوونەوەکـە بـووە و ئـەو ڕێوشـوێنانەی تورکیـا لەمبارەیـەوە دەیانگریتەبـەر بـۆ پەیوەندییـەکانی بـە یـەکێتی ئـەورووپاوە

(1) -U.S. Department of State, "Turkey Country Report on Human Rights Practices for 2000", Released by the Bureau of Democracy, Human Rights, and Labor, February 23, 2001. Via at: (http://www.state.gov/g/drl/rls/hrrpt/2000/eur/844.htm).

(2) -Amerikanin sesi Radyosu'nun Dunku" Basbakani Ecevit, Ulusal Basin Kulubu'nde Bir Konusma Yapti", 29-9-1999, 21.00-22.00; Turkce Yayindan, in: T.C, Bas Baskanlik, E.G, S.17.

(3) -Almaniya'nin Sesi Radyosu: "ABD Kibris Konusunda Turkiye Ile Yunanistan Arasinda Arasinda Arabuluculuk Yapmak Istiyor" 0.8-08.50 Turkce Yayindan, in, T.C, Basbakanlik, E. G., S.79.



گرنگن[1]. ڕادیۆی تاران لە 28ی ئەیلول باسی ئـەوەی کـردووە کـە ئـەمریکا داوای لە تورکیا کردووە، کە ڕێوشوێن لەبواری مافەکانی مرۆڤ بگرێتەبـەر و ئـازادی زیـاتر بە بەرهەلستکارانی کورد بدات، هەروەها واشـنتۆن دەیـەوێت زامـنی ئاشـتی نێـوان ئەنقەرە و کوردە بەرهەلستکارەکان بکات، بەڵام دەتوانرێت ئەمە بگوترێـت کـە بـە بوونی سوپا سەختە حکوومەتی تورکی ئەمەی پێ قەبووڵ بکرێت[2].

لە میانەی ئـەو چـاوپێکەوتنەی کـە لـە 30ی ئـەیلول لـە نێـوان ئەجەویـد و کلینتۆن سازکرا، پرسی ماف مرۆڤ و پارتی کرێکارانی کوردستان، لەسـەرەوەی ئەو فایلانـەبوون کـە هـەردوولا گفتوگۆیـان لەسـەری کـردووە. ڕادیـۆی دەنگـی ئەمریکا لە ئەجەویدی گواستۆتەوە کە **"کەمینەکانی تورکیا خـاوەن مـافێکی زۆرترن لەوەی کە لە وڵاتانی دراوسێدا هەیە"** و **"پارتی کرێکارانی کوردستان لە بەدی نەهێنانی گەشەی ئابووری ناوچە کوردییەکان بەرپرسیارە"**[3].

ڕۆژنامەی Neue Zurcher Zeitung کە لە سویسرا دەردەچیت لە ژمارەی تشرینی یەکەمی 1999 باسی لەوە کردووە، کە کۆشکی سپی وای دەبـینی کـە ئازادکردنی زانای کۆمەڵناسی ئیـسماعیل پێشکـچی و ئـاکین بیرداڵـی Akin Birdal سەرۆکی پێشووی کۆمەڵەی مافەکانی مرۆڤ، نابێت ئازادکردنیان وا لێکبدرێتەوە کە ئەو باشکردنەی پەیوەستە بە مافەکانی مرۆڤ، هاتۆتە دی[4].

گرنگیدانی ئیدارەی ئەمریکی بـە پرسـی کـورد لـە تورکیـا لـەو وتەیـەی کـە سەرۆکی ئەمریکی بیـل کلینتـۆن لـە 15ی تـشرینی دووەمـی 1999 لەبەرامبـەر

(1) -Almaniya'nin Sesi Radyosu: "Basbakan Ecevit'in Washington Ziyartinin En Onemli Gorusmeleri Gerceklesti" 08.00-08.50 Turkce Yayindan, in, T.C, Basbakanlik, E. G., S.80.

(2) -Tahran Radyosu: "Turkeye Basbakani Bulent Ecevit Amerika'yi Ziyaret Ediyor", 28/9/1999, 19,30-20,30, Turkce Yayindan, in, T.C, Basbakanlik, E. G., S.90.

(3) -Amerikanin sesi Radyosu'nun Dunku, " Basbakani Ecevit, Ulusal Basin Kulubu'nde Bir Konusma Yapti", 29-9-1999, 21.00-22.00, Turkce Yayindan, in: T.C, Bas Baskanlik, E.G., SS. 23-24.

(4) -Neue Zurcher Zeitung, "Washington'da Yeni Kibris Sondajlari" Bern, 1/10/1999, in, T.C, Bas Baskanlik, E.G., S.127.

ئەنجوومەنی نیشتمانی تورکی پێشکەشی کرد، دەردەکەوێت، سەرۆکی ئەمریکی لە وتەکەیدا بەشێکی بۆ قسەکردن لەسەر رەوشی کوردان لە تورکیا تەرخان کردبوو و بەم شێوەیە بە ئەندامانی پەرلەمانی تورکی گوت کە: **"یەکەم هەنگاو بەرەو داهاتووی هاوبەشمان لەوەوە دەست پێدەکات کە تورکیا دیموکراتی قوڵ بکاتەوە. هێزێکی پاڵنەر بۆئەمەش هەیە، کە خۆی لەو مەڕسومانەی کە لە دژی ئازاردان و لە یاسای نوێ کە مافی پارتە سیاسییەکان دەپارێزێ، دەبینێتەوە. هەروەها چالاکی و ئەکتیڤبوونی ئەم ئەنجوومەنەتان پاڵنەرێکی دیکە، ریگا لەبەردەم هاووڵاتیانی کورد کرایەوە، بۆئەوەی چێژ لە مافە سەرەکییەکانیان و ژیان و سروشت وەربگرن"**[(1)]. هەروەها باسی لەوە کردووە کە **"کاتی نووسەرێك یا رۆژنامەنووسێك بە ئازادانە رای خۆی دەردەبرێت، ئەوانە هەر پیادەی مافێکی سەرەکی سروشتی خۆیان ناکەن، بەڵکو بەمە لە بەردەوامی ئالوگۆڕی ئەو نموونە باڵایانەی کە بەهۆیانەوە خۆشگوزەرانی و بوژاندنەوە دێنە دی، بەشداری دەکەن، چونکە بوونی تاکە کێبڕکێکارێکی ئاشتیخواز، لە ناکۆکییە سروشتییەکانی نێوان مرۆڤەکان ئاشتی لەناو نابات دەیپارێزێ، چونکە کاتێ خەڵکی بواری ئەوەیان دەبێت بیروباوەریان و کلتووریان بەشێوەیەك کە مافەکانی مرۆڤ پێشێل نەکات، دەربڕن، ئەو کات میانڕەوەکان بۆ توندرەو ناگۆڕێن، هەروەها توندرەوەکانیش بۆ پاڵەوانی بێ باك ناگۆڕێن"**[(2)]. هەروەها کلینتۆن بابەتی خوێندن بەزمانی کوردی خستەبەرباس و ئاماژەی بە بوونی قوتابخانەی شارۆچکەی ارلنکتون– Arlingtonی ویلایەتی فیرجینیای نزیك واشتۆن دا، کە لەو قوتابخانەیە گرووپی ئەتنی جیا وانە دەخوێنن، هەروەها گوتی سیستەمی ئەو قوتابخانانە **"بواری ئەوەیان پێدەدات کە بەهای فرەکلتوورییەکەیان بزانن و بناسن"**[(3)].

---

(1) -Milliyet, 16 Kasim, 1999;

(2) - خەبات، 10 کانون الاول، 1999.

(3) -Millyet, 16 Kasim, 1999.



وتەکەی کلینتۆن لەپەرلەمانی تورکی شەپۆلێك تورەیی و نارەزایی هەندێ لە ئەندامانی پەرلەمانی ورژاند، بەتایبەتی ئەوانەی سەربە پارتی بزووتنەوەی نەتەوەیی توندرەو. کاتێ کورد باسی لە **"هاووڵاتیانی کورد"** کردووە، ئەوانە بەپێوەوە وەستاون وەك نارەزاییەك بەرامبەر بەم بەکارهێنانە[(1)]. بەڵام ئەو نارەزاییانەی هەندێ لە پەرلەمانتاران رێگر نەبوو لەوەی کە پەرلەمانتارانی دیکە بەچەپڵە رێزانەوە پێشوازی لێ بکەن. بۆیە کلینتۆن لەتەواوی ئەو پێنج رۆژەی سەردانەکەی بۆ تورکیا، بابەتی دیموکراتی و مافی مرۆڤی لە تورکیا ورژاندووە و داوای لە بەرپرسانی تورکی کردووە، کە هەنگاوی کرداری لەم بوارە بهاوێژن و پێیانی راگەیاندووە کە **"تورکیا رێگایەکی دوورودرێژی بۆ بەدەستهێنانی دیموکراسی لەبەردەستدایە"**[(2)]. و **"ئەو هەنگاوانەی تورکیا لە بواری دیموکراسی و پرسی کورد دەیانهاوێ بۆ تەواوی جیهان گرنگن"**[(3)].

لەپال نارەزایی نوێنەرەکانی پارتی بزووتنەوەی نەتەوەیی توندرەو لەسەر گوتارەکەی کلینتۆن، دیارترین کاردانەوەی سەردانەکە لە دامەزراوەی سەربازی هات و بە دەنگێکی جیاواز رەخنەی لە وتەکەی سەرۆکی ئەمریکی گرت، نامێلکەیەکی بە 21 لاپەرە لەژێر ناوی)پرسە سەرەکییەکان Main) Issuesچاپ و بڵاوکردەوە. رەخنەی توندی لە سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر تورکیای تێیدا هاتبوو و چەندین تاڵی هەڵگرتبوو کە هەندێکیان زۆر کۆن بوون. نامێلکەکە باسی ئەوەی کردبوو کە ئەمریکا رەتیکردۆتەوە ژمارەیەك هەلیکۆپتەر بە تورکیا بفرۆشیت کە پێشتر تورکیا بۆ شەڕی ئەوەی پێی دەگوترێت **"تیرۆری ناوەخۆ"** داوای کردبوو، ئەم رەتکردنەوەیەش بەهۆی **"پێشێلکاری مافی مرۆڤ لە تورکیا"** بووە، لەهەمان کاتدا واشنتۆن لە فرۆشتنی هەمان فڕۆکە بۆ هەمان مەبەست بە مەغریب دوودل نەبوو، لە رێگەی

---

(1) -Cumhurriyet, 16 Kasim, 1999.

(2) -Radikal, 16 Kasim, 1999.

(3) -Sabah, 17 Kasim, 1999.

فەرمانێکی تایبەت کە سەرۆك جیمی کارتەر لە تشرینی یەکەمی 1977 دەریکردبوو، پرۆسەی فرۆشتنەکەی ئەنجامدا[1].

هەروەها نامیلکەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کردبوو کە واشنتۆن لە بواری مافەکانی مرۆڤ گازاندەی لە تورکیا کردووە، کەچی سیفەتی وڵاتی یەکەم بە چین دەبەخشی کە تۆمارێکی زۆر خراپی لەو پرسەدا هەیە، هەروەها تۆپباران کردنی پەرلەمان لەلایەن سوپای رووسیەوە لە ساڵی 1995ەوە بەکارێکی پێویست بۆ گەڕانەوەی دیموکراسی لەقەڵەم داوە. هەروەها نامیلکەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە لۆژیك نییە ئەمریکا لەکاتی فرۆشتنی چەکەکانی مەرجی گریدراو بەمافەکانی مرۆڤ دابنێت، لەهەمان کاتدا خۆی یەکەم هاوردەکەری چەکە بۆ سعودیە. بەم شێوەیە بوو **"بەرووخستنی حیسابەکە"** لەلایەن دامەزراوەی سەربازی تورکی کە بەسەر وڵاتدا باڵادەستە و ئەمریکا پەیوەندییەکی توندی کلاسیکی لەگەڵیدا هەیە، ئەو پەیوەندییەی کە گومان و تاڵی لەگۆڕنراو ئاشکرا دەکات. نامیلکەکە مەودای هەستکردنی دامەزراوەی سەربازی تورکی بە تاڵی و ناخۆشی لەبەرامبەر مامەڵەی هاوپەیمانی ئەمریکی بۆ تورکیا روون دەکاتەوە[2].

کلینتۆن لە وتەکەیدا بەرامبەر پەرلەمانی تورکی و لەمیانەی چاوپێکەوتنی بە بەرپرسانی تورکی، گەشبینی خۆی بە داهاتووی تورکیا و باشبوونی رەوشی مافەکانی مرۆڤ و پێشکەوتنی دیموکراتی دەربڕی، بەڵام راپۆرتی وەزارەتی دەرەوە بۆ ساڵی 1999 بە زۆر نیگەرانییەوە سەیری رەوشی مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا و بە تایبەتی لە باشووری رۆژهەڵاتی کرد. بەڵام ئیدارەی ئەمریکی هەولێکی وای نەدا کە فشار بخاتە سەر تورکیا بۆئەوەی لە دیدگای مافەکانی مرۆڤەوە مامەڵە لەگەڵ پرسی کورد و دیموکراسی بکات، بەڵکو زۆربەی جار هەر بە بەلێندانی تورکی دەوەستا، کە زۆربەی جاریش

(1) - یاسر احمد حسن، ترکیا: البحث عن مستقبل، الدار المصرية–اللبنانية للكتاب، القاهرة، 2006، ص 297.

(2) - المصدر نفسه، ص ص 296–297.



ئەو بەلێنانە جێبەجێنەدەکران. هەتاکو راپۆرتەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاش لەبارەی پیادەکانی ماف مرۆڤ زۆری لە ئامانجەکانی نەپێکا. کیفن مارك کیرنان Kiven Mckiernan ی رۆژنامەنووسی ئەمریکی لەگەڵ رێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ هاوڕایە کە **"وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە راپۆرتەکانی جگە لە نیوە چارەسەری بۆ ئەوەی حکوومەتی تورکی توڕە نەکات، هیچی دیکەی نەکردووە"**[1].

دەرەنجام هەوڵەکانی ئیدارەی ئەمریکی بۆ رازیکردنی تورکیا تاکو چاکسازی تەواو ئەنجام بدات، بە داخوازییە کوردییە میانرەوەکانیش، لەلایەن تورکیا بە نابەدڵ و گوماناوی بەتوندی رەتکرایەوە. بەردەوام سەرانی تورکی ئەوەیان دووپات دەکردەوە کە **"ئەمریکا ئەژیندایەکی نهێنی هەیە"** بۆ وڵاتەکەیان، هەورەها دەیانگوت تورکیا بەشی خۆی لە گرنگیپێدانی ئەمریکی بەرنەکەوتووە، لەمەدا ئاماژەیان بە گفتوگۆکانی کۆنگرێس و رازی نەبوونی لەسەر بەرژەوەندییەکانی تورکیایان بە نموونە دەهێنایەوە[2].

(1) -Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds", P.29.

(2) -Henry J. Barkey, "Under Gun: Turkish Foreign Policy…", P. 74.

## بابەتی دووەم: ڕەخنەکانی کۆنگرێسی ئەمریکی

گرنگی پێدانی کۆنگرێسی ئەمریکی بە پەیوەندییەکانی تورکیا– ئەمریکا بە ناکۆکییەکانی نێوان تورکیا– یۆنان لەسەر قوبرس و دەسەڵات بەسەر دەریای ئیجە و دورگەکانی بەستراوبووەوە، کە ئەمەش بەردەوام شەرمەزاری و شڵەژانی بۆ ئیدارەی ئەمریکی لەگەڵ بەرپرسە تورکەکان دروست دەکرد[1]. بەڵام بە کۆتا هاتنی جەنگی سارد کە هاوڕێ بوو لەگەڵ ڕاپۆرتە زۆرەکانی گرووپە جۆراجۆرەکانی ماف مرۆڤ و ڕۆژنامەکان، سەرباری ڕاپۆرتە ساڵانەییەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کە پێشێلکاریەکی زۆری لە باری مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا تۆمار کرد، یاسادانەرانی ئەمریکا لە سیاسەتی دەرەوەوەی وڵاتەکەیان زیاتر گرنگی و هەستیان بەم بابەتانە کرد[2]. بەهاوکاری کومەلەکانی ماف مرۆڤ و ڕێکخراوە مرۆییەکان و ئەوانەی بە پەرۆشن بۆ کەمکردنەوەی ئاستی یارمەتییەکان بۆ تورکیا، کێشەیەکی دیکە و گرفتێکی نوێ بۆ نێو پەیوەندییەکانی ئەمریکا –تورکیا هات.

کاریگەرییەکانی پرسی کورد لە تورکیا لەسەر هەڵوێستی کۆنگرێس سەبارەت بە پەیوەندییەکانی ئەمریکا–تورکیا لە دوو بواری گرنگ بەدەرکەوت، یەکەم پەیوەستە بە پرۆگرامی یارمەتییەکانی ئەمریکا بۆ تورکیا. دووەم، پەیوەستە بە بۆندە گەورەکانی چەکی ئەمریکی بۆ تورکیا.

ڕۆژنامەی تورکیش دەیلی نیوز Turkish Daily News لە 4ی ئابی 1994 تێبینی بەدەرکەوتنی ئاراستەیەکی لە ناو کۆنگرێس کردبوو، کە لەگەشەدایە و کار بۆ بڕینی یارمەتییەکان لەسەر تورکیا دەکات، ئەگەر لە قوبرس پاشەکشە نەکات و کار بۆ باشترکردنی ڕەوشی ماف مرۆڤ لە تورکیا نەکات[3].

(1) -Carol Migdalovitz, "Turkey: Issues for U.S. Policy", P.64.

(2) -Makiko Ali, Op. Cit., P.59.

(3) -Turkish Daily News, 4 august 1994;



یەکەم کارکردی فشارەکانی کۆنگرێس لەسەر پەیوەندییەکانی تورکیا– ئەمریکا بە ڕوونی لەسەر یارمەتییە سەربازییە ساڵانەییەکانی ئەمریکا ڕەنگیدایەوە. ئەو یارمەتییانە لە 500 ملیۆن دۆلار لە ساڵی 1991 بەرە بەرە کەم بووەوە، تا لە ساڵی 1998 بەتەواوی بڕا[1]. لە ساڵی دارایی 1995 ئیدارەی کلینتۆن پێشنیازی کرد بڕی 405 ملیۆن دۆلار وەك بەخشینی سەربازی بۆ تورکیا تەرخان بکرێت، بەڵام کۆنگرێس بڕە پارەکەی بۆ 365.5 ملیۆن دۆلار کەمکردەوە[2]. دوای ئەوەی وەزارەتی دەرەوە کۆتایی بە ئامادەکردنی ڕاپۆرتێك لە بارەی بەکارهێنانی چەکی ئەمریکی لە جەنگی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا، هێنا و لە حوزەیرانی 1995 بە کۆنگرێسی دا، کۆنگرێس دووبارە لە 10٪ی بڕە پارەکەی سەرەوەی بڕی و کردی بە 328.05 ملیۆن دۆلار. لە ساڵی دارایی 1996 ئیدارەی ئەمریکی پێشنیازیکردبوو کە بڕی 450 ملیۆن دۆلار وەك بەخشینی سەربازی بە تورکیا بدرێت، بەڵام کۆنگرێس بڕەکەی بۆ 321 ملیۆن دۆلار کەمکردەوە[3].

لەوەتەی ساڵی 1996ەوە قەرز و بەخشینە سەربازییە ئەمریکییەکان و پاڵپشتی ئابووری ئەمریکی بۆ تورکیا، زۆر کەمبۆتەوە. لە ساڵی 1997 کۆنگرێس بەخشینی ساڵانەی سەربازی ئەمریکی بۆ 175 ملیۆن دۆلار کەمکردەوە، قەرزەکانیشی بۆ 22 ملیۆن دۆلار کەمکردەوە[4].

بەهۆی زۆری ڕەخنەکان و فشارەکانی کۆنگرێس و ئەو کۆت و بەندانەی لەبەردەم ئیدارەی ئەمریکی دایناوە، تورکیا لە ساڵی 1998 هیچ پارەیەکی نە لە پرۆگرامی

(1) -U.S. Military Aid and Arms Sales to Turkey, (Fiscal years 1980 – 1999), via at (http://www.fas.org/asmp/library/reports/turkeyrep.htm#execsum) ; Carol Migdalovitz, "Turkey Issues for U.S. Policy", P. 66.

(2) -Human Rights Watch, " The Human Rights Picture in Turkey Grew Worse During 1995" via at: (http://www.hrw.org/reports/1995/WR95/HELSINKI-16.htm#P655_198257).

(3) -Arming Repression: U.S. Arms Sales to Turkey. During the Clinton Administration, Pp. 10-11.

(4) -Human Rights Watch, "The Human Rights Picture in Turkey Grew Worse During 1997" via at: (http://www.hrw.org/reports/1997/WR97/HELSINKI-17.htm#P674_209013).

بەخشینە سەربازییەکان و نە لە پرۆگرامی بەخشینی قەرزی ئابووری وەرنەگرت، بڕیاردرا تەنها بڕی 1.5 ملیۆن بۆ پارەدارکردنی پرۆگرامی پەروەردەی سەربازی دەرەکی و پرۆگرامی مەشقی بیانی کە زۆربەیان جەختی لەسەر بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری مافەکانی مرۆڤ لە نێوان هێزەکانی تورکی دەکرد، وەربگرێت[1].

لەو ماوەیەدا فایلی فرۆشتەنییەکانی چەکی ئەمریکی بۆ تورکیا بێ گرفت نەمایەوە، لەماوەی نێوان (1994 تا 1997) فرۆشتەنییەکانی چەکی ئەمریکی بۆ تورکیا نزمبوونەوەیەکی گەورەی بەخۆیەوە بینی[2]. دەنگدانەوەی رەخنەی بەرپرسانی ئەمریکی لە ساڵی 1994، کە هاوشان بوو لەگەڵ راپۆرتەکانی رۆژنامەنووسان کە بەبەڵگە بەچڕی بەکارهێنانی ئەو چەکانەی لەلایەن تورکیاوە بۆ لەناوبردنی یاخیبوان و هەڵمەتەکانی چۆلکردنی گوندەکانی رۆژهەڵاتی وڵات، لە کۆنگرێس دەنگوی ئەوە هەبوو کە داوا لە وەزارەتی دەرەوەی بکات راپۆرتێك لەبارەی بەکارهێنانی ئەو چەکە ئەمریکییانە لە دژی مەدەنییەکان ئامادە بکات[3]. دەرەنجامی ئەو راپۆرتەی کە وەزارەتی دەرەوە بەهاوکاری وەزارەتی بەرگری لە یەکی حوزەیرانی 1995 تەواویان کردبوو، ئەوە بوو کە کۆنگرێس کوتوبەندی لەسەر فرۆشتەنی چەکی ئەمریکی بۆ تورکیا بە فایلی **"باشکردنی تۆماری مافەکانی مرۆڤ"** گرێدا، هەرچەندە راپۆرتەکە

(1) -Arming Repression: U.S.Arms Sales II…; Human Rights Watch, "The Human Rights Picture in Turkey Grew Worse During 1996" via at: (http://www.hrw.org/reports/1996/WR96/Helsinki-19.htm#P960_193943).

(2) -Human Rights Watch, "The Human Rights Picture in Turkey Grew Worse During 1995" via at: (http://www.hrw.org/reports/1995/WR95/HELSINKI-16.htm#P655_198257).

(3) -Human Rights Watch, " The Human Rights Picture in Turkey Grew Worse During 1995" via at: (http://www.hrw.org/reports/1995/WR95/HELSINKI-16.htm#P655_198257).

پێویستە ئەوەش بگوترێت کە رێگرییەکانی ئەمریکا لەسەر بۆندەکانی چەك بۆ تورکیا، بە هاوسەنگی سەربازی نێوان تورکیا و یۆنانی هاوسێیەوە بەندبوو، ئیدارەی ئەمریکی جگە لە کۆنگرێس کە لۆبییەکی بەهێزی یۆنانی تێدابوو، دەیویست ئەم هاوسەنگییە تێك نەدات. سەیری:
Carol Migdalovitz, "Turkey: U.S. Sale of Helicopters", P.67.



لەزیاتر لە شوێنێك جەختی لەسەر گرنگی و هەڵوێستی پێشووی تورکیا بەرامبەر ئەمریکا کردووە.

گەیشتنی پارتی رەفاه بە سەرکردایەتی نەجمەدین ئەربەکان بۆ دەسەڵات لە تورکیا (1996–1997) پەراوێزێکی زیاتری بە کۆنگرێس بەخشی تاکو کار لەسەر دارشتنی بڕیارگەلێك بکات لەبەرژەوەندی تورکیادا نەبێت، لە پێشەوەی ئەوانەش، ئەو بڕیارەی کە رێگری لە هاوردەکردنی چەك بۆ تورکیا دەکات. ئەمە زەوییەکی بەپیتی بۆ لۆبیە بەهێزەکانی یۆنانی و ئەرمەنی رەخساند تاکو یاساگەلێك لە دژی بەرژەوەندییەکانی تورکیا بە پاساوی خراپی تۆماری تورکیا لەبارەی مافەکانی مرۆڤ، دەربکەن. سەرباری پەسندکردنی لەلایەن وەزارەتی بەرگری ئەمریکییەوە، یاسادانەرانی ئەمریکی لەساڵی 1996 بۆندێکیان بە بڕی 10 ملیۆن دۆلار کە بەهای هەلیکۆپتەری (سوپەر کوبرا) بوون بۆ تورکیا، راگرت[1]. کۆنگرێس پاساوی بۆ ئەوە هێنایەوە و بە پشت بەستن بە راپۆرتی رێکخراوی نێودەوڵەتی لێبووردن رایگەیاند کە ئەو چەکانە بۆ **"گواستنەوەی هێزەکانی تورکی بۆ شوێنە دوورەکان بەکاردێت، ئەوشوێنانەی کە پێشێلکاری لە مافەکانی مرۆڤی تێدا ئەنجام دراوە"**[2]. لەهەمان ساڵدا سیناتۆر پاول سربانس Paul Sarbanes بۆندێکی فرۆشتنی سێ کەشتی دەریایی بۆ تورکیای بۆ ماوەی زیاتر لە دوو ساڵ راگرت[3]، هەرچەندە پارەکەشی پێشتر درابوو. لە تشرینی دووەمی 1996 تورکیا لەسەر هەڵوەشاندنەوەی بۆندی کڕینی 10 هەلیکۆپتەرەکەی پێشتر باسکران و بەهاکەی 150 ملیۆن دۆلار بوو، دوای ئەوەی کۆنگرێس بۆماوەی ساڵێك بە بیانووی بەکارهێنانی لە باشووری رۆژهەڵات ی تورکیا دژ بەکورد دوایخست، لەسەر ئەمە تورکیا تووڕە بوو[4].

(1) -Human Rights Watch, " The Human Rights Picture in Turkey Grew Worse During 1996" via at: (http://www.hrw.org/reports/1996/WR96/Helsinki-19.htm#P960_193943).

(2) -Carol Migdolovit, "Turkey: U.S. Sale of Helicopters", p.

(3) -Sabri Sayari, Turkey and U.S…, P. 36.

(4) -Michael M. Gunter, The Kurds…, P. 107.

بەرپرسێکی تورکی بە توڕەییەوە لەسەر بریاری وڵاتەکەی لێدوانی دا و گوتی: **"تورکیا کڕینەکەی هەڵوەشاندنەوە، چونکە ناتوانێت رێگە بەوە بدات کە خواستە سەربازییەکانی وڵاتەکەی ببێتە بارمتەی لۆبیە نەیارەکان"**[1]. تورکیا بۆندەکەی بۆ کۆمپانیای (فرانکو جیرمن ئیرۆ کوبتر Franco-German Euro copter) گۆڕی[2]. بەشێوەیەکی گشتی لەوەتەی 1996ەوە رێگرییەکانی کۆنگرێس لەسەر گواستنەوەی چەکی ئەمریکی بۆ تورکیا بووە بۆیەریکی ئامادە، کە بە **"گەمارۆی چەك لەسەر تورکیا"** وەسفکرا[3].

کۆمپانیاکانی چەك، لە ئازاری 1997 داواکارییەکیان بۆ مادلین ئۆلبرایتی وەزیری دەرەوەی ئەمریکی بەرزکردەوە داوایان کرد رێگرییەکانی بۆندەکانی چەك بۆ تورکیا هەلبگرێت، هەتاکو فشاری ئەو کۆمپانیایانەش وای لە کۆنگریس نەکرد لە ریگری دانان بۆ گواستنەوەی چەك و سیستەمی پیشکەوتووی سەربازی بۆ تورکیا بوەستێ[4]. ئیدارەی ئەمریکی هەولیدا ئەو کێشە و ئالۆزییەی کە کۆنگرێس لەبەردەم گواستنەوەی چەك بۆ تورکیا دایدەنێت، بەهۆی جەختکردنەوە لەسەر گرنگی تورکیا وەك هاوپەیمانێکی ستراتیژی بۆ ئەمریکا چارەسەری بکات. هەروەها بەهۆی هاندانی تورکەکان بۆ ئەنجامدانی چاکسازی لە بواری مافەکانی مرۆڤ و بەڵێن وەرگرتن لە بەرپرسانی تورکی چارەسەری کێشەکە بکات. لە شوباتی 1997 ژەنەراڵ جفیك بیر–Cevik Bir سەردانی واشنتۆنی کرد بۆ قسەکردن لەسەر هاوکاری سەربازی نێوان تورکیا– ئەمریکا و داواکردنی پاڵپشتی زیاتری ئەمریکا بۆ پرۆسە سەربازییەکانی لەباکووری عێراق، هەرچەندە ئەو ژەنەراڵە بە لایەنگرانی پەیوەندی نێوان ئەمریکا و تورکیا دادەنرێت، بەڵام هەڕەشەی کرد و گوتی: **"وادەکات تێچوونی مەشقپێکردن لەسەر فڕۆکەکانی F-16 ببێتە کێشە، ئەگەر ئەمریکا هاوکاری زیاتر پیشان نەدات"**[5].

(1) -Carol Migdalovitz, U.S. Sale of Helicopters, P. 69.
(2) -Philip Robins, Suits and Uniforms, P. 198.
(3) -Ibid.
(4) -Carol Migdalovitz, "Turkey: U.S. Sale of Helicopters", P.70.
(5) -Philip Robins, Suits and Uniforms, P. 198



کۆنگرێسی ئەمریکی گوێی بە رەخنە و هەرەشەکانی سیاسەتمەدار و سەربازانی تورك بەیەکەوە، نەدا و یاسادانەرانی ئەمریکی هەوڵەکانی ئیدارەی ئەمریکی لەم پشتگوێخستنە بەدەر نەنا، بەتایبەتی وەزارەتی بەرگری، کە دەیویست لە دەرەنجامی راپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوە لەبارەی پیادەکردنەکانی مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا کەم و سوك بکات، بۆیە سەرلەنوێ داوای لە لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی کۆنگرێس کرد کە دووبارە داوا لە وەزارەتی دەرەوە بکات راپۆرتێکی نوێ لەسەر شێوەی ئەوەی حوزەیرانی 1995 ئامادە بکات، ئەو راپۆرتە لە سەرەتای تەمووزی 1997 ئامادەکرا و کۆنگرێس وەری گرت[1]. دەرەنجامی هەوڵەکانی کۆنگرێس لە ساڵی 1997 و فشارەکانی دەستە و رێکخراوە نێودەوڵەتییە چالاکەکانی بواری مافەکانی مرۆڤ، ئەوەی لێکەوتەوە کە یەلمازی سەرۆك وەزیرانی تورکی لەمیانەی سەردانەکەی بۆ واشنتۆن لە کانوونی یەکەمی 1997، بەڵێنی دا کە رێز لە پابەندییەکانی کە بە ئیدارەی ئەمریکی دابووی و لەبارەی رێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ و دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤ بۆ چارەسەری پرسی کورد، هەروەك باسمان کرد. بە فشارەکانی کۆنگرێس، ئیدارەی کلینتۆن بەڵێنیدا بۆندی فرۆشتنی فڕۆکەی هێرش بەر بۆ تورکیا رابگریت کە بە بەهای 3.5 ملیۆن دۆلار بوو، ئەگەر تورکیا پابەندی ئەو بەلێنانە نەبیت کە یەلماز پێشتر دابووی. دوای ئەم هۆشدارییە وەزارەتی دەرەوە بریارێکی بێ وێنەی دەرکرد، ئەوەی لەسەر تورکیا سەپاند کە گالیسکەی گواستنەوەی سەربازان لە 11 پارێزگای کوردی کە هێزە ئەمنییەکان و پۆلیس مافی مرۆڤیان تێدا پێشێلکردووە، بەکارنەهێنیت[2].

هەندی لە ئەندامانی کۆنگرێس بە توندی لەگەڵ سیاسەتی ئەمریکی ناکۆك بوون، لەبارەی پێدانی چەکی ئەمریکی بۆ تورکیا. سینتیا ماککینی Cynthia

(1) -Department of State, U.S Military Equipment and Human Rights Violations, report submitted to the Chairman of the Senate Foreign Relations Committee on 1 July 1997, pursuant to Senate Committee Report 104-295, accompanying H.R. 3540. Via at: (http://www.fas.org/asmp/profiles/turkey_dos_USweapons.htm).
(2) -Human Rights Watch, " The Human Rights Picture in Turkey Grew Worse During 1998" via at: (http://www.hrw.org/worldreport/Helsinki-23.htm#P1117_264948).

Mckinney ئەندامی کۆنگرێس لە ویلایەتی جۆرجیا، وای دەبینی کە ڕێزگرتنی مافی مرۆڤ و پێوەرە دیموکراتییەکان، پێویستە لەکاتی فرۆشتنی چەك یان پێشکەشکردنی بەخشین بە وڵاتێکی وە تورکیا گرێ بدرێت، ئەگەر تورکەکان دەیانەوێت ببنە هاوپەیمانمان و چەکمان لێوەربگرن. هەروەها ماك کینی گوتی: **"کەمترین شتێك کە بتوانین بیکەین ئەوەیە کە بۆیان پێشنیار بکەین کە چەك لەدژی گەلەکەیان بەکار نەهێنن"**[1].

ماك کینی بە درێژایی ساڵی 1997 پێشەوایەتی هەوڵەکانی کۆنگرێسی ئەمریکی بۆ دەرکردنی پرۆژە یاسای (یاسای ڕەفتار–Code of Conduct) کرد، بۆئەوەی مۆرکردن و پارەدارکردنی بۆندەکانی چەکی ئەمریکی بۆ تورکیا بایکۆت بکات، بەڵام ئەمە ڕووبەڕووی بەرهەڵستکاری ئیدارەی ئەمریکی بووەوە، لە ئەنجوومەنی پیران دەنگی پێویستی بەدەست نەهێنا[2]. بەڵام ماك کینی لە ئەیلولی 1998 سەرلەنوێ پرۆژەکەی پێشکەش کردەوە و 80 دەنگی ئەندامانی بەدەستهێنا، بەڵام بەهۆی ئەوەی دانیشتنەکە بەر لە دەنگدان دواخرا، پەسند نەکرا[3]، بۆئەوەی ئیدارەی ئەمریکی لەبەرامبەر تورکەکان شەرمەزار نەبن. چارەسەری مام ناوەندی کە زۆربەی ئەندامانی کۆنگرێس پەسەندی دەکەن ئەوەیە کە ڕێوشوێنیکی کەمتر گشتگیر و توند بێت بگرێتەبەر، ئەو هەموارکردنەش سیناتۆر پاتریك لیهی Patrick Leahy (سیناتۆری دیموکرات لە ویلایەتی ڤێرمۆنت–Vermont) پێشکەشی کرد. ڕێوشوێنەکە بریتی بوو لە هەموارکردنی یاسای یارمەتییە سەربازییەکانی ئەمریکا بۆ یەکەی ئەمنی بیانی[4]. هەروەها بەهۆی ئەو هەموارکردنەوە ڕێگری لە پێدانی کەلوپەلی سەربازی بۆ ئەو هێزە ئەمنییە بیانییانەی کە مافی مرۆڤ

(1) -Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds", P. 29.

(2) -Kevin McKiernan, "Turkey's War Kurds", Pp.29-30; "Kurdish Question in Turkey, The U.S-Turkish Military Relationship", Via at: (www.mtholyoke.edu)

(3) -Kevin McKiernan, "Turkey's War Kurds", P. 30.

(4) -Henri J. Barkey, "The Endless pursuit", P.227.



پێشێل دەکەن کرد، ئەو ڕێگریکردنە پارەدارکردنی پرۆگرامی مەشقی سەربازیش دەگرێتەوە، هەتاکو ئەگەر سەلمێنرا تاکێکیش لە تاکەکانی ئەو یەکانە مافی مرۆڤیان پێشێل کردووە[1]. ئەو هەموارکردنە بە ڕێگری سەرەکی بەردەم فرۆشتنی گالیسکەی زرێپۆشی گواستنەوەی سەربازان بۆ تورکیا لە ساڵی 1999 دانرا، سەرباری فشارەکانی ئیدارەی ئەمریکی کە مۆڵەتی هەناردەکردنیشی دابوو[2]. ئەو هەموارکردنە ڕێگری لە ئەمریکا کرد کە زامنی قەرزە پێویستەکانی تەواوکردنی بۆندەکان دابین، ئەو دابینکردنانەی کە زۆربەی جار بە **"تێکشکێنەری بۆندەکان"** وەسف دەکرا[3].

لایەنێکی گرنگی هەستکردنی کۆنگرێس بە پرسی کورد لە تورکیا، لە پاڵپشتیکردنی لە چارەسەری ئاشتییانەی سیاسی پرسی کورد لە تورکیا دەردەکەوێت. کۆنگرێس لە زیاتر لە لایەنێکدا تورکیا بە خراپ مامەڵەکردن لەگەڵ هاووڵاتییە کوردەکانی تۆمەتبار کردووە، داوای لیکردووە کە بە گوێرەی ڕێوشوێنەکانی مافی مرۆڤ و پێوەرە دیموکراسییەکان سەیری داخوازییەکانیان بکات. میواندارییکردنی کۆنگرێس بۆ کەسایەتییە کوردییەکان، گرنگییەکی بێ وێنە و کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆی لە تێگەیشتنی ئەندامانی کۆنگرێس بۆ ناوەڕۆك و قەبارەی پرسی کورد لە تورکیا هەبوو. کۆنگرێس بانگهێشتی هەریەکە لە لەیلا زانا و ئەحمەد تورکی کرد کە هەردووکیان ئەندامی پەرلەمانی تورکی بوون لە لیستی پارتی کاری گەل، بۆئەوەی لەبەردەم لیژنەی هلسنکی لە کۆنگرێسی ئەمریکی گەواهی خۆیان بدەن. هەردووکیان لە 17ی ئایاری 1993 گەواهی خۆیان بەشێوەی لێدوان لەبەردەم کۆنگرێس پێشکەشکرد. دوای ئەوەی کورتەیەکی مێژووی کۆنی کوردیان لە ناوچەکە باسکرد، باسیان لە مەرگەساتی کورد لە تورکیا کرد، دواتر مەحرومبوونیان لە مافەکانیان و ملکەچ پێکردنیان بۆ سیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەیی لە بۆتەی نەتەوەی

(1) -Kevin McKiernan, "Turkey's War Kurds", P.30.

(2) -Washington Post, 31 December, 1998.

(3) -Henri J. Barkey, "The Endless pursuit", P.227.

تورکی، قسەیان لەبارەی دەسەڵاتی عەسکەر لە باشووری رۆژهەڵاتی وەڵات و رژێمی پاسەوانانی لادێ و دۆزینەوەی رێکخستنێکی فەندەمێنتالیزمی ئیسلامی کە حزبولای کونترا–Hizbi Kontra یە (مەبەستیان حیزبوڵای تورکیە) کرد و کە ئەو پارتە لەلایەن میتیMIT تورکییەوە سەرپەرشتی دەکرا و دەستیان بۆ کوشتنی هێزی عەلمانی و دیموکراتخواز لە بزووتنەوەی کوردی ئاوەڵا کرابوو. هەروەها هەردوو نوێنەرەکە باسیان لە چۆلکردنی گوند و شارە کوردییەکان کرد، کە بە پاساوی جەنگان لەدژی پارتی کرێکارانی کوردستان خاپوورکردنی بە بەرنامەی گوندەکانیان ئەنجامدا، لێدوانەکەیان جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە "**ململانێکە لە نێوان گەلی تورکی و گەلی کورد نییە، بەڵکو لە نێوان کورد و حکوومەتی گەندەڵی تورکیایە**" و "**ململانێیەکە لە ناوەرۆکدا تەنگژەی دیموکراتی تورکییە، چونکە 20 ملیۆن کوردی لە مافەکانی بێ بەش کردووە**"، لێدوانەکەیان هەشت پێشنیاری بۆ بەدیهێنانی ئاشتی و بەهێزکردنی بونیادی برایەتی نێوان کورد و تورك لە خۆگرتبوو، دیاریترینان پێویست بوونی داننان بە ناسنامەی کوردی و بەخشینی سەرجەم مافە رۆشنبیرییەکان بە کورد و بەخشینی مۆڵەتی یاسایی بە پارتە سیاسییە کوردییەکان بەشێوەیەکی تەواو و چەککردنی پێکهاتەکانی پاسەوانانی لادێ و هەڵوەشاندنەوەیان بوو[1].

ئەمەش تاکەجار نەبوو کە کۆنگرێس لایەنی کوردی– تورکی بۆ کۆنگرێس بانگ بکات، 13 ئەندامی کۆنگرێس هەریەکە لە رەمزی کارتال Remzi Kartal و جۆرج ئاریۆ George Aryo بەو سیفەتەی کە دوو نوێنەری پەرلەمانی تاراوگەی کوردین بانگهێشت کرد، ئەو پەرلەمانەی کە لە پارتی کرێکارانی کوردستان نزیك بوو. ئەو 13 ئەندامەی کۆنگرێس لە 6ی تشرینی یەکەمی 1995 نامەیەکیان ئاراستەی سەرۆك کلینتۆن کرد، بەم شێوەیە نامەکەیان لەبارەی کێشەی کورد دەستپێکردبوو و بە "**یەکێك لە پرسە بەردەوامەکان کە دروستکەری بریار دەشلەژێنێ**" وەسفکرد. لەنامەکە باسی ئەوەیان کردبوو کە

(1) -Ahmet Turk and Layla Zana, "Testify Before The Helsinki Commission in the United States congress, 17 May, 1993, Via at: (www.kurdistan.org/washington/Turk-2and.html).



دوو لە پەرلەمانتارانی کورد (مەبەستیان لەیلا زانا و ئەحمەد تورك بوو) لایەنێکی رەوشی کوردییان لە تورکیا باسکردووە، هەروەها باسیان لەوە کرد بەرێز کارتال کە پێشتر نوێنەری هەڵبژێردراوی پەرلەمانی تورکی بوو لە بۆ شاری وان، لە تشرینی یەکەمی 1991 ناچارکراوە بۆ تاراوگە بچێت، چونکە لەلایەن حکوومەتی تورکییەوە بە خیانەتکار تۆمەتبارکراوە و حەسانەی لەسەر لابراوە، چونکە داوای چارەسەری ئاشتییانەی پرسی کوردی کردووە، هەرچی نوێنەری دووەمە (ئاریۆ)، کە ئاشوورییە و خەڵکی کوردستانە، ئەوەیش ناچارکراوە تورکیا بەجێبێڵێت، چونکە داوای کردووە، دەسەڵات واز لە سیاسەتی نا لێبووردەیی لەگەڵ داخوازییە ئایینی و کلتووری ئاشوورییەکانی تورکیا بهێنیت. لە بەشێکی نامەکەدا هاتووە، کە "**ئەو دوو کەسایەتییە ئێستا نوێنەرایەتی دوو گرووپی ناو پەرلەمانی تاراوگەی کوردی دەکەن**". هەروەها داوا لە سەرۆك کلینتۆن کراوە کە پێویستە دان بەو پەرلەمانەی کوردی بنێت، چونکە "**دەستەیەکی هەلبژێردراوە و نوێنەرایەتی نزیکەی یەك ملیۆن کوردی تاراوگە لە ئەورووپا دەکات و لەبەرئەوەی دەستەیەکە هەوڵدەدات چارەسەری ململانێیەکە لەگەڵ تورکەکان بە رێگەی ئاشتی بکات**" و "**ئەگەر هانی گفتوگۆ لەنێوان پەرلەمانی تاراوگە و حکوومەتی تورکی لەلایەن ئەمریکاوە بدرێت، بە پاڵپشتی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، لەوانەیە ئەمە ئاشتی لە ناوچەکەی لێ بکەوێتەوە**". نامەکە بە پاڕانەوەی ئەوانەی واژۆیان کردووە، کۆتایی هاتووە، و داوایان لەسەرۆك کلینتۆن کردووە، کە وەڵامی بانگەوازەکەیان بداتەوە و باسیان لەوە کردووە کە ئەوان "**وەڵامدانەوەی بانگەوازەکەیان لەلایەن کلینتۆنەوە بەرز دەنرخێنن، سەبارەت بە نیازەکانی بۆ کارکردن لەگەڵ پەرلەمانی کوردی لە تاراوگە بۆ ئەوەی پرسی ئاشتی لە تورکیا بەرەو پێش بچێت**"[1].

لە شوباتی 1996، کریستۆفەر سمیسی–Christopher Smith سەرۆکی لیژنەی پەیوەندییەکانی وەزارەتی دەرەوە لە کۆنگرێسی ئەمریکی و سیناتۆر

(1) -The Kurdish Parliament in Exile and The United States congress, Congress of the United States, Hous of Representatives, Washington, D.C. 20515, 6 October, 1995. Via at: (www.kurdistan.org/ Washington/letcon.html).

ســتینی هــویر Stini Hoyer نامەیــەکیان بــۆ فرانــسوا رایــانی ســەرۆکی ئەنجوومەنی هاوکاری ئەورووپی نارد، بۆئەوەی **"نووسینگەی پەیوەندییەکان و هاوکاری لە باکووری کوردستان بکرێتەوە"**، و لە نامەکەدا داوای یارمەتییان کرد بۆ شەڕ راگرتن و دۆزینەوەی چارەسەرێکی ئاشتییانە بۆ پرسی کوردیان کردبوو"، و داوای ناردنی شاندێکی پەرلەمانی ئەورووپییان بۆ تورکیا کرد بۆئەوەی لە نزیکەوە لەبارەی رەوشەکە ئاگادار بن[1].

لە هەنگاوێکی بێ وێنە و بوێرانەدا، کۆنگرێس بە رەزامەندی ئەنجوومەنی نوێنەران لەسەر پرۆژە بریاری 25ی کانوونی دووەمی 1996 لە پرسی کورد گەیشت، سمیسی نوێنەری ویلایەتی نیوجیرسی لەجیاتی هویری نوێنەر، لەمیانەی دانیشتنی دووەمی خولی 104ی کۆنگرێس بریارەکەی خوێندەوە، دوای ئەوەی بریارەکە لەلایەن ئەنجوومەنی نوێنەرانەوە پەسندکرا، رەوانەی لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی کۆنگرێس کرا[2]. بریارەکە بە مەرگەسات و زیانە مرۆییە گەورەکانی ململانێی حکوومەتی تورکی و جەنگاوەرانی کورد، لەوەتەی جەنگە لە 1984ەوە بەردەوامە، دەستی پێکردبوو. هەروەها بریارەکە ئاماژەی بۆ ئەو یاسایانەی تورکیا کردبوو کە ئازادی رادەربرین بە تاوان دادەنێت و رۆژنامەنووس و ئەکادیمییەکان و چالاکانی بواری مافی مرۆڤ دەستگیر دەکەن. هەروەها بریارەکە باسی لە دەرکردنی نوێنەرانی کورد لە پەرلەمان کرد و بەهۆی بیروڕایان بۆ تاراوگە دوورخراونەتەوە، هەروەها ئاماژەی بۆ بێ بەشکردنی هاوولاتیانی کوردی لە مافە سەرەکییەکانی وەك مافی خوێندن بەزمانی دایك و ئازادی بەشداری لە ژیانی سیاسی و بلاوکردنەوە بەزمانی کوردی کردبوو. هەروەها بریارەکە ئاگاداری و بە بیری تورکیای هێنابووەوە، کە تورکیا لە ناتۆ و رێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپی ئەندامە و هاوبەشی ستراتیژی ئەمریکایە و میساق و رێککەوتنەکانی مافی

[1] - شمس الوطن، العدد (4)، (كُردستان العراق)، 3 شباط 1996.

[2] -House Concurrent Resolution 136, 10uth congress, 2D Session, 25 January, 1996. Via at: (www.kurdistan.org/washingtion/hous.html).



مرۆڤی نەتەوەیەکگرتووەکان و میساقی جنێڤی مافەکانی مرۆڤی 1948 و یاساکانی هلسنکی مۆرکردووە، هەورەها بەرژەوەندییە ستراتیژییە دوورەکانی ئەمریکا بەهۆی ململانێی بەردەوامی تورکیا کەوتۆتە مەترسییەوە، **"چارەسەری سەربازی پرسی کورد شتێکی ئەستەمە، چارەسەرێك کە لەسەر توندوتیژی نەوەستابێت، تەنها ئەو چارەسەرەیە کە دەتوانیت ئاشتی ئارامی و دیموکراتی تەواو و خۆشگوزەرانی بۆ تورکیا بێنیت، ئەو چارەسەرەیە کە دەبێت لە چوارچێوەی کۆماری تورکیا هەوڵی بۆ بدەین و جێبەجێ بکرێت"**[1].

بریارەکەی حکوومەتی ئەمریکی داوای جێبەجێکردنی ژمارەیەك راسپاردەی، لەسەر شێوەی 7 خاڵ کرد، یەکەمیان داوای لە حکوومەتی تورکی کردبوو سەرجەم بەندییە سیاسییەکان ئازاد بکات و رێگری بەردەم ئازادی رادەربرین لابەرێت **"بۆئەوەی هاوولاتیانی تورك بە کوردیشەوە بتوانن پیادەی مافە سیاسی و کلتوورییەکانیان وەك ولاتانی دیکەی دیموکراتی بکەن"**. هەروەها بریارەکە داوای لە پارتی کرێکارانی کوردستان کردبوو کە ئاگربەست بکات و راشبگەیەنێ کە بە چارەسەرێکی دیموکراتیك لە نێو یەکێتی خاکی تورکی رازییە، هەروەها داواش لە حکوومەتی تورکی کرا کە ئاگربەست رابگەیەنێ[2].

دیارترین خاڵ لە راسپاردەکانی کۆنگرێس خاڵی شەشەم بوو، کە بریتی بوو لەهەمان ئەو داوایەی کە پێشتر هەریەکە لە ئەحمەد تورك و لەیلا زانا لەمیانەی گەواهیدانەکانیان لە کۆنگرێسی ئەمریکی لە 17ی ئایاری 1993 پێشکەشیان کردبوو، ئەویش ئەوەبوو **"کورد سەرجەم مافە کلتووری و سیاسی و کۆمەلایەتییەکانی پێ ببەخشرێت"**[3]. بریارەکە بە داواکردنی بۆ گەیشتن بە میکانیزمیکی راوێژکاری بۆ کوژاندنەوەی ئەو ئاشوبە و پێشنیارکردنی ستراتیژی چارەسەری تەنگژەی دارایی باشووری رۆژهەلاتی تورکیا. هەورەها

[1] -Ibid.

[2] -Ibid.

[3] -House Concurrent Resolution 136, 10uth congress, 2D Session, 25 January, 1996. Via at: (www.kurdistan.org/washingtion/hous.html).

پابەند کردنی سەرۆك کلینتۆن بۆ دابینکردنی یارمەتی تەکنیکی بۆ جێبەجێکردنی برگە و خاڵەکانی سەرەوە[1].

لایەنێکی دیکەی گرنگی پێدانی هەندێ لە ئەندامانی کۆنگرێس بە پرسی کورد لە تورکیا، خۆی لە داواکردن لە ئیدارەی ئەمریکی دەنوێنێ تاکو فشار بخاتە سەر تورکیا بۆئەوەی وەڵامی بانگەشەکانی ئاشتی کە ئۆجەلان و پارتەکەی دەری دەکەن بداتەوە. 15 ئەندامی کۆنگرێس لە 25ی ئازاری 1996 گوتارێکیان ئاراستەی سەرۆکی ئەمریکی کرد و داوایان لێ کرد کە ئاوڕ لە بانگەشەکانی ئاگربەستی پارتی کرێکارانی کوردستان بداتەوە کە لە 15ی تشرینی یەکەمی 1995 دەریکرد، ئەوانە روویان لە کلینتۆن کرد و گوتیان: **"تۆ لە گوتاری لەبارەی حاڵەتی ئیتیحاد** Union Adrdress **ی رۆژی 23ی کانوونی دووەمی 1996 گوتت کە ئێمە دەتوانین، بەڵکو دەبێت باشترین دروستکەری ئاشتی جیهان بین. ئێمە بۆت دەنووسین و داوای یارمەتیت لێ دەکەین بۆئەوەی بەرەکەتی ئاشتی بەسەر ئەو کوردانەی کە لە دژی سەرکوتکردن لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا خەبات دەکەن، ببارێنی"**[2]. هەورەها لە گوتارەکەیان باسی رۆڵی بەکارهێنانی تورکیا بۆ چەکی ئەمریکییان لە گەورەکردنی کارەساتەکە کردبوو، نووسیویانە **"ئێمە بەڕاستی داوات لێ دەکەین ئەی سەروەرمان، کە چیدی چەك بە تورکیا نەدرێت، مادام تورکیا بەردەوامە لە خراپ مامەڵەکردن لەگەڵ کورد. هەروەها داوات لێدەکەین هەوڵی باشی خۆت لای ئەو دوو گەلە بخەیتە گەر بۆ ئەوەی چارەسەری کێشەکانیان بکەن. ئێمە داوات لێدەکەین ئەی سەرۆك ساتەوەختی هیوا هەڵبقۆزیتەوە، چونکە ئەمە لەگەڵ تێروانینی جەنابیشتان سەبارەت بە جیهانێکی ئازادی بێ ململانێ دەگونجێ"**[3].

---

(1) -House Concurrent Resolution 136, 10uth congress, 2D Session, 25 January, 1996. Via at: (www.kurdistan.org/washingtion/hous.html).

(2) -The Second Kurdish cease – Fire and the United States Government, Congress of the United States, House of Reprehensive, Washington, D.C 20515, 25 March, 1996. Via at:

(3) -Ibid.



لە 9ی تشرینی یەکەمی 1998 یەکێ لە ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمریکی، کە ئەویش هۆپ فلنەر بوو، قسەی بۆ برادەرانی کرد و گوتی: **"من ئەمڕۆ وەستاوم تاکو پاڵپشتی خۆم بۆ ئەو ئاگربەستەی کە عەبدوڵا ئۆجەلان تاك لایەنە رایگەیاندووە دەرببڕم، راگەیاندنەکە لە پەخشێکی زیندووی** Med Tv **بڵاودەکرایەوە، باسی لەوە کرد کە فەرمان بە جەنگاوەرانی دەکات هەموو چالاکییەکی جەنگاوەرانە لە یەکی کانوونی ئەیلول تا دوا ئاگادارکردنەوە رابگریت"**. و **"ئەوە هەلێکی گرنگە بۆ ئەوانەی کە ئاشتی دەگرنەبەر و بەرگری لە مافەکانی مرۆڤ دەکەن، هەروەها بۆ ئەوانەش کە لایەنگری بازرگانیکردنن لەگەڵ وڵاتانی نەوتی دەوروبەری ناوچەیەکی تەقیوە، کە کوردستانی پێ دەگوترێت گرنگە"**. لە وەسفی حاڵەتی کورد لە تورکیا گوتی: **"ئێمە مەرگەساتێکی مێژوویی دەبینین"** و **"ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، کە گۆڕانکاری بوێرانە لە سیاسەتی کۆنمان بکەین، کە متمانەی بە تورکیا هەیە و گلۆپێکی سەوزی بۆ پێ دەکات تا بە ئارەزووی خۆی چی بوێت بە کەمینە کوردییەکەی بیکات..."** و **"لەبەرئەوەی شەڕاگرتنەکەی ئۆجەلان، ئێستا لەوانەیە ئاشتی بۆ ناوچەیەکی شلەژاو بێنیت و رێگا لەبەردەم بەیەکەوە ژیانی کورد و تورك دەکاتەوە...پێویستە هاوکۆکی خۆمان لەگەڵ بەرێز ئۆجەلان لە پێویستی گرتنەبەری رێگایەکی شارستانی لەبڕی خۆینرێژی و مەینەتی دەرببڕین. ئەوە بەرپرسیارێتی ئێمەیە بەوپێیەی تاکە هێزی مەزنی جیهانین. یارمەتی ئێمەی دا تاکو رێککەوتننامەی بەلفاست مۆر بکەین[1] و گفتوگۆی دایتۆن و رێککەوتننامەی ئیسرائیل–فەلەستینی. پێویستە شتێکی کەمتر لەوە بۆ کورد نەکەین"**[2].

ئەو ئەندامەی کۆنگرێس لە نامەیەکدا کە بە بۆنەی گرێدانی کۆنگرەی نیشتمانی کوردستانی لە برۆکسل بە ئامادەبوونی 150 نوێنەری کورد لە

---

(1) – رێککەوتننامەی بەلفاست، هەندێجار رێککەوتننامەی ستۆرمۆنتیشی پێ دەگوترێت، لە 10ی نیسانی 1998، مۆرکرا و، سنوورێکی یەکجاری بۆ ململانێی ئیرلەندای باکوور دانا. سەیری ویکیپیدیا، فەرهەنگی ئازاد، کە لەسەر توری ئەنتەرنیت هەیە (http://ar.wikipedia.org/wiki/).

(2) -The Kurdish Cease – Fires An Opportunity; It should not be Squandered", 9 October, 1998, Via at: (www.kurdistan.org/washington/bFspeaks.html)

سووریا و تورکیا و عێراق و ئێران، ستایشی بانگەوازەکەی ئۆجەلانی بۆ چارەسەری ئاشتییانەی کێشەی کورد کرد، دوای دەستگیرکردنەکەی. لە بەشێکی نامەکەی باسی لەوە کردبوو کە **"ئەوە شایەنی هێزێکی مەزنی وەك ئەمریکا نییە کە پاڵپشتی لەو دیکتاتۆرانەی خۆیان لە جلی دیموکراتی شاردۆتەوە بکات. ئەوانەی کە نوێنەرێکی هەڵبژێردراوی وەك لەیلا زانا بەهۆی گەواهیدانی لەبەردەم ئەم کۆنگرێسەدا بەند دەکات، نابیت پاڵپشتی ئێمەیان هەبێت. سەرۆکی وەك ئۆجەلان سەرباری رابردووە توندەکەی، هێشتا بەدوای ئاشتی و تەبایی نێوان کورد و هاوسێکانی رادەکات"**[1].

ئەو جوڵانەوانەی کە هەندێ لە ئەندامانی کۆنگریسی ئەمریکی بە تاك یا بە کۆمەڵ بۆ دەربڕینی هاوسۆزی لە پرسی کورد لە تورکیا ئەنجامیاندا، زۆر کات تورکیای تورە دەکرد و بەدحاڵیبوونی لێدەکەوتەوە، هەندێجاریش کاری لە پەیوەندیە بەهێزەکانی نێوانیان دەکرد.

لەنێو ئەو کێشانەی کە زۆرێك لە سیاسەتمەدارانی تورکی ورژاند، بەهۆی ئەو کاردانەوانەی هەندێ ئەندام کۆنگرێسەوە بوو لەبەرامبەر بەندکردنی لەیلا زانا و هاوڕێیانی، دوای ئەوەی حەسانەیان لێسەنرایەوە. 43 نوێنەر و 16 سیناتۆری ئەمریکی نامەیەکیان لە تشرینی یەکەمی 1994 ئاراستەی تانسۆ چیللەری سەرۆك وەزیرانی تورکی کرد و تێیدا نیگەرانی قوولی خۆیان لەبەرامبەر دادگاییکردنی نوێنەرە کوردەکان دەربڕی و گوومانیان لە راستگۆیی تورکیا و پابەندبەکانی لەبەرامبەر مافەکانی مرۆڤ و پرەنسیپەکانی دیموکراتی دەربری. لە بەشێکی نامەکەیان باسیان لەوە کردبوو کە **"ئێمە لەو باوەڕەداین کە پرسی کورد، کە رووبەڕووی وڵاتەکەتان بۆتەوە، کە ئەگەری تەقاندنەوەی زیاتر دەبێت، پێویستی بە چارەسەرێك هەیە، ئەویش لە رێگەی ئامرازەکانی دیموکراتی و گفتوگۆوە دەبێت"**[2].

---

(1) -The Statement of Congressman Bob Filner on the occasion the Inauguration of the National Congress of Kurdistan in the house Representatives", Washington. DC, 20 May 1999. Via at: (www.kurdistan.org/washington/Filner-nck.html).

(2) - سالار اوسی و یوسف ابراهیم الجهماني، المصدر السابق، ص 85.



لەهەمان رێرەودا، فرانك بالۆنی– Frank Pallone ئەندامی گۆنگرێس لە ویلایەتی نیوجیرسی لە ئایاری 1997 نامەیەکی ئاراستەی ئەنجوومەنی نوینەرانی ئەمریکی کرد، بەم رستەیە دەستی پێکردبوو **"لەیلا زانا ئازاد کەن– Free Layla Zana"**، بالۆن بە قسەکردن لەسەر رەوشی کوردستان دەستی پێکردبوو، ئەو شوێنەی کە بەفراوانی مافی مرۆڤی لی پێشێل دەکرێت، دواتر داوای یارمەتی لە برادەرەکانی کرد بۆ ئازاد کردنی لەیلا زانا، دوای ئەوەی بەشێك لە ژیان و هۆکاری دەستگیرکردنەکەی خستبووە روو[1]. هەروەها پۆپ فلنەری ئەندامی کۆنگرێس لە 23ی ئابی 1997 لە وتارێکی کە لەبەردەم گردبوونەوەیەك کە تۆری زانیاری کوردی ئەمریکی– Kurdish Information Network و سەنتەری رۆشنبیری کوردی The Kurdish Cultural Center و کۆنگرەی نەتەوەیی کوردی– The Kurdish National Congress لە سان دیگۆ لە کالیفۆرنیا پێشکەشی کرد، گوتی: ئەو و 118 هاوڕێی کۆنگرێس نامەیەکیان ئاراستەی سەرۆك کلینتۆن کرد، بۆ ئەوەی کار بۆ دەستبەجێ ئازادکردنی لەیلا زانا بەبێ مەج بکات. لە بەشێکی وتەکەیدا رایگەیاند، **"کارە سەختەکەی لەیلا و هەزارانی دیکە، رۆژێك دێت سنوورێك بۆ سەرکوتی تورکی دادەنێن"** و **"زۆرێك لە ئەندامانی کۆنگرێس لەپاڵ لەیلا و گەلی کورد لە هەموو کاتێکی دیکە زیاتر، دەوەستن. گومانی تێدا نییە کە کۆنگرێسی ئەمریکی زیاتر هەست و سۆزی بەرامبەر مەینەتییەکانی گەلی کورد دەبێت. گومانی تێدا نییە کە پێشکەوتن بەدەستهاتووە، بەهۆی چالاکییە مانادارەکانتان هەموو جیهان ئەو سەرکوتکردنەی رووبەڕووی کورد لە تورکیا بۆتەوە، دەزانن، هێندەی پێناچیت گەزەنگی رووناکی دووبارە لەسەر ئەو زەوییەی کە بەناوی کوردستانەوە ناسراوە، دەپرێشکێتەوە"**[2]. دواتر فرانك بالۆون ئاماژەی بۆ

---

(1) "-Free Leyla Zana", The speech below was delivered by congressman Frank Pallon of New Jersey, Hous Floor-United States. Congress, 1 May, 1994. Via at: (www.kurdistan.org/washington/speech2.html).

(2) -U.S. Congressman Bob Filner (D) Supports Self-Determination for the Kurds," the speech delivered before a crowd of 200 people in San Diego, 23 August, 1997. Via at: (www.kurdistan.org/washington/filnerb.html).

لەیلا زانا کرد و بە "**یەکێ لە قوربانیانی توندوتیژی تورکی و سیاسەتی ناعەقلانی دژ بە کوردی**" دانا و رایگەیاند کە "**زۆربەی ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمریکی دەچنە پاڵ پەرلەمانی ئەورووپی بۆ بەرگریکردن لەو ژنە ئازایە، کە پەرلەمانتار و هەڵبژێردراویشە و ئامانجی داننانە بە ناسنامەی کوردی و ئازادی قسەکردن و نووسین بەزمانی کوردی و بەخشینی مافە رۆشنبیرییەکان بەکورد و مافە دەستوورییەکان بە هەموو پارتێکی سیاسی کوردییە...**"[1].

لە ئاماژەیەکی دیکەی گرنگیدانی کۆنگرێس بە پرسی لەیلا زانا بەگشتی، 153 ئەندامی کۆنگرێس لە 3ی تشرینی یەکەمی 1997 نامەیەکیان ئاراستەی کلینتۆن کرد و باسیان لە "**باری کارەساتباری لەیلا زانا و دەستگیرکردنی لەلایەن دەسەڵاتدارانی تورکییەوە لە 2ی ئازاری 1994 و بەندکردنی بۆ ماوەی 15 ساڵ کرد، چونکە پیادەی مافی خۆی لە بەرگریکردن لە مافەکانی گەلی کورد کردووە، هەورەها بەهۆی تۆمەتێکی دیکەیەوە کە بۆ واشنتۆن هاتووە و لەبەردەم لیژنەی هلسنکی لە کۆنگرێسی ئەمریکی گەواهی داوە. نامەکە داوای لەسەرۆکی ئەمریکی کردبوو، کە تا ئەوپەری فشار لەسەر دەسەڵاتدارانی تورکی دروست بکات بۆئەوەی دەستبەجێ و بێ مەرج زانا ئازاد بکرێت و بۆئەوەی دووبارە بۆ هاتنی بۆ کەنارەکانمان پێشوازی لێ بکەین**"[2].

ئەلیزابیس فیۆرس–Alizabeth Furse ئەندامی کۆنگرێس و یەکێك لەوانەی نامەکەی مۆرکردووە، حاڵەتی لەیلا زانا و هاوڕێیانی بە حاڵەتی نیلسۆن ماندیلا چواندووە . کاتێ لە 13ی تشرینی دووەم 1997 لەبەردەم ئەنجوومەنی نوێنەران قسەی کرد و گوتی: "**من گوێم لە خەلکانێك بووە دەڵێن ئەوانە تیرۆریستن** [مەبەست لەیلا زانا و هاورێیانی لە بەندیخانەی تورکیان]، **من ئەوەم لە بیرە کاتی خۆی بە نیلسۆن ماندێلا گوترا، تیرۆریست. تیرۆریست ئەو**

(1) - Statement by Rep. Fran Pallone", Jr.(D-NJ). Via at: (www.kurdistan.org/washington/Pallone.html).

(2) -Congressional letter to president Clinton Signed by 153 Members of Congress, 30 October, 1997. Via at: (www.kurdistan.org/153html).



**کەسەشە کە لەپێناوی ئازادی شەڕ دەکات. ئەوانە لەپێناوی ئازادی بۆ گەلەکانیان دەگەڕێن**"[1]. هەمان خانمە ئەندام لە 9ی تشرینی یەکەمی 1998 هات و سەرلەنوێ رەوشی لەیلا زانای بەبیری ئیدارەی کلینتۆنی هێنایەوە و ئەو دووساڵەی کە دادگای تورکی بۆ حوکمە 15 ساڵییەکەی زانای زیادی کرد بە "**پێشێلکارییەکی ناهەمواری ئازادی رادەربرین و سوکایەتیش بە لایەنگرانی لە جیهاندا**" لەقەڵەم دا و گوتی: "**حکوومەتی تورکی لە لەیلا زانا دەترسێ و لەو باوەڕەدایە کە دەتوانێ هەتاهەتایێ بەندی بکات. ئەمە چیرۆکی ئەوانەیە کە نیلسۆن ماندیلایان بەندکرد. درێژی شەو هەڵاتنی بەرەبەیان خێرا دەکات**"[2].

جۆن ئیدوارد پۆرتەر –John Edward Porter ی ئەندامی کۆنگرێس وایبینی کە بەخشینی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی رێوشوێنیکی پالپشتیکەری گفتوگۆ و ئاشتییە، لەو نامەیەی کە لە 23ی کانوونی دووەمی 1998 ئاراستەی لیژنەی خەڵاتی نۆبل بۆ ئاشتی کردبوو، تێیدا لەیلا زانای بۆ وەرگرتنی ئەو خەڵاتە پاڵاوتبوو، "**بەخشینی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی 1997 کارێك بۆ دەستپێکردنی گفتوگۆیەك کەولەوانەیە بەرەو ئاشتی بچیت، دەکات. ئەمجۆرە خەڵاتە دەبێتە سیبمۆلی هیوا و ئاشتی لە ناوچەکە... ئەمجۆرە کارە بوێرانەی لیژنەکە وادەکات مۆمێك لە بەشێکی تاریکی جیهان دابگیرسێنێ. هیوادارم ئێوە رێککەون لەسەر ئەوەی کە ئەمجۆرە تیشکە بۆ کۆتاییهێنان بە مەینەتییەکانی کورد پێویستە**".[3]

پرسێکی دیکە، کە کۆنگرێس دەستی تێوەردا و ناکۆکییەکانی ئەمریکا–تورکیای فراوانکرد، ئەویش ئەوە بوو کاتێ دادگای باڵای ئەمریکی بریاریدا کانی غولام Kani Xulam ی چالاکی کورد و سەرۆکی نووسینگەی پارتی

(1) -Congress woman Elizabeth Furse (D-OR), Floor of the House of Represents, 13 November, 1997. Via at: (www.kurdistan.org/washington/Furse137.html).

(2) "Congress woman Elizabeth Furse Condemns Turkey for Giving Leyla Zana Additional Prison Time, 9 October, 1998. Via at: (www.kurdistan.org/washington/efspeaks.html).

(3) "Letter Form Rep. Porter, Nominating Leyla Zana For the Nobel Peace Prize", 23 January, 1998. Via at: (www.kurdistan.org/portnobel.html).

کرێکارانی کوردستان لە واشنتۆن، دەستگیر نەکات، هەروەك ئەوەی تورکیا دەیخواست، لەبری ئەمە دادگاکە 24 کاتژمێر بەندی بەبێ جێبەجێکردن، بەتۆمەتی هەڵگرتنی پاسەپۆرتی ساختە، بەسەرا سەپاند[1]. دەرەنجامی دادگا تورکیای هیوا بڕ کرد[2].

ئەوەی لە پشت دەرکردنی ئەو بڕیارە سوکەوە بوو، ئەو 20 ئەندامەی کۆنگرێس بوون کە نامەیەکیان بۆ ریچارد رۆجەرز Richard Rogers ی سەرۆکی دائیرەی پەناهەندان لە لۆس ئەنجلۆس نارد، داوایان کرد ئەو رێوشوێنانەی کە وادەکات غولامی بۆ تورکیا بگوازێتەوە، رابگرێت و ئاماژەیان بۆ حالەتەکانی کوشتن و رفاندن و ئازاردانی بڵاو لە تورکیا کرد و پشتگیرییان لەداواکەی غولامی کرد سەبارەت بە وەرگرتنی مافی پەناهەندەیی سیاسی، گەڕانەوەی بۆ تورکیا بە **"مەترسییەکی گەورە دەبینی. لەبەرئەوەی رەخنەی لە سیاسەتەکانی تورکیا لەبەرامبەر کورد دەگرت، ئەوانەی رەخنەی رەوشەکە بگرن یا دەستگیرکراون یا ئازاردراون، ئێمە وادەبینین کە چەوساندنەوەیەکی هاوشێوە چاوەڕێی دەکات. ئێمە سوورین لەسەر ئەوەی کە ئەو راستییە لە بەخشینی مافی پەناهەندەی سیاسی بە غولامی لەبەرچاو بگیرێت"**[3].

هەڵوێستەکانی کۆنگرێس، ئەوانەی لایەنگری مافەکانی مرۆڤن لە تورکیا و زۆربەیان بە کوردەوە پەیوەستن، ئەو هەڵوێستانە لە زۆربەی کات لە باوەڕەوە نەهاتوون، بەڵکو زۆربەی جار ئەو هەولێستانە دەکەوتنە ژێرکاریگەری بەرژەوەندییە کاتی و سازشکارییەوە. بۆ نموونە کاتێ تورکیا ویستی 50 فڕۆکەی هەلیکۆپتەری بلاك هۆك بکڕیت، کۆنگرێس ئەو بۆندەی کە بەهاکەی 460 ملیۆن دۆلاربوو، بەهۆی پێشێلکاری تورکیا بۆ مافەکانی مرۆڤەوە رەتکردەوە. سیناتۆر کریس دود Chris Dodd لە ویلایەتی کۆنکتیکت

(1) -The Washington Post, 29 October, 1996.

(2) -Michael M. Gunter, The Kurds…, P.108.

(3) –"Stop the Deportation of Kani Xulam", Congress of the United States, Washington, DC 20515, 15 July, 1996. Via at: (www.kurdistan.org/washington/Letcon3.html).



Connecticut لە دیاریترین ئەوانە بوون کە لایەنگری تێپەڕاندنی ئەو بۆندەیان دەکرد چونکە خۆی لەو ویلایەتە بوو کە ئەو فڕۆکەیەی بەرهەم دێنا. سەیر لەوەیە دود لە دیارترین ئەوانەش بوون کە گرنگییان بە باشکردنی رەوشی مافی مرۆڤی سەلفادۆری دەدا، لەمیانەی پێشکەشکردنی یارمەتی سەربازی ئەمریکی بۆ سلفادۆر مەرجی دانا کە دەبێت سەلڤادۆر هەنگاوی بەرجەستە بۆ باشکردنی تۆماری بواری مافی مرۆڤ بهاوێ، بەڵام رێککەوت لەسەر ئەوەی کە رای خۆی بگۆڕێت، بەڵام دەبێت کۆمارییەکانیش سەبارەت بە فرۆشتنی فڕۆکەی بلاك هۆك بە تورکیا رایان بگۆڕن. ئەوەی مایەی گاڵتەجارییە لەمەدا، ئەوەیە کە دەنگدان لەبارەی فرۆشتنی فڕۆکەکان بە تورکیا لەهەمان ئەو رۆژەدا ئەنجامدرا کە ئەمریکییەکان یەکەیەکی سوپای سەلفادۆریان مەشقپێکرد کە 6 قەشەی مەسیحی و دوو کرێکاری سان سلفادۆریان کوشتبوو[1].

رەخنەکانی کۆنگرێسی ئەمریکی تورەیی و نارەزایی لای حکوومەتی تورکی لێکەوتەوە، تورکیا ئەو رەخنانەی بۆ **"کاریگەری نێگەتیڤی لۆبیە شەڕانگێزەکان"** دەگەڕاندوە، کە لە بنەماوە لە هاوپەیمانێتی بەرژەوەندییەکانی نێوان هەردوو لۆبی یۆنانی و ئەرمەنی دێتن کە پێکهاتوون لە یۆنانی و ئەرمەن و ئەمریکییەکان و گرووپەکانی مافی مرۆڤ و هاوپەیمانەکانی ناو کۆنگرێس و هەندێکیش ئاماژە بە بوونی **"لۆبی کوردی جوداخواز"** یش دەدەن[2].

لە جوڵانەوەیەك بۆ قەرەبوو کردنەوە سەرنەکەوتنی تورکیا لە دۆزینەوەی لۆبیەکی تورکی– ئەمریکی کە کێبڕکێی لۆبییە یۆنانی و ئەرمەنی **"نەیار"** بە بەرژەوەندییەکانی تورکیا لە ناو کۆنگرێس بکات، لەم جوڵانەوەیەدا تورکەکان رێکخراوە یەهودییە–ئەمریکییەکانیان بە باشترین قەرەبووی لۆبی پالپشتیکەر بینی، هەرچەندە ئەم بیرۆکەیە بۆ سەرۆك ئۆزال دەگەڕێتەوە کاتێ لەهەشتاکانی سەدەی بیستەم ویستی ئەمە بە پاڵپشتی دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی بچووکی تورکی–یەهودی لە واشنتۆن ئەنجام بدات، بەڵام ئەمە تا دوای

(1) -Kevin McKiernan, The Kurds: A People in Search of Their Homeland, St. Martin's Press, New York, 2006, P. 82.

(2) -Henri J. Barkey, "The Endless pursuit", P. 225.

ناوەڕاستی نەوەدەکان، بەدیاریکراوی تا دوای هاوپەیمانی نێوان تورکیا و ئیسرائیل لە ساڵی 1996 بەدەست نەهات. لە میانەی گفتوگۆکردن و تێپەڕاندنی بۆندی چەکی ئەمریکی بۆ تورکیا لۆبییە یەهودی– ئەمریکییەکانی پاڵپشتی توندیان لە ئەنقەرە کرد و لە کارکردی تۆمارە خراپەکەی لەبواری مافی مرۆڤیان کەمکردەوە[1].

لەمیانەی سەردانەکەی مەسعود یەڵماز لەکانوونی یەکەمی 1997، زیفی قەمحی بەرپرسی جولەکە لە وەزارەتی دەرەوە تورکیی لەگەڵ خۆی برد، ئەو پیاوە توانی چاوپێکەوتنی یەڵماز بە زۆریک لە کەسایەتی جولەکەی کاریگەر رێکبخات، دیاریترینیان ئەوەبوو کە یەڵماز چاوی بە کۆمەڵەی لۆبی ئەمریکی – جولەکە کەوت، لە چاوپێکەوتنەکەدا قەمحیش بەشداری کرد، کە سەرباری لایەنی تورکی و جولەکە، هەریەکە لە مادلین ئۆلبرایتی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و ریچارد هۆلبرۆکی یاریدەدەری ئامادەبوون. بەهۆی هەوڵی لۆبییە جولەکە و ئەمریکییەکان، یەڵماز لە کۆتایی سەردانەکەی بۆ واشنتۆن رایگەیاند کە گفتوگۆی سەبارەت بە رۆکێتی ئارۆ Arrow و بۆندی کڕینی فڕۆکەی F-15 کە کێشە و کۆسپیان هاتبوونە پێش، گەیشتۆتە کۆتاییەکی خواستراو و پێشوازیلێکرا[2].

هەرچۆنی بێت، رەخنەی ئەمریکا لەسیاسەتی تورکیا، جا چ ئەوانەی لە ئیدارەی ئەمریکیەوە یا ئەوانەی لە کۆنگرێسەوە دەهاتن، هەرتەنها بەهۆی **"لۆبییە نەیارەکان"**ی بەرژەوەندییە تورکییەکان لە واشنتۆن نەبوون، هەروەك ئەوەی نێوەندە تورکییەکان بانگەشەیان بۆ دەکرد و هەندێجاریش میدیاکانیش. زۆربەی رەخنەکان و بانگەشەکانی گوڕان ئاراستەی سیاسەتی تورکیا بەرامبەر کورد لە ناو تورکیا لە پارتە ئۆپۆزسیۆنە گەورەکان و ناوەندە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگەی تورکییەوە هاتبوون. ئەردال ئینونۆ سەرکردەی

(1) - بۆ زیاتر پێزانین لە بارەی لۆبیە ئیسرائیلی–ئەمریکی پشتگیری تورکیا لە ناو کۆنگریسی ئەمریکی، سەیری؛
Robert Olson, Turkey's Relations with Iran…, Pp. 131-137; Henri J. Barkey, "The Endless pursuit", Pp. 226-227.

(2) -Robert Olson, Turkey's Relations with Iran…, P.137 .



بەرهەلستکار لە پەرلەمانی تورکی لە نیسانی 1990 لێدوانی لەسەر سیاسەتە نێوخۆییەکانی ئۆزال و یەلدرم ئەقبولوتی سەرۆك حکوومەتەکەی (12/5/1989–17/6/1991) سەبارەت بە باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ دا و گوتی:
**"من وەك سەرکردەی ئۆپۆزسیۆن بە توندی ناچارکردنی هاووڵاتیان بۆ جێهێشتنی زێدیان و راگواستنیان بۆ ناوچەی دیکە رەت دەکەمەوە، جا هۆکار و پاساوەکانی هەرچییەك بن. هەروەها من دژی هەموو ئەو بڕیارانەم کە رۆژنامە کوتوبەند دەکات و تەگەرە دەخاتە بەردەم ئازادی بیرکردنەوە لە تورکیا. بەڵام جەنگان لە دژی تیرۆر ئەوا دەبێت وەك وڵاتانی ئەورووپی بە ئامرازی دیموکراتی بێت، چونکە هاووڵاتی زیان لیکەوتوو بەهۆی تیرۆرەوە، چاوەڕێی ئەوە لە دەوڵەت دەکات ئاسایش و ئارامی بۆ دابین بکات نەوەك راوەدووی بنێت و رایگوازێت"**[1]. هەروەها لە ئایاری 1990 دوای گەڕانێکی بە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆل، دووبارە رەخنەی توندی لە سیاسەتەکانی حکوومەت لە مامەڵەکردنی لەگەڵ کورد گرت و گوتی:
**"حکوومەت بەچاوی گوومان سەیری هەموو جوڵانەوەیەکی خەڵکی دەکات و وەك تاوانبار و جینایەتکار مامەڵەیان لەگەڵ دەکات، ئەمەش جۆرێك لە بێ هیوایی لە نێو خەڵکی ناوچەکە پەیداکردووە، سەرباری ئەمەش خەڵکی لەو کردەوانەی پاسەوانانی لادێ لە پێشێلکاری ئەنجامی دەدەن زۆر نارەحەتن، کە کێشەکەی ناوچەیەك زیاتر قووڵ دەکاتەوە، ناوچەیەك کە خەلکەکەی هەست بەوە دەکەن خەلکانی خۆشنەویستراون، بۆیە دەخوزارێت لە پەراوێزی ژیان دابنرێن، ئەمەش نامۆی کردوون و دواتریش بۆ هەڵگرتنی چەك هانی داون بۆئەوەی بەرگری لە ئادەمی بوونی خۆیان و مافیان لە ژیان بکەن"**. هەروەها ئەوەشی زیاد کرد کە **"حکوومەتی پارتی نیشتمانی دایك لە هەموو ئەوانەی لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ روودەدەن، بەرپرسە. لەوکاتەی کە شنەبای ئازادی بەسەر جیهاندا هەلیکردووە، دیموکراسی لە هەموو شوێنێکی**

(1) - ابراهيم الداقوقي، المصدر السابق، ص 340.

**جیهان سەرکەوتنی نوێ تۆمار دەکات، دەبینین حکوومەتی تورکی دەیەوێت ئامرازەکانی دەسەڵات لە ناوچەکە بە گوێرەی پێوانەکانی سەدەکای ناوەڕاست بگونجێنێت"**[1]. هەرچی سلێمان دێمیرێلی سەرۆکی پارتی ڕێگای ڕاست بوو، بەمشێوەیە لێدوانی لەسەر سیاسەتەکانی حکوومەتەکەی ئۆزال بەرامبەر کورد دا و گوتی: **"ئێمە دەمانەوێت یارمەتی هاووڵاتیان بدەین و ئارامی و ئاسایشیان بۆ دابین بکەین، نەوەك لەدژیان بوەستین و دوژمندارییان بکەین و ئارامی و ئاسایشیان تێکبدەین. بە دەستەواژەیەکی روون دەوڵەتی عوسمانی و ئیدارەی کۆمار کە سیاسەتی ڕاگواستنیان تەجرەبە کردووە، سەرکەوتوو نەبوون، چونکە پرۆسەی ڕاگواستن کۆمەڵی زوڵم دەگەڕێنێتەوە. دەوڵەت ئەو تۆمەتانەی دەخرێتە پاڵی دەستەوەستان دەوەستێ و ناتوانێت جیاوازی لە نێوان هەق و نا هەق و داد و زوڵمدا بکات و هێزەکانی لاواز دەبن و چارەسەری پێ ناکرێت و دەبێتە ئامێرێکی ناهەقی و زۆرداری. مێژووی تورکیمان زۆریك نموونەی لەم شێویەی تێدایە"**[2]. سەرباری ڕاستی ئەو ڕەخنانە بەڵام، ئەوەی شایەنی ئاماژە بۆکردنە هەموویان لە ڕێرەوی **"زیادکراوەکانی سیاسی"** و بەرهەڵستکاری بۆ حکوومەتی پارتی نیشتمانی دایك دەهاتن.

لە ساڵی 1998 لیژنەی ڕاگواستن لە پەرلەمانی تورکی تیمێکی لە ئەندامانی پەرلەمان، کە نوێنەری زۆربەی پارتە سیاسییەکانی تورکی تێدا بوو، بۆئەوەی ڕاپۆرتێك لەبارەی ڕاگواستن لە باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵات ئامادە بکەن. ڕاپۆرتەکە شەش مانگی پێچوو تا ئامادەکرا، لە 171 لاپەرە دابوو، ئینجا لە پەرلەمانی تورکی گفتوگۆی لەسەر کرا، هەرچەندە لە کۆی 550 ئەندام تەنها 20 ئەندام ئامادەی دانیشتنی گفتوگۆکە بوون[3]، ڕاپۆرتەکە بیروڕای بوێرانەی

(1) - المصدر نفسه، ص ص 342–343.

(2) - ابراهيم الداقوقي، المصدر السابق، ص 341.

(3) – ئەو ڕاپۆرتە ڕەنگدانەوەیەکی زور توند لە ناو و دەرەی ئەنجومەنی نیشتیمانی تورکی دا هەبوو، بۆ نموونە هەندێك لە ئەندامانی ئەنحومەن لە پارتی وەلاتی دایك و پارتی ڕێگای ڕاست نارازیبوونی خۆی پیشاندا لە کاتی خوێندنەوەی ڕاپۆرتەکە و، لە شوێنی خۆیان هاواریان کرد و قسەیان کرد: "چ کۆچکردنێك؟! چ گوندی کۆچکراو؟!"، ئینجا جێگیری سەرۆکی ئەنجومەن کامیران گەنج وەڵامیان داوە و گوتی: "ئەگەر دەتانەوێ ئەو گوندە کۆچکەرانە ببینن وەرن لەگەڵ من بۆ تونجلی=



لەخۆگرتبوو، لەبەشێکی هاتبوو کە **"لە ساڵی 1990ەوە لە ژمارەیەك هەرێم، جووتیاران لە شوانکاری مەڕ و ماڵاتیان قەدەغەکراون، ئەمەش وایکردووە، لە سەرچاوە گوزراندن مەحروم بن، حاکمی ناوچەی تەنگەتاوی بەپشت بەستن بە یاسای 2935 فەرمانی بە چۆڵکردنی ناوچە ئاوەدانییەکان دەکرد"**، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە ڕێژەی 85٪ی ڕاگوێزراوان لە تورکیا بۆ ئەلمانیا سەرچاوەکەی ویلایەتەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتە. ڕاپۆرتەکە دەنگدانەوەیەکی گەورەی لە دەرەوەی تورکیا هەبوو، هەریەکە لە جۆن شاتوك یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ کاروباری دیموکراتی و مافەکانی مرۆڤ و ئەلمانیا و وڵاتانی دیکەی ئەورووپی داوای دانەیەکی ڕاپۆرتەکەیان کرد[1].

=[دێرسم] و سەیری کۆچکردن و ئابلۆقەی ئابووری بکەن، کە لەسەر ناوچەکە سەپێندراوە". هەروەها ئەم ڕاپۆرتە جێگایی ڕەخنەی موراد باشیسکی اوغلوی وەزیری دەرەوەی تورکیا بوو.سەیرکە، Turkish Daily News, 3 Jun, 1998.

(1) -Ibid.

## بابەتی سێیەم: ڕەخنەکانی میدیاکانی ئەمریکی

پرسی کورد لە تورکیا لەلایەن میدیاکانی ئەمریکاوە ئەوەندە گرنگی پێنەدراوە تا سەرەتای دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم نەبێت، کە میدیای ئەمریکی ئاماژە بۆ پرسی کورد لەگەڵ هەر ڕووداوێك یا وەرچەرخانێکی گریدراو بە ڕەوشی تورکیاوە دەکات، وەك هەرەشەیەك لەو هەرەشانەی کە ڕووبەڕووی هاوپەیمانێکی گرنگ و نزیکی ئەمریکا دەبێتەوە، هەرچەندە راپۆرتی رۆژنامەوانی دروست لەبارەی ئەوەی کە حکومەتی تورکی لە مامەڵەکردن جیاوازی لە نێوان جەنگاوەران و خەڵکی بێتاوانی ناوچە کوردییەکان لەمیانەی ئەنجامدانی چالاکییە سەربازییەکانی ناکات. بۆ نموونە یەکێ لە رۆژنامەنووسانی ئەمریکی لە سەربازێکی تورکی بەشدار لەو پرۆسانەی سوپای لە کوردستان گواستۆتەوە کە "**بۆئەوەی ببێتە قوربانی لەوێ [باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا]، پێویستیت بەوە نییە، کە پێشمەرگە یا لایەنگری پارتی کرێکارانی کوردستان بێت، ئەوەندە بەسە کورد بیت**"(1).

کیفن ماککیرنان کە بەدرێژی لەبارەی پرسی کورد لە تورکیا نووسیووە، باسی لەوەکردووە کە "**تورکیا توانای ئەوەی هەیە بانگەشەکانی ڕۆژئاوا بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ کورد فەرامۆش بکات**". و "**سیاسەتی زەوی سووتێنراو وەحشیەتگەری و لابردنی دارستانەکان و سووتاندنی گوندەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا، بەشێوەیەك ئەنجامدراون، ڕۆژنامەکان ئەوەندە گرنگییان پێنەداوە، هەروەها گفتوگۆی جەماوەی نەورژاندووە، دەستەی نەتەوە یەکگرتووەکانیش ئەوەندە تێبینی نەکرد**"(2).

ئەو هۆکارانەی ڕۆڵیان لە دەرکەوتنی پرسی کورد لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستەم، گێڕا، هەمان ئەو هۆکارانەیە کە پاڵی بە میدیا ئەمریکی و

(1) -M. Schulter, "Genocide against Kurds and Ocalan Trial", 30 May, 1999 (http://www.kurdistan.org/Trial/schulter.html).

(2) -Kevin McKiernan, "Turkey's War on Kurds", P. 37.



ڕۆژاواییەکانەوە بەگشتی نا تا گرنگی بە پرسی کورد بدەن. بە شێوەیەکی گشتی ئاماژەکانی گرنگیدانی میدیای ئەمریکی لەماوەی ناوەڕاستی نەوەدەکانەوە ڕێرەوێکی روو لەسەری شانبەشانی توندبوونەوەی ڕووبەڕووبوونەوەکانی نێوان پارتی کرێکاران و حکومەتی تورکی بەخۆیەوە بینی، لەمیانەی ئەو ڕووبەڕووبوونەوانە زۆر پێشێلکاری لە مافەکانی مرۆڤ ئەنجامدران. هەروەها پرسەکە ڕەهەندێکی ترسناکی هەرێمایەتی وەرگرت، کاتێ تورکیا چالاکی سەربازی گەورەی سنوور بەزێنی بۆ باکووری عێراق ئەنجامدا.

ورژاندنی کێشەکانی دیموکراتی و پێشێلکارییەکانی ماف مرۆڤ بەتایبەتی لەلایەنە کوردییەکەوە لەلایەن رۆژنامەنووسان و میدیا ئەمریکییەکانەوە، ڕوویەکی دیکەی رژێمی سیاسی لە تورکیا ئاشکرا کرد، کە دەمێك بوو بە دیموکراتی وەسفکرابوو. زۆربەی ڕەخنە و گرنگی پێدانەکانی کە رۆژنامەنووسان و میدیاکانی دیکەی ئەمریکا لەبارەی تەنگپێهەڵچنینی لەسەر رۆژنامەنووسان و سەرکوتی ئازادییە گشتییەکان و پاڵپشتی ئەمریکا بۆ تورکیا و ئەو ڕێوشوێنانەی کە بە کاری ئەو رۆژنامەنووسانەی جەنگی بەردەوامی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا دژ بە پارتی کرێکاران لەوەتەی 1984ەوە رووماڵ دەکرد، پەیوەستبوون، ئاراستەی حکومەتی تورکیان کردبوو. لیژنەی پاراستنی رۆژنامەنووسان Committee to Protect Journalists، ڕێکخراوێکە چاودێری ئازادی رۆژنامە و ئەو ڕەوشەی کە رۆژنامەنووسانی جیهان لەژێر سایەیدا کاریان دەکرد، دەکرد، بارەگاکەی لە نیۆیۆرکە، ئەو ڕێکخراوە لەو راپۆرتەی کە لە ساڵی 1997 دەریکرد، ڕەخنەی توندی ئاراستەی تورکیا کرد، و ئاماژەی بەوەدا کە تورکیا هەرچەندە "**ئەندامی ناتۆیە و وڵاتێکی دیموکراتییە و هاوپەیمانێکی بەهێزی ئەمریکایە، بەڵام ئاشکرایە کە رۆژنامەی ئازاد سەرکوت دەکات و بەدەیان رۆژنامەنووس و نووسەر و پەیامنێر دەستگیر دەکات...**"، راپۆرتەکە ناوی 78 رۆژنامەنووسی ناو بەندیخانەکانی تورکیای تێدا بوو، لەوانەیە ژمارەی دوو هێندەش بێت بەگوێرەی ئەنجوومەنی رۆژنامەی تورکی. هەروەها راپۆرتەکە پەنجەی بۆ ئەوە درێژکردووە کە زۆربەی ئەو

رۆژنامەنووس و نووسەرانەی تووشی دادگایی کردنەوە دێن، لەوانەن کە لەسەر پرسی کورد و جەنگی بەردەوامی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات دەنووسن[1].

لە دیارترین ئەو رۆژنامە ئەمریکییانەی کە لەبارەی ئەو پێشێلکارییانەوە رەخنەیان ئاراستەی تورکیا کردووە، نیۆیۆرك تایمز New york Times و سەن Sun و دالاس مۆرنینگ Dallas Morning News نیوز و ئەکرۆن بیکۆن جۆرناڵ Akorn Beakon Journal و سان بیترسبیرگ تایمز St. Petersburg Times و بۆستن کلوب Boston Club و ئەوانی دیکە بوون.

جنیڤەر واشبۆرن Jenifer Washburn ی توێژەر لە پەیمانگای سیاسەتی جیهانی لە نیویۆرك لە ئەیلولی 1995 وتارێکی لە رۆژنامەی St. Louis Post-Dispatch لەژێر ناونیشانی (**تورکیا چەکی ئەمریکی بۆ هێرشکردنە سەر کورد بەکاردێنێ**) نووسی، قسەی لەبارەی پێدانی چەك و پارەی ئەمریکی بە تورکیا کردبوو، ئەمریکاش دەزانێ تورکان ئەو چەکانە لە خاپوورکردنی گوندە کوردییەکان بەکاردێنێ. هەروەها وتارەکە ئاماژەی بۆئەوە کردبوو کە ئەمریکا ئەوەشی لە راپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوەش لەبارەی پیادەکردنەکانی مافی مرۆڤ لە تورکیا هاتووە، لەبارەی خراپ بەکارهێنانی چەکی ئەمریکی بۆ پێشێلکاری مافی مرۆڤ فەرامۆش کردووە. هەروەها وتارەکە رەخنەی توندی لەو چاوپۆشینەی بەردەوامەی واشنتۆن بۆ سنوور بەزاندنی تورکیا بۆ باکووری عێراق گرتووە، بەڵکو پالپشتیشی لێکردووە. ئەوەشی باسکردووە کە تورکیا متمانەی تەواوی بەوە هەیە کە ئەمریکا پاساو بۆ هەناردەکردنی چەك بۆ وڵاتەکەی دەهێنێتەوە و "**بەپێویستی دەزانی بۆ پارێزگاریکردن لە پەیوەندی ستراتیژییان**" لەگەڵ هێزێکی سەربازی دیاری ناوچەکە. نووسەرەکە لە وتارەکەدا هۆشداری داوە کە "**بەرزبوونەوەی توندوتیژی ئەتنی، هەرەشەیەکی سەرەکی لە ئاشتی جیهانی دەکات، ناردنی بارەچەکی ئەمریکی بۆ تورکیا نامەیەکی هەلەیە بۆ ئەو وڵاتانەی ململانێی ئەتنی و هەرێمایەتی لە جیهان هەیە**". واشبۆرن گازندەی لە

(1) -Andrew N. Guthrie, "Turkey: Suppresses Journalists", Voice of America, 15 July, 1997. Via at: (www.Kurdistan.org/washington/voa.html).



وڵاتەکەی گرت بەوەی کاری نەکردووە بۆ بلۆککردنی هەموو یارمەتی سەربازییەکانی بۆ تورکیا، هەورەك ئەوەی لەگەڵ ئەلمانیا و ژمارەیەك وڵاتانی دیکەی ئەوروپی کردی[1].

لە ئایاری 1996 لە وتارێك کە لە رۆژنامەی واشنتۆن تایمز Washington Times لەژێر ناوی (**بۆچی ستایشی ئەمریکی بۆ تورکیا پێشوەختەیە؟**) بلاوکرایەوە، واشبۆرن سەرلەنوێ رەخنەی لە ئەمریکا گرتەوە. وتارەکەی بەدواداچوونێك بوو لەمەڕ ئەو پەسن و سەنا و پیاهەڵدانانەی یاسادانەر و کەسایەتییەکانی هەردوو وەزارەتی بەرگری و بازرگانی ئەمریکی کە لەمیانەی ئەو وتانە و گوتارانەی کە لە کۆنگرەی ساڵانەی ئەنجوومەنی ئەمریکی – تورکی کە لە سەرەتای ئازاری 1996ەوە گرێدرا، پێشکەشکران. باسی ئەوەی کرد کە "**وەستاندنی یارمەتییە سەربازییەکانی ئەمریکا بۆ تورکیا نیشانەیەکی بەهێز بۆ تورکیا رەوانە دەکات کە ئەمریکا چیتر پاڵپشتی لە چارەسەری سەربازی پرسی کورد ناکات. تا ئەو کاتەی کە تورکیا رێگە بە کەمینەی کوردی و تەواوی رێکخراوە ناحکومییەکانی دەدات کە بە مافی مرۆڤ شاد ببن و ئازادی رادەربڕینی تەواویان هەبێت، ئەوا ستایشی ئەمریکی بۆ تورکیا پێشوەختەیە بەشێوەیەکی مەترسیدار**"[2]. واشبۆرن وتارێکی دیکەی پەیوەندیدار بەهەمان بابەتی پالپشتی ئەمریکی بۆ تورکیا بۆ سەرکوتی کورد لەژێر ناونیشانی (**پێویستە ئەمریکا بەرپرسیارێتی خۆی بەرامبەر بە کورد ئاراستە بکات**) لە رۆژنامەی نیوزدای Newsday کە لە لونگ ئایلاند Long Island دەردەچیت لە تشرینی یەکەمی 1996 بلاوکردەوە، باسی لە سیاسەتی دووفاقییەی کە ئەمریکا مامەڵەی پێوە دەکات لەبەرامبەر یاسا نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە رێگەدا بە تورکیا بۆ ئەنجامدانی چالاکی داگیرکاری چەندبارە بۆ باکووری عێراق، سەرباری روودانی زیانی مرۆیی لە نێو مەدەنییەکان و پرۆسەی هەڵاتنی بەکۆمەڵی گوندییەکانی کورد[3]. هەمان

(1) -St. Louis Post-Dispatch, 7 September, 1995.

(2) -The Washington Times, 24 May, 1996.

(3) -Newsday (long Island), 2 October, 1996.

خانمە نووسەر لە وتارێکی دیکەیدا کە لە 2ی شوباتی 1997 لە گۆڤاری بازرگانی Journal of Commerce بڵاوکرایەوە، بەرپرسیارێتی راستەوخۆی ئەوەی پێی دەگوترێت **"جەنگی ناوەخۆی تورکیا"** خستە ئەستۆی ئەمریکا، ئەمەش لە وەڵامی دزەکردنی زانیاری بوو لەبارەی پێشنیازی فرۆشتنی 10 هەلیکۆپتەری ئەمریکی جۆری سوپەر کوبرا بە تورکیا، هات. باسی لەوە کرد کە **"ئیدارەی کلینتۆن نکۆڵی لە رۆڵی یارمەتییە سەربازییە ئەمریکییەکان لە بەردەوامی جەنگی ئەهلی لە تورکیا دەکات... سەرباری ئەوەی گرووپەکانی مافی مرۆڤ و وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا سەبارەت بە بەکارهێنانی چەکی ئەمریکی لە ئەنجامدانی پێشێلکاری لە مافەکانی مرۆڤیان بە بەڵگە سەلماندووە، بەڵام ئیدارەی کلینتۆن ئەوە رەت دەکاتەوە کە فرۆشتنی چەکی ئەمریکی بە تورکیا بە باشکردنی تۆماری تورکیا لە بارەی مافی مرۆڤەوە گرێ بدرێت"**. نووسەرەکە داوای لە ئیدارەی کلینتۆن کردبوو کە وەڵامی نامەکەی کانوونی یەکەمی 1996ی ئۆجەلان بداتەوە، کە داوای لە ئیدارەکەی کلینتۆن کردبوو بەشداری لە سەرکەوتنی شەڕ راگرتنە تاک لایەنیەکەدا بکات، ئەگەر تورکیا هێرشەکانی رابگریت **"چونکە پارتی کرێکارانی کوردستان لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتێکی جیاواز سوورنابیت، بەڵکو بەرەو چارەسەرێکی فیدرالی وەك ئەوەی لە ئەمریکا هەیە کراوە دەبێت"**. خانمە نووسەرەکە لە وتارەکەیدا هۆشداری لە مەترسی کەوتنی سیاسەتی ئەمریکی بە دەستی لۆبییەکانی دروستکەری چەك دا و گوتی: **"هەر رادەستکردنی چەکی ئەمریکی بە حکوومەتی نا دیموکرتی تورکی، ناردنی نامەیەکی رۆشن و ترسناکە بۆ بەردەوامی جەنگی ناوەخۆ دژ بە کورد و پاڵپشتی حکوومەتی لایەنگری رۆژئاوایە بەهێزی سەربازی و فەرامۆشکردنی ئاماژەکانی هەڵوەشاندنەوەی ئابوورییە..."**[1].

لەنێو ئەو رۆژنامە ئەمریکییانەی دیکە کە رەخنەی توندی لە سیاسەتی ئەمریکا لە پاڵپشتی و یارمەتیدانی تورکی گرتووە، بەبێ ئەوەی ئاوڕ لە کارکردە ترسناکەکانی

(1) -Jenifer Washburn, "Don't sell Weapons to Turkey", Journal of Commerce, 2 February, 1997.



بداتەوە، رۆژنامەی سان فرانسیسکۆ کرۆنکل San Francisco Chronicle بوو، جۆن ستیوارت John Stewart وتارێکی گاڵتەئامێزی لەبارەی ئەوەی لە تورکیا دەگوزەرێ لەژێر ناوی (**چەکوشی ئەمریکی و بزماری کورد**) لە شوباتی 1996 بڵاوکردەوە. ستیوارت وتارەکەی بەم پرسیارە دەست پێکردبوو **"ئایا ئەمە لۆژیکییە؟ ئەمریکا لە پێناو بەکارهێنانی بنکەی ئاسمانی ئەنجەرلینك بۆ گەرانی فرۆکە بۆ پاراستنی کوردی باکووری عێراق، بە ملیۆنەها دۆلار لە چەك بە تورکیا دەدات تاکو ئەویش لە کوشتنی کوردی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا بەکاریان بهێنیت"**. دواتر باسی ئەو دووفاقییەی واشنتۆن لە سنووردانان بۆ چەك مامەڵەی پێوە دەکات و دەڵێت ئیدارەی ئەمریکی فشار دەخانە سەر کۆنگریس بۆئەوەی بۆندی 130 ملیۆن دۆلاری بۆ فرۆشتنی 120 رۆکێت جۆری ATACMS بە تورکیا پەسەند بکات، ئەمەش یەکەم پرۆسەی هەناردەکردنی رۆکێتی بالیستییە کە توانای هەڵگرتنی سەری بۆمبی هێشوویی هەیە[1]. هەمان ئەو ئیدارەیە کە هەوڵەکانی بڵاوبوونەوەی رۆکێتی بالیشتی و جبەخانەی هێشوویی پەك دەخات. وتارەکە ئەوەشی زیاد کردووە کە ئەمە هەر کێبرکێی چەکی نێوان تورکیا و یۆنان زیاد ناکات، بەڵکو بە کارێکی شەرمهێن لە دیدگای مافی مرۆڤەوە سەیر دەکرێت، چونکە ئاشکرایە کە ئەو چەکانە بە چڕی لە هەڵمەتەکانی زەوی سووتێنراو کە تورکیا دژ بە کوردستان گرتبوویانە بەر. هەروەها وتارەکە رەخنەی لە پشتگوێخستنی تورکیا بۆ بانگەشەکانی سەرکردەکانی پارتی کرێکاران گرتووە لەبارەی شەڕاگرتن و چارەسەری پرسی کورد لەسەر بنەمای دیموکراتی و پلەیەك لە ئۆتۆنۆمی لە چواچێوەی تورکیا. نووسەری وتارەکە دەڵێت **"ئەو کێشەیەی کە زۆر بۆ ئەمریکا جێی نیگەرانییە ئەوەیە کە ئەو برە زۆرەی بەڵگە لەسەر ئەوەی کە زۆربەی فرۆکە و هەلیکۆپتەر و تانکە بەکارهاتووەکان لە بۆردوومان و سووتاندنی گوندە کوردییەکان و کوشتنی کورد و بڵاوەپێکردنیان، لەبەرهەمەکانی کارگە ئەمریکییەکانن، نرخەکەشی بەهۆی بەخشینی قەرز لەلایەن حکوومەتی**

(1) -San Francisco Chronicle, 11 February, 1996.

**ئەمریکییەوە دەدرێت"**. هەروەها وتارەکە ژمارە و ئامار و لێدوانی بەرپرسانی ئاست بەرزی ئیدارەی ئەمریکی لە دەستە و رێکخراوە بەرگریکارەکانی مافی مرۆڤ لەبارەی بەکارهێنانی تورکیا بۆ چەکی ئەمریکی بۆ پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤ و چۆلکردن و وێرانکردنی گوندە کوردییەکان خستە روو. وتارەکە گەیشتە ئەوەی کە ئەو جۆرە بەکارهێنانە دژایەتی لەگەڵ ئەو مەرجانە هەیە کە رێکخراوی ئاسایش و هاوکاری لە ئەورووپا دایناوە کە ئەمریکا تێدا ئەندامە. ئەمەش وایکردووە ئەو وڵاتانەی کە هەناردەی چەك دەکەن فرۆشتەنی دەکەن چەند جارێك فرۆشتنی چەك بۆ تورکیا رابگرن، بەڵام ئەمریکا ئەو کارەی نەکردووە. نووسەری وتارەکە، وتارەکەی بە پەندێکی تورکی کۆتایی پێهێناوە، کە **"کورت بینی"** و سەرنەکەوتنی سیاسەتی هەناردەکردنی چەکی ئەمریکی، کە دەڵێت **"چەکوشێك بدە بە پیاو، ئەوجا فیکر دەکات کە هەموو کێشەیەك بزمارن"**[1].

نیۆیۆرك تایمز، کە یەکێکە لە دیارترین رۆژنامەکانی ئەمریکا، وتارێکی گرنگی لەبارەی ئەو پێشێلکاریانەی کە تورکیا لە بواری ئازادییە گشتییەکان و مەدەنییەکان ئەنجامی دەدات بڵاوکردەوە. لە سەروتارێکی رۆژنامەکە لە ئابی 1996 لە ژێرناوی (**نا لێبووردەیی سیاسی**) بڵاوکردەوە. ئەم وتارە بۆ بەدواداچوونی ئەو هەلمەتە رەشبگیرییەی کە دەزگای ئەمنی تورکی دەرهەق بە ئەندامانی پارتی دیموکراتی گەلی ئەنجامی دا، بەهۆی ئەوەی پیاوێکی نەناسراو لە کۆبوونەوەیەك کە پارتەکە رێك خستبوو، ئالای تورکی دابەزاندوو ئالای پارتی کرێکارانی کوردستانی بەرزکردەوە. وتارەکە ناوی سەرکردەی پارتەکە ئەوانەی بە پێی یاسای لەناوبردنی تیرۆر دادگایی کراون، ئاشکرا کرد، بەهۆی ئەوەی رای خۆیان دەربریوە. رۆژنامەکە وای دەبینی **"هەتاکو ئەوەی کە ئاڵاکەی هێنایە خوارە ئەندامی پارتی دیموکراتی گەل بێت، ئەوا کاردانەوەی حکوومەتی تورکی زێدەرۆیی زۆری تێدابوو و گونجاو نەبوو... سەرکوتی ئەوانەی بەرگریکردن لە پرسی کورد بە شێوەیەکی ئاشتییانە**

(1) -San Francisco Chronicle, 11 February, 1996



**دەگرنەبەر، مافی مەدەنییان نامینێت و وادەکات سیاسەتی تورکی چڕ ببیتەوە..."**، رۆژنامەکە هۆشداری لەبارەی داخستنی پارتی گەلی کوردی دا، کە لە هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمی 1995 نزیکەی 1.2 ملیۆن دەنگی هێنا، بەسەرکەوتن بۆ پارتی کرێکاران دەژمێردرێت، چونکە **"رەشبگیری، دوژمنداری ئەتنی لە وڵاتدا، کە خۆی لە بنەماوە خەریکە کەرتببێ، قووڵتر دەکاتەوە"**، رۆژنامەکە لە بەشێکی دیکەدا دەڵێت **"دەبیت حکوومەت هانی ئەوانە بدات کە بانگەوازی چارەسەری ئاشتی دەکەن نەوەك بێ دەنگیان بکات"**[1]. لە ژمارەی دەرچووی رێکەوتی 13ی تەمووزی 1997 رۆژنامەکە سەروتارەکەی بۆ قسەکردن لەبارەی پێشێلکارییە فراوانەکانی ئازادییەکانی رۆژنامەوانی تەنگکردنەوەی ئازادی رادەربرین تەرخان کردووە. رۆژنامەکە لەژێر ناوی (**تورکیا بەندکەری رۆژنامەنووسان**) نووسیویەتی کە **"تورکیا خاوەن ناوبانگێکی شەرمهێنە، چونکە گەورەترین ژمارە لە رۆژنامەنووسان لە هەموو وڵاتان زیاتر بەند کردووە، زۆربەیان بە تۆمەتی (بانگەشەکردن بۆ جوداخوازی) یا ئەندامی گرووپە سیاسییە قەدەغەکراوەکان یا لایەنگری کورد، تۆمەتبار کراون"**، رۆژنامەکە نموونە بە دەستگیرکردنی ئۆجاك ئیشك Ocak Isik Yurtcu یۆرتچۆ دەهێنیتەوە، کە نووسەرێکی دیار و نووسەری رۆژنامەیەکی پێشووشە، ئەو نووسەرە 3 ساڵان لە کۆی 15 ساڵی حوکمەکەی بەتۆمەتی بڵاوکردنەوەی وتار لەبارەی زەوی سووتێنراو کە سوپا دژ بە یاخیبوانی کورد لە باشووری رۆژهەڵات ئەنجامی داوە، بڵاوکردۆتەوە[2]. هەروەها لە هەمان ژمارەدا ستیڤن کینزەر Stephn Kinzer لێکۆلینەوەیەکی درێژی لەبارەی دیموکراتی تورکی و ئەو کردەوانەی کە دیموکراتییەکەی دەشیوێنی لە ژێرناوی (**پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ وێنەی تورکیا دەشیوێنی**) بڵاوکردەوە، لێکۆلینەوەکە تۆماری پڕ لە پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤی تورکی لە مامەڵەکردن لەگەڵ پرسی کوردی خستۆتە روو. باسی لە نموونەی ئەو

(1) -New York Times, 3 August, 1996.

(2) -New York Times, 13 July 1997.

دەستگیرکراوانە کردووە، کە لەکاتی دەستگیرکردنیان لەلایەن پۆلیسەوە، ونبوونە. لێکۆڵینەوەکە گەیشتە ئەوەی کە "**زۆربەی تۆمەتەکانی پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا لەو رووداوانە وەرگیراون کە لە باشووری وڵات روودەدەن. بەگوێرەی رای ئەوانەی لەبواری بەرگریکردن لە مافەکانی مرۆڤ کاردەکەن، لە 80٪ی پێشێلکارییەکان بەشێوەیەك لە شێوەکان پەیوەندییان بە ململانێی کوردییەوە هەیە... بە گوێرەی قسەی سەبری ئەرگول** Sabri Ergul **ی ئەندامی لیژنەی مافەکانی مرۆڤ لە پەرلەمانی تورکی بە هەزاران کەس لەوێ کوژراون. لاشەی هاووڵاتی و سەربازانی کوژراوی ئەوێ بە هەموو گوند و شارۆچکەیەك گەیشتووە**". هەروەها لێکۆڵینەوەکە باسی لەوەکردووە کە سەرباری بەردەوامی ئازاردان لە بنکەکانی دەستگیرکردن و چالاکییەکانی کوشتنی نادیاری نەتەپەروەرانی کورد، ئەوا پرسی مافەکانی دیکەی مرۆڤ لە تورکیا بریتییە لە قەدەغەکردنی هەموو لێدوانێك کە هەڕەشە لەسەر یەکێتی نەتەوەیی تورکی بکات[1].

ستیڤن کینزەر لە ئەستەنبۆڵەوە وتارێکی دیکەی بۆ رۆژنامەی نیویۆرك تایمز لە 16ی شوباتی 1998 لە ژێرناوی (**تورکیا سیاسەتمەدارانی دیار بە هەڕەشە بۆ یەکێتی نەتەوە تۆمەتبار دەکات**)، لەبەشێکی دا باسی لە هەڵمەتەکانی دەستگیرکردن کردووە کە ئەندامانی پارتی دیموکراتی گەلیشی گرتەوە و باسی لەوەکردووە کە ئەمە یەکێکە لەو رێکخستنە سیاسییە کەمانەی کە لایەنگری کورد دەکات، داواکاری گشتی دەوڵەت لە ئەنقەرە حوکمی دەستگیرکردنی 57 ئەندامی سەرکردایەتی ئەو پارتەی دەرکرد[2].

رۆژنامەی ملبارد ئاند سان برنۆ Millbrad and San Bruno یەکێکە لەو رۆژنامە ئەمریکییانەی کە داوای لە ئیدارەی ئەمریکی کردووە کە سیاسەتی پاڵپشتیکردن لە تورکیا بگۆڕێت، رۆژنامەکە لە سەروتاری رۆژی 3ی ئابی 1997 لە ژێرناوی (**لەپێناوی بەرگری کردن لە مافەکانی مرۆڤ**)، نووسیویەتی

(1) -New York Times, 13 July 1997.

(2) -New York Times, 16 February, 1998



لەبارەی لەیلا زانا و دەستگیرکردنەکەی و ئەونامانەی کە بۆ کۆنگرێس و سەرۆك کلینتۆن بۆ ئازاد کردنی نووسیبوونی "**لەوانەیە زۆربەی ئەمریکییەکان ئەوە نەزانن کە ئەوەی بە ئازادی رادەربرین دادەنرێت لە تورکیا بە خیانەت لەقەڵەم دەدرێت**". هەروەها باسی لەوە کردووە کە تورکیا هاوپەیمانێکی کۆنی ئەمریکایە و پێشکەشکردنی پاڵپشتی سەربازی بەردەوام بۆی، بۆ مانەوەی حکوومەتەکەی پێویستە. بەڵام ئەندامبوونی تورکیا لە ناتۆ لە رەخنەی ئەمریکی دەیپارێزێ. رۆژنامەکە لە کۆتایی سەروتارەکەدا دەڵێت "**تورکیا بەهێزترین هاورێ و هاوپەیمانی ئەمریکایە لە جیهانی ئیسلامی. بەڵام بێ گوومان فاکتەرێکی باش لە ئارادایە بۆ ئەوەی ئەمریکا فشار بخاتە سەر تورکیا تاکو سیاسەتەکانی لەبواری مافی مرۆڤ بگۆڕێت. گومانی تێدا نییە کە کورد هۆکاری خۆیان هەیە، تاکو لایەنگیری ئەمریکی بەدەست بێنن، وەکو هەر گرووپێکی دیکەی جیهان کە رووبەڕووی سەرکوت دەبنەوە**"[1].

پرسی کورد بەشێکی کەمی لە میدیای ئەمریکی بەرکەوت، بەڵام ئەو چەندجارە کەمەی کە باسی پرسی کورد کراوە، بانگەشەکانی گۆڕان لە سیاسەتی ئەمریکی خەسڵەتی توندیان بەخۆیەوە دەبینی.

یەکێ لە ئامادەکارانی بەرنامەی (**سیاسەت**) لە رادیۆی دەنگی ئەمریکا کە ئەندرۆ ن. گوتری Andrew N. Guthrie بوو، لە 15ی تەمووزی 1997 بەرنامەیەکی رادیۆیی بەناوی (**تورکیا رۆژنامەنووسان سەرکوت دەکات**) ئامادەکرد. گوتری لە میانەی بەرنامەکەیدا تیشکی خستە سەر هەڵسوکەوتەکانی تورکیا لە سەرکوتکردنی رۆژنامەی ئازاد و ئاماژەی بە راپۆرت و توێژینەوەکانی کردووە، دیاریترینیان، توێژینەوەیەکی نوێ بوو کە لەلایەن رێکخراوێکی نێودەوڵەتییەوە کە گرنگی بە رەوشی مافی رۆژنامەنووسان لە جیهان دەدات، ئامادەکرابوو، ئەو رێکخراوەش (**لیژنەی بەرگریکردن لە رۆژنامەنووسان**) بوو، لە نیویۆرك. بەرنامەکە دیارترین ئەو رۆژنامە ئەمریکییانەی کە رەخنە لە تورکیا دەگرێت بەرووخست، بەهۆی

(1) -Millbrae and San Bruno, 3 Augustus, 1997.

ئەوەی تورکیا تۆماری خراپی لەبواری سەرکوتی ئەو رۆژنامەنووسانە هەیە کە رووماڵی جەنگی باشووری رۆژهەلات ی ولات دەکەن. هەروەها بەرنامەکە باسی لە نموونەی ئەو رۆژنامانە کرد کە بەهۆی رەخنەگرتن لەو شێوازانەی ئەنقەرە لە بەرێوەبردنی جەنگەکە دژ بە کورد ئەنجامی دەدات(1).

ئامی کۆدمان Amy Goodman ی پێشکەشکاری بەرنامەی (**دیموکراتی ئێستا**) لە رادیۆی باسفیك Pacifica Radio's لە 6ی تشرینی یەکەمی 1997 چاوپێکەوتنێکی دوورودرێژی لەگەڵ کانی غولام ئەنجامدا، کە بەوردی چالاکییەکانی تورکی لە باکووری عێراق و رەوشی کوردستانی تورکیا خستە روو. باسی لەو شێوازە سەرکوتکارییانەی تورکیا کرد کە بەهۆیەوە مامەڵە لەگەڵ پرسی کورد دەکات. لەم پێوەندەدا ئاماژەی بە دەستگیرکردنی لەیلا زانا کرد بەهۆی ئەوەی داوای چارەسەری ئاشتییانەی پرسی کورد لە تورکیای کردبوو، هەروەها باسی لەوە کردبوو کە هێشتا تورکیا هەلمەتی خاپوورکردنی گوندە کوردییەکان ئەنجام دەدات و ئەو بانگەشانەی ئەندامانی کۆنگرێس لەبارەی پێشێلکارییە فراوانەکانی مافەکانی کورد فەرامۆش دەکات. کاتێ بێژەرەکە لەبارەی سەرچاوەی ئەو چەکانەی کە تورکیا بەهۆیەوە کوردستان بۆردوومان دەکات، غولامی وەڵامی دایەوە کە "**زۆربەی زۆری ئەو چەکانەی تورکیا لە دژی کورد لەم جەنگەدا بەکاری دێنێت لە ئەمریکاوە دێت، بۆنموونە فرۆکەی F-16 و سیکۆرسکی**". ئاماژەی بەو پەرتووکەی جۆن تیرمان J. Tirman بەناوی (**دەستکەوتەکانی جەنگ** The Spoils of War)(2) نووسیویەتی کرد، کە باس لە کارگەکانی فرۆکەی ستونی دەکات کە بە تورکیا دەدرێت و لە لێدانی خاکی کوردان بەکاردێت(3).

(1) -Andrew N. Guthrie, "Turkey: Suppresses Journalists", Voice of America, 15 July, 1997. Via at: (www.Kurdistan.org/washington/voa.html).

(2) -جۆن تیرمانی شارەزای سیاسی ئەو ناوەی بۆ کتێبەکەی بە گوێرەی ئەوەی تێیدا هاتووە، هەڵبژاردووە، کتێبەکە لە ساڵی 1998 دەرچووە، تێدا هاتووە، کە توکیا ویستوویەتی 50 فرۆکەی جۆرری بلاك هۆك بۆ سەرکوتی بزووتنەوە کوردییەکان بکرێت، بەلام ئەوکات کۆنگرێس رەتیکردەوە، بەڵام دواتر پەسندی کرد. سەیری، Kevin McKiernan, The Kurds: A People in Search of Their Homeland, Pp. 81-82.

(3) -Amy Goodman Interviews Kani Xulam" Pacifica Radio's "Democracy Now, 6 October, 1997. Via at: (www.Kurdistan.org/washington).



کیڤن ماککیرنان فیلمێکی دیکیۆمێنی لەبارەی کوردی تورکیا و سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر کورد و تورکیا لە ژێرناوی (کوردی باش و کوردی خراپ ( Good Kurds, Bad Kurds) لە ماوەی دوایین دەیەی سەدەی بیستەم بەرهەمهێنان. بابەتی فیلمەکە لە سەفەرە چەندجارەکانی ماکیرنانەوە بۆ کوردستانی تورکیا و چاوپێکەوتنەکانی بە خەڵکی شار و گوندە راگوێزراوەکان پێکهاتبوو، سەرباری چاوپێکەوتنی بە کەسایەتی ئەمریکی پایەبەرز کە پۆستی دیپلۆماسی ئەمریکییان لە تورکیا و واشنتۆن وەرگرتووە، وەکو مۆرتون ئەبرامۆفیتەر، بالیۆزی ئەمریکا لە تورکیا (1989–1991) وجۆن شاتۆکی یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ مافەکانی مرۆڤ و کەسایەتی کوردی و ئەمریکی دیکە. ماککیرنان باسی لەوە کردووە کە فیلمەکە چیرۆکی کورد بەبەڵگە دەکات، کە میدیای ئەمریکی هیچ گرنگی و رومالێکی بۆ ناکەن، لەهەمان کاتدا میدیای ئەمریکی بە بۆردوومانی ئەمریکی بۆ سەر عێراق سەرقاڵن. دەرهێنەرەکە پرسێکی گرنگ لە فیلمەکەدا دەورژێنێ، ئەویش پرسەکانی سیاسەتی دەرەوە و سنوورە، کە رۆڵێکی سەرەکی لە مامەڵەکردنی ئەمریکا لەگەڵ داخوازییەکانی کورد و خەباتیان لەپێناوی مافە نەتەوەیی و کلتووری و سیاسییەکان گێراوە. دەرهێنەرەکە لە فیلمەکە باس لەوە دەکات کە ئەمریکا خۆی دەستەواژەی "**کوردی باش**"ی بۆ وەسفکردنی کوردی عێراق دارشتووە، چونکە ئەوان یارمەتی ئەمریکایان لە جەنگی دژ بە سەدام حوسێن داوە. دەستەواژەی "**کوردی خراپ**"یشی بەسەر کوردانی تورکیا سەپاندووە، چونکە ئەوان شەڕ لەگەڵ هاوپەیمانێکی ستراتیژی ئەمریکا دەکەن، هەتاکو ئەگەر خەباتەکەیان لەپێناوی مافە مەدەنییە سروشتییەکانیش بێت. ماککیرنان لە فیلمە دیکیۆمینتییەکەدا رەخنە لە ئەمریکا دەگرێت، بەوەی لە ململانێ تورکیا لەگەڵ کورد گلاوە و چەکی ئەمریکی بە تورکیا دەدات، باس لەوە دەکات کە ئەمریکا دەتوانێ خۆی لەمەی روودەدات بێ بەری بکات، ئەگەر دەست لە کێشمەکێشی دژ بە کورد لە تورکیا وەرنەدات، بەڵام ئەمەی نەکردووە(1).

(1) - بۆ زیاتر پێزانین لە بارەی فیلمەکەی ماککیرنان، سەیری ئەو سایتی ئەلیکترۆنییە بکە: (www.kevinmckiernan.com.)

## بابەتی چوارەم: ڕۆڵی ڕێکخراوەکانی بەرگریکردن لە مافەکانی مرۆڤ

ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ Human Rights Watch لە پێشەوەی ئەو ڕێکخراوە ناحکوومییە چالاکانەی ئەمریکا دێت، کە فشاری بۆ سەر ئیدارەی ئەمریکی هێناوە، زۆربەی جار بە هاوکاریکردن لەگەڵ کۆنگرێس، بۆئەوەی فرۆشتنی چەکی ئەمریکی بۆ تورکیا رابگرێت، هەروەها راسپاردەی لەبارەی دۆزینەوەی چارەسەری ئاشتییانەی پرسی کورد پێشکەشکردووە، لە ڕێگەی داننانی تورکیا بە ناسنامەی کلتووری و سیاسی کوردیی، ئەو ڕێکخراوە لە ساڵی 1989 بە بۆنەی وەرگرتنی جۆرج بۆشی باوك پۆستی سەرۆکی ئەمریکا، کۆمەڵێ راسپاردەی پێشکەش کرد، کە خۆی لە کێشەکانی مافی مرۆڤ و کۆتایی هێنان بە حاڵەتەکانی ئازاردان و هەڵوەشاندنەوەی ئەو یاسایانەی تایبەتن بە بەرتەسککردنەوەی ئازادییەکان و پیادەکردنەکانی دیموکراتی، لە راسپاردەیەکی بە راشکاوانە داوای لە جۆرج بۆشی باوك کردووە، کە کار بۆ رازیکردنی تورکیا بۆ **"داننان بە کەمینەی کوردی لە تورکیا و بەخشینی مافە مەدەنی و سیاسییەکان پێیان هەروەك ئەوەی تورك پیادەی دەکات و کۆتایی هێنان بەو کۆت و بەندانەی کە وا لە کورد دەکەن بە ناسنامەی نەتەوەیی نەگەن، بەوانەش کە بەسەر زمانی کوردی و مۆزیك و شایی کوردی سەپێنراون"**[1].

ڕێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ لە ساڵی دواتر راسپاردەیەکی دیکەی ئاراستەی ئیدارەی ئەمریکی کرد و داخوازی نوێی دیکەی خستە سەر، کە زۆربەیان راستەوخۆ ئاماژەیان بۆ رەوشی کوردان لە تورکیا دەکرد. ئەوەی لەم راسپاردانە نوێ بوو، ئەوە بوو کە داواکرابوو کە یارمەتییە سەربازی و ئابوورییەکانی ئەمریکا بۆ تورکیا هەڵبپەسێنرێت، داوای یەکسان بوونی کورد و تورك لە شادبوون بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان و داننان بە بوونیان، هەروەها داواکرابوو کە کۆتوبەندە سەپێنراوەکانی سەرزمان و مۆزیکی کوردی

(1) -Human Rights Watch, " The Human Rights Picture in Turkey Grew Worse During 1989". Via at:
(http://www.hrw.org/reports/1989/WR89/Turkey.htm#TopOfPage).



لابرێن. هەروەها رایسپارد کە تورکیا رازی بکات تاکو مەرسومی 413 کە زۆریك لە مافە سەرەکییەکانی هەڵپەساردووە، هەڵبوەشێنێتەوە و رژێمی پاسەوانانی لادێ نەهێڵێت و هەڵمەتەکانی راگواستنی هاووڵاتیان لە ناوچەی کێشەدارەکان رابگریت و پارێزگاری لە مەدەنییەکان بکات و سزای ئەندامانی ئەمنی تورکی ئەوانەی لە مامەڵەی خراپ بەرپرسن بدات[1].

لە ساڵی 1991 داواکارییەکانی ڕێکخراوەکە بەشێوەیەکی وردتر بۆ سەرۆك بۆشی باوك دووبارە کردەوە[2]. ریچارد بارکلی Richard Barkley باڵیۆزی نوێی ئەمریکی لە تشرینی یەکەمی 1991 بانگەوازێکی ئاراستەی تاکەکانی ڕێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ و نوێنەرانی ڕێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی کرد، بۆئەوەی راستەخۆ لەوان گوێبیستی رەوشی مافی مرۆڤ لە تورکیا بن[3].

دەستەی چاودێری هلسنکی[4] لە ئابی 1992 لەگەڵ فەرمانبەرانی کۆنگرێسی ئەمریکی و بەرپرسانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی کۆبووەوە، ئەوانە بەشێوەیەکی راستەوخۆ (**رەوشی ترسناکی مافەکانی مرۆڤ لە تورکیا**)یان بۆ دەستەکە گواستەوە و داوای لێکۆڵینەوەیان لە بەرنامەی مەشقپێکردنی ئەمریکی بۆ پۆلیسی تورکی، ئەو بەرنامەی کە لەژێر پەردەی بەرنامەی یارمەتیدان بۆ لەنابردنی تیرۆر ئەنجام دەدرا. لەهەمان ساڵدا

(1) -Human Rights Watch, "The Human Rights Picture in Turkey Grew Worse During 1990" via at: (http://www.hrw.org/reports/ 1990/WR90/HELSINKI. BOU-04.htm#P585_134572).

(2) -Human Rights Watch, "The Human Rights Picture in Turkey Grew Worse During 1991" via at: (http://www.hrw.org/reports/199 /WR9 /HSW-06.htm#P744_222349).

(3) Ibid-.

(4) - دەستەی چاودێری هلسنکی یان (لیژنەی هلسنکی)، ئاژانسێکی فیدرالی سەربەخۆیە و بارەگاکەی لە ئەمریکایە. بەپێی یاسا چاودێری و هانی ئەوەی لە بواری جێبەجێکردنی برگەکانی رێککەوتننامەی هلسنکی کە لە ساڵی 1975 پەسندکرا، دەدات، کە جەخت لەسەر بەرگریکردن لە مافەکانی مرۆڤ دەکات. ئەو لیژنەیەی کە لەساڵی 1976 لە حەوت ئەندامانی ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکی و نۆ ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران پێکهات، سەرباری بەرپرسێکی وەزارەتی بەرگری و دەرەوە و بازرگانی. لە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپی ئەو ڕێکخراوە هەیە. سەیری ویکیپیدیا فەرهەنگی ئازاد، کە لەسەر تۆری ئەنتەرنیت هەیە. (http://ar.wikipedia.org/wiki/)

دەستەی هلسنکی چوار وتاری لەبارەی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لە تورکیا لە گەورە رۆژنامەکانی ئەمریکا بڵاوکردەوە، دوو لەو وتارانە لە رۆژنامەی واشنتۆن پۆستدا، کە دواتر لە هیراڵد تریبیوّن ئەنتەرناشیۆنال Herald Tribune International بڵاوکرایەوە، یەکێکیش لە نیۆیۆرک تایمز و ئەوەی دیکەش لە رۆژنامەی ئەسینای رۆژانە Kathimerini بڵاوکرایەوە، کاردانەوەکانیشی لە رۆژنامەکانی نیۆیۆرک تایمز و واشنتۆن پۆستدا بڵاوکرانەوە[1].

لەمیانەی ساڵی 1993 دەستەی چاودێری هلسنکی لە چاوپێکەوتنی بە بەرپرسانی کۆنگرێس بەردەوام بوو، پێی راگەیاندووە کە ئەگەر ئەمریکا لە مەشقپێکردنی پۆلیسی تورکی بەردەوام بێت، بە تێوەگلاو لە پیادەکردنی ئازاردان کە ئەو هێزانە ئەنجامی دەدەن، دەژمێردرێت[2].

رێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ لە ساڵی 1994 راپۆرتێکی لەبارەی هاوردەکردنی بۆمبی هێشوویی ئەمریکی بۆ تورکیا ئامادەکردووە، ئەم راپۆرتە لە وەڵامی مۆرکردنی کۆمپانیای Alliant Tech Systems بۆندیك لەگەڵ حکوومەتی تورکی لە 21ی حوزەیرانی 1994 بۆ پێدانی 493 بۆمبی هێشویی لە جۆری 87 _CBU کە کاریگەرترە لە جبەخانەی سەربازی ئەمریکی. راپۆرتەکە کە لە مانگی کانوونی یەکەمی 1994 تەواو بوو، ئەو حاڵەتانەی خستۆتە روو کە لەشوێنەکانی دیکەی جیهان ئەو چەکەی تێدا بەکاردێت، زۆربەی قوربانیانی لە هاوولاتی مەدەنین، دواتر هاتۆتەسەر پیادەکردنەکانی تورکیا لە دژی کورد و پێشێلکارییە فراوانەکانی بۆ مافەکانی مرۆڤ. راپۆرتەکە ئاماژەی بۆئەوە کردووە کەتورکیا کە پێشێلکارییەکی فراوانی مافەکانی دانیشتوان و یاساکانی جەنگی کردووە، لەوانەیە ئەو بۆمبانە لە جەنگەکەی لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان بەکار بهێنێت، بەتایبەتی تورکیا کە تۆماری

(1) -Human Rights Watch, "The Human Rights Picture in Turkey Grew Worse During 1992" via at: (http://www.hrw.org/reports/1992/WR92/HSW-06.htm#P744_222349).

(2) -Human Rights Watch, " The Human Rights Picture in Turkey Grew Worse During 1993" via at: (http://www.hrw.org/reports/1993/WR93/Hsw-08.htm#P564_202642).



بەڵگەداری لەسەر گوێنەدان بە ژیانی مەدەنییەکان لە میانەی پرۆسە سەربازییەکان هەیە. سوپای تورکی ترس و تۆقاندن و ئازاردانی بۆ نەهێشتنی دانیشتوان بە پاساوی برینی پاڵپشتی لە پارتی کرێکاران بەکارهێناوە. هێزی ئاسمانی تورکی بۆردوومانی سەربازی ژمارەیەك ناوچەی قەڵەمرەوی پارتی کرێکارانی کوردستانی لە باشووری رۆژهەڵات و باکووری عێراق جێبەجێکردووە، کە بۆمبی هێشوویی بەکارهیناوە، ئەمەش بە گوێرەی میدیاکانی تورکی[1]. رێکخراوی چاودێری ماف مرۆڤ پێشەوایەتی هەڵمەتێکی بۆ رازیکردنی وەزارەتی دەرەوە کرد، تاکو مۆڵەتی هاوردەکردن بە کۆمپانیای Alliant Tech Systems نەدەن و رێگە لە ئەمریکا بگرن تاکو ئەو چەکە کوشندەیە بە تورکیا نەدات، **"لەگەڵ بوونی ئەگەری خراپ بەکارهێنانی ئەو چەکانە بۆ پەیداکردنی مەینەتییە مەدەنییەکان"**[2].

بەهۆی ئەو راپۆرتەی کە رێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ بۆ ئیدارەی ئەمریکی لە کانوونی یەکەمی 1994 بەرزیکردەوە، لەبارەی پێدانی بۆمبی هێشوویی بە تورکیا،کاتی پێشینازەکە بە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی درا، زۆر دەمەتەقێی لە هەمەجۆر لقی جێبەجێکاری ئیدارەی ئەمریکی لێکەوتەوە[3]. بەتایبەت کە راپۆرتەکە باسی لەوە کردبوو کە هەر بۆمبێك لەو بۆمبانە بەهۆی ئەوەی 220 بۆمبی بچووکی تێدایە و هەریەکێکیان 300 پارچەی لێ دەبێتەوە، لەوانەیە بەقەد رووبەری گۆرەپانێکی تۆپی پێ دابپۆشێ[4]. تورکیا لە شوباتی 1995 جگە لە راکێشانەوەی داخوازییەکەی هیچی بۆ نەمایەوە، ئەمەش بەهۆی ئەو دەمەقاڵێیە زۆرەی کە بۆندە کە لەلایەن ئەو دەستە و رێکخراوانەی کە گرنگی بە مافەکانی مرۆڤ دەدەن وروژاندی و پاشەکشەکەی تورکیایان بە سەرکەوتنێك بۆ خۆیان لەقەڵەمدا[5].

(1) -Human Rights Watch, "U.S. Cluster Bombs for Turkey?", December 1994 Vol. 6, No. 19, New York, 1995.

(2) -Ibid.

(3) -St. Louis Post-Dispatch, 7 September, 1995.

(4) -Human Rights Watch, "U.S. Cluster Bombs for Turkey… ."

(5) -St. Louis Post-Dispatch, 7 September, 1995; Henry J. Barkey, "Under Gun: Turkish…", P. 74.

